میخائیل بار زۆهار

نەسیم میشال

# کردە هەرە گرنگەکانی

# دەزگەی هەواڵگریی ئیسرائیلی

# مۆساد

و. لە ئینگلیزییەوە:

شەفیقی حاجی خدر

ناوی کتێب: کردە هەرە گرنگەکانی دەزگای هەواڵگریی ئیسرائیلی – مۆساد

ناوی نووسەر: میخائیل بار زۆهار و نەسیم میشال

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: شەفیقی حاجی خدر

بابەت: هەواڵگریی

نۆبەتی چاپ: یەکەم، ٢٠١٨

بەرگ: ئازاد وەرتی

چاپخانە: حەمدی

نرخ: ٨٠٠٠ دینار

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان – هەرێمی کوردستان ژمارەی سپاردنی «٧٢» ی ساڵی ٢٠١٨ی پێدراوە.

پێشکەشە بە

ئەو پاڵەوانانەی هێشتا گۆرانییان بۆ نەگوتراوە،

ئەو جەنگانەی نەگێڕدراونەتەوە،

ئەو کتێبانەی نەنووسراونەتەوە،

ئەو نهێنییانەی نەدرکێندراون،

ئەو خەونانەی ئاشتی، کە هەگیز بەلاوە ناندرێن و قەتیش فەرامۆش ناکرێن.

میشێل بار زۆهار

## ناوەڕۆک

# پێشباری وەرگێڕ

نۆبەرەی وەرگێڕانەکانم، کتێبێکی نایابی «گۆردۆن تۆماس» بوو بە ناوی "نهێنیەکانی مۆساد". ئێستاش جارێکی دیکە لە ئەڵقەی پێنجەمی ئەو کتێبانەی دەربارەی ئیسرائیل وەرمگێڕاون، گەڕامەوە سەر کتێبێکی ناوازەی دیکەی بەردەستتان.

ڕاستیەکەی نە من دەمەوێ پێشەکی بۆ کتێبەکە بنووسم، و نە لە ڕێی ئەو چەند دێڕەشەوە بە خوێنەرانی بناسێنم، بەڵام ئەوەندە هەیە، شێواز، دەوڵەمەندی ناوەڕۆک، زانیاری نوێی ئەم کتێبە وایلێکردم بیکەمە کوردی.

ئاخر خۆ لە دنیای هەواڵگرییدا هەر ئەوەندە بەس نییە، دەزگەیەکی هەواڵگری نهێنیت هەبێ، بەڵکو ئەوە گرنگە شێوازی کاری هەواڵگرییەکە چۆن ئاسایشی نەتەوەیی وڵاتێک دەستبەر دەکا، هەڵبەتە ئەمەش هاوکار لەگەڵ توانستی هۆکارەکانی دیکە. وەک «شیمۆن پیریز» سەرۆکی کۆچکردوویی ئیسرائیل، لە وتەیەک سەبارەت بە ناساندنی ئەم کتێبەدا مۆساد گوتوویەتی: "هێزی شاراوەی ئیسرائیل (مەبەستی دەزگەی هەواڵگریی نهینییەکەیانە) بە قەد هیزی دیار و ئاشکراکەیەتی".

هەر بەندێک لەو ٢١ بەندەی نێو کتێبەکە بەدەر لە پێشبەند و پاشبەندەکەی، باس لە قۆناغێکی مێژووی دەوڵەتی ئیسرائیل و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەکا، هەروەها بەندێکیشی لەسەر عێراق و شۆڕشی ئەیلوولی کوردستانە. ئیدی شێوازی داڕشتنەکە وەک چیرۆکێک، وەک کورتە ڕۆمانێکی لێدێ، دەکرێ بگوترێ ڕۆمانی مۆساد، ئاخر ڕووداو و سەربردە و بەسەرهاتەکان وا بە لەیەکگرێدراوی و بەتام دەگێڕێتەوە،

خوێنەر بە وردەکارییەکان، بە پاشخان و تەواوی پێشهاتەکانی دووتوێی ڕووداوەکە، بێ ئەوەی وەڕەز بێ، ئاشنا دەکا.

پێمخۆشە خوێنەری خۆشەویست بزانێ، کە ٣٠ لاپەڕەی کۆتایی بۆ سەرچاوە، بۆ بەڵگەدارکردنی ناوەڕۆکەکەی دیاریکراوە، واتە لە کۆتایی هەر بەندێکدا سەرچاوەکان لە کتێب ڕۆژنامە و گۆڤار و چاوپێکەوتنەکان لەگەڵ لایە پەیوەندیدارەکانی باس کردووە، ئەمە جیای دەکاتەوە لە کتێبێکی ئاسایی، وای لێدەکا ڕاستی و دروستی لە هۆنینەوە جیابکرێتەوە؛ هەڵبەتە لە کاتی خوێندنەوەشدا هەستی پێدەکرێ. بەڵام من لەبەر قەبەبوون، ئەو لاپەڕانەم نەهێناونەتەوە، بۆ ئەو کەسەش بیەوێ سەروسۆراغی ئەو سەرچاوانە بکا، دەکرێ بگەڕێتەوە سەر ئەم ماڵپەڕە: https://archive.org/details/pdfy-kxJuN00KtPU1iooO

لەم وەرگێڕانەمدا، لەبەر دەوڵەمەندی و فرەڕەهەندی ناوەڕۆکەکەی، لەوانەیە زۆرترین پەراوێزی بۆ کرابێ، بەتایبەتی هێنان و لێکدانەوەی کۆمەڵێ وشەی کوری پەتی پاراو، لەوانەیە بشگوترێ، وشەکان مۆرکی دەڤەری باڵەکایەتییان پێوەیە، بەڵام شیرینی و ڕەسەنی وشەکان، خۆیان خۆیان هێناوەتە پێشەوە. پێموایە بۆ دەوڵەمەندکردنی زمانی وەرگێڕانیش کەڵکبەخشە.

ماوەتەوە ئەوەی دانی پێدابنێم، وەک هەر وەرگێڕانێکی دیکەم، دەستەیەک لە کەسانی خۆشەویستم لەگەڵ خۆم ماندوو بوون، ئەرکم خستوونەتەبەر، هەمووشی لەپێناوی ئەوەی، تا بکرێ زمانی وەرگێڕانەکە بێگرێوگۆڵ بێ، ڕەوان و ئامانجشکێن بێ، هەڵەبڕیش بێ.

جارێ لە پێشەوە سوپاسی «شێخ شەماڵ گەزنەیی» دەکەم، کە پار ئەم کتێبەی بە دیاری لە هۆڵەنداوە بۆ کڕیم. دوای ئەوەش کاتێ کە بەندەکانم

بۆ دەناردن، وێڕای دەستنیشانکردنی هەندێ هەڵەی چاپی زەق، لەسەر ناوەڕۆکەکەش وتەی هاندەرانەی جوانی بۆ دەنووسیم، تا لێی ساردنەبمەوە و تەواوی بکەم.

«لوقمان شلانی»، کە زۆر جاران هەر بۆ خۆشی پێی دەڵێم، مامۆتکی کتێبەکانم، ئاخر هەموو جارێک بە دەستنیشاکردنی هەڵەی تایپ، لەنگی هەندێ وشە، دیاریکردنی هەندێ وشە بۆ لێکداوە، هاوکارم بووە. جێی باسکردنە، زۆر لەو وشانەی ڕاڤەکراون، کە لە پەراوێزدا ئاماژەی پێدراوە، لە داهاتوودا دەچنە نێو ئەو فەرهەنگەی کە بەیەکەوە شانمان داوەتە بەر(هەڵگۆردنامە)، بەڵکو لە ئایندەدا بە چاپی بگەیەنین.

هەر دوو دۆتمامە خۆشەویستەکانم «ئەژین و ڕۆژان مام محەمەد» کە زۆر بە سەلیقە و وردبینانە، وشە بە وشەی دەستنووسە تایپکراوەکەمیان خوێندۆتەوە، بژارێکی تێر و تەسەلیان بۆ کردووم، بۆم بوونەتە هەڵەدۆزی نایاب.

برای خۆشەویستم کاک «بارام سوبحی»، ئەویش بە سەلیقەی وەرگێڕانەکەی خۆی، کارێکی بۆ کردووم پێداچوونەوەکەمی بۆ ئاسان کردم، ئەو نەوەک هەر پییداچۆتەوە و هەڵەکانی دەستنیشان کردوون، بەڵکو لەسەر ڕاستکردنەوەکانی ئەوەوە، باقی هەڵەبڕییەکانی دیکەم ڕاستکردوونەتەوە، بۆیە کات و کاری زۆری بۆ گەڕاندمەوە.

لە کۆتاییشدا دیسان کاک کاروان عارف بە پشوودرێژی و بیرتیژیی خۆیەوە، بە دوا دانەی دەستنووسەکەدا چووەوە، لە خەم ڕەخساندی و خاترجەمی کردم.

شایانی گوتنە، سوپاسی کارمەندانی کتێبخانەی گشتی زەیتوون لە هەولێر دەکەم، کە لەماوەی ئەو دوو مانگەی وەرگێڕانەکەمدا، هەموو بەیانیانی

ڕۆژی دوام، وەک ئەوان ئەویم ڕووگەنما بوو، ئاخر هۆڵە گەورەکەی خوێندنەوەیان، بەیانیان هەم کارەبای لێ هەبوو هەم گەرمیش بوو، ئیدی بۆ من لەبارترین شوێنی کار بوو.

هەوڵی ئەو خۆشەویستە بەهرەمەندامەن نەبووایە، بەرهەمەکە بەم جۆرە نەدەکەوتە بەردەستتان.

ش. ح. خ

## پێشبەند: بەتەنیا، لە بێشەی شێردا

لە١٢ی نۆڤێمبەری ٢٠١١دا تەقینەوەیەکی یەکجار گەورە بنکەی نهێنی مووشەکە دوورهاوێژەکانی لە نزیک تاراندا تێکومەکاندا. بە هۆیەوە حەڤدە پاسەوانی شۆرش (پاسدار) کوژران و بە دەرزەن لە مووشەکە دوورهاوێژەکانیشی کردنە خۆڵەمێشێکی وردە ئاسن. ژەنەڕاڵ حەسەن تەهرانی موقەدەم[1]، مامۆتکی[2] موشەکی دوورهاوێژی شەهاب[3]، کە بەرپرسی بەرنامەی مووشەکە دوورهاوێژەکانی ئێران بوو، لە تەقینەوەکەدا کوژرا. بەڵام خۆ مەبەستی سەرەکی لە بۆمباردمانەکەدا موقەدەمەکە خۆی نەبوو. بەڵکو ئەو ماشێنە توندوبەندەی هەڵدانی مووشەکەکە بوو کە توانای هەڵگرتنی مووشەکی ناوەکیشی هەبوو، کە زیاتر لە شەش هەزار مایل دوور بە دەوری خۆی لەنێو ئەم سەرزەمینەدا دەڕۆیشت، بەم جۆرە لەسەر خاکی ئێرانەوە دەگەیشتە خاکە سەرەکییەکەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

نەخشەی سەرکردە ئێرانییەکان بۆ مووشەکە دوورهاوێژەکان ئەوەبوو، شارە سەرەکییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایان لەبەردەم نیشانەی چەکەکانیاندا بێ و بەم جۆرە دەسەڵاتدارانی ئەمریکایی بهێننە سەرچۆک و ئێرانیشی پێبکەنە زلهێزێکی جیهانی. ئیدی تەقینەوەکەی نۆڤێمبەر، بەرنامەکەی بۆ چەندین مانگ وەخراند.

---

[1] Hassan Tahrani Moghaddam

[2] لێرەدا مامۆتکم لە جیاتی باوکی ڕۆحی، عەڕاب، Godfather بەکارهێناوە.

[3] Shehab

لەگەڵ ئەوەش کە مەبەست لە مووشەکە دوورهاوێژەکان ئەمریکا بوو، بەڵام ئەو تەقینەوەیەی بنکەی ئێرانییەکانی خاپوور کرد، پێدەچوو نەخشەکەی لە لایەن دەزگەی هەواڵگری ئیسرائیلی مۆسادەوە دارێژرابێ. ئاخر هەر لە ڕێکەوتی دامەزراندنییەوە، شەست ساڵ بەر لە دامەزراندنی مۆسادەوە، نەترسانە و بەنهێنی دژی گەف و هەڕەشەکانی سەر ئیسرائیل و ڕۆژئاوا وەستاوەتەوە. ڕۆژ بە ڕۆژ و لە جارانیش زیاتر، مۆساد زانیاری کۆدەکاتەوە و چالاکی وا دەنوێنێ، باندۆری بەسەر ئاسایشی دەرەوە و ناوەخۆی ئەمریکاوە هەبێ.

بەڵێ لە ئێستادا و بەگوێرەی سەرچاوە بیانییەکان، مۆساد ڕووبەڕووی دارسانی[4] ڕاشکاو و زەقی سەرکردایەتی ئێرانییەکان بۆتەوە، بەوەی ئیسرائیل لەسەر نەخشەدا بسڕێتەوە. سێبەرێکی چڕی دژەشەڕ باڵی بەسەر چالاکییەکانی مۆسادا کێشاوە، ئەمەش ڕەنگی داوەتەوە لە؛ وێرانکردنی توانستی ناوەکی، لەناوبردنی زاناکان، دەستەبەرکردنی کەرەستەی نادروست لە ڕێی کۆمپانیا ساختەکان بۆ بەرنامەکەیان بۆ لەخشتەبردنیان، ڕێکخستن و سازدانی یاخیبوون و هەڵاتنی ئەفسەران و بیچمە ناودارەکانی لێکۆڵینەوەی بەرنامەی ناوەکی، دروستکردنی ڤایرۆسی تێکدەر و ناردنیان بۆ سیستمی کۆمپیوتەری ئێرانی، ئیدی وەک دەگوترێ مۆساد دژی باسکی ناوەکی ئێران بۆتەوە، دیاریشە ئەمە چی بۆ ئەمریکا و تەواوی جیهان دەگەیەنێ. لەگەڵ ئەوەی مۆساد لە چەندین ساڵی ڕابردوودا بۆمبی ناوەکی ئێرانی پەکخست و وەخراند، بەڵام جەنگەکەی ئەوان، ئێستا گەیشتۆتە ئەوپەڕی، هەڵبەتە ئەمەش بەر لەوەی دوایین ڕێکاری - تێسرەواندنی گورزی سەربازی- بچێتە بواری جێبەجێکردن.

---

[4] دارسان: بەرۆکگیریی، ئاڵنگار، تحدی.

لە دژایەتیکردنی تیرۆریستەکانیشدا، مۆساد لە هەفتاکانی سەدەی ڕابردووەوە توانیویەتی سەرچاوەی تیرۆریستە سەرەکییەکانیان هەر لە کون و مۆڵگە سەرەکییەکانی خۆیان بگرێ و لەناویانبەرێ وەک لە بەیروت، دیمەشق، بەغدا و تونس، هەروەها لەمەیدانی وێستگەی شەڕەکانیشیان لە پاریس، ڕۆما، ئەسینا و قوبرسدا کردی.

لە ١٢ی فێبرایری ٢٠٠٨ و بەگوێرەی میدیای ڕۆژئاوایی، ئاژانەکانی مۆساد بۆسەیەکیان بۆ «عیماد موغنیە»، سەرکردەی حیزبوڵلای لوبنانی لە دیمەشق دانایەوە و هەر لەوجێ ساردیان کردەوە. «موغنییە» دوژمنی سەرسەختی ئیسرائیل بوو، لەهەمان کاتیشدا یەکێک بوو لە سەرمەشقەکانی لیستی داواکراوی FBI. چونکە ئەو نەخشەی کوشتارگەی ٢٤١ مارینزی ئەمریکی لە بەیروت داڕشتبوو، جێبەجێشیکرد. ئەو لەدوای خۆی تەرمی سەدان ئەمریکی، ئیسرائیلی، فەڕەنسی و ئەرجەنتینی بەجێهێشتبوو. ئێستاشی لەگەڵدابێ، سەرانی جیهادی ئیسلامی و ئەلقاعیدە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ڕاوەدوو دەندرێن.

هەنوکەش، کاتێ ئیسرائیل هۆشداری ئەوە دەدا، کە دەکرێ بەهاری عەرەبی ببێتە زستانێکی عەرەبی، پێناچی کەس هەبێ گوێ بگرێ. لە ٢٠١١دا ڕۆژئاواییەکان ئاهەنگیان گێڕا، ئاخر لەو باوەڕەدابوون خۆری ڕۆژگارێکی نوێی دیموکراسی، ئازادی و مافەکانی مرۆڤ لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هەڵبێ. بەهیوابوون بە بۆسەلماندن بۆ میسریەکان، بەوەی سەرۆکە خۆرئاوایستەکەیان، حوسنی موبارەک کە باشترین هاوپەیمانیان بوو لەنێو جیهانی عەرەبدا، لەسەر تەخت لابچێ. بەڵام خۆ یەکەمین شاڵاوی گوڕدەمی[5] خەڵک گەیشتە ساحەی تەحریری قاهیرە،

[5] گوڕدەم: ئاپۆرایەکی زۆر لە خەڵک.

سەرەتا ئاڵای ئەمریکایان سووتاند، ئەوسا بەسەر باڵوێزخانەی ئیسرائیلیاندا دا و داوای کۆتاییهێنانیان بە ڕێککەوتننامەی ئاشتیان لەگەڵ ئیسرائیلدا دەکرد و چالاکوانەکانی ڕێکخراوە ناحکومییە (NGO)یەکانی ئەمریکایان گرتن. هەڵبژاردنی ئازادانەی میسریش، ئیخوان موسلیمینی هێنایە سەر تەختی دەسەڵات، تا ئەمڕۆشی لەگەڵدابێ میسر لەسەر لێواری پاشاگەردانی و کارەساتی ئابوورییە.[6]

ڕژێمی ئسوڵ (فەندەمەنتال)ی ئیسلامی لە تونس ڕەگی داکوتا، پێدەچێ لیبیاش بەهەمان ڕێچکەدا بڕوا. لە یەمەنیش هەرا و ئاژاوەیە. لە سوریاش سەرۆک ئەسەد خەڵکەکەی قەتڵ و عام دەکا. هەرچی دەوڵەتێکی میانڕەویش وەک ئوردن، عەرەبستانی سعودی و ئیماراتی عەرەبییە لەسەر کەنداوی فارسیدا، لەلایەن هاوپەیمانە ڕۆژئاوایەکانییانەوە ناپاکییان لێکراوە. هەرچی هیوای مافەکانی مرۆڤ، مافەکانی ئافرەتان و دێموکراسی و دەوڵەتی قانونیشە، کە دنەدەری[7] ئەو شۆڕشانە بوو، بە لێشاوی لایەنە دینیە جۆشدراوە ئاگرینیەکان سڕایەوە و لوولدرا، ئەوانەی باشترین پەیوەندییان بە ئاپۆرای عەوامی خەڵکییەوە هەیە.

ئەم بەهاری عەرەبییە، ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی کردۆتە بۆمبێکی قورمیشکراو، هەڕەشەیە بەسەر خەڵکی ئیسرائیل و هاوپەیمانیە ڕۆژئاواییەکانی لە جیهان. وەک مێژووش پەردەی لەسەر هەڵدەداتەوە، کاروکردەوەی مۆساد سەرکێشانەتر دێنەپێش، بەڵام بۆ ڕۆژئاوا لە جاران چارەنووسسازترن. پێدەچێ مۆساد باشترین بەرگریکار بێ دژی هەڕەشەکانی چەکی ناوەکی ئێرانی، دژی تیرۆریستەکان، دژی هەر شتێک

[6] جێی ئاماژەپێدانە ئەم کتێبە لە ٢٠١٢دا و لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا چاپ بووە.

[7] دنەدەر: پاڵنەر، مۆتیڤ.

که له ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ببێته مایەی توندوتیژی. له هەموو ئەوانەش گرنگتر، مۆساد دوا کورته شێلکەی[8] تفەنگه لەجەنگێکی کراوەدا.

شەڕڤانه نەناسراوەکانی مۆساد له خوێن و گۆشتن، ئەو ژن و پیاوانەن که ژیانی خۆیان خستۆته سەر لەپی دەست، دوور له خێزانەکانیان و لەژێر ناسنامەیەکی نمایشکارانەدا و لەسەر خاکی دوژمنەکانیان چالاکیەکانیان دەنوێنن، کەمترین هەڵه و شاشییان دەبێته مایەی گرتن، ئازار و ئەشکەنجەدان یان کوشتن. له ماوەی شەڕی ساردا، پۆلکترین[9] چارەنووسی ئاژانی دەزگەیەکی هەواڵگری نهێنی که له ڕۆژئاوا یان له وڵاتەکانی بلۆکی کۆمۆنیستی گیرابا، گۆڕینەوەبوو لەسەر پردە ساردوسڕ و تەمومژاوییەکەی بەرلین. ڕووسیا یان ئەمریکا، بەریتانیا یان ئاڵمانی ڕۆژهەڵات، ئاژانەکه هەمیشه دەیزانی که هەر خۆی بەتەنیا نییە، بەڵکو هەردەم کەسێک هەیه لەو ساردوسڕیەی ئەوێ دەریبهێنێ و بیباتەوە. بەڵام سەبارەت بەو شەرڤانه تەنیایانەی مۆساد، که نه پردێکی تەمومژاوی بۆ گۆڕینەوەیان هەیه و نه هیچ، بەڵکو ئەوان دەبێ سەریان لەپێناو بوێرییەکەیاندا دابنێن.

لەم کتێبەدا، ئێمه تیشک دەخەینه سەر گەورەترین ئەرک و چالاکی و ئازاترین کارەکانی مۆساد، بەهەمان شێوەش هەڵه و کەموکورتی و شکستەکانیان، که بوونه مایەی لەناوبردنی وێنەنمای ئاژانسەکه و بوونه مایەی هێدمه[10] و سەرسامی دامەزراوەکانیان. ئەم چالاکییانه نەوەک هەر شەقڵی چارەنووسی ئیسرائیلییان دارشتۆتەوە بەڵکو له زۆریاندا هی

[8] شێلکه: تفەنگ هاوێشتن به شێلکه، واته بەسەلیە، به مەخزەن نەوەک به گوللەی تاک تاک.

[9] پۆلکترین: بەدترین، خراپترین.

[10] هێدمه: شۆک.

جیهانیش. تا ئێستاشی لەگەڵدا بێ، ئەوەی بە قووڵی لەنێوان ئاژانەکانی مۆسادا هاوبەشە، ئەو خۆشەویستییە بێوێنەیانەیە بۆ وڵاتەکەیان، بە تەواوی خۆتەرخانکردنیانە بۆ بوون و مانەوەی ئامادەکاری بۆ دراماترین سەرچڵی و ڕووبەڕووبونەوەی کوشندەترین مەترسی. هەمووشی لە پێناوی ئیسرائیلدا.

## بەندی یەک، پاشای سێبەرەکان

لە ئاخروئۆخری هاوینی ١٩٧١دا، شەپۆلە هاروهاجەکانی دەریای سپی ناوەڕاست بە توندی خۆیان بە کەنارەکاندا دەدا، ئەو شەپۆلە دووروودرێژانە گەیشتنە کەناراوەکانی غەززەش. عەرەبە ماسیگرە خۆجێیەکانی ئەویێ بە چاونەترسی لەسەر کەنارەکەدا مانەوە، هەرچەندە ڕۆژەکەش هی ئازایەتی نواندن نەبوو لەبەرانبەر دەریا گوماناوییەکەدا. ئەوان لەو ئانوساتەدا بە سەرسامی بینیان لەپڕێکەوە بەلەمێک شەقوشڕی بەدەرکەوت و بە قوڕسی لەنێو شەپۆلەکاندا بەرەو کەنار دێ تا لەنگەر بگرێ. چەند فەلەستینییێک بە جلوبەرگی خۆیان و ئاغەبانییە[11] شلوخاو و تەڕبووەکانیان، بە پەلەپڕوزێ لەنێو بەلەمەکەدا خۆیان هەڵدا و لە کەنارەکە دوورکەوتنەوە. ڕیشی نەتاشراویان نیشانەی ماندوبوون و هیلاکی و شەونخوونی گەشتە دووروودرێژەکەی نێو دەریا بوو، بەڵام خۆ ئەوان کاتی ئەوەشیان لەبەردەستدا نەبوو لە سەر کەنارەکە پشوویێک بدەن، دیاربوو ئەوان لەتاو ژیانی خۆیان هەڵدەهاتن. ئاخر زۆری نەبرد، هەر لەنێو ئەو دەریایە هاروهاجەدا[12] بەلەمە تۆرپیدۆیەکی ئیسرائیلی پەیدابوو، دیاربوو بەدوای ڕاکردووەکانی بەلەمە شەقوشڕەکەوە بوو، کاتێ گەمییە تۆرپیدۆیەکە گەیشتە کەنار، سەربازەکان بە تەواوی چەکو جبەخانەکانی خۆیانەوە بوون. کە گەیشتنە لێوارەکە، سەربازەکان لە تەنکاوەکە دابەزین و تەقەیان کرد و گوللەیان بەدوای فەلەستینیە ڕاکردووەکانەوە نا. ئەوکات دوو کوڕە مێردمنداڵی غەززەیی لەسەر

---

[11] ئاغەبانی: جامانە، دەسرۆکی سەر.

[12] هاروهاج: زۆر تووڕە.

لێوارەکەدا یاریان دەکرد، کاتێ ئەمەیان بینی، یەکسەر بەرەو ڕووی فەلەستینییە هەڵاتووەکان ڕۆیشتوون و بردنیانە نزیکترین پەناگە و لە ڕەزێکی ترێدا داڵدەیان دان و لە دەست تەقەی سەربازە ئیسرائیلیەکان قوتاریانکردن. پێدەچوو سەربازە ئیسرائیلیەکان شوێنپێی هەڵاتووەکانیان ونکردبێ، لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا هەر سەرکەناری دەریاکەیان کێوماڵ دەکرد.

پاشان، بە درەنگێکی شەوەوە، گەنجێکی فەلەستینی کە کڵاشنکۆفێکی پێبوو، چوە نێو ڕەزەکە و بەدوای هەڵاتوەکاندا گەڕا. ئەو هەڵاتووەکانی لە گۆشەیەکی پەناگەکەدا دۆزینەوە. لێیپرسین: "ئەرێ برایان، ئێوە کێن؟"

ئەوانیش وەڵامیاندایەوە: "ئێمە ئەندامی بەرەی میللی ڕزگاریخوازی فەلەستینین. ئێمە لە ئۆردوگای ئاوارەکانی (تیرە)ی[13] لوبنانیەوە هاتووین."

گەنجەکەش پێیگوتنەوە: "مەرحەبا[14]، بەخێربێن."

"ئەرێ خۆت دەزانی کە فەرماندەکەمان «ئەبو سەیفە»؟ ئەو ئێمەی ناردووە تا لەگەڵ فەرماندەکانی بەرەی میللی لە «بەیت لەحیا» (بنکەی تیرۆرستەکانی باشوور لە کەرتی غەززە) یەکدی ببینین. ئێمە پارە و چەکمان پێیە و دەمانەوێ هاوڕێکبین لەکار و چالاکییەکانیاندا."

کوڕە گەنجەکەش پێیگوتنەوە: "من لەمەدا یارمەتیتان دەدەم."

بۆ بەیانییەکەی، چەندین تیرۆرستی چەکدار، ئەو تازە هاتووانەیان بردنە نێو ئۆردوگای ئاوارەکانی «جەبەلیا». لەوێش بردینیانە هۆدەیەکی گەورە و فەرموویان لێکرا لەسەر مێزەکەدا دابنیشن. زۆری پێنەچوو، فەرماندەی

---

[13] Tyre

[14] نووسەرەکان هەمان وشەی عەرەبییان نووسیوەتەوە: marhaba

بەرەی میللی کە بەتەمابوو چاوی پێیانبکەوێ، چووە هۆڵەکە. ئیدی سڵاوی لە برا لوبنانییە میوانەکان کرد و لەبەرانبەریان لەسەر مێزەکەدا دانیشت.

"دەستپێبکەین؟" ئەو قسەی دەستپێکی پیاوە گەنجە سەر کەچەڵەکە بوو کە جەمەدانییەکەی لەسەر بەستبوو، پێدەچوو سەردەستەی لوبنانییە میوانەکان بێ، ئینجا پرسی. "ئەرێ هەمووان لێرەن؟"

"بەڵێ هەمووان لێرەن."

ئەوسا لوبنانییەکان دەستەکانیان بەرزکردەوە و سەیری سەعاتی دەستی خۆیانیان کرد. دیاربوو ئەمە نیشانە بوو. ئیدی لە هیکەوە "نێردە لوبنانییەکە" دەستیان دایە تفەنگەکانیان و تەقەیان کرد. لەماوەی کەمتر لە خولەکێک، تیرۆرستەکانی «بێت لەحی» کوژران. "لوبنانییەکان"یش لە ماڵەکە هەڵاتن، ڕێگەی خۆیان بەنێو ئۆردوگای «جەبەلیا»دا و بەنێو شەقامە جەنجاڵەکانی غەززەدا کردەوە و بەرەو خاکی ئیسرائیلی تێیانتەقاند. بۆ ئەنگۆرە[15] ئەو پیاوەی جەمەدانی سووری فەلەستینی بەستبوو، کاپتن «مایەر داگان»، فەرماندەی یەکەی کۆماندۆی نهێنی (ڕیمۆن)ی هێزی بەرگری ئیسرائیلی (IDF) بوو، ڕاپۆرتی بۆ ژەنەڕاڵ «ئارییێل شارۆن (ئاریک)» بەرزکردەوە، بەوەی ئۆپەراسیۆنی (کامیلیۆن)[16] سەرکەوتوو بوو. هەموو سەرە گەورەکانی بەرەی میللی لە «بێت لەحیا»دا، کە گرووپێکی تیرۆرستی سامناک بوون، کوژران.

---

[15] ئێوارەیەکی درەنگ، کە تاریک دادێ.

[16] کاملیۆن: حەڕبا

تەمەنی «داگان» هەر بیست و شەش ساڵ دەبوو، بەڵام شەڕڤانێکی ئەفسانەیی بوو. ئەو نەخشەی سەرلەبەری ئۆپەراسیۆنەکەی داڕشتبوو: خۆیان کردبووە تیرۆرستی لوبنانی، لە «ئەشدۆد»ی بەندەری ئیسرائیلیەوە بە بەلەمێکی کۆنەوە هاتبوون؛ شەوێکی دوورودرێژی خۆحەشاردانیان بردبووەسەر؛ فەرماندە تیرۆرستەکانیان بینیبوو؛ دوای زەبروەشاندنەکەشیان ڕێگەی هەڵاتنیان مسۆگەرکردبوو. تەنانەت بۆ لەخشتەبردن، بیری لەوەش کردبووەوە، چۆن بە ساختە لەلایەن بەلەمێکی تۆرپیدۆی ئیسرائیلیەوە ڕاوەدووبندرێن. «داگان» گەریلایەکی لێبڕاوانە بوو، ئازا و چاپووک، ئەو کەسێک نەبوو بەگوێرەی ڕێساکان بڕوا. جارێکیان «ئیسحاق ڕابین» گوتی: "مایەر داگان توانایەکی بێوێنەی بۆ داهێنانی چالاکی دژی تیرۆرستان هەیە، کە هەر لە فیلمی سینەمایی ترسناک دەچێ."

لەوەش زیاتر، «دانی یاتۆم»، سەرۆکی مۆساد، «داگان»ی وا بیردەکەوتەوە، گەنجێکی تێکسمڕاو و پرچ قاوەیی، کە خۆی خزاندە نێو بە نمایشترین یەکەی کۆماندۆوە بەناوی «سەیارەت ماتکال»ـەوە[17]، هەمووشیانی بە هونەری ڕاوەشاندنی چەقۆکەی سەرسامکرد. بە چەقۆی دەستی دەیتوانی هەر ئامانجێکی لێی نزیکبێ، بکوژێ. هەرچەندە ئەو نیشانئەنگێوێکی کارامەبوو، کەچی لە تاقیکردنەوەی «سەیارەت ماتکال»دا کەوت، پاشان قەناعەتی بە خۆی هێنا بچێتە ڕیزی لاباڵی زیوینی پەرەشووتوانەکان.

لەسەرەتای حەفتاکاندا، ڕەوانەی کەرتی غەززە کرا، کە لە شەڕی شەش ڕۆژەی ١٩٦٧ەوە کەوتبووە بن دەستی ئیسرائیل و لەو کاتیشەوە ببووە

[17] Sayeret Matkal

بنکەی چالاکییە تیرۆرستییە کوشندەکان. تیرۆرستە فەلەستینیەکان ڕۆژانە لە کەرتی غەززە و لەنێو ئیسرائیلدا، جووەکانیان بە بۆمب، تەقینەوە، تەقەلێکردن دەکوشتن؛ هێزی بەرگری ئیسرائیلیش هەموو توانایەکی خۆی بەکارهێنا، بەڵام دەسەڵاتی بەسەر ئۆردوگای پڕ لە توندوتیژی ئاوارەکاندا نەشکا. لە ٢ی یانیوەری ١٩٧١دا، کاتێک منداڵە نازدارەکانی ناوچەی ئارۆیۆ، «ئاڤیگیلی» تەمەن پێنج ساڵە و «مارک»ی تەمەن هەشت ساڵە بەهۆی فڕێدانی نارنجۆکێکی دەستی تیرۆرستان بۆ نێو ترومبێلەکەیان هەپڕون بەهەپڕون بوون، ژەنەڕاڵ «ئارییێل شارۆن (ئاریک)» بڕیاریدا کۆتایی بە کوشتوبڕە خوێناویەکە بێنێ. ئیدی چەند کۆنە هاوڕێیەکی کاتی خۆی، هی سەردەمی شەڕ بانگکرد، ئەوانەی لە سەربازیدا چەندین بەهرەیان هەبوو. «داگان»ی دەموچاوخڕ و کورتەبنەی تێکسمڕاو کە لەڕۆیشتندا دەلەنگی[18]، لەگەڵ ئەواندا بوو، ئاخر لە شەڕی شەش ڕۆژەدا بنەتەقەیەکی[19] پێدا تەقیبووەوە. لەو کاتەی «داگان» لە تیمارخانەی بیر-شیڤا لەژێر چارەسەریدابوو، عاشقی (بینا)ی پەستاری دەبێ و کە چاکیش دەبێتەوە دەیخوازێ و دەیهێنێ.

ئەو یەکەیەی شارۆن، بە فەرمی بوونی نەبوو. کاروچالاکیەکەیان تێکوپێکدانی ڕێکخراوە تیرۆرستەکانی غەززە بوو، کە سەرچڵییان دەکرد و ڕێگەی ناتەقلیدییان بەکاردەهێنا. «داگان» وەها ڕاهاتبوو بە خۆی و داردەستێک، سەگێکی جۆری «دۆبرمان»، چەندین تفەنگ، دەمانچە و ڕەشاشێکەوە بەنێو غەززەدا بڕوا. هەندێک پێیانوابوو ئەویان لەبن دەمامکی کابرایەکی عەرەبدا بینیوە، بە کاوەخۆ[20] بەسواری گوێدرێژێکەوە

[18] دەلەنگی: دەشەلی.

[19] بنەتەقە: مین، لوغم.

[20] بەکاوەخۆ: لەسەرخۆ، بەهێواشی، بە خاوی.

بەنێو کۆڵانە گوماناوییەکانی غەززەدا دەڕوا. نەخۆشیەکەی هەرگیز وایلێنەدەکرد لە هەنگاونانی لێبڕاوانە بەرەو جێبەجێکردنی ئۆپەراسیۆنە دژوارەکان سڵبکاتەوە. ڕامانی ئەو سادە بوو. ئاخر لەوێ دوژمن هەیە، عەرەبی خراپ هەن، دەیانەوێ بمانکوژن، بۆیە دەبێ لەپێشدا بکوژرێن.

لەنێو یەکەکەدا، داگان "ڕیمۆن"[21]ی داهێنا، ڕیمۆنیش یەکەمین یەکەی کۆماندۆی ئیسرائیلی بێ پاڵپشت بوو، ئەو یەکەیە بە دەمامکی عەرەبی و لەنێو جەرگەی بنکە و مۆڵگەکانی دوژمندا دەستبەکار دەبوو. بۆ ئەوەی ئازادانە و خێرا بەنێو حەشاماتی عەرەبدا بڕۆن و بەئاسانی بگەنە ئامانجەکانیان، دەبوو خۆیان وەک عەرەب هەڵبخەن و نەشناسرێنەوە. هەر زووش بە دەستە زەبروەشێنەکەی «ئاریک» ناسران و دەنگۆی ئەوەش بڵاوبووە، کەزۆر جاران بەخوێنساردی تیرۆرستە گیراوەکانیان دەکوشتن. هەندێک جاریش دەگوترا، ئەوان تیرۆرستەکانیان دەبردنە کۆڵانە تەنگەبەرە تاریکەکان و پێیان دەگوتن: "تۆ هەر دوو خولەکەت بوار هەیە تا هەڵبێی." کاتێکیش کابرا تەکانی بەخۆی دەدا هەڵبێ، لەپشتەوەڕا گوللەیان پێوەدەنا و فتیاندەکرد. هەندێ جاریش خەنجەرێک یان تفەنگێکیان لەدوای خۆیان بەجێدەهێشت، کاتێکیش تیرۆرستێک دەگەیشتێ و دەستی دەدایێ، هەر لەوێ دەکوژرا. ڕۆژنامەنووسەکان وایان نووسیوە، هەموو بەیانییەک کاتێ «داگان» دەچوە چۆڵگەیەک، بە دەستێک میز دەکرد و بە دەستێکیش نیشانەی لە بوتڵێکی بەتاڵ دەگرتەوە. ئەویش بەخۆی ئەو هەواڵانەی ڕەتدەکردنەوە و دەیگوت: "خۆ دەوری هەمووان هەر بە ئەفسانە تەنراوە، بەڵام هەندێک لەوانەی نووسراون، سووکوئاسان هەڵبەستراون."

[21] Rimon

ئەو یەکە کۆماندۆ بچکۆلەیە، کە زۆر بەتوندی و بێبەزەییانە دەجەنگا، ڕۆژانە ژیانیان لەسەر لەپی دەست بوو. وەک خووی لێهاتبوو، شەوانە پیاوەکانی «داگان» یان ماسیگرە دەمامکدراوەکان دەبیندران کەوا بۆ ڕاوی تیرۆرستەکان دەردەچوون. لە ناوەڕاستی ینایری ١٩٧١دا، تیرۆرستە عەرەبەکانیان لە باکووری کەرتی غەززە بەدیکرد، ئیدی داویان بۆ ئەندامەکانی ئەو گرووپە نایەوە، کاتێ کەوتنە نێو بۆسەکە، تەقەیان لێکردن و هەموو تیرۆرستەکانی «فەتح» لەوێدا کوژران. لە٢٩ی ینایری ١٩٧١دا، ئەمجارەیان «داگان» و پیاوەکانی لەبن جلی یەکپۆشی سەربازییدا، بە دوو جێبەوە بەرەو ئۆردوگای «جالایا»ی دەرەوەی شار (ئۆردوگایەکی ئاوارە فەلەستینییەکان) ڕۆیشتن. ڕێگەیەکەیان پڕ لە تاکسی بوو، «داگان» لەنێو سەرنشینانی تەکسییێکدا، «ئەبو نەمر»، تیرۆرستی سامناک و بەناودەنگی ناسییەوە. یەکسەر «داگان» فەرمانی بە شوفێری جێبەکە کرد بوەستێ، لەهەمان کاتیشدا «ئەبونەمر» لە ترۆمبێلەکە دابەزی و دەستی بۆ نارنجۆکەکی دەستی برد. سەیری «داگان»ی کرد، دەرزیەکەی لە نارنجۆکەکە کێشایەوە. «داگان»یش هاواری کرد: "نارنجۆک!"، بەڵام لەجیاتی ئەوەی خۆی پەنابدا، یەکسەر بازیدا و پەلاماری کابرای دا و بەزەویدا دا و نارنجۆکەکەشی لەدەستی کابرای تیرۆرست دەرهێنا. لە پاداشتی ئەم کارەیدا، میدالیای ئازایەتی پێبەخشرا. دەگوترێ دوای ئەوەی «داگان» نارنجۆکەکەی دوور فڕێدا، هەر بە دەستەکانی خۆی «ئەبونەمر»ی لەجێدا کوشت.

ساڵانێک دواتر، لە چاوپێکەوتنێکی دەگمەنی «ڕۆن لێشم»ی ڕۆژنامەنووسی ئیسرائیلدا، «داگان» گوتی: "«ڕیمۆن» دەستەیەکی دەستوەشێن نەبوو... ئەو ڕۆژئاواییە سەرکەشە نەبوو، کە خولیا و ئارەزووی پەلاپیتکە گیرساندن بێ. ئێمە هەرگیز ئازاری ئافرەت و

منداڵانمان نەداوە... ئێمە پەلاماری ئەو کەسانەمان داوە، کە بکوژی دەستبەخوێن بوون. ئێمە زەبری خۆمان لەوان دەدا و دەستیشمان لە کەسانی دیکە دەپاراست. بۆ پاراستنی خەڵکی مەدەنی، هەندێک جار ناچاردەبووین شتگەلێک بکەین کە لەگەڵ ڕەفتاری دێموکراسییانەدا نەدەهاتەوە. ئەوە ڕاستە کە لە یەکەیەکی وەک هی ئێمەدا، ئەوپەڕی سنوورە دەستنیشانکراوەکە تەمومژاوی بوو. هەر بۆیە دەبووایە پیاوانی دەستەکە لێهاتووترین کەس بووبان. چەپەڵترین کار دەبێ لە لایەن پیاوە هەرە پاکەکان بەئەنجام بگەیەندرێ.

دیمۆکراسی بێ یان نا، شارۆن، «داگان» و هاوڕێکانیان بە شێوەیەکی بەرفراوان تیرۆریزمیان لە غەززەدا لەناوبرد، ئیدی بۆ چەندین ساڵ ناوچەکە ئارام بووەوە. بەڵام هەندێکیان پێیانوابوو، شارۆن بەنیوە گاڵتەیەکەوە وا باسی یارمەتیدەرە دڵسۆزەکەی کردووە: "پسپۆڕێتی «مایەر داگان» لەوەدایە کە سەری عەرەب لە لاشەکەی جیابکاتەوە."

هێشتاش زۆر کەم دەربارەی «داگان»ی ڕاستەقینە زاندراوە. ئەو لە ١٩٤٥و لەنێو واگۆنێکی قیتاردا لەدایک ببوو، لە یەکێ لە گەڕەکەکانی دەرەوەی «هیرسۆن» لە ئۆکراین، لەو کاتەی ماڵباتەکەی لە سیبیریاوە بەرەو پۆلۆنیا هەڵدەهاتن، خانەوادەکەی لە هۆلۆکۆستدا فەوتان. مایەریش لەگەڵ دایبابیدا بەرەو ئیسرائیل کۆچدەکا و لەوێ لە «لۆد» گەڕەکێکی هەژارنشیندا گەورە دەبێ، لۆدیش شارێکی کۆنی عەرەبییە و نزیکەی پازدە میل لە تەلئەبیبەوە دوورە. زۆر کەس ئەویان بە شەڕڤانێکی نەبەزیو ناسیوە؛ کەم کەسیش بە خولیا نهێنییەکانی ئەویان زانییوە، ئەو خوێنەرێکی تامەزرۆی کتێبە مێژووییەکان بوو، کابرایەکی ڕوەکخۆر بووە، کەسێک بووە حەزی لە موزیکی کلاسیک کردووە وەک ئارەزووییێکیش بەدوای تابلۆ و نیگارەکاندا چووە و کۆیکردوونەتەوە.

ئەو پیاوێک بووە، هەر لە تەمەنێکی زووەوە تووشی ژان و ناسۆرێکی سەختی بنەماڵەیی بووە و پاشانیش بەهۆی هۆلۆکۆست و شوێنەوارەکەیەوە نالاندوویەتی. ئیدی ژیانی خۆی تەرخانکردبوو بۆ بەگریکردن و پاراستنی وڵاتە ساواکەی ئیسرائیل. کاتێکیش بەپلەداری سەربازییدا سەردەکەوت، یەکەمین شت لە نووسینگە نوێیەکدا کردی، هەڵواسینی وێنەیەکی پیرەجوویێک بوو، کە دووگوردێکی[22] نوێژی لەخۆ وەرگرتبوو، لەبەردەم دوو ئەفسەری ئێس ئێس SSدا کەوتبوو، یەکێکیان مەترەقێکی[23] پێیە و ئەوی دیکەش تفەنگێک. "ئەم پیرەمێردەی ناو وێنەکە باپیرمە،" داگان بەم جۆرە بۆ ئەوانەی سەردانیاندەکرد و لە وێنەکە ڕادەمان، ڕوونکردنەوەی دەدا؛ "من سەیری وێنەکە دەکەم، ئینجا دەزانم دەبێ ئێمە بەهێز بین و بە شێوەیەکی وەها بەرگری لەخۆمان بکەین، کە هەرگیز جارێکی دیکە، هۆلۆکۆست ڕونەداتەوە."

هەر بەڕاستیش پیرەمێردەکەی ناو وێنەکە «بێر ئێرلیش سلوشنی» باپیرەی «داگان» بوو، هەر چەند خولەکێک پاش گرتنی وێنەکە لە «لوکۆڤ» کوژرابوو.

لە ماوەی جەنگی یوم کوپەر و لە ١٩٧٣دا، «داگان» لە کەسە یەکەمەکانی یەکەی چاودێری و پشکنینی ئیسرائیلیدا بوو، ئەوانەی بە نۆکەندی سوێسدا پەڕینەوە. لە ١٩٨٢شدا لە شەڕی لوبناندا، ئەو سەرلقی ئەو لقە زرێپۆشە بوو کە چووە نێو بەیروت. هەر زووش بووە فەرماندەی زۆنی ئاسایشی باشووری لوبنان، ئیدی لەوێوە سەرچڵییەکانی شەڕڤانە گەریلاکان لە کۆلۆنێلێکی سەربازی سەریانهەڵدایەوە. ئەو سەرلەنوێ

---

[22] دووگورد: بەرماڵ.

[23] تێلا، حەیزەران، دارێکی کورتە بۆ لێدان و ئەشکەنجەدان بەکاردێ.

بنەماکانی نهێنیبوون، خۆشاردنەوە و ڕووخسارگۆڕین و ڕێکارە لەخشتەبردنەکانی ڕۆژگاری غەززەی لەوێ ژیاندنەوە. هاوڕێکانی پێیاندەگوت "پاشای سێبەرەکان". ژیان لە بەیروت بە هاوپەیمانی نهێنی، بە ناپاکی و غەدر، بە توندوتیژی، بە شەڕی تارمایی شتێک بوو لەنێو دڵی ئەودا جێیگرتبووەوە. "تەنانەت بەرلەوەی بە لقە زرێپۆشەکەشمەوە بچمە نێو بەیروت" ئەو جارێکیان وایگوت؛ "من بە باشی بە شارەکە بەڵەد بووم." دوای کۆتاییهاتنی شەڕی لوبنانیش، ئەو هەر وازی لە سەرچڵییە نهێنیەکانی خۆی نەهێنا. لە ١٩٨٤دا لە لایەن سوپاسالار «موشێ لیڤی» سەرکۆنەکرا، بەوەی بە جلی عەرەبان دەرکەوتووە و چووەتە بارەگای سەرەکی تیرۆرستی «بحمدون»[24].

لەماوی ئینتیفازەکەشدا[25] (یاخیبوونی فەلەستینییەکان لە ١٩٨٧-١٩٩٣)، ئەو کاتەی وەک ڕاوێژکارێک بۆ سوپاسالارێتی «یەهود باراک» گواسترایەوە بۆ کەناری ڕۆژئاوا، لەوێشەوە «داگان» خووە کۆنەکەی ژیاندەوە، تەنانەت قەناعەتی بە «باراک»یش کردبوو ڕەگەڵی بکەوێ. ئیدی هەردووکیان بە قاتێکی کەشخە، وەک دوو فەلەستینی ڕاستەقینە بە سواری مارسیدسێکی شینی خۆجێی بەنێو ناوچەی گوماناوی (نابلس کبش)دا گوزەریان کرد، جارێکیشیان ئەو حاڵەتە ناسرایەوە، کەوا «باراک» لەسەر کورسی پێشەوەی ترومبێلەکەدا دانیشتووە.

لە ١٩٩٥دا کە بووە مێجەر، ڕیزەکانی سوپای بەجێهێشت ڕەگەڵ هاوڕێ خۆشەویستەکەی «یۆسی بن هانان» کەوت، تا بۆ ماوەی هەژدە مانگ گەشتێکی ماتۆڕسواری بە دەشتەکانی ئاسیادا بکەن. بەڵام گەشتەکەیان

[24] Bahamdoun

[25] لێرەدا نووسەرەکان هەر وشە عەرەبییەکەیان بەکارهێناوە Intifada منیش بە پێویستم نەزانی بیگۆڕم.

لەبەر کوژرانی «ئیسحاق ڕابین» لەکورتیدا بڕیەوە. کە گەڕایەوە ئیسرائیل، «داگان» بۆ ماوەیەک لە سەرۆکایەتی دەسەڵاتی دژە تیرۆردا مایەوە، بە شەوقێکی کەمیشەوە هەوڵیدا بچێتە دنیای بزنس و یارمەتی شارۆنی لە هەڵمەتی هەڵبژاردنی «لیکود»دا دا. ئینجا لە ٢٠٠٢دا خانەنشین کرا و گەڕایەوە شارەکەی خۆی لە «گالیلیا»، دیسان گەڕایەوە لای کتێبەکانی، لای تۆمار و نەوارەکانی، لای تابلۆ و نیگارەکانی.

سێزدە ساڵ دوای غەززە، ئەو ژەنەڕاڵە خانەنشینە، کە ئێستا بە باشی لەگەڵ خانەوادەکەی ئاشنایە و لەنێویاندایە گوتی: "لەپڕێکەوە لەخەو بێداربوومەوە، بینیم منداڵەکانم گەورەبوونە." ئەوسا زەنگێکی لە دۆستێکی دێرینی خۆشەویست بۆهات، ئەویش «ئارییێل شارۆن» بوو پێیگوت: "دەمەوێ ببیە بەرپرسی مۆساد،" «شارۆن» ئاوای بە برادەرە دێرینەکەی خۆی کە تەمەنی گەیشتبووە پەنجا و حەفتساڵی گوت؛ "من دەمەوێ سەرۆکی مۆساد کەسێک بێ کە کێردێکی[26] بە ددان هەڵگرتبێ."

لە ساڵی ٢٠٠٢وە مۆسادیش بریقوباقی جارانی لەدەستداوە. چەندین چالاکی شکستخواردوو لەو چەند ساڵانەی ڕابردوودا نمرەی نمایشی باڵای مۆسادی دابەزاندبوو. بڵاوبوونەوەی زۆروزەوەند سەبارەت بە هەوڵی شکستخواردووی لەناوبردنی سەرکردەی حەماس لە عەممان و گرتنی ئاژانەکانی مۆساد لە سویسڕا، قوبرس، نیوزیلاند، هەموو ئەمانە زیانێکی ڕاستەقینە و بەرچاوی بە ناوڕوومەتی مۆساد گەیاندبوو. دواین بەرپرسی مۆساد، «ئەفرایم هالڤی»[27] لەبەر ئەو چاوەڕوانیانە خۆی نەگرت، ئاخر ئەو باڵوێزێکی پێشتری ئیسرائیل بوو لە یەکێتی ئەورووپا لە

[26] کێرد: چەقۆیەکی گەورە.

[27] Afraim Halevy

بروکسل، ئەو دیپلۆماتێکی باش و شیکەرەوەیەکی لێهاتووش بوو، بەڵام نە سەرکردە بوو نە شەڕڤانیش. «شارۆن»یش دەیویست سەرۆکایەتی مۆساد بداتە دەست سەرکردەیەکی ئازا و کارا تا بتوانێ بە شێوەیەکی گونجاو چەکەکانی خۆی بەرانبەر تیرۆزمی عەرەبی و چەکی ناوەکی ئێران بەکاربێنێ.

«داگان»یش لەنێو مۆساددا بەخێرهاتنی لێنەدەکرا، لەنێویاندا کەسێکی خۆشەویست نەبوو. ئاخر ئەو وەک غەوارەیەک وابوو، بەزۆری تیشکۆی هزر و کردەوەکانی خستبوونە سەر ئۆپەراسیۆنەکان، ئەو زۆر گوێی بە زانینی لێکدانەوەی هەواڵگرییەوە نەدەدا یان باکی بە گۆڕینەوی دیپلۆماسی نهێنی نەبوو. چەندین بەرپرسی مۆساد لە نەیارێتییان بۆ ئەو وازیان لە پلە و پایەکانی خۆیان هێنا و دەستیان لەکار کێشایەوە، بەڵام خۆ «داگان» زۆر گوێی پێنەدان. ئەو یەکەکانی ئۆپەراسیۆنی نۆژەنکردەوە، پەیوەندییێکی توندوتۆڵی لەگەڵ دەزگە هەواڵگرییە بێگانەکان دروستکرد، خۆیشی تەرخانکرد بۆ هەڕەشەی ئێرانیەکان. کاتێکیش کارەساتی شەڕی دووەمی لوبنان لە ٢٠٠٦دا تەقییەوە، تاکە سەرکردە بوو، ئەو ستراتیژەی ڕەتکردەوە بەوەی لەڕێی هێزی ئاسمانییەوە بەچڕی بەیروت بۆمباباران بکرێ. ئەو بڕوای بە هێرشی زەمینی بوو، بەگومان بوو لەوەی شەڕی هەواییدا سەرکەوتن بەدیبێنێ و بە ساغیش لە شەڕەکە بێیتەدەر.

هێشتاش لە لایەن ڕۆژنامەگەرییەوە ڕەخنەی لێدەگیرا، بەوەی بە ڕەقی لەگەڵ فەرماندەکانی بندەستی خۆی دەجووڵێتەوە. ئەفسەرە نامرادەکانی مۆساد، ئەوانەی خانەنشینکرابوون، بەرەو میدیا ڕۆیشتن و دۆخەکەیان قۆستەوە و لێدوانی ئاگرینیان لەبارەی «داگان»ەوە دا. "ئاخر «داگان» کێیە؟" یەکێ لە ستوننووسە پڕخوێنەرەکان جارێک وای نوسیبوو.

پاشان سەرهێڵەکانی ڕۆژنامەکان گۆڕان. وتارەکان بە شێوەیەکی بەرچاو ڕووپەڕی ڕۆژنامەکانیان داگیرکرد و بە مانشێت نوسرابوو: "ئەو پیاوەی شکۆی بۆ مۆساد گێڕایەوە."

لەژێر ڕکێفی داگاندا، مۆساد ئەرکی بەرچاو و ئەستەمی ڕەچاونەکراوی بەدیهێنا" لەناوبردنی بکوژە ناودارەکەی حیزبوڵڵا، «عیماد موغنیە» لە دیمەشق، تێکوپێکدانی کارلێککەری (کوورەی) ناوەکی سووری، لەناوبردنی سەرکردە هەرە دیارەکانی تیرۆرست لە لوبنان و سوریا، لەمانەش هەمووی سەرنجڕاکێشتر، لە هەموویان لێبڕاوانەتر و توندتر، ئەو هەڵمەتە سەرکەوتووانەیان بوو دژی بەرنامەی نهێنی چەکی ناوەکی ئێران.

## بەندی دوو: بەخاکسپاردنەکان لە تاراندا

لە سەعات چوار و نیوی ئێوارەی ٢٣ی تەمووزی ٢٠١١دا دوو چەکدار بە سواری ماتۆڕ لە شەقامی بەنی هاشم لە باشووری تاران دەرکەوتن، کاتێ گەیشتنە شەقامەکە، چەکەکانیان لەبن چاکەتە چەرمینەکانیان دەرهێنان و پیاوێکیان دایە بەر گوللە، کە خەریکبوو بەرەو ماڵ بێتەوە. دوای کوشتنەکە، پیاوەکان ماوەیەکی باش بەر لە گەیشتنی پۆلیس بۆ شوێنی ڕوداوەکە، بزربوون. قوربانیەکە «داریوش ڕەزایی نەژاد»[28]، پیاوێکی سی و پێنج ساڵە، مامۆستایەکی فیزیا و بیچمێکی سەرەکی بەرنامەی نهێنی چەکی ناوەکی ئێران بوو. ئەو بەرپرسی پەرەپێدان و لەیەکدانی پێویستی ئەلەکترۆنی بوو بۆ ئەوەی دامودەزگەی ناوەکییەکە کارا بکا.

لێ گەلۆ، خۆ «ڕەزایی نەژاد» یەکەمین زانای ئێرانی نەبوو، لەو دواییانەدا بەو شێوە خوێناوییە لەناوببرێ. بە فەرمی ئێران بە مەبەستی ئاشتیخوازانە سەرقاڵی پەرەپێدانی تەکنەلۆژیای ناوەکی بوو. کاربەدەستان وایان نمایشدەکرد، گوایە کوورەی بوشەهر، سەرچاوەیەکی گرنگی وزەیە و بە کۆمەکی ڕووسەکان ڕۆنراوە، گوایە هەر ئەمەش خۆی لەخۆیدا بەڵگەی سەلماندنی نیازپاکییانە. بەڵام وێڕای کوورەی[29] بوشەهر،

---

[28] Darioush Rezaei Najad

[29]کوورە: لێرەدا بە واتای rector ڕێکتەرم بەکارهێناوە، کە ئامرێکی گەورە و زەبەللاحە وزەی ناوەکی بەرهەمدەهێنێ. من وشەیەکی گونجاوترم بۆ نەدۆزییەوە.

توانستی ناوەکی شاراوەی دیکەش دۆزرانەوە، کە هەموویان بە شێوەیەکی چڕوپڕ چاودێری دەکران و هی ئەوە نەبوون ببیندرێن و دیاربن. بە تێپەڕبونی ڕۆژ، ئێران دانی بە هەندێک لەو مەڵبەندانە نا، هەرچەندە حاشایی لەو دەنگۆیانە دەکرد کەوا چەکی ناوەکی پەرەپێبدا. بەڵام تا ئەوکات، دەزگە هەواڵگرییە نهێنییەکانی ڕۆژئاوا و ڕێکخراوە ژێرزەمینییەکان، پەردەیان لەسەر چەندین زانای زانکۆکانی ئێرانی هەڵدایەوە، کە لە قافدا گیرابوون[30] و خەریکی دروستکردنی یەکەمین بۆمبی ناوەکی ئێرانی بوون. لەناو ئێرانیشدا، ئەوەی بەتەنیا دەکرا بە "لایەنە نادیارەکان" بناسرێتەوە، زاتی ئەوەیان تێدابوو بەرنامەی نهێنی ناوەکی بوەستێنن.

لە سەعات حەفت و چل و پێنج خولەکی بەیانی ٢٩ی نۆڤێمبەری ٢٠١٠دا و لە باکووری تاراندا، ماتۆڕێک لە دوای ترۆمبێلەکەی دکتۆر «مەجید شەهریاری»[31]، سەردەستەی زانایانی بەرنامەی ناوەکییەکە پەیدابوو. کاتێک ماتۆڕسوارە شەپقەدارەکە گەیشتە ترۆمبێلەکە و لێی تێپەڕی، شتێکی بە جامی پشتەوەی ترۆمبێلەکەوە کرد. چەند چرکەیەک دواتر، ئامێرەکە تەقییەوە، کابرای فیزیاناسە چل و پێنج ساڵیەکەی کوشت و ژنەکەشی بریندارکرد. هاودەم لەگەڵ تەقینەوەکەدا، لە شەقامی «ئاتەشی»[32] لە خوارووی تاراندا، ماتۆڕێکی دیکە هەر هەمان کردەوەی دەرهەق ترۆمبێلی بیجۆ ٢٠٦ەکەی دکتۆر «فەرەیدون عەباسی- داڤنی»[33]

---

[30] لەقافگیران: واتە بەداوەوەبوون، ئاشکرابوون.

[31] Majid Shahiryari

[32] Atashi

[33] Fereydoun Abbasi-Davny

کرد، ئەویش زانایەکی ناسراوی ناوەکی بوو. تەقینەوەکە هەم «عەباسی» و هەم ژنەکەیشی بریندارکرد.

دەستبەجێش حکوومەتی ئێرانی پەنجەی تاوانی بۆ مۆساد درێژکرد. ڕۆڵی ئەو دوو زانا ئێرانییە لە دروستکردنی بۆمبی ناوەکیدا زۆر نهێنی بوو، بەڵام «عەلی ئەکبەر ساڵحی»[34]، بەڕێوبەری پڕۆژەکە ڕایگەیاند، پەلامارەکە «شەهریار»ی گەیاندە پلەی شەهادەت و تیمەکەشی بە لەناچوونی "گوڵی بیابان" کۆستی کەوت.

سەرۆک «ئەحمەدی نەژاد»یش بە شێوەیەکی ڕاستگۆیانە پێزانینی بۆ هەردوو قوربانیەکە دەربڕی؛ کاتێکیش عەباسی داقنی لە برینەکەی چاکبووەوە، یەکسەر ئەحمەدی نەژاد ئەوی کردە جێگری سەرۆکی ئێران.

ئەو پیاوانەش کە پەلاماری ئەوانیان دان، نەدۆزرانەوە.

لە ١٢ی ینایری ٢٠١٠دا و لە سەعات حەفت و پەنجا خولەکی بەیانیەوە، پرۆفیسۆر «مەسعود عەلی محەمەدی»[35] لە شەقامی شەریعە لە ماڵی خۆی دەهاتەدەر، لە گەڕەکی «گیاتاریهە»ی[36] نزیکیان لە باکووری تاران، خەریکبوو بچێتە تاقیگەکەی زانکۆی تەکنەلۆژی شەریف.

کاتێک هەوڵیدا سویچی ترومبێلەکەی بابدا، تەقینەوەیەکی گەورە گەڕەکە ئارامەکەی هەژاند. هێزەکانی ئاسایش بە پەلە گەیشتنە شوێنی ڕووداوەکە، بینیان ترومبێلەکەی محەمەدی هەپروون بە هەپروون بووە، وردەئاسن و پارچەکانی لەگەڵ پارچەکانی جەستەیی قوربانیەکەدا تێکەڵاو

[34] Ali Akbar Salehi

[35] Masoud Ali Mohammadi

[36] Gheytarihe

بووه. ئەو بەو تەقینەوەیە کوژرا کە بەهۆی ماتۆڕیکەوە بۆی داندرابووە، بەتەنیشت تڕومبێلەکەدا ڕەتببوو. میدیای ئێرانیش ئەوەی خستەبەرباس، کەوا ئاژانەکانی مۆساد لەپشت کردەی لەناوبردنی زانایەکەوە بوون. سەرۆک ئەحمەدی نەژادیش ڕایگەیاند: "لەناوبردنەکان شێوازەکانی زایۆنیمان بیردەخەنەوە."

محەمەدی پەنجا ساڵە پسپۆڕی بواری چۆنایەتی فیزیا بوو، ڕاوێژکارێکی بەرنامەی چەکی ناوەکی ئێرانیش بوو. میدیای ئەورووپیش ڕاپۆرتی لەسەر ئەوەدابوو، کە کوژراوەکە ئەندامێکی پاسەوانانی شۆڕشە، واتە هێزە چەکدارەکەی لایەنگری حکوومەت کە لەگەڵ سوپادا تەریبە. بەڵام ژیانی محەمەدی وەک مردنەکەی لەنێو تەلیسمی نهێنیبووندا ونبوو. هەندێ لە برادەرەکانی باسی ئەوەیان کردبوو، گوایە تەنیا لە ڕووی لێکۆڵینەوەی تیۆریەوە لە پرسەکەوە گلاوە و هەرگیز لەگەڵ پڕۆژەیەکی سەربازی وادا نەبووە؛ هەندێکی دیکەش دەیانگوت؛ ئەو پاڵپشتی بزووتنەوەی هەڵگەڕاوەکانی کردووە و لە نارەزایەتی دژی حکوومەتیشدا بەشداربووە.

لەگەڵ ئەو دەنگۆیانەشدا، لەکاتی بەخاکسپاردنەکەیدا، ئەوە دەرکەوت، کە نیوەی ئامادەبووان لە سوپای پاسداراندا بوون. دارەبازەکەشی هەر بە شانی ئەفسەرانی سوپای پاسداران هەڵگیرا. پاشان لێکۆڵینەوە نهێنییەکان دەریانخست، هەر بەڕاستی محەمەدی بەقووڵی دەستی لەگەڵ وردەکاری نیازخوازی بەرزەفڕی ناوەکی ئێرانیدا هەبووە.

لە ینایری ٢٠٠٧یشدا ئەوە ڕاگەیەندرا، گوایە دکتۆر «ئەردەشێر حوسێنپوور»[37]بە تیشکێکی ژەهراوی بەدەستی ئاژانەکانی مۆسادەوە

[37] Dr. Ardashir Hosseinpour

کوژراوە. هەواڵی لەناوبردنەکە گەیشتە سەندەی تایمز لە لەندەن، زانیارییەکانیش لە بنکەی تەکساسی ستاتفۆردی ستراتیژیی ثینک تانکەوە[38] هەڵقووڵان. بەرپرسە ئێرانیەکانیش ئەو زانیارییانەیان بە شتێکی پڕوپووچ لەقەڵەمدا، باسی ئەوەیان کرد گوایە مۆساد هەرگیز پەلامارێکی لەو شێوەیەی لە ئێراندا پێئەنجام نادرێ، هەروەها ئەوەشیان گوت: "پرۆفیسۆر حوسێنپوور لە ئاکامی هەڵمژینی دووکەڵی زۆرەوە، بەهۆی ئاگربەربوون لە ماڵەکەیدا، خنکاوە." لەسەر ئەو دەنگۆیەش سووربوون، کەوا پرۆفیسۆرە تەمەن چل و چوار ساڵەکە تەنها شارەزایەکی ناوداری ئەلکترۆمانیتیک بووە و هیچ پەیوەندی بە هەوڵوتەقەللای بەرنامەی ناوەکی ئێرانییەوە نەبووە.

بەڵام دواتر دەرکەوت، کە «حوسێنپوور» لە دامەزراوەی نهێنی ئیسفەهاندا کاری کردووە، لەوێدا یۆرانیۆمی خاو کراوەتە گاز. هەر ئەوگازەش بۆ پیتاندنی یۆرانیۆم لەڕێگەی زنجیرەیەک سێنتریفیوگ[39] لە ناتانز[40]، لە شوێنێکی زۆر دوور لە قەڵایەکی مەحکەمی ژێرزەمینییەوە کراوە. لە ٢٠٠٦دا حوسێن پوور خەڵاتێکی هەرەبەرزی زانست و تەکنەلۆژیای ئێرانی پێبەخشرا، دوو ساڵ پێشتریش پلەیەکی هەرە بەرز و دیاری بۆ لێکۆڵینەوەی سەربازی پێدرا.

لەناوبردنی زانا ناوەکییەکانی ئێرانی تەنها بەرەیەک بوو لە جەنگێکی زۆر پانوپۆڕتر. بەگوێرەی دێیلی تەلەگراف لە لەندەن، مۆسادەکەی «داگان»

---

[38] Think tank

[39] Centrifuge ئەو دەزگایەیە کە هێزی ناوەکی خانەکان لەیەک جیادەکاتەوە و وزەی لێپەیدا دەبێ.

[40] Natanz

هێرشێکی به ئاژانه دووسەرەکانەوە دەستپێکردبوو، تیمەکانی زەبروەشێن، تێکدەرەکان و هەڵمەتی بەرەی پێشەوە و لێسەندنەوەی ئەو هێز و توانایەی کە ساڵ لە دوای ساڵ ئۆپەراسیۆن دژی بەرنامەی چەکی ناوەکی ئێران ڕێکبخەن.

«ڕێڤا بهالا»[41] بەڕێوبەری شیکارییەکانی «ستراتفۆرد»، وەک خۆی دەقاودەق وتەیەک دەهێنێتەوە: "بە هاوکاری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئۆپەراسیۆنەکانی ئیسرائیلی تیشکۆی کاریان دەخەنە سەر لەناوبردنی پیاوە گرنگەکان، ئەوانەی جێپەنجەیان لەسەر بەرنامەی ناوەکی ئێرانییەوە دیارە، لەگەڵ وێرانکردنی زنجیرەی ئەو کەرەستە و تفاقە ئێرانیانەی بۆ بەرنامەکە پێویستن." بە قسەی خانمەکە، ئیسرائیل هەمان تاکتیکیشی لە عێراقی سەرەتای هەشتاکان بەکارهێنا، لەو کاتەی مۆساد سێ زانای ناوەکی عێراقی لەناوبردن، پاشان مەکۆی کوورەی ناوەکی عێراقی «ئۆسیراک»ی لە نزیک بەغدادا بەسەریەکدا ڕماند.

لەو جەنگە نمایشییەی دژی بەرنامەی چەکی ناوەکی ئێرانیدا، مۆسادەکانی داگان بەشێوەیەکی کارایانە توانیان پەرەسەندنی بۆمبی ناوەکی ئێرانی تا بکرێ بۆ ماوەیەکی دورودرێژ بوەخرێنن[42]، بەمجۆرە مەترسیە هەرە دژوارەکە، کە لەوەتەی ئیسرائیل دروستبووە هەیە، لاببەن. ئاخر ئەحمەدی نەژاد هەڕەشە و گەفی ئەوە دەکا، ئیسرائیل لەسەر زەوی نەهێڵێ.

هێشتاش ئەو سەرکەوتنە وردانە ناتوانن ڕووی شێواو و زیانلێکەوتوی مێژووی مۆساد ڕاستبکەنەوە، چونکە لەوەدا شکستیان هێناوە بە تەواوی

---

[41] Reva Bhalla

[42] وەخراندن: دواخستن.

پڕۆژەی ناوەکی ئێران لەکار بوەستێنن. بۆ چەندین ساڵە ئێران خەریکی ڕۆنانی هێزی ناوەکییە - ئیسرائیلیش هیچ دەرەتانێکی نییە. ئێران بڕە پارەیەکی قەبە لەو بوارەدا وەبەردەهێنێ، زاناکان دەهێنێتە ڕیز، بنکەی نهێنی ڕۆدەنێ، تاقیکردنەوی پێشکەوتوو دەکا- کەچی ئیسرائیلیش هەر پەلدەکوتێ. لەو ساتەوەی کە خومەینی لە ئێراندا بڕیاردەدا وڵاتەکەی ببێتە هێزێکی ناوەکی، کاری لەخشتەبردن دەسازێنی، فەندوفێڵی وا دەکا، نەخشەی فێڵبازانەی وا دادەنێ کە دەزگەی هەواڵگری ڕۆژئاوای بە مۆسادیشەوە پەی پێنەبا.

ڕەزاشا پەهلەوی، شای ئێران، کاتی خۆی دەستی بە دامەزراندنی دوو کوورەی ناوەکی کرد، هەردووکیشیان بۆ مەبەستی ئاشتی و سەربازییانە بوون. بەرنامەکەی شا لە هەفتاکانی سەدەی ڕابردوو دەستپێکرد، ئەوکات کردەوەکە بۆ ئیسرائیل هیچ مایەی گومان نەبوو، ئاخر ئێران دۆستی لەپێشی ئیسرائیل بوو. لە ١٩٧٧دا، ژەنەڕال «ئایزەر وایزمەن»ی وەزیری بەرگری ئیسرائیل، لە وەزارەتی بەرگری لە تەلئەبیب، وەک هاوپەیمانێک پێشوازی لە «حەسەن توفانیان»[43]کرد، کە بەرپرسی مۆدێرنیزەکردنی سوپای ئێرانی بوو، ئەوکات ئیسرائیل چەکوتفاقی پێشکەوتووی دەدایە ئێران. بەگوێرەی کۆبونەوە باوەڕپێکراوەکەیان، «وایزمەن» ئەوەی خستە بەردەم «توفانیان» کە مووشەکی زەوی بە زەوی بداتە ئێران، لەو کاتەشدا دکتۆر «پیناس زوسمان»[44]، بەڕێوبەری گشتی وەزارەتی بەرگری ئیسرائیل، مێوانەکەی بەوە سەرسامکرد، کە مووشەکە دوورهاوێژەکانی ئیسرائیلی دەکرێ کڵاوی ناوەکیش هەڵبگرن. بەڵام بەرلەوەی بە فەرمی پلانەکەیان جێبەجێبکەن، شۆڕشی ئیسلامی

[43] Hassan Toufanian

[44] Pinas Zusman

پەیوەندییەکانی ئێران-ئیسرائیلی هەڵگێڕایەوە. حکوومەتی ئیسلامی دەستوپێوەندی شای لەناوبرد و دژایەتی ئیسرائیلیشی ڕاگەیاند. کاتێکیش وڵات کەوتە بن ڕکێفی ئایەتوڵڵا خومەینی و مەلا دڵسۆزەکانی، پاشایە نەخۆشەکەش تێیتەقاند و لە وڵات هەڵات.

هەر دەستبەجێش، خومەینی کۆتایی بە پڕۆژەی ناوەکی هێنا، چونکە بە شتێکی "دژە ئیسلامی" دادەنا. ڕۆنانی کوورەکە وەستێندراو کەلوپەل و دەزگەکانیش لەبارییەک هەڵوەشێندرانەوە. ئەمما لە هەشتاکانی سەدەی ڕابردوودا، جەنگێکی خوێناوی لە نێوان عێراق و ئێران هەڵگیرسا. سەدام حوسەینیش گازی ژەهراوی دژی ئێرانیەکان بەکارهێنا. بەکارهێنانی ئەو چەکە ناتەقلیدییە لەلایەن دوژمنەکەیانەوە، ئایەتوڵڵاکانی خستەوە سەر کەڵکەڵەیەکی دیکە بەوەی بە سیاسەتەکەیاندا بچنەوە. تەنانەت بەر لە کۆچی دوایی خومەینیش، جێگرەوە دیارەکەی خۆی، عەلی خامنەیی، ڕێنمایی بۆ هێزی سەربازی دەرکرد کە پەرە بە چەکی نوێ -بایەلۆژی، کیمیایی و ناوەکی- بدەن بۆ ئەوەی بەرپەچی چەکی کۆمەڵکوژی عێراق بدەنەوە، کە زیانێکی زۆری بە ئێران گەیاندبوو. زۆری نەبرد دوای ئەوە، سەرکردە ئۆلییە قایلەکان بانگی ڕابەرەکەیان کرد، بەڵکو قەدەغەی سەر چەکی "دژە-ئیسلامی" هەڵبگرێ.

لەناوەڕاستی هەشتاکانەوە هەندێ برگەی هەواڵ سەبارەت بە هەوڵ و تەقەللاکانیان لەو بوارەدا بڵاوبوونەوە. لەگەڵ ڕووخانی یەکێتی سۆڤیەتیش لە ١٩٨٩دا، تەوژمی هەواڵەکان ڕووی لە ئەورووپا کرد، بەوەی ئێرانیەکان لە هەوڵی ئەوەدان بۆمبی ناوەکی لە ژەنەڕاڵ یان زانا برسییەکانی سەربازی پێشووی یەکێتی سۆڤیەتەوە بکڕن و لە وڵاتەکەی خۆیاندا دابیمەزرێنن. ڕۆژنامە ڕۆژئاواییەکان وردەکاری مەرگەساتانەیان سەبارەت بە ونبوونی زانا و ژەنەڕاڵە ڕووسییەکان لەماڵەکانی خۆیاندا

وەسف دەکرد، گوایە چوونەتە ڕیزی ئێرانییەکان. ڕاپۆرتی زۆرو زەوەند پەردەیان لەسەر ئەوە هەڵدەدایەوە گوایە لۆری سەرداپۆشراو لە ئەورووپاوە بەرەو ڕۆژهەڵات دەڕۆن، بە ئاراستەی سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لێدەخوڕن. سەرچاوەکان لە تاران، مۆسکۆ و بێجینگ ئەوەیان ئاشکراکرد، کە ئێران ڕێککەوتنامەیەکی لەگەڵ ڕووسیادا مۆرکردووە تا کوورەیەکی ناوەکی لە «بوشەهر» بنیاد بنێ، بوشەهریش دەکەوێتە سەر کەناری کەنداوی فارسی، هەروەها ڕێککەوتننامەیەکی دیکەشیان لەگەڵ چین واژۆکردووە، بۆئەوە دوو کوورەی بچکۆلەتری دیکە دروستبکەن.

بەهۆشدارییەوە تیمی ئاژانە تایبەتییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئیسرائیل بە ئەورووپادا بڵاوبونەوە بۆ ئەوەی بە دوای ئەو بۆمبە کرداوانەی ڕووسیا بۆ ئێران بکەون و ڕاوەدووی زاناکانیشیان بنێن. بەڵام ئەوان هیچیان بەدەستنەکەوت. ئینجا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا گوشارێکی زۆری خستەسەر ڕووسیا و چین تا ڕێککەوتننامەکانیان لەگەڵ ئێراندا هەڵبوەشێننەوە. چین گوێڕایەڵ بوو، بەشە ڕێکەوتننامەکەی خۆی لەگەڵ ئێراندا هەڵوەشاندەوە. هەرچی ڕووسیاش بوو، بڕیاریدا لەسەر ڕێککەوتننامەکە بەردەوام بێ بەڵام هەندێکی وەخراند. ئیدی بەمجۆرە کوورەکە زیاتر لە بیست ساڵی پێچوو تا بنیاد بندرێ و بەوەش سنووردار کرا کە تەنیا لەلایەن ڕووسیا و کۆنترۆڵی نێودەوڵەتییەوە بەکاربهێندرێ.

بەڵام وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئیسرائیل لەگەڵ ساردبوونەوەی ئاراستەی ڕێبەرایەتیەکەدا، هەڵمەتی گەڕان و پشکنینیان فرەوانتر کرد. سەرانی هەردوو دەزگەکەی مۆساد و سی ئای ئەی شکستیان هێنا، لەوەی تێبگەن کەوا کوورەکانی ڕوسی و چینی تەنها دووکەڵێکی

بەلاڕێدابردنی "باشترین دەزگەی نهێنی جیهانی" بوو. ئاخر ئێران بەشێوەیەکی بالکێش بەرنامەیەکی کەتە و زلی بۆ مەبەستی هێزی ناوەکی هەڵدا.

لە پایزی ١٩٨٧دا کۆبونەوەیەکی نهێنی لە دوبەی سازدرا. هەشت پیاو، لە نووسینگەیەکی بچکۆڵەی تۆزلێنیشتوودا کۆبوونەوە: سێ ئێرانی، دوو پاکستانی و سێ پسپۆڕی ئەوڕووپی (دووانیان ئاڵمانی بوون) کە کاریان بۆ ئێران دەکرد.

نوێنەرەکانی ئێران و پاکستان ڕێککەوتننامەیەکی باوەڕپێکراویان لەنێو خۆیاندا واژۆکرد. بڕە پارەیەکی قەبە بۆ پاکستانییەکان گوێزرایەوە، یان دەقاودەقتر پارەکە بۆ دکتۆر «عەبدولقادر خان»، بەرپرسی فەرمی بەرنامەی چەکی ناوەکی پاکستانی بوو.

بەر لە چەند ساڵێکی کەم لەو ڕوداوە، پاکستان بانگی پڕۆژەی ناوەکی خۆی هەڵدابوو، تا بگاتە ئاستی دوژمنە سەرخستەکەی خۆی، کە هیندستان بوو. «دکتۆر خان» زۆر حەوجەی بە ماددەی پەرتکەری چارەنووساز هەبوو بۆ ئەوەی بۆمبە ئەتۆمیەکەی لەیەکبدا. هێشتاش ئەو پلاتینیومی بۆ ئەو مەبەستە بەکارنەهێنابوو، کە پلاتینیۆمەکە لە بەرهەمی کلاسیکیانەی کوورە ناوەکیەکانە، بەڵام بۆ ئەوەی یۆرانیۆمی پیتێندراو دەستەبەربکەی، ئەوا کانەکانی یۆرانیۆم بە تەنیا بەڕێژەی یەک لەسەد لە ٢٣٥ی یۆرانیۆمی مەبەستیان تێدایە، بەرهەمەکەش بۆ چەکی ناوەکی چارەنووسسازە، ئیدی باقی ٩٩ لەسەدی یۆرانیۆمەکە بێکەڵکە. دکتۆر خانیش ڕێگەیەکی دۆزیبووەوە، کە یۆرانیۆم بکاتە گاز، ئیدی ئەم گازەش لەڕێی هێڵی سێنترفیوگەوە (دووکەرتکردن) بەزنجیرەیەک بەیەک بگەیەنێ، ناوی لێنابوو کانی. لەڕێی ئەو سەنتەرفیوگانە و گازی یۆرانیۆم بە خێرایی خولخواردنی ١٠٠٠٠٠ جاری لە خولەکێکدا، ئەوا یۆرانیۆمی

سووکی ٢٣٥ له یۆرانیۆمه قورسەکەی ٢٣٨ جیادەکرێتەوە. به دووبارەکردنەوەی ئەو پێواژۆیە[45] بۆ هەزاران جار، ئەوا سێنتەرفیوگەکە یۆرانیۆمی پیتێندراوی ٢٣٥ بەرهەمدەهێنێ. ئەم گازەش کاتێ له دۆزەکەی دەبێتەوە ماددەیەکی ڕەق، ئەوا ئەو مادده پێویستیەی لێپێکدێ که بۆمبی ناوەکی لێدروست دەکرێ.

«خان»یش نەخشەی ئەو سەنتەرفیوگەی له ئێورنکۆ[46]وە، له کۆمپانیایەکی ئەوڕووپی دزیبوو، ئەو کاتەی له سەرەتاکانی ١٩٧٠ەوە، کارخانەی خۆی له پاکستان دامەزراند. هەر زووش به هۆیەوه خان بووه "بارزگانی مەرگ". شێواز، داڕشته و سەنتریفیگوسی دەفرۆشتنەوە. ئێرانیش بووه کڕیاره سەرەکییەکەی. له کڕیارەکانی دیکەیشی لیبیا و کۆریای باکوور بوون.

ئێرانییەکان له شوێنێکی دیکەشەوه سەنتەرفیوگوسەکانیان کڕین، ئیدی فێریشبوون چۆن لەناوخۆشدا دروستی بکەن. باری قەبەی پاپۆڕەکان له یۆرانیۆم، سەنتەرفیوگەکان، کەرەسته ئەلکترۆنیەکان و پارچەی یەدەگ دەگەیشتنە ئێران. توانستی زۆر قەبه بۆ چارەسەرکردنی یۆرانیۆم، بۆ داکردنی سەنتەرفیوگەکان و بۆ گۆڕینی دۆخی گاز به ماددەیەکی ڕەق، بنیاتنران؛ زانایانی ئێرانی سەردانی پاکستانیان کردن و پسپۆڕ و شارەزایانی پاکستانیش دەهاتنه ئێران، هەموو ئەو کارانه دەکران بێئەوەی کەسیش پێیبزانێ.

ئێرانیەکان وشیار بوون بەوەی هەموو هێلکەکانی خۆیان نەخەنه یەک سەبەتەوە. ئەوان بەرنامه ناوەکیەکەیان بەنێو وڵاتەکەیاندا

[45] پێواژۆ: پرۆسە.

[46] Eurenco

پەرشوبڵاوکردەوە، تاقیگەی دەمامکدراو و توانستی شوێنی دووردەستیان بەکارهێنان. هەندێکیان لەوانە لە قوڵایی ژێر زەمیندا دروستکردن، لەسەررووپیشەوە بنکەی هەڵدانی موشەکی زەوی بۆ هەوایان لێدامەزراند. یەکێک لەو بنکانە لە ئیسفەهان دامەزرێندرا، ئەوی دیکەشیان لە ئاراک، بەڵام لە هەمووشیان گرنگتر -توانستی سەنتەرفیگەکەیان بوو- لە «ناتانز» دایانمەزراند؛ چوارەمین مەڵبەندیشیان لە شارە پیرۆزەکەی «قوم» دانا. لەو کاتەی ئاماژەی ئەوە بدرێ کە شوێنەکەی دۆزراوەتەوە، ئەوا بەئاسانی ئێرانییەکان دەیانتوانی شوێنەکەی بۆ یەکێکی دیکە بگوازنەوە و چینەکانی سەرەوەی خاکەکەشیان ڕادەماشت بەوەی شوێنەواری هەموو تیشکدانەوەیەکی سەر زەوی بسڕنەوە. هەروەها ئەوان لێهاتووانە ئاژانسی چاودێری وزەی جیهانیان لەخشتەبرد و دەستخەرۆ کرد. ئاخر بەڕێوبەری ئاژانسەکە، کابرای میسری، دکتۆر «محەمەد ئەلبەرادعی» وای ڕەفتار دەنواند وەک ئەوەی بڕوا بە ڕاگەیاندن و لێدوانە ساختەکانی ئێران بکا و ڕاپۆرتی پەسەندنامەی وای بڵاودەکردنەوە کە ئێران بتوانێ لەسەر خشتە دژوارەکەی خۆی بۆ بەرنامە داخوازەکە بەردەوامبێ.

لە یەکی حوزەیرانی ١٩٩٨دا، بۆ یەکەمین جار کاری فراوانخوازانەی ڕاستەقینەی ئێرانییەکانیان بینی. یاخیبوویێکی پاکستانی لەبەردەم لیژنەی لێکۆڵینەوەی FBIدا لە نیویۆرک دەرکەوت و داوای مافی پەنابەری سیاسی لە ئەمریکا کرد. ئەو خۆی بەناوی دکتۆر «ئیفتیخار خان چاودهری»[47] ناساند، بە دووردرێژی پەردەی لەسەر هاوکارییە نهێنییەکەی نێوان پاکستان و ئێران هەڵدایەوە. ئەو دکتۆر «عەبدولقادرخان»یشی ئاشکرا کرد، وەسفی ئەو کۆبوونەوانەشی کرد کە

[47] Dr. Iftikhar Khan Chaudhry

تێیدا بەشداربووە و ناوی ئەو پسپۆڕە پاکستانیانەشی هێنا کە لە پڕۆژەی ئێرانیدا بەشداربوونە.

ڕاستیەکان و بیچمەکانی نێو گەواهینامەکەی دکتۆر «چاودهری» بە وردی لە لایەن FBI یەوە پشکێنران و ڕاستی و دروستیەکەشیان پشتڕاستکرایەوە. هەر بەڕاستیش FBI ڕاسپاردەی ئەوەی بە حکوومەتەکەی دا، کە «چاودهری» لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەک پەنابەرێکی سیاسی ڕێ پێبدرێ، بەڵام بۆ مایەی سەرسامی، هەرگیز بەدواداچونی زیاتر بۆ گەواهینامەکەی دکتۆرە پەنادراوەکە نەکرا. لەوانەیە هەر لەبەرخاتری فەرامۆشکردن، دەسەڵاتدارە باڵاکانی ئەمریکا دەستنووسەکانی چادروهییان پەردەپۆشکردبێ و هیچ هەنگاوێکی کردەییان بۆ هەڵنەهێنا و ئیسرائیلیشیان لێئاگادارنەکردەوە. چوار ساڵی ڕەبەق بەسەر بویەرەکەدا[48] ڕەتبوو، ئەوسا ڕاستییەکان سەبارەت بە ئێران کەوتنە بەرتیشک و ئاشکرابوون.

لە هیکەوە[49] و لە ئابی ٢٠٠٢دا «موجاهدینی خەلق» کە ڕێکخراوێکی یاخیبووی ژێرزەمینییە، بۆ میدیای جیهانی ئاشکرا کرد، کە ئێران لە «ئاراک» و «ناتانز» توانستی ناوەکی هەیە. لەو ساڵانەی بەدوایداهاتن، موجاهدینی خەلق ڕاستی زیاتری سەبارەت بە پڕۆژەی ناوەکی ئێران خستەڕوو. هێشتاش سی ئای ئەی بێدەنگی لێکردبوو، بەڵام دەگوترا ئیسرائیلی و بەریتانیەکان لەهەوڵی ئەوەدان ئەمریکیەکان بۆ ئەو پرسە بهێننە ڕەدایێ[50] و لە ئۆپەراسیۆنە هەراسانەکاندا بەشداربن. بە

[48] بویەر: ڕووداو.

[49] لەهیکەوە: لەپڕ، لەناکاو.

[50] بێننەڕایێ: قەناعەتپێکردن، هێنانەسەرخەت.

دەقاودەقیش پێدەچوو سی ئای ئەی لەو بڕوایەدا بێ کەوا مۆساد و MI6ی بەریتانی[51] هەواڵ و دەنگوباسەکانی موجاهیدینی خەڵق وەردەگرن، ئەوان (واتە هەردوو دەزگە هەواڵگرییەکە) ئۆپۆزسییۆنی ئێرانی وەک سەرچاوەیەکی گرنگی هیوابەخش بەکاردەهێنن. بەگوێرەی سەرچاوەکانی ئیسرائیلیش، چاودێریکردنەکە هەر بەڕاستی بەرهەمداربوو، چونکە ئەفسەرەکانی مۆساد بنکەی دامەزراوەی زەبەللاحی سەنتەرفیوگیان لە قووڵایی بیابان دۆزیبووەوە. لەهەمان ساڵیشدا، واتە لە ٢٠٠٢دا، ئێرانییەکان ئەوانەی بە نهێنی و ژێرزەمیندا کاریان دەکرد، لاپتۆپێکی پڕ بەڵگەنامەیان ڕادەستی سی ئای ئەی کرد. یاخیبووەکانیش ئەوەیان ئاشکرا نەکرد ئاخۆ چۆن ئەو لاپتۆپە پڕ زانیارییەیان بەدەستکەوتووە؛ ئەمریکاییە دڕدۆنگەکانیش، گومانیان بۆ پەیدابوو بەوەی ئەو بەڵگەنامانەی بە سکان خراونەتە نێو لاپتۆپەکە، کەواتە زانیارییەکان کۆن نین و هی ئەو دواییانەن؛ ئەوان گومانیان لە مۆساد دەکرد، بەوەی بە شێوەیەک لە شێوەکان ئەو زانیارییانەی لەسەرچاوەکانی خۆیەوە، بۆ لای یاخیبووەکان دزەپێکردبێ، ئەوسا هەر لەڕێی ئەوانەوە درابێتە سەرکردەکانی موجاهیدینی خەڵق و ئەوانیش ڕادەستی ڕۆژئاواییەکانیان کردبێ.

بەڵام خۆ ئێستا بەڵگەی دیکە خراونەتە سەر مێزی ئەمریکایی و ئەوروپییەکان، کە لە دواییدا دەبوایە چاوەکانیان بکەنەوە. دەنگۆی داهێنانەکانی دکتۆر خان و "بازرگانییە فرمێسک و خوێنییەکەی"[52] لە سەرتاسەری دنیادا بڵاوبووەوە. لە کۆتاییشدا، لە ٤ی فێبرایری ٢٠٠٤دا،

---

[51] واتە دەزگەی هەواڵگریی نهێنی بەریتانی.

[52] نووسەران بازرگانی مەرگ، یان مەرگهێنیان نووسیبوو: منیش ئەو دەستەواژەیەی مام هێمنم قۆستەوە کە لە شیعری ئێوارەی پایزدا هەیە، پێموایە ڕەوانتر دەگونجێ.

دکتۆر خان بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنی پاکستانی پەیدابوو، دانی بەوەدانا، کە بەڕاستی ئەو هەرچۆنێک بێ ئەزموون و سەنتەرفیوگەکانی فرۆشتوونەتە لیبیا، کۆریای باکوور و ئێران، لە ئەنجامی ئەو سەودایەشیدا چەندان ملیۆن دۆلاری پێبڕاوە. حکومەتی پاکستانیش بە پەلە لێبوردنێکی متمانەبەخشی بۆ "دکتۆری مەرگ" کە مامۆتکی بۆمبی ناوەکیان بوو، دەرکرد.

ئیدی ئیسرائیل بووە سەرچاوەی سەرەکی زانیاری دەربارەی ئێران. «مایەر داگان» و مۆسادەکانی زانیارییان بە داتای نوێیەوە دەدایە هەواڵگری ئەمریکا و وردەکارییان سەبارەت بە توانستی دامەزراوەی ناوەکی ئێران کە بە نهێنی لە «قوم» دروستی کردوە دایە سی ئای ئەی، دیاربوو ئیسرائیل لە پشتی چەندین ئەفسەری هەڵگەڕاوەی سوپای پاسداران و پرۆژەی ناوەکیشەوە بووە؛ مۆساد زانیاری بەڵگەدارە نۆژەنکراوەکانی دانە چەندین دەوڵەت، هانیدەدان بەڵکو ڕێ لەو پاپۆڕە بارکراوانەی بگرن، کە کەلوپەل و تفاقی پێویست بەو مەبەستە لە بەندەرەکانیان باردەکەن و بەرەو ئێران بەڕێدەکەون.

بەڵام بە ئاستەم بەدەستهێنانی ئەو ئاگادارییانە جێی ڕەزامەندی ئیسرائیل بوون. لە کاتێکدا کە ئێرانی توندڕەو ڕاشکاوانە هەڕەشەی لەناوبردنی ئیسرائیلی جاڕدەدا، باقی وڵاتەکانی جیهان خۆیان لەهەر کردەیەکی بەگوڕ و جۆش دوور دەخستەوە. ئیسرائیل بەبێ بژاردە و دەرەتان بەجێهڵدرا، تەنها ئەوەی لەبەردەمدا مابوو، هەر بەخۆی هەڵمەتی پاڵپشتنەکراو دژی بەرنامەی ناوەکی ئێران بەڕێبکا.

دوای شازدە ساڵ لە قرە و بگرە بەردەی کەمتەرخەمی بەرپرسانی پێشخۆی، «داگان» بڕیاریدا لێرەوە بەدوا دەستبەکار بێ.

لە ینایری ٢٠٦دا فڕۆکەیەک لەناوجەرگەی ئێران تێکشکا. سەرجەم سەرنشینانی فڕۆکەکە فەوتان. لەنێو سەرنشینە سەرتێداچووەکاندا، ئەفسەری پلەباڵای پاسداران بوون بە«ئەحمەد کازمی»یشەوە، کە یەکێک لە فەرماندەکانیان بوو. ئێرانییەکانیش ڕایانگەیاند، هۆکاری تێکشکانی فڕۆکەکە باری خراپی کەشوهەوا بووە، بەڵام گروپی ستراتفۆر ئاماژەیان بەوەدا، فڕۆکەکە لە لایەن ئاژانە ڕۆژئاواییەکانەوە تێکشکاوە.

هەر مانگێکیش پێش ڕووداوەکە، فڕۆکەیەکی بارهەڵگری سەربازی لە تاران خۆی بە باڵەخانەیەکدا کێشا. هەر بیست و چوار کەسەکەی نێو فڕۆکەکە مردن. زۆریان ئەفسەری پاسداران و ڕۆژنامەنووسی دەرباری ڕژێمەکە بوون. لە نۆڤێمبەری ٢٠٠٦یشدا، فڕۆکەیەکی بارهەڵگری دیکەی ئێرانی لەکاتی هەڵسانی لە تاران تێکشکا، لەوێشدا سی و شەش پاسداری تێدا کوژران. لە ڕادیۆی نیشتیمانیشدا، وەزیری بەرگری ئێران جاڕیدا: "بەگوێرەی سەرچاوە هەواڵگرییەکان، ئێمە دەتوانین بڵێین، کەوا ئاژانەکانی ئەمریکایی، بەریتانی و ئیسڕائیلی بەرپرسیارن لە تێکشکانی ئەم فڕۆکەیەدا."

لەو نێوەدا و بە بێدەنگی، بێ هیچ نیازێکی ئاشکراکراو، «داگان» بووە ستراتیژداڕێژەری سەرەکی سیاسەتی ئیسڕائل لە بەرانبەر ئێراندا. ئەو باوەڕی وابوو لەوانەیە ئیسڕائیل هیچ بژاردەی دیکەی لەدەستدا نەمێنێتەوە، مەگەر هێرشێکی چڕوپڕی گردەبڕانە[53] نەبێ بۆسەر ئێران. بەڵام بەگوێرەی لێکدانەوەکانی «داگان»، ئەم جۆرە کردەوەیە دەبێ دوامژار بێ.

[53] گردەبڕانە: یەکلاکەرەوانە.

کاروباری تێکدەرانە لە فێبرایری ٢٠٠٥دا سەریهەڵدا. لەڕۆژنامەگەری نێودەوڵەتییدا ئەو هەواڵە بڵاوبووە کەوا بنکەیەکی توانستی ناوەکی لە «دەیلەم» لە لایەن موشەکێکی دوورهاوێژی فڕۆکەیەکی نەناسراوە بووە لە شوێنێک لە شوێنەکان تێیگیراوە و پێکاویەتی. لەهەمان مانگیشدا، تەقینەوەیەک لە شوێنێکی نزیک «بوشەهر»، لە لوولەکێشی گازەوە بووە کە ڕووسەکان بۆ کوورەی ناوەکی بنیادیان نابوو.

بنکەی تاقیگەی توانستێکی دیکەش لە لای پارچین[54] لە نزیک تاران هێرشی کرایەسەر. لەوێدا شارەزا ئێرانیەکان خەریکی پەرەپێدانی "لێنزەکانی تەقینەوە"، ئەو میکانیزمەی ناوکی بۆمب بکاتە گوڕدەمێکی کوشندە و چۆنیەتی بەیەکگەیاندنی زنجیرە کاردانەوەکانی تەقینەوەیەکی ناوەکی. ڕێکخراوە ژێرزەمینیەکەی ئێران، ڕایگەیاند کەوا تەقینەوەکەی پارچین زیانێکی مەزنی بە تاقیگە نهێنییەکە گەیاندووە.

لە ئەپریلی ٢٠٠٦یش، چەقی بازنە -دامەزراوە مەڵبەندییەکەی ناتانز- ببووە نمایشی ئەنجوومەنێکی ئاهەنگێڕانە. حەشاماتێک لە زانایان، تەکنیکارەکان و سەرانی پڕۆژە نهێنییەکانی ناوەکی لەوێدا گردببونەوە، لەوێدا بە هەزاران سەنتەرفیگوس لەگەڵ میلی سەعاتدا دەسووڕانەوە. لە میزاجێکی ئاهەنگیانەدا، ئەوان هاتبوون، سەیری یەکەمین کارابوونی هەڵقوڵانی سەنتەرفیوگەکە بکەن. هەمووان بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی ئەو ساتەیان دەکرد، کە کارەکە ڕوویدا. ئیدی بەرپرسی ئەندازیارەکان دەستی بە دوگمەی کاراکردنی شتەکەوە نا، ئەوسا تەقینەوەیەکی بەهێز ئەو هۆڵی گەورەی گردبوونەوەکەی هەژاند. لولەکە تەقیەوە و گرمژنێکی زۆری لێوەهات و سەرتاپای کاری هەڵقوڵانی سەنتەرفیوگەکە تێکوپێکدرا.

---

[54] Parchin

هەرزوو بە دەهریبونەوە سەرۆکی پڕۆژەی ناوەکی داوای لێکۆڵینەوەی لە ڕووداوەکە کرد. دیاربوو "کەسێکی نەناسراو" پارچەیەکی کاریگەری خستۆتە نێو ئامێرەکەوە. CBS ڕاپۆرتی ئەوەی دا، کەوا سەنتەرفیوگەکە بە هۆی تەقینەوەیەکی بچکۆلانە کە کەمێک بەر لە کاراکردنەکەدا تەقیوەتەوە. هەروەها ئەوەشی گوت کەوا هەواڵگری ئیسرائیلی بە هاوکاری ئەمریکیەکان لە پشت ڕوداوی تەقینەوەکەی ناتانزەوە بوونە.

دیسان لە ینایری 2007دا، سەنتەرفیوگەکان بوونە ئامانجی تێکدان و وێرانکردنێکی ئاڵۆز. دەزگە نهێنیەکانی ڕۆژئاوا کۆمپانیای ئەورووپیان دامەزراندبوون و ناردبوویانە پێشەوە تا مادەی خاو بۆ دامەزراوەکانی سەنتەرفیوگەکان بەکاربهێنن. ئاخر ئێرانییەکان نەیاندەتوانی ئەو کەلوپەلانە لە بازاڕی کراوەدا بکڕن، چونکە ئەم شتانە بەگوێرەی بڕیارنامەکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان سنووردار کرابوون، بۆیە دەبوایە پەنایان بۆ کۆمپانیا ساختەکانی ئەورووپی بردبا کە لە لایەن ڕووسی و ئیتالییەکان کە لە تاراوگەدا دەژیان، هەڵدەسووڕان، ئەوانیش لەبنەوە کاریان لەگەڵ دەزگە هەواڵگرییە نهێنیەکاندا دەکرد. هەر تەنیا دوای دانان و دامەزراندنی ئەو کەلوپەلانە، ئێرانییەکان لەوە تێگەیشتن، کە شتەکان زڕن و کارناکەن.

لە ئایاری ٢٠٠٧دا سەرۆک جۆرج بوش، فەرمانێکی سەرۆکایەتی نهێنی دەرکرد و دەسەڵاتی دایە سی ئای ئەی، بە نهێنی ڕووماڵی ڕۆژانەی بەرنامەی ناوەکی ئێرانی بکا. دوای ئەوە زۆری نەخایاند، بڕیارێک لەلایەن دەزگەیەکی هەواڵگری نهێنی ڕۆژئاواییەوە درا، تا ئەو زنجیرە بارە نهێنییانەی بۆ ئێران دەنێردرێن، لە کەلوپەل و ئامێر و تفاقەکانی پێویست بۆ بەرنامە نهێنییەکەیان، تێکوپێکبدرێن و لە کەڵک بخرێن. لە مانگی ئابی هەمانساڵیشدا، «داگان» چاوی بە یاردیدەری وەزیری دەرەوەی وڵاتە

یەکگرتووەکانی ئەمریکا «نیکۆلاس بێرنس» کەوت و ستراتیژێکی هاوبەشیان سەبارەت بە ئێران تاوتوێکرد.

زیانپێگەیاندن، تێکدان، لە کەڵکخستن لە ماوەی ئەو حەفت ساڵانەی دوایی دامەزراندن و دانانی دامەزراوەکانی پڕۆژەی ناوەکی ئێران بەردەوامبوو، بەیەکەوە بەستنەوەیەکی تەلیسماوی، کێشەی بۆ سیستمی ساردکردنەوەی کوورەی بوشەهر دروستکرد، کە بە هۆیەوە کاروچالاکیەکانی بۆ ماوەی دوو ساڵ ڕاگیرا. لە ئایاری ٢٠٠٨دا تەقینەوەیەک لە ئامێرێکی چاندنی بنکەی ئاراک ڕوویدا، بووە مایەی زیانێکی زۆر و بەرچاو بە بنکەی توانستی ناوەکی «نیک» خۆیەوە. تەقینەوەیەکی دیکە کۆمەڵگەیەکی گرنگ کە بە شێوەیەکی چڕوپڕ چاودێری دەکرا، لە ئیسفەهان تێکوپێکیدا، کە یۆرانیۆمی تێدا دەگۆڕدرا بۆ دۆخی گازی.

لە ٢٠٠٨ و ٢٠١٠دا نیویۆرک تایمز ئاشکرای کرد کەوا «تینەرەکان»، خێزانێکی ئەندازییاری سویسری، یارمەتی سی ئای ئەیان داوە بۆ ئەوەی بەرنامەی ناوەکی لیبیا و ئێران بتەقێننەوە و بۆ ئەم کارەش ئاژانسەکە بڕی ١٠ ملیۆن دۆلاریان داوەتەوە کۆمپانیای ئەندازیاریەکە. سی ئای ئەی ئەو کۆمپانیایەی لە هەر بەدواداچوونێکی دادگایانەی دەسەڵاتی سویسراییەوە پاراست بەوەی قاچاخچێتیان بە کەلوپەلی پێکهێنەری ناوەکییەوە کردبێ. باوکەکەیان، «فرێدریک تینەر» و دوو کوڕی بەناوی «ئورس» و «مارکۆ»[55] کەلوپەلی ئەلکترۆنییان بە دامەزراوەی بنکەی توانستی ناتانز فرۆشتبوو، کە بە هۆیەوە سەنتەرفییوگەکەی تێکوپێدابوو.

---

[55] Urs and Marko

ئەو بارە کەلوپەلەی «تینەرەکان» لە کۆمپانیای «فیڤەر ڤاکوومە» لە ئاڵمانیاوە گەیەندرابووە «نیو مەکسیکۆ» لەوێشەوە بۆ ئێران ناردرابوو.

گۆڤاری تایمزیش ئەوەی پشتڕاتکردەوە، کەوا دەزگەی مۆساد لەپشت ڕفاندنی کەشتی ئارکتیک سییەوە[56] بووە، کە لە فینلەنداوە بەرەو جەزائیر ڕۆیشتووەوە، تاقمێکی ڕووسی لەژێر ئالای ماڵتاوە "باری دار" هەڵگرتووە و ئەو ڕێگە دەریایەی تەیکردووە. لە ٢٤ی تەمموزی ٢٠٠٩داو دوو ڕۆژ بەرلەوەی گەشتە دەریاییەکەی دەستپێبکا، ئەو کەشتییە بارهەڵگرە بە ڕفێنەران دەورەدراوە. تەنها یەک مانگ دوای ڕووداوەکە کاربەدەستە ڕووسەکان ئاشکرایان کرد، کە کاپتنە ڕووسەکە لەسەر پشتی کەشتیەکە بردراوە. تایمزی لەندەنی و دێیلی تێلەگرافیش ڕایانگەیاند، مۆساد هۆشداریەکەی داوە. ئەوان گوتیان پیاوەکانی «داگان»، ئاگاداری ڕووسەکانیان کردۆتەوە، کە بارەکە یۆرانیۆمی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە، یۆرانیۆمەکەش لەلایەن ئەفسەرێکی پێشوی ڕووسی فرۆشراوەتە ئێران. بەڵام «ئەدمیرال کۆوتز» کە فەرماندەی هێزی دژە چەتەیی دەریایی یەکێتی ئەورووپایە، ڕوانینی تایبەتی خۆی بە گۆڤاری تایمز گوتووە. تاکە ڕوونکردنەوەی دروست ئەوەیە کە کەشتیەکە لەلایەن مۆسادەوە ڕفێندرابێ بۆ ئەوەی ڕێ بە یۆرانیۆمەکە بگرن.

بەڵام وێڕای هەموو ئەو شتانەی بە ناوەڕۆکی ئەو پەلامارەوە بوو، ئێرانییەکان دەستەوەستان نەبوون. لەنێوان ٢٠٠٥ و ٢٠٠٨دا بە شێوەیەکی تەواو نهێنی، ئەوان دامەزراوەیەکی دیکەیان لە نزیک «قوم» دروستکرد. نەخشەیان وابوو سێ هەزار سەنتەرفیوگ لەو هۆڵە ژێرزەمینەی قووڵایی خاکدا دروستبکەن. هەرچەندە لە ناوەڕاستی ٢٠٠٩دا

[56] Arctic sea

ئێرانیەکان، پەییان بەوەبرد، کەوا ڕێکخراوە هەواڵگرییەکانی ئەمریکا، بەریتانیا و ئیسرائیل زانیاری تەواویان لەسەر نەخشەکەی دامەزراوەی قومەوە هەیە. بەڵام ئێران لەسەر نەخشەکەی بەردەوام بوو. لە ئەیلوولی ٢٠٠٩دا، ئێران جیهانی سەرسامکرد کە ڕێکخراوی IAEAی لە هەبوونی دامەزراوەی «قوم» ئاگادارکردەوە. هەندێ سەرچاوە باس لەوە دەکەن، ئێرانییەکان شۆفارێکی[57] ڕۆژئاواییان (پێدەچێ ئاژانێکی MI6ی بەریتانی بێ) لە دامەزراوەکە گرتبێ، کە سەرقاڵی زانیاری کۆکردنەوە بووە، بۆیە ئەوان بنکەی دامەزراوەی قومیان بۆ جیهان ئاشکرا کردبێ، تا خۆیان لە هەراسانی هەواڵەکە بدزنەوە.

هەر مانگێکیش دوای ئەوە، «لیۆن پانێتا» بەڕێوەبەری سی ئای ئەی بە تایمزی ڕاگەیاند، کە سێ ساڵ دەبێ ڕێکخراوەکەی بە پرسی دامەزراوەی قوم دەزانێ و ئیسرائیلییەکانیش دەستیان لە ئاشکراکردنەکەدا هەبووە.

ئاشکرابوونی دامەزراوەی قوم ڕێگەی خۆشکرد، هەر سێ هاوپەیمانی نهێنی: سی ئای ئەی، MI6 و مۆساد بەیەکەوە گروپێک بۆ شەڕ دژی ئێران پێکبهێنن. بەگوێرەی سەرچاوە فەرەنسییەکان هەر سێ دەزگە ناوبراوەکە بەیەکەوە دەستبەکاربوون، لەڕێی مۆساد ئۆپەراسیۆنەکانیان لەنێو ئێراندا کرد، سی ئای ئەی و هەواڵگری بەریتانیش هاوکاری ئیسرائیلیەکان بێ. لە ئۆکتۆبەری ٢٠١٠دا مۆساد بەرپرس بوو لە چەندین تەقینەوە، کە بە هۆیەوە هەژدە تەکنیکاری ئێرانی لەسەر شاخی زاگرۆس کوژران کە لەیەکدانی مووشەکی شەهاب لەوێ کۆیکردبوونەوە. بە یارمەتی هاوپەیمانە بەریتانی و ئەمریکاییەکان، مۆساد توانی پێنج زانای ناوەکی دیکەی ئێرانی لەناوبەرێ.

---

[57] شۆفار: جاسوس، سیخوڕ، سۆسەکار

هاوپەیمانیەتییەکە بە شێوەیەکی فرەوان بە هەوڵ و تەقەللای «داگان» دروستبوو. لەو کاتەی ئەو بووە بەڕێوبەری مۆساد، ئەو گوشاری دەخستە سەر پیاوەکانی تا هاوکاری دەزگە هەواڵگرییە بیانییەکان بکەن. یاریدەدەرەکانی ڕاوێژیان بۆ دەکرد کە زانیارییەکان بۆ دەزگە هەواڵگرییە بیانییەکان ئاشکرا نەکا، بەڵام ئەو بە ڕوویاندا تەقییەوە و دەیگوت: "ئەمە قسەی پڕوپوچە." بە گرژییەوە فەرمانی دەردەکرد؛ "دەی بڕۆن، بڕۆن کاریان لەگەڵدا بکەن."

لەپاڵ بەریتانی و ئەمریکیەکان، «داگان» هاوپەیمانییێکی گرنگی دیکەی لەنێو خودی ئێرانەوە هەبوو: ئەویش سەرکردە بەرهەڵستکارەکانی ئێرانی بوون. لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانی نائاسایی لە دەرەوەی ئێراندا، سەرکردەکانی ئەنجوومەنی نیشتمانی ئێرانی بۆ بەرهەڵستکاری ناوی ئەو زانایانەیان ئاشکرا کرد کە بەرپرسی پرۆژەی ئێرانییەکان بوو. لەمێژیش بوو ناسنامەی زاناکان بەنهێنی شاردرابووە. «موحسن فەخریزادە»[58] ی تەمەن چل و نۆ ساڵ، پرۆفیسۆرێکی فیزیای زانکۆی تاران بوو. ئەو بەخۆی دەگوت، دەبێتە پیاوێکی تەلیسم و نادیار. ڕێکخراوە بەرهەڵستکارەکان زۆر زانیارییان دەربارەی پیاوەکە ئاشکراکرد، بە ئەندامێتییەکەشەوە لەنێو سوپای پاسداراندا، هەر ئەوکاتەی تەمەنی هەژدە ساڵی بووە، هەروەها ناونیشانی ماڵی لە شەقامی محەللەتی لە تاران و ژمارەی پاسپۆرتی ٠٠٠٩٢٢٨ و ٤٢٢٩٥٣٣ و ژمارە تەلەفۆنی ماڵەکەشی ٠٢١٢٤٤٨٤١٣. «فەخری زادە» شارەزابوو لە پێواژۆی ئاڵۆزی پەیداکردنی تەوژمێکی کوشندە لەنێو ئامێری ناوەکییدا تا زنجیرەیەک کاردانەوە بێنێتە کایە و تەقینەوەی ناوەکی لێ پەیدابێ. تیمەکەی ئەو

[58] Mohsen Fakhri Zadeh

لەسەر بچووکردنەوی شێوەی بۆمبێک کاری دەکرد کە لەگەڵ هەڵدانی موشەکی شەهابدا بگونجێ.

بەگوێرەی ئەو زانیاری ئاشکراکردنانە، ئەو ڕێگەی پێنەدەدرا بچێتە نێو خاکی ئەمریکا و یەکێتی ئەورووپا، هەروەها حیساب بانکیشی لە ڕۆژئاوا سڕکرابوو. بەرهەڵستکاران بەوردی کار و چالاکییەکانی ئەویان باسکردبوو، ناوی ئەو زانایەشیان دابوو کە لەگەڵ ئەودا کاریان دەکرد لەگەڵ ئەو تاقیگە نهێنییەی تێیدا دەستبەکاربوون. ئەو فرە زانیارییانە و ڕێگەی گواستنەوەیان وای لە مرۆڤ دەکرد بڕوا بەوە بهێنێ، کە دیسان دەزگەیەکی هەواڵگری نهێنی گومانی ئەوەی لێدەکرێ بە حوکمی ڕاوەدوونانی ڕۆژئاواییەکان بۆ کارنامەکەی، بە وریاییەوە ڕاستییەکان سەبارەت بەزانا ئێرانیەکان کۆبکاتەوە و بیداتەوە بە بەرهەڵستکارە ئێرانیەکان، بۆ ئەوەی ڕەوانەی ڕۆژئاوایان بکا. ئەو ئاشکراکردنانەش ئاماژە ئاگادارکردنەوەیەکە بەوەی ئەو کەسەی داهاتووی لیستی تیرۆرکردنە و دنەی ئەوەی بدرێ[59] بۆ ئەوەی خێرا بجووڵێ یان باشترین بژاردەی لێبگرێ بەوەی بۆ ڕۆژئاوا نەرم بێ.

ژەنەڕال عەلی ڕەزا ئەسغەری[60]، جێگری پێشووی وەزیری بەرگری، لەکاتێکدا لە ٢٠٠٧دا بەناو ئیستەمبولدا لەگەشتدا بوو، ونبوو. ئەو بە قووڵی دەستی لە پڕۆژەی ناوەکییەکەدا هەبوو. دەزگەی هەواڵگری ئێرانی هەموو شوێنێکی بۆ گەڕا، بەڵام نەیاندۆزیەوە. نزیکەی چوار ساڵ دوای ڕووداوەکە، لە یانیوەری ٢٠١١دا، «عەلی ئەکبەر سەلاحی»، وەزیری دەرەوەی ئێران لە کۆمەڵەی گشتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکاندا

[59] دنەدان: هاندان.

[60] Ali Reza Asgari

پەنجەی تاوانی بۆ مۆساد درێژکرد بەوەی کابرای تایینیان[61] ڕفاندبێ و لە ئیسرائیل زیندانییان کردبێ.

بەگوێرەی سەندەی تێلێگرافی لەندەنیش، ئەسغەری لە ڕۆژئاوادا بیندراوە؛ مۆساد نەخشەی هەڵگەرانەوەکەی کێشاوە و هەر لە تورکیاوە لە پاراستنی بەرپرسیار بووە. سەرچاوەکانی دیکەش باسیان لەوەکرد، ئەو لای سی ئای ئەی بووە و زانیاری بایەخداری سەبارەت بە بەرنامەی ناوەکی ئێرانی داوەتێ.

مانگێک دوای بێسەروشوێنبوونی ئەسغەری - لە مارتی ۲۰۰۷دا -، ئەفسەرێکی دیکەی پلەپاڵای ئێرانی ون بوو. ئەمیر شیرازی کە لەنێو یەکەی "ئەلقودس"ی یەکەی دەستەبژێری سوپای پاسداران بوو، بەرپرس بوو لە ئۆپەراسیۆنەکانی دەرەوەی ئێراندا. سەرچاوەیەکی ئێرانی بۆ تایمزی لەندەنی ئاشکرای کرد، کە سەرباری سەر و سۆراغنەمانی ئەسغەری و شیرازی، ئەفسەرێکی پلەباڵای دیکە ون بووە، ئەویش محەمەد سوڵتانی، فەرماندەی سوپای پاسداران بوە لە کەنداوی فارسیدا.

لە تەمموزی ۲۰۰۹شدا «شەهرام ئەمیری»، زانای ناوەکی چووە لیستی هەڵگەڕاوەکان. «ئەمیری» لە قوم کاریدەکرد، لە عەرەبستانی سعوودیدا لەکاتی سەفەری حەج بۆ مەککە نەگەڕایەوە و دیارنەما. ئێرانییەکان داوایان کرد کە دەبێ سعوودیەکان بەدوایدا بگەڕێن و بیدۆزنەوە. دوای چەند مانگێکی دیکە، ئەمیری لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا سەری هەڵدایەوە. وەها باسدەکرا گوایە زانیارییەکانی بە پێنج ملیۆن دۆلار فرۆشتبێ و بە ناسنامەیەکی دیکە و لە ماڵێکی نوێ لە ئاریزۆنادا بژیێ. سەرچاوەکانی سی ئای ئەی ئەوەیان ئاشکراکرد، کەوا کابرا دەمێک ساڵە

---

[61] کابرای تایین: کابرای گۆرینێ، کابرای جارەکەی پێشوو، کابرای ناوبراو.

کاریان لەگەڵدا دەکا و زانیاری نهێنی دەستی یەکەمی داوەتە دەزگەکە. ئەمیری ئەوەی ئاشکرا کرد، کەوا زانکۆی مەلەک ئەشتار[62] بۆ تەکنەلۆژیا، کە تیایدا دەرسی دەدایەوە، وەک ئەکادیمیایەک بۆ ڕووپۆشی یەکەیەکی لێکۆڵینەوە کە تایبەتە بە دیزاینی دروستکردنی مووشەکی دوورهاوێژ و فەخریزادەش بەرپرسی زانکۆکەیە.

دوای ساڵێک مانەوە لە ئەمریکا، ئەمیری ڕای خۆی گۆڕی و بڕیاریدا بگەڕێتەوە ئێران. پێدەچوو لەگەڵ ئەو سترێسی ژیانی نوێیە هەڵنەکا. لە ڤیدیۆیەکی دەستکرد کە خۆی لە ئەنتەرنێت بڵاویکردەوە، تێیدا گوتبووی، کەوا لەلایەن سی ئای ئەیەوە ڕفێندراوە، چەند سەعاتێکی دیکە ڤیدیۆیەکی دیکەی بڵاوکردەوە، گوتنەکەی پێشووی ڕەتکردبووەوە، پاشان ڤیدیۆی سێهەمیشی بڵاوکردەوە، ئەم جارەیان گوتنەکەی دووەمی بە درۆخستبووەوە. ئەو پەیوەندی لەگەڵ باڵوێزخانەی پاکستانی پەیداکردبوو، کە لە ئامریکا کاروباری باڵوێزخانەی ئێرانی بەڕێوەدەبرد. داوایکردبوو بینێرنەوە ئێران. پاکستانییەکانیش یارمەتیان دا. ئەوەبوو لە تەمموزی ٢٠١٠دا، ئەمیری لە فڕۆکەخانەی تاران دابەزی. لەوێ لەبەردەم ڕۆژنامەوانان بەدەرکەوت، سی ئای ئەی بەوە تاوانبارکرد کە ڕفاندوویانە و بەدڕەفتارییان لەگەڵدا کردووە ئینجا بزربوو. چاودێرانیش شکستییەکەی سی ئای ئەیان شەرمەزارکرد، بەڵام وتەبێژی سی ئای ئەی بێدەنگییەکەی شکاند: "ئێمە زانیاری گرنگمان دەستکەوت و ئێرانییەکانیش ئەمیری؛ کەواتە لێرەدا کێ باشترین سەفقەی دەستکەوتووە؟"

لەو نێوەدا ئێرانییەکانیش دژەکردار نەبوو بەرانبەر مۆساد. لە دیسێمبەری ٢٠٠٤دا، ئێران چەند کەسێکی بە تۆمەتی سۆسەکاری بۆ ئیسرائیل و

---

[62] Malek Ashtar

ئەمریکا دەستگیرکردن؛ سێ لەو کەسانە لەنێو دامەزراوە ناوەکییەکاندا کاریان دەکرد. لە ٢٠٠٨یشدا، ئێرانییەکان ڕایانگەیاند کەوا دەمامکیان لەسەر شانەیەکی دیکەی مۆساددا هەڵداوەتەوە: سێ هاووڵاتی ئێرانی کە لە لایەن مۆسادەوە مەشقیان پێدراوە تا لە کاری ئامێرە پەیوەندیە زۆر ئاڵۆزەکاندا، لە چەک و لە تەقەمەنیدا بەکاریان بێنێ. لە نۆڤێمبەری ٢٠٠٩، ئەوان «عەلی ئەشتاری»[63]ی تەمەن چل و سێ ساڵەیان لە دار دا، کە بە شۆفاریکردن بۆ ئیسرائیل تاوانبارکرابوو. لەمیانەی دادگاییکردنەکەیدا، ئەو دانی بەوەدا نابوو، گوایە ئەورووپا چاوی بە سێ ئاژانی مۆساد کەوتووە و پارە و کەلوپەلی ئەلەکترۆنیان داوەتێ. "کەسانی ناو مۆساد لە منیان خواست، بارێکی کەشتی مارکەی باش لە کۆمپیوتەر و کەلوپەلی ئەلکترۆنی بۆ دەزگەی هەواڵگری ئێرانی بکڕم و دەزگەی سووسەکاری گوێهەڵخستنیش لەنێو ئەو ئامێرانەدا داندرابوو کە من دەمکڕین." ئەمە گەواهینامەکەی ئەشتاری بوو.

لە ٢٨ی دیسێمبەری ٢٠١٠ و لە مەیدانی زیندانە بەدناوەکەی «ئەڤین»[64] لە تاران، ئەفسەرە ئێرانییەکان سیخوڕێکی دیکەیان لەسێدارەدا، ئەمجارەیان «عەلی ئەکبەر سیادات» بوو؛ کە بەهاوکاریکردنی مۆساد تاوانبارکرابوو، زانیاری سەبارەت بە توانا و لێهاتوی سەربازی و بەرنامەی مووشەکی سوپای پاسدارانی دابووە دەزگە هەواڵگریەکە. لەو شەش ساڵانەی ڕابردووشدا، «سیادات» لە تورکیا، تایلەند و هۆڵەندا چاوی بە ئاژانە ئیسرائیلییەکان کەوتبوو، لەوانەوە و لەهەر کۆبونەوەیەکدا بڕی ٣٠٠٠ تا ٧٠٠٠ دۆلاری وەرگرتبوو. کاربەدەستە ئێرانییەکان بەڵێنیاندا؛ گرتن و لەسێدارەدانی زیاتر بەڕێوەیە.

---

[63] Ali Ashtari

[64] Avin

بەڵام ٢٠١٠ ساڵی گەورەترین پاشەکشەی بەرنامەی ناوەکی ئێرانییەکان بوو. تۆ بڵێی ئەمە بەهۆی کەموکورتی زۆری پارچە یەدەگی کەلوپەل و تفاقی ئێرانیەکان نەبووبێ؟ ئایا ئەوە بەهۆی ئەو پارچە و یەدەگە لەکارکەوتوانەوە نەبوو، کە کۆمپانیا دەمامکدراوەکانی مۆساد بە ئێرانییەکانیان فرۆشتبوون؟ ئایا لەبەر کەوتن و تێکشکاندنی فڕۆکەکان، تاقیگەکان بووە کە ئاگریان تێبەربووە؟ ئایا لەبەر تەقینەوەی مووشەکەکە دوورهاوێژەکان و بنکە توانستەکانی ناوەکی بووە؟ ئایا لەبەر یاخیبوونی ئەفسەرە پلەباڵاکانەوە بووە، یان لەبەر مردنی زاناکانەوە، ئایا لەبەر شۆڕشی کەمایەتییەکانەوە بووە؟ ئایا ئەو هەموو بەڵگە و دیاردانە کە ئێران (ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ) پەنجەی بۆ کەسەکانی «داگان» درێژدەکرد، بەو هۆیەوە بووە؟

## بەندی سێ: هەڵواسینەکان لە بەغدا

ئیسەر بێری بە «ئیسەری گەورە» ناسرابوو. پیاوێکی بەژندرێژی باریکەڵە و کەمە پرچێکی ماشوبرنجیشی هەبوو. برۆ چڕوپڕە ڕەشەکەی، چاوە گەورە و قووڵەکانی شاردبوونەوە؛ بە زۆریش وابوو خەندە تەوسدارەکەی لەسەر لێوە ئەستوورەکانی نەدەپچڕا. لە پۆلەندا لەدایکببوو، بە ژیانە سۆفیانەکەی ناسراوبوو، پیاوێکی خاکی هەر دڵسۆزی لێدەتکا، کەچی نەیارەکانی دەیانگوت، کەسێکی ترسناک و شێتئاسا هەڵوەدای گەورەییە. کابرا بۆ ماوەیەکی بەردرێژ ئەندامی ڕێکخراوی «هاگانا» بوو، ئیسەری گەورە لە «حەیفا» بەڕێوبەری کۆمپانیایەکی تەلارسازی بوو. ئەو کابرایەکی تەنیاخواز، کڕ و بێدەنگ و ناکۆمەڵایەتی بوو، بەخۆی و ژن و کوڕەکەی لە خانووێکی بچکۆلانە لە گوندێکی سەر کەنار لە «بات گالیم»دا دەژیا.

کەمێک بەر لە دامەزراندنی ئیسرائیل، لە لایەن فەرماندەکانی هاگاناوە بێری بە بەرپرسی «شای» داندرا. کاتێکیش سەربەخۆیی لە ١٤ی ئایاری ١٩٤٨دا جاڕدرا، لە هەر چوارلای دراوسێوە پەلاماری دەوڵەتە ساواکە درا، ئیدی «بێری»ش بووە سەرۆکی دەزگەی هەواڵگری نهێنی سەربازی وڵاتە تازە لەدایکبووەکە. پێشتر «بێری» لە باڵی چەپی بزوتنەوەی کرێکارییدا چالاک بوو، پەیوەندی سیاسیانەی نایابیشی هەبوون. دۆست و برادەرەکانی پەسنی دڵسۆزییان بۆ بەرگریکردن لە ئیسرائیل دەدا. جەنگی سەربەخۆییش تا ئەپریلی ١٩٤٩دا درێژەی کێشا.

هەر دوای ئەوەی «بیری» بە بەرپرسی دەزگە نهێنییەکە داندرا، ڕووداوگەلێکی سەیر وخوێناوی -پێدەچوو پەیوەندیشیان بە دەزگەکەوە نەبووبێ- سەریانهەڵدا.

ڕۆژێکیان جووتە گەڕیدەیەک لەسەر کێوی «کارمێل» شتێکی سامناک و تۆقێنەریان دۆزییەوە. لە قووڵایی دۆڵەکەی دامێن کێوەکەدا، تەرمێکی نیوە شاردراوەی سەیریان لەگەڵ چەند قەوانە فیشەکێک بینی. تەرمەکە هی سووسەکارێکی عەرەبی سەر بە دەزگەکە بوو، ناویشی «عەلی قاسم» بوو. بکوژەکەی هەوڵیدابوو تەرمەکە لەوێ گۆڕەوشار بکا. چەند هەفتەیەک دواتر لەگەڵ بنگۆریۆنی سەروەزیردا، ئیسەری گەورە کەسێکی بە ناوی «ئابا هوشی»، کە سەرکردەیەکی دەسترۆیشتووی «ماپای» حیزبەکەی بنگۆریۆن بوو، بەوە تاوانبارکرد کە ناپاکە و بۆتە ئاژانێکی بەریتانی. بنگۆریۆنیش بە هەواڵەکە ماهی ما[65]. ئاخر بەریتانیای گەورە بەر لە دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل لە فەلەستین دەسەلاتدار بوو؛ «هاگانا»ش خەباتێکی ژێرزەمینی دژی ئەو ڕێسا و قانونانە دەکرد، کە ژیانی کۆمەڵگەی جوولەکەیان لەوێدا تەنگەتاوکردبوو. جار لەسەر جاریش دەزگەی هەواڵگری بەریتانی تێکۆشابوو، بەڵکو شۆفار لەنێو ڕیزی سەرکردەکانی جوودا بچێنێ. بەلام (ئابا هوشی)، ئەو کۆڵەگەیەکی کۆمەڵگەی جوو، ئەو سەرکردە کاریزمایەی کرێکارانی حەیفا، ناپاک دەرچێ؟ قسەکە پێدەچوو نەکردە بێ[66]؟ سەرەتا سەرکردە جووەکان بە توڕەیی و دەهریبوونێکەوە ئەو تاوانبارکردنەی «بیری»یان ڕەتکردەوە. بەلام «بیری» دوو برووسکەی باوەڕپێکراوی لە لایەن هەواڵگری بەریتانیاوە لە دەزگەی پۆستە و گەیاندنی حەیفا لە ئایاری ١٩٤٨دا

[65]ماهی: بەدوو واتا دێ: ١- حەیران و سەرسام، دووەم شاخێکی عاسێ کە وەک پشتی ماسی بێ.

[66] نەکردە: مەحاڵ، موستەحیل.

دۆزینەوە. ئەو برووسکەکانی خستنە سەر مێزی بنگۆریۆن، گوایە بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگری ناپاکێتی «هوشی»یە.

لە هەمان کاتیشدا، «بێری» فەرمانی گرتنی برادەرەکەی «هوشی»، واتە «یولیوس ئامستەر»ی دەرکرد. «بێری»، «ئامستەر»ی بردە شۆراوێکی خوێی لە «ئاتلیت» لە دەرەوەی حەیفا، لەوێدا بۆ ماوەی شەش ڕۆژی ڕەبەق ئازار و ئەشکەنجەدا، فشاری خستەسەر بەڵکو دان بەوەدا بنێ، کەوا «هوشی» ناپاکێکی قێزەونە. هەرچی ئامستەریش بوو ڕەتیکردەوە لەبن ئەو بارەدا وابکا، لە کۆتاییدا وەک پیاوێکی تێکشکاو ئازادکرا. ددانەکانی نەمان، قاچەکانی هەموو برین بوون، جێشوێنی برینی پێوە بوو، بۆ ماوەی چەندین ساڵانیش لەسێبەری خۆی دەترسا.

لە ٣٠ حوزەیران ١٩٤٨دا و لەو کاتەی «مایەر توبیانسکی» کە کاپتنێکی سوپا بوو، لە دوکانەکانی تەلئەبیب بازاڕی خۆی دەکرد، گیرا و بردرایە «بێت جیز» کە گوندێکی عەرەبان بوو، تازە دەستی بەسەرداگیرابوو. لەلایەن هەواڵگری سەربازییەوە گومانی ئەوە هەبوو، گوایە «توبیانسکی»، لەو کاتەی لە ئۆرشەلیم بوو، زانیاری زۆر نهێنی دابێتە بەریتانیەکان و ئەوانیش بە دەوری خۆیانەوە ئەو زانیارییانەیان دابێتە لیوای عەرەبی لە لەشکری ئوردنیدا. ئیدی تۆپخانەی ئوردنیش لە سایەی ئەو زانیاریانە دەستبەکاربووبێ و بەخەستی و بۆ چەندین جار ئامانجەکانی خۆی لەنێو ئۆرشەلیمدا دابێتە بەر تۆپەکانیان. لە دادگایەکی کورتدا کە کەمتر لە نیو سەعاتی خایاند، «توبیانسکی» بەوە تاوانبارکرا، شۆفاری بۆ عەرەبەکان کردووە، ئیدی تاوانبارکرا و بڕیاری مەرگی بۆ دەرچوو. هەر بەخێرایش دەستەیەکی چەکدار بڕیاری گوللەبارانکردنەکەیان لەبەردەم کۆمەڵێک لە سەربازە ئەوقماوەکانی

ئیسرائیلدا بەجێگەیاند. (توبیانسکی لەپاڵ «ئەدۆلف ئایخمان»دا تاکەکەس بوو، کە لە ئیسرائیلدا گوللەباران کرابێ.)

پاشان داواکردنی لێکۆڵینەوە لە مردن و ئەشکەنجەدانەکە سەریکێشا بۆ بکەرەکەی، کە لە «ئیسەرە» گەورەکە بەدەر، کەسێکی دیکە نەبوو.

ئەو گومانی هەبوو لەوەی «عەلی قاسم» ئاژانێکی دووسەربێ، بۆیە فەرمانی لەناوبردنی دابوو.

ئەویش «ئابا هوشی» تێوەگلاند. بەگوێرەی ڕای چەندین لێکۆڵەرەوە، ڕاستییەکە بەم جۆرە بووە، ئیسەری گەورە بەدوای هوشیەوە بوو بیخاتە داو. دەکرا لەو کردەوەیەشیدا سەربکەوێ، ئەگەر هاتبا و ساختەکارە سەرەکییەکەی دەزگەی هەواڵگرییەکە لەبەردەم بەرپرسەکەیدا دانی بەوەدا نەنابایە، کەوا ئەو بە بڕیاری بەڕێوبەرەکەی، واتە بە بڕیاری «بێری»، بروسکە پەیوەندیدارەکانی ساختە کردوون.

هەروەها خۆ هەر بێریش بوو، کە بەپەلە بڕیاری گرتن و گوللەبارانکردنی کاپتن توبیانسکی دابوو.

ئینجا تەڕدەستانە «داود بنگۆریۆن» هاتەسەر سەخت. بێری لە لایەن دادگایەکی سەربازی، پاشان دادگایەکی مەدەنی لێپێچرایەوە و پلە سەربازیەکەی لێسەندرایەوە و لە ڕیزەکانی سوپای بەرگری ئیسرائیلیش دەرکرا و بە کوشتنی عەلی قاسم و مایەر تیوبیانسکیش تاوانبارکرا.

بە مەش سەرکردە ئیسرائیلییەکان سەریان سوڕما. پێدەچوو ئەو شێوازە کارەی «بێری» ڕاستەوخۆ لە کارە ناقۆلاکانی «کەی گی بی»ـەوە وەرگیرابێ، لەوەی کەسایەتییێکی بەد، بڕیاری ساختەکردنی بەڵگەنامە،

ئەشکەنجەدان و کوشتن پەیڕەوبکا، ئەمەش پێچەوانەی بنەمای ڕەوشت و بنەماکانی مرۆڤایەتی بوو، کە دەوڵەتی ئیسرائیلی لەسەر ڕۆندرابوو.

گۆبەندەکەی «بێری» جێشوێنێکی قێزەونی لەسەر دەزگەی هەواڵگری نهێنیدا بەجێهێشت و بە شێوەیەکی قووڵیش بەسەر پەرەسەندنەکەی کارانگاز[67] بوو. خۆ ئەگەر لە کاتی جەنگدا، سەرکردە مەدەنییەکان خۆیان لە شەرمەزارکردنی «بێری» بە دوورگرتبێ، دەبوایە دەزگەی هەواڵگری ئیسرائیل کاراکتەرێکی تەواو جیاوازی نیشاندابوایە. دەبوو هاوشێوەی ڕێکخراوێکی وەک کەی گی بی، کە ساختەکاری، ئەشکەنجەدان و کوشتن لە کارە ڕۆتینییەکانی ڕۆژانەیان بوایە. بەڵام لە جیاتی ئەوەدا، شێوازەکانی «بێری» قەدەغەکران. دەزگە هەواڵگرییە نهێنیەکە دەسەڵاتی خۆی سنووردارکرد و ئۆپەراسیۆنە داهاتووەکانی خۆی لەسەر بنەمای ڕەوشت ڕۆنا تا مافەکانی تاکی تێدا مسۆگەر بکرێ.

بە لاچوونی «بێری»ش، پیاوێکی دیکە هاتە مەیدانی جیهانی سێبەری ئیسرائیل، ئەویش تەواو پێچەوانەی جەمسەربەندییەکەی «بێری» بوو، پیاوەکەش «ڕێوڤن شیلواهـ»[68] بوو.

✡ ✡ ✡

«ڕێوڤن شیلواهـ»ی تەمەن چل ساڵە، قسەنەرم، نهێنیپارێز، پیاوێکی تەلیسماوی بوو. ئەو سەر بە کلتوورێکی دەوڵەمەند بوو، مێشکێکی تیژ و شرۆڤەکارانەی هەبوو، زانیاری قووڵی لەسەر ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و عەرەب هەبوو، ئاشنای دابوونەریتەکانیان، هاوپەیمانێتیە

[67] کارانگاز: موتەئەسیر.

[68] Reuven Shiloah

کورتخایەنەکانیان و کێشە و ململانێ خوێناوییەکان بوو. لەو کاتەی وەک ڕاوێژکارێکی سیاسی بنگۆریۆن کاریدەکرد، یەکێ لەو کەسانەی پێیەوە سەرسامبوون بە "پاشای گەمەی شەترەنجی بنگۆریۆن"ی وەسفکرد. هەندێکیش بە کاردینالە فیڵبازەکەی «شیلو»ی فەڕەنسیان بەراورد دەکرد؛ ئەوانی دیکەش وەک مانۆرچییێکی هەستیار و تەڕدەست، گەمەزان، ئەو پیاوەی کە دەزانێ چۆن لەپشت پەردەدا داوەکان ڕابکێشێ، لەقەڵەمیان دەدا. «شێلواهـ» لە تەمەنی ژیانی خۆیدا لە ئەرک و کاری نهێنی و دەمامکدراودا کەسێکی کارابوو.

«شیلۆاهـ»، کابرایەکی بڕوابەخۆ و شارستان و کوڕی ڕابای، لە ئۆرشەلیمە دێرینەکە لەدایکببوو. هەمیشە جلوبەرگی پۆشتە و فەرمییانەی دەپۆشی. ئەو گەنجە قۆز و کەشخە، بە ماوەیەکی زۆر و بەر لە دروستبوونی دەوڵەتەکە، بە ئەرکێک ڕەوانەی بەغدا کرا. سێ ساڵان لە بەغدا مایەوە، خۆی وەک ڕۆژنامەنوس و مامۆستا نمایشکرد و لە بارودۆخی سیاسی وڵاتەکەی کۆڵیەوە. لەماوەی جەنگی دووەهەمی جیهانیشدا، لەگەڵ بەریتانییەکان کەوتە دانوستان بۆ ئەوەی بەریتانییەکان بەتالیۆنی جووەکان وەک هێزێکی تێکدەر لە ئۆپەراسیۆنەکان لە ئەورووپای ژێردەستی نازییەکان بەکاربهێنێ. بەم جۆرە توانی دوو یەکەی کۆماندۆی تایبەتی جووەکان دروستبکا: یەکێکیان بەتالیۆنێکی ئەڵمانی بوو، کە بە چەک و بەرگی سەربازی ئەڵمانی بوون، ئازایانە چالاکی و ئەرکەکانیان لەودیو هێڵەکانی دوژمنەوە، لە ئەورووپا ئەنجام دەدا، یەکەی دیکەش، بەتالیۆنێکی عەرەبی بوو، لەو کەسانە پێکهاتبوو کە زمانی عەرەبییان باش دەزانی وەک عەرەبیش خۆیان نمایشکرد، بەجۆرێک ڕاهێندرابوون کە لە قووڵایی خاکی عەرەبدا چالاکی بنوێنن. هەروەها لەوەشدا سەرکەوت کە بەریتانییەکان قایلبکا، جووە

خۆبەخشەکانی فەلەستین وەک پەرەشووتوان لەگەڵ سوپای بەریتانیا ڕێکبخا، تا لەناوچە داگیرکراوەکانی ئەورووپادا، یاخیبوونی جووەکان دژی نازییەکان ڕێکبخەن. «شیلواهـ» یەکەمین کەس بوو کە پەیوەندی لەگەڵ OSS (نووسینگەی دەزگەی ستراتیژی)، کە دواتر دەزگەی سی ئای ئەی لێ دروست بوو، سازبدا. لە ئانوساتی بەر لە جەنگی سەربەخۆییدا، ئەو بە نهێنی گەشتی بەنێو پایتەختە عەرەبییەکاندا کرد و سەرکەوتووانەش نەخشە و پلانی دەقاودەقی هێرشی عەڕەبەکان بۆسەر وڵاتەکەی، بۆ ئیسرائیل هێنایەوە.

«شیلواهـ» وەک هێزێکی بەرهەڵستنەکراو پێویستی بەوەبوو، لەژێر بەرگێکی ئەستووری نهێنییەوە بجووڵێتەوە تا بێتە سەرچاوەیەکی ئەفسانەیی شایستە. جارێکیان برادەرێکی نوکتەیەکی لەدوا هەڵبەستبوو. ڕۆژێکیان تاکسیەکی ڕاگرت. شوفێرەکەش لێیپرسی: "بەرەو کوێ؟" شیلواهیش وەڵامی دایەوە: "ئەمە شتێکی نهێنییە."

لەماوەی جەنگی سەربەخۆییدا، «شیلواهـ» بەرپرسی دەزگەی زانیاری سیاسیی دەرەکی بوو. ئەمەش یەکێک بوو لەو چەند گرووپە هەواڵگرییە نیمچە سەربەخۆییانەی کە بەر لە لەدایکبوونی دەوڵەتەکەوە دروستکرابوون. بەڵام لە ١٣ی دیسێمبەری ١٩٤٩دا، بنگۆریۆن فەرمانێکی بە دروستکردنی "دەزگەیەک (بە زمانی عیبری مۆساد) دەرکرد بۆ ئەوەی ئاژانسە هەواڵگریەکان ڕێکبخا" و سەرپەرشتییەکەشی بدرێتە دەستی «ڕێوڤن شیلواهـ».

هێشتاش دوو ساڵی دیکەی لە دواخران و مشتومڕ و قڕەوکێشە خایاند، تا مۆساد وەک دەزگەیەک هاتە ئارا. ئەوێ دەمێ یەکەیەکی هەواڵگری هەبوو هۆبەی سیاسی بوو، ئەندامەکانی هەواڵی سیاسی دەرەوەیان کۆدەکردەوە، حیسابێکی دەستکراوەییان لەبەردەستدابوو، ژیانێکی

باشیشیان هەبوو، کاتێ زانییان دەزگەیەک لەنێو وڵات بەناوی مۆساد دروست دەبێ، هەڵگەڕانەوە و نەیانویست چیدی لەسەر کاروباری سیخوڕیکردن بۆ ئیسرائیل بەردەوامبن. دوای ئەوەی سەرزەنشتکران و زۆربەشیان لەسەر کار لادران، «شیڵواهـ» توانی مۆساد دروستبکا.

لەدواییدا ناونیشانەکە بووە پەیمانگە بۆ هەواڵگری و ئۆپەراسیۆنە تایبەتەکان و دروشمەکەشیان ئەو قسە نەسەتەقەی بایبل ژمارە ١١:١٤ بوو کە دەڵێ: "بەبێ نەخشە و ڕێنوێنێ گەل دەکەوێ و باشترین فریادڕەسیش ڕاوێژە بە ئاوەز."

بەڵام خۆ نە ناونیشانەکە و نە دروشمەکە مۆسادی نەکردە شتێکی بێوێنە. «شیڵواهـ» مکوڕبوو لەسەر ئەوەی ئایندەیەکی ناوازەی بداتێ. ئاخر مۆساد هەر بەتەنیا نەبووە باسکە درێژەکەی ئیسرائیل، بەڵکو بووە باسکە درێژەکەی سەرجەم گەلی جوو. لە کۆبونەوەی لەگەڵ ئەو کەسە مارانەی[69] هاتبوونە ڕیز دەزگەکەی، شیڵواهی ڕامساد[70] ڕایگەیاند: "لەپاڵ هەموو ئەو کردەوانەی دەزگەی نهێنیدا، ئێمە ئەرکی سەرەکی دیکەمان لە ئەستۆ دایە، ئەویش پاراستنی گەلی جووە، ئەوسا لەهەر شوێنێک بن دەبێ ڕێی کۆچکردنیان بۆ ئیسرائیل ڕێکبخەین." هەر بەڕاستیش لەو ساڵانەی بەدوایدا هاتن، مۆساد بە نهێنی یەکەی بەرگری لەخۆکردنی لەو شوێنانە دامەزراند کە مەترسی قڕکردن و لەناوبردن لەسەر کۆمەڵگەکانیان هەبوو، وەک قاهیرە، ئەلئەسکەندەریە، دیمەشق، بەغدا و هەندێ شارەکانی خوارووی ئەمریکا. گەنجە جووەکان بە شێوەیەکی

[69] مارە: یەکەم، پێشەنگ. لە یاری کەلایانێ (ماتانێ)دا ئەو کەسەی یەکەمجار نۆرەی دێ، بە مارە دادەندرێ، منیش وشەکەم بە جوان و پڕبەپێست زانی.

[70] لەبەندی پێشوو باسکراوە کەوا ڕامساد وشەیەکی عیبرییە، واتە سەرۆکی مۆساد. وەرگێڕ.

نهێنی دەهێندرانە ئیسرائیل و لەلایەن مۆساد و سوپاوە مەشقیان پێدەدرا، چەکیان بۆ بەقاچاغ ئاودیوی وڵاتە دوژمنەکانیان دەکرا و حەشاردەدرا، یەکەی بەرگری لەنێو کۆمەڵگە جووە خۆجێیەکان ڕێکدەخرا بۆ ئەوەی لەکاتی پەلاماری ئاپۆرای گێرەشێوین و باندی چەکداری ناڕێکخراوەوە لەسەرپێ بن، هەر هیچ نەبێ ئەم کارانە بکەن و بەرگەبگرن تا ئەو کاتەی یارمەتی هێزەکانی حکومەت یان ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکانیان دەگاتێ.

لە پەنجاکانیشدا، مۆساد دەیان هەزار جووە هەڕەشەلەسەرەکانی لە وڵاتە عەرەبییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و مەراکشی گەیاندنە ئیسرائیل، دواتریش لە هەشتاکانیشدا هەر دیسان مۆساد بوو بە هاواری قوتارکردنی ئەو جووانەوە چوو، کە گیرۆدەی دەستی ئێرانی خومەینی بوون و کۆڕەوی جووەکانی ئەسیوپیاشی گەیاندە وڵات. بەڵام لە میانەی یەکەمین ئۆپەراسیۆنی بێ پاڵپشت (دانەپۆشراو) لە عێراقدا، کارەساتی لێکەوتەوە.

✡ ✡ ✡

لە بازاڕە گەورەکەی «ئۆرزدی باک»ی بەغدا، لەسەر شەقامی ڕەشید، گەنجێک بەناوی (ئەسعەد) بۆینباخی بەرانبەرەکەی ڕێکدەخست. ئەسعەد پەنابەرێکی فەلەستینی بوو، دوای شەڕی عەککا و دوای ئەوەی سوپای ئیسرائیل شارەکەی داگیرکردبوو، وڵاتەکەی خۆی بەجێهێشتبوو. بە ماوەیەکی کورتیش، بەرلەوەی ئیسرائیل بەجێبێڵێ، چاکەیەکی لەگەڵ ئامۆزاکەی کردبوو، کە لەناو جێگا نەخۆش کەوتبوو. چاکەکەش ئەوەبوو، لەجێگەی ئەو لە قاوەخانەیەک لە نزیک دامەزراوەیەکی سەربازی وەک گەرسۆن (بۆی) کاریکردبوو. بۆ ماوەی هەفتەیەک ئەسعەد لە دالانی ئەو دامەزراوە سەربازییەدا دەهات و دەچوو، سینی پڕ لە کوپی قاوەی ڕەش و تۆخی تورکی بۆ ئەفسەرەکانی سوپای ئیسرائیلی دەگێڕا. ئێستاشی

لەگەڵدا بێ هەندێ سەروسەکوتی[71] ئەو ئەفسەرانەی ئەوێ ڕۆژێی هەر لەبەرچاوە.

ڕۆژی ٢٢ ئایاری ١٩٥١ بوو، بینی کڕیارێک لەو بازاڕەی کاری تێدادەکرد دەسووڕێتەوە، ڕووخساری کابرای ناسییەوە. سەرەتا بیری کردەوە، نابێ و ناکرێ وابێ؛ تۆبڵێی ئەو بێ؛ ئاخر ئەمە شتێکی نەکردەیە! بەڵام خۆ ئەو پیاوەی بینی، ناسیەوە، خۆ کاتی خۆی وەک ئەمڕۆ کابرا تیشێرتێکی هاوینە و پانتۆڵێکی لەبەردانەبوو، بەڵکو جلێکی خاکییانەی سەربازی لەبەردابوو. ئەسعەد بەلەخۆڕاپەرموونەوە زەنگی هۆشداری بۆ پۆلیس لێدا. "ئەز ئەفسەرێکی ئیسرائیلیم بینی! بەڵێ لێرە لە بەغدا!"

پۆلیسیش دەستبەجێ پیاوە شێوە ئەورووپیەکەیان دەستگیرکرد، کە لەگەڵ پیاوێکی باریکەلەدا، کە بە ئاسانی نەدەناسرایەوە، جوییێکی عێراقی چاویلکەلەچاو بوو. ناوەکەشی «نەسیم موشێ» بوو. کابرا ڕایگەیاند کەوا کارمەندێکی مەدەنی مەڵبەندی کۆمەڵگەی جووەکانە. "من دوێنێ لە ئاهەنگێکدا ئەو گەشتیارەم بینی،" ئەو وای بۆ دەزگەی پۆلیس ڕوونکردەوە، "داوای لێکردم بازاڕی نیشانبدەم." کاتێکیش ئەوانیان گەیاندنە بارەگای سەرەکی پۆلیس، دەستبەجێ هەردوو پیاوەکانیان لەیەک جیاکردنەوە. لێکۆڵەرە عێراقییەکە بێویژدانانە «موشێ»ی پرسیارکوت کرد، ویستی زانیاری سەبارەت بە ناسنامەی کەسە ئیسرائیلییەکەی لێوەربگرێ. موشێش هەر دەستی بە چیرۆکەکەی خۆیەوە گرت: هەر تەنیا دوێنێ ئەو گەشتیارەی بینیوە و نایناسێ. لە ژوورە زیندانیە تاریکەکانی بارەگای پۆلیسدا، مۆشێ بە قاچەکانی پاشان بە دەستەکانی هەڵواسرا، زۆریان لێدا و هەڕەشەی کوشتنیشیان لێکرد؛ بەڵام

[71] سەروسەکوت: ڕووخسار، بیچم.

گیراوەکە پێنەدەچوو هیچ شتێک لەبارەی کابراکەوە بزانێ و بیدرکێنێ. دوای هەفتەیەک لە ئەشکەنجەدان، عێراقییەکان بڕیاریاندا، کەوا «مۆشێ» هیچی لەگەڵ هیچ دانییە و بەریاندا.

گیراوەکەی دیکە، هەر ئەوەی دووبارە دەکردەوە، کەوا کەسێکی ئێرانییە و ناوی «ئیسماعیل سالحون»[72]ە و پاسپۆرتە ئێرانییەکەشی نیشانی لێکۆڵەرەوەکان دا، بەڵام ئەوان زیاتر ئەشکەنجەیان دا. کابرا لە ئێرانیی نەدەچوو، ئاخر هیچ وشەیەکی فارسی نەدەزانی. لەکۆتاییدا ئەویان ڕووبەڕووی ئەسعەد، ئەو گەنجە فەلەستینییەی خەبەری لێدابوو، کردەوە. گیراوەکە دواتر گوتی: "کاتێ ئەسعەدم بینی، خوێن لە دەمارەکانمدا مەیی." ئینجا ڕووخاو دانی پێدانا: ئەو یەهودا تاگەر (یودکە تاجیر)[73]ی جوولەکە و کاپتن بوو لە سوپای بەرگری ئیسرائیلیدا. دوای دانی پێدانانەکە لێکۆڵەرەوەکان گیراوەکەیان ڕاکێشایە ئەو ئەپارتمانەی لێیدەژیا، مێز و کورسیەکانیان شکاندن، دیوارەکەیان کونکرد و شتی قاچاغ و بەڵگەنامەیان لەبن چەکمەجەی خوارەوەی مێزەکەیدا دۆزینەوە.

ئەوسا مۆتەکە دەستیپێکرد و قیامەت ڕابوو. ئەوەش نەوەک هەر دەرگەی دۆزەخ لەسەر «تاگەر»دا کرایەوە، بەڵکو لەسەر تەواوی کۆمەڵگەی جوو لە بەغدا.

ئاخر چەندین ڕێکخراوی نهێنی جوولەکە و ئیسرائیلی لە بەغدا کاریان دەکرد، بە یەکە قاچاغە کۆچبەرانیشەوە، بە گرووپی داکۆکی لەخۆکردنیشەوە، لەگەڵ یەک دوو بزووتنەوەی لاوانی جوو. هەندێکیان بەر لە سەرهەڵدانی دەوڵەتی ئیسرائیلیشەوە هەبوون. لە دەوروبەری

---

[72] Ismail Salhun

[73] Yudke Tadjier

بەغداش، چەندین شتی قاچاغ، چەک و بەڵگەنامەیان داکردبوو، هەندێکیان لەناو کەنیشتە[74]ی «ماسودا شیمتۆڤ» دانابوو. سەرباری ئەو گروپانە هەندێ ڕایەڵەی سووسەکاری بە خێرایی بەر لە دامەزراندنی مۆسادەوە دروستببوون، ئەوان لەنێو خۆیاندا بەسەر هۆبە و لقی لەیەکجیاواز دابەش نەببوون، بۆیە کەوتنی یەکێکیان بە ئاسانی دەبووە مایەی کەوتنی هەموو ئەوانی دیکەش. جووەکانی عێراق لەسەر فتیلەی تەقینەوەی بەرمیلە بارووتەکە بوون، بارودۆخیان لە ترکزە[75] بوو: عێراق پیسترین دوژمنی سەرسەختی دەوڵەتە ساواکەی ئیسرائیل بوو، ئەو تاکە دەوڵەت بوو ڕەتیکردەوە ڕێککەوتننامەی ئاگربەستی لەگەڵدا مۆربکا. هەر ئەندامێکی تۆڕی هەواڵگری نهێنی جوو دەیزانی، کە عێراقییەکان بەزەییان لەلا نییە و دەبێ لەوێ گیانی لەسەر لەپی دەستی بێ.

هەر بۆ هەمان هۆکار «یەهودا تاگەر» نێردرابووە ئەوێ تا سەرەداوی تەونی سووسەکاری لەدەست هەموو گرووپەکانی دیکە دەربێنێ و بیکاتەوە یەک. ئەو ئەفسەرە پێشووەی «پالماخ»، کە تەمەنی بیست و حەفت ساڵ بوو، کەسێکی سپۆرت و پۆڕێکی[76] هەبوو و هەردەم خەندەشی لەسەر لێوەکان حازر بوو. ئەمەشیان یەکەمین ئەرکی بوو کە لە دەرەوەی ئیسرائیل ئەنجامی بدا، بەر لە گرتنیشی باشترین هەوڵ و تەقەللای خۆی دا، تا ئەو تەونە جاڵجاڵۆکە سووسەکاریەکەی خۆی لە گرووپەکانی دیکە دابڕێ، بەڵام هەندێ بێباکی لە پیاوەکانی خۆی هێشتا لەنێو کاری هەواڵگری نهێنییدا دەکران؛ ئەوەبوو ئیسرائیلییێکی دیکە بە

[74] کەنیشتە: کڵێسای جووەکان.

[75] لە ترکزە: زۆر لەمەترسی، لەسەر لێواری ڕووداو، هەر بقەمێ بقەمێ.

[76] ئەو پرچەی پێشەسەر کە لە باقی پرچی سەر زیاترە.

پاسپۆرتی ڕاستەقینەی بەریتانییەوە کە بەناوی «پیتەر یانیڤ (ڕۆندی هیندیەکە)» بوو، سەرەداوی تۆڕە سووسەکارێکی دیکەی ڕاچاندبوو، بەڵام هێشتا پەیوەندی بە «تاگەر»ەوە مابوو.

پەیوەندییەکانی (تاگەر) لەگەڵ تەلئەبیبدا بە شێوەیەکی هەرە نهێنییەوە بەلای سەرانی هەموو گرووپە سووسەکارانی دیکەی بەغدادا دەڕۆیشت: کەسێکی نهێنی کە کەم کەس دەیانزانی. ناوە نهێنییەکەی «زاکی هاڤیڤ» بوو، بەڵام لەڕاستیدا ئەو (مۆردەخای بن پۆرات) بوو، ئیسرائیلییەک کە لە عێراق لەدایکببوو، لەکاتی شەڕی سەربەخۆیشدا ئەفسەرێکی سوپا بوو. ئەو حەزی نەدەکرد بگەڕێتەوە بەغدا و لەسەر ئانوساتی ژنهێنانیشدا بوو، کچێکی خۆشدەویست لەگەڵ خۆی لە ڕیزەکانی سوپادا بوو، بەڵام لەدوایدا لەبەر گوشاری دەزگەی هەواڵگری، شلیکرد و ئەرکە دژوارەکەی گرتە ئەستۆ.

لە ڕۆژەکانی دوای گیرانی (تاگەر)، شیرازەی سەرتاپای ڕێکخراوە نهێنییەکان تێکچوو و لەباریەک هەڵوەشان. یەکەکانی پۆلیسی تایبەتی عێراقی سەرچاوە جووەکانی گرتن. هەندێکیان لەبن لێکۆڵینەوەدا ڕووخان و بوونە مایەی بەگرتندانی ئەوانەی خۆیان حەشاردابوو. ئیدی عێراقییەکان ئەو بەڵگەنامانەیان دۆزینەوە کە پەیوەستبوون بەو جووانەی بە دەقاودەقی دەستیان لەگەڵ تۆڕی سووسەکاریدا هەبوو. لەبن ناوکەوە کۆنکریتییەکەی کەنیشتەی شێمتۆڤدا، پۆلیس شتەگەلێکی قاچاخ و چەکی دۆزییەوە. ئەو تفاقانەش ماوەیەکی زۆر بوو خەریکی کۆکردنەوەی بوون، هەر لەساڵی ڕاوەدوونانە خوێناوییەکانی ١٩٤١ەوە خەریکیبوون کە تێیدا ١٧٩ جوو سەربڕان و ٢١١٨ کەسیش بریندارکران و دەستدرێژیش کرایە سەر سەدان ئافرەت و لاقەکران. ئەو ژمارە زۆرەی چەکە دۆزراوەکان،

عێراقییەکانی سەرسامکرد: ٤٣٦ نارنجۆکی دەستی، ٣٣ دەمانچە، ١٨٦ تفەنگ، ٩٧ ڕەشاش، ٣٢ قەمە (خەنجەر) لەگەڵ ٢٥٠٠٠ فیشەک.

لە ماوەی لێکۆڵینەوە توندوتیژییەکەدا، ناوێک زیاد لە جارێک بە بەردەوامی دەهاتە سەر زاران: ناوی «زاکی هاڤیڤ»، ئەو پیاوە تەلیسماوییەی بەنهێنی کارەکانی دەکرد. بەڵام تۆبڵێی ئەو کێ بووبێ؟ لەکوێ بووە؟ لە کۆتاییدا، یەکێ لە لێکۆڵەرەوە گەنجەکان سەرەداوێکی پەیوەست بە کابرای تایینی دۆزیەوە: «زاکی هاڤیڤ» کەسێک نییە مەگەر هەر خودی «نەسیم موشێ» نەبێ، ئەو کەسەی کە لەگەڵ «تاگەر»دا گیرا و دوای یەک دوو ڕۆژیش بەردرا. ئیدی هەیتەکانی عێراقی بەدوای ماڵی «موشێ»دا گەڕان، بەڵام خۆ هیچ کەسیان لەوێ نەدۆزییەوە. پاشان هەموو کوچە و قوژبنی بەغدایان بەدوادا کێوماڵ کرد، بەڵام زاکی هاڤیڤ سەرۆسۆراخی نەما.

ڕاستییەکەش ئەوەبوو، ئەو لە شوێنێک بوو، پۆلیس بە خەونیش ئەوێی بە دوادا نەدەگەڕا. بەڵێ ئەو.... لە گرتووخانەدا بوو.

هەر دوو ڕۆژ دوای ئەوەی کە لەگەڵ «تاگەر»دا گیرا و بەردرا، «بن پۆرات» بە لەدەرکەدانەکەی لەخەو بێدار بووەوە. یەکێک لەدەرکەی دەدا و بانگی دەکرد "بیکەرەوە، پۆلیسە!" «بن پۆرات»یش وایدەزانی کۆتایی هات. ماڵەکەش هیچ دەرگەی پشتەوەی نەبوو، کەسیش لە بەغدا نەبوو تا بەهانایەوە بچێ. دەشیزانی کەسێک لە پێگە و ڕێگەی ئەودا، لە بەردەم دادگادا هەر یەک بڕیار هەیە ئەویش: سێدارەیە. بە دەستبەخۆداشۆڕکردنەوە دەرگەکەی کردەوە. دوو ئەفسەری پۆلیس لە دەرەوە بۆی وەستابوون. یەکێکیان پێیگوت: "فەرمانی گرتنی تۆمان پێیە."

«بن پۆرات»یش بە شپرزەییەکی چاوەڕواننەکراوانە پرسی: "بۆ من چیم کردووە؟"

"ئاها، هیچ شتێکی گرنگ نا،" پۆلیسەکەش وا وەڵامی دایەوە. "تەنها ڕووداوێکی ترومبێلە. دەی ئێستا بڕۆ خۆت بگۆڕە."

«بن پۆرات» ئەمەی بیستی، بە گوێیەکانی خۆی باوەڕنەدەکرد. ئاخر ئەو ڕووداوەی کە بە ترومبێل و چەند مانگێک پێشتر لێیقەومابوو، لەبیر کردبوو. ئەو برە پارە پێبژاردنەکەی دادگای فەرامۆشکردبوو، هەنووکەش لەسەر دۆزەکە دەبووایە ڕووبەڕووی دادگا ببێتەوە. دادگەکەش ئەوەندە خێرا بوو سەعاتە وەختێکیشی نەخایاند. دادوەر بڕیاری دوو هەفتە زیندانی بۆ بڕیەوە. ئیدی بەم جۆرە، لەکاتێکدا سوپایەک لە پۆلیسی عێراقی بەو پەڕی هۆشداریەوە بەدوایدا دەگەڕان، کەچی «زاکی هاڤیڤ» بۆ قەرەبووی ئەو پێبژاردنەی بە دوو هەفتە مانەوە لە گرتووخانەدا بەسەردەبرد.

دوای دوو هەفتەکەش و بەر لە ئازادکردنی، بردرایە بارەگای پۆلیس تا پەنجەمۆر بکا و وێنەی بگرن ئینجا وازی لێبهێنن. ئەویش دەیزانی، گەر ئەو ڕووبدا ئەوا قوڕی بۆ دەگیرێتەوە. ئەوسا ئەو بە «زاکی هاڤیڤ» دەیناسنەوە، ئەمجارەیان هەر بە تەنیا بە دوو هەفتە زیندانی لێیناگەڕێن. ئیدی ئەو بە یاوەری دوو پۆلیس بەنێو شەقامەکانی بەغدا بەرەو بارەگای سەرەکی پۆلیس دەڕۆی تا پەنجەمۆرەکەی بکا، کە لە شوێنی زیندانەکەیەوە هەندێ دووربوو. ئەو ڕێگەی گرتبوویانەبەر شەقامە جەنجاڵەکەی شۆریجە بوو، ئەو بازاڕە سیخناخەی کە دووکانۆکە و باریکەی ڕێی تەنگوتاریکی تێدابوون، لەوێدا دووکاندارەکان هەر هاواریان بۆ کاڵاکانەی خۆیان دەکرد و پێیان هەڵدەدا و زەوقی کڕیارەکانیان دەکردنەوە. وەک هیواخواز بوو، ساتە گونجاوەکە هات، «بن پۆرات»

پاڵێکی بە پۆلیسەکەوە نا بەناو ئاپۆرای خەڵکیدا هەڵات و لەناویاندا خۆی بزرکرد. کاتێ ئەو هەڵات، پۆلیسەکان هەر خۆشیان لە گوورە نەبرد[77]. خۆ هەموو شتێک کۆتایی هاتبوو، دوای کەمتر لە سەعاتێکدا هەر بەردەدرا، کەواتە بۆچی خۆی پێوە سەخڵەت بکەن؟

بەڵام کاتێ هەر دوو پۆلیسەکە هاتنەوە شوێنی خۆیان و ڕاپۆرتی خۆیان لەسەر ڕوداوەکە دا، قیامەت ڕابوو. ئاخر ئەوان، هەر بەخۆیان، خوازراوترین کەسیان لەدەست دەرچووە و لێگەڕاون لەنێو عێراقدا بە پێی بڕوا! ئۆپۆزسیۆنیش دابەزییە سەر کەمتەرخەمبوونی حکوومەت و بە دروشم و مانشێتی گەورە گەورە " ئەرێ «هاڤیڤ» لە کوێیە؟ ڕۆژنامەکان دەیانپرسی و هەر خۆشیان وەڵامیان دەدایەوە: "هاڤیڤ لە تەلئەڤیڤ!"

با بگەڕێینەوە تەلئەبیب. بەرپرسەکانی «بن پۆرات» بە شێوەیەکی زۆر وریایانە خۆیان ئامادەکرد و مشووری هەڵاتنیان لە عێراقەوە خوارد. لەکاتێکدا ئەو لەماڵی برادەرێکی خۆی حەشاردابوو، نەخشەیەکی بوێرانە داڕێژرا. هەر لەو کاتەدا، فڕۆکەیەکی زەبەلاح لە ڕێگەدا بوو، دەیەویست تەواوی جووەکانی عێراق لە ڕێی قوبرسەوە بگەڕێننەوە ئیسرائیل. ئاخر نزیکەی ١٠٠٠٠٠ لە عێراقەوە دەرچوبوون، لەڕێی گەشتە فڕۆکەوانییەکان کە شەوانە بە فڕۆکەی گەورە گەورە بەغدایان بەرەو ئیسرائیل بەجێدەهێشت.

لە شەوی ١٢ی حوزەیراندا، «بن پۆرات» کەشخەترین جلەکانی خۆی لەبەرکردن و تەکسییەکی ڕاگرت. برادەرەکی خۆی تێرووپڕ عارەقی – خوارنەدوە دەستکردەکەی خۆجێی– دەرخواردی دابوو، نقەی لێبڕیبوو،

[77] خۆیان لە گوورە نەبرد: خۆیان تێکنەدا، خۆیان شلوێ نەکرد.

ئیدی خۆی فڕێدایە پشتی تاکسیەکە و لێیخەوت. شوفێرەکەش لەنزیک فڕۆکەخانەی بەغدا هەڵیساندەوە و هێنایەخوار و بەخۆیشی گەڕایەوە و لەوێ بەجێیهێشت. ئینجا «بن پۆرات» بەتەنیا لە فڕۆکەخانەکەدا خێرا دەڕۆیی، ئەو دەیزانی لەکوێدا خۆی پێدادەکا، بەم جۆرە چووە نێو فڕۆکەخانەکە. فڕۆکەکە لە ڕێڕەوەکەی خۆیدا بوو، تازەش کۆچبەرەکانی بارکردبوو، لەسەر ڕێڕەوەکەی خۆی چاوەڕێی نۆرەی خۆی دەکرد هەڵبستێ و بفڕێ. لەپڕێکەوە فڕۆکەوانەکە ڕووی لایتەکانی خۆی کردە تاوەری چاودێری، کە بە شێوەیەکی کاتی لە باڵەخانەی کۆنترۆڵی ئاسمانی فڕۆکەخانەکەوە بوو. فڕۆکەکە خێرایی خۆی خڕکردەوە، دەرگەی پشتەوەشی کردەوە، دە پێ لەسەر زەوی بوو و پەتێکیشی بەردایەوە. ئەوسا لەو تاریکییەدا، «بن پۆرات» بە ئاراستەی فڕۆکەکەوە هات، دەستی بە پەتەکەوە گرت و بۆ نێو فڕۆکەکە هەڵکێشرا، کە دەستبەجێ لەگەڵ سەرکەوتنی، دەرگەکەی داخرایەوە. بەم جۆرە نە تاقمی فڕۆکەخانەکە و نە سەرنشینانی فڕۆکەکە هەستیان بە هەڵاتنی کابرا نەکرد، فڕۆکەکەش لەسەر گەشتەفڕینەکەی خۆی بەردەوام بوو.

کاتێکیش فڕۆکەکە بەسەر شارەکەدا ڕەت بوو، سێ جاران لەسەر یەک فلاشەکەی هەڵکرد و کوژاندەوە. "سوپاس بۆ خودا،" ئەوە منگەمنگێکی چەند پیاوێک بوو کە لەسەر بانەکان کۆببوونەوە. ئاخر برادەرەکەیان بەسەلامەتی بەرەو ماڵ بووەوە.

هەر بەڕاستیش دوای چەند سەعاتێکی کەم، «هاڤیڤ» گەیشتەوەتە تەلئەڤیڤ (تەلئەبیب).

پاشان خۆشەویستەکەی مارەکرد و گواستیەوە، ساڵانیک دواتر بووە کابرایەکی سیاسی، بووە ئەندامی پەرلەمان، ئەندامی کابینەی وەزیران، ئەمڕۆش سەرکردەیەکی دێرینی جووە عێراقییەکانە لە ئیسرائیل.

✡ ✡ ✡

ئەوانەی لە دوای ئەویش لە بەغدا مانەوە، وەک ئەو خۆشبەخت نەبوون. سەرچاوە جووەکان گیران، لێیاندرا، ئەشکەنجەدران. «تاگەر» و بیست کەسی دیکە، کە بە نهێنییەوە دەیانویست کاری تێکدەرانەی ژێرزەمینی بکەن؛ دوو کەسی ناوداری جوو بە ناوی «شالۆم سالاخ» و «یوسف باتزری» کە بە هەڵگرتنی ماددەی تەقینەوە و چەک تاوانبارکرابوون، حوکمی مەرگیان بەسەردا درا.

هەر کەمێکیش دوای دەستپێکردنی دادگاکەیان، «تاگەر» لە نیوەی شەودا بێدارکرایەوە، ژوورە زیندانییەکەی پڕ لە پۆلیس بوو. سەرۆکی لێکۆڵەرەوەکان پێیگوت: "ئەمشەو تۆ لە سێدارە دەدرێی."

«تاگەر»یش بە ناقایلیەوە: "بەڵام خۆ ناکرێ پیاوێک بەبێ دادگا لە سێدارە بدەن!"

"ئێمە ناتوانین؟ ئێمە هەموو شتێکت لەبارەوە دەزانین، تۆ ئەفسەرێکی ئیسرائیلی، تۆ سیخوڕی، لەمە زیاتر شتی دیکەمان ناوێ."

ئینجا ڕابینێکی بەڕیش هاتە ژوورەکە و لە تەنیشت «تاگەر» دانیشت، هەندێ درودی لەنێو پسالمدا[78] بەسەردا خوێندنەوە. لە سەعات سێ و سی خولەکی بەرەبەیانیشدا، ئەفسەرەکان «تاگەر»یان بردە ژووری لەسێدارەدانەکە. ئەویش بەواقوڕماوی لەگەڵیان ڕۆیشت. ئاخر هەر هەفتەیەک بەر لە ئێستا بوو، کە سەردانی خێزانەکەی خۆی لە ئۆرشەلیم

---

[78] Psalm: پسالم کتێبی نزاکانە، یەکەمین بەشی کتێبی کێتوڤیم (نووسراوەکانە) کە بە دەوری خۆی سێیەمین بەشی تەوراتی عیبریە. وشە ئینگلیزیەکەی پسالمیش لە زمانی گریکییەوە هاتووە، واتای "ئامێری موزیک" دەدا. لە دابونەریتی جووایەتی وکریستیانێتیدا ١٥٠ پسالم هەن. وەرگێڕ

کردبوو، لەڕێگەشی بەرەو بەغدا لە پاریس و ڕۆما خۆش ڕابیواردبوو. هەنووکەش بەپێی خۆی بەرەو کۆتایەکەی، بەرەو پەتی سێدارە دەڕوا.

عێراقییەکان وایان لێکرد چەندین فۆرم واژۆبکا – لەو کاتەشدا ئەو کارە بێرۆکراتییانەیان هەر پێکرد- ئینجا کابرای لەسێداردەر ئەڵقەکەی خستە مل و چاوەڕێیکرد. «تاگەر»یش داوایکرد کە تەرمەکەی ڕەوانەی ئیسرائیل بکەنەوە. لەسێدارەدەرەکەش لەسەر پەیژەیەک داینا و کیسە خۆڵێکیشی لە پێیەکانی بەستەوە. ناچاریش کرا بسووڕێتەوە و پشتی بکەوێتە لەسێدارەدەرەکە، کە گرێی پەتی پشتملەکەی قایمکرد و بە بمنیچەکەی گرێدا. ئینجا لەسێدارەدەرەکە چاوەڕێی فەرمانی ئەفسەرەکەی کرد، ئەویش لەگەڵ چەندین ئەفسەری دیکە لەبەرانبەر ئەو کەسەی بەرەو مەرگیان دەنارد، وەستابوو. لەو ساتەدا «تاگەر»یش بیری لە خێزانەکەی کردەوە، بیری لە خەڵکی خۆجێی ئۆرشەلیم، بیری لە ژیانی پێشووی کردەوە. تۆ بڵێی ملم بشکێ؟ پێی سەیربوو، هیچ ترسی لە گیاندا نەما.

ئینجا لە پڕێکەوە ئەفسەرەکان لەوێ ڕۆیشتن. «تاگەر» لەسەر پەیژەکان خرایە دواوە. لەسێدارەدەرەکە توورەکە خۆڵەکەی لەپێی کردەوە و پەتە درێژەکەی ملیشی خاوکردەوە، منگەمنگێکیشی لێوەهات، کەوا پارەی ئەمشەویشی لەدەستچوو. «تاگەر» بە تاساوی لەوە تێگەیشت کە نامرێ! هەموو شتێک بە وردەکاریەوە هۆنرابووەوە، هەمووی هەر داو بوو. ئەوان هیوایان وابوو تێکیبشکێنن، بەڵکو وردەکاری زیاتر سەبارەت بە کارەکانی بدرکێنێ. ئێستاش کاتێ ئەویان گێڕایەوە دواوە و بە زیندوویی گەڕاندیانەوە زیندانەکەی خۆی، «تاگەر» لەوە دڵنیابوو، کەوا لە زیندانی عێراقییدا نامرێ. بەڵکو برادەرەکانی دەریدەهێنن.

کاتێکیش دادگایەکە تەواوبوو، بڕیاری مەرگی درا، بەڵام دەستبەجێ بڕیارەکە بە زیندانی هەتا هەتایە گۆڕدرایەوە. «باتزری» و «شالاخی»ش

لەسێدارەدران. ئەوان دوا شەویان لەسەر زەوی لەلای «تاگەر» بەسەربردبوو، ئەویش هەوڵی دەدا دڵیان بداتەوە.

ئینجا بۆ "یۆدکا" ڤیا دۆلۆرۆسا بە شێوەیەک لە شێوەکان لەژیاندا مایەوە. لە یاوەری لەگەڵ بکوژان، لەگەڵ زیندانیانی سیاسی و لەگەڵ جەللادە سادییەکانی چەندین زیندانی عێراقیدا، ئەو لەو بڕوایەدابوو هەرگیز لەنێو زیندانی عێراقیدا نامرێ. ڕۆژێک هەر دێ ئازاد ببێ!

ئەو دەبووایە نۆ ساڵ چاوەڕێ بکا. لە ١٩٥٨دا ژەنەڕاڵ عەبدولکەریم قاسم لە کودەتایەکدا دەسەڵاتی گرتەدەست و سەروەزیری پێشوو لەگەڵ بنەماڵەی پاشایەتی لەناوبرد. پاش دوو ساڵان، هەندێک لە یاریدەرە نزیکەکانی هەوڵی پیلانێکی کوشتنیان دا (کە دەبوایە دوای چەند ساڵێکی کەم وایان بکردبایە). ئەوسا مۆساد بە پیلانەکەی زانی، ڕامسادەکەیان (سەرۆکی مۆساد) دەستبەجێ پەیوەندییێکی لەگەڵ دڵسۆزەکانی قاسمدا گرێدا و سەودایەکیان لەگەڵ یەکدا کرد: مۆساد ناوی پیلانگێڕەکانیان بداتێ و ئەوانیش «یەهودا تاگەر» ئازادبکەن.

«تاگەر»یش لە ژوورێکی تاریکدابوو، کاتێ زیندانکەرانی هاتن و دەستە جلێکی خاکییان بۆ هێنا. "دەی ئەمانە بکەبەرت" ئەوان وایان فەرمان پێکرد. "تۆ دەبردێیتە بەغدا."

تڕومبێلێکی پۆلیس «تاگەر»ە سەرسامەکەیان گەیاندە کۆشکی کۆماری. چەندین ئەفسەر یاوەری بوون تا گەیاندیانە نووسینگەیەکی گەورۆنە[79]. لە پشت مێزێکی نەخشێندراو، بیچمێکی ناسراو هەبوو: خودی سەرۆک عەبدولکەریم قاسم بوو. یەکسەر «تاگەر» تێگەیشت: ئەوان ئازادی دەکەن! قاسم ماوەیەک لە سەروبیچمی ئیسرائیلییەکە ڕاما، ئینجا لە

[79] گەورۆنە: زۆر گەورە.

دواییدا پێیگوت: "دەی پێمبڵێ، ئەگەر جارێ شەڕ لەنێوان عێراق و ئیسرائیلدا بدرێ، لە دژمان دەجەنگییەوە؟"

«تاگەر»یش وەڵامی دایەوە:"من هەموو شتێک دەکەم کە لەتوانامدا هەبێ، بۆ ئەوەی لەیەک تێگەیشتن و ئاشتی لە نێوان ئیسرائیل و دەوڵەتە عەرەبییەکاندا بێتە کایە. بەڵام ئەگەر شەڕیش هەڵگیرسا، من بۆ ئیسرائیل دەجەنگم، هەروەک تۆ چەندین جار بۆ وڵاتەکەت جەنگاوی." هەر دەبوو قاسم کەیفی بەو وەڵامە هاتبا. ئەو هەڵسایە سەرپێ و پیگوت: "کاتێ دەگەڕێیتەوە ماڵی خۆت، بە خەڵکەکەت بڵێ، کە عێراق ئێستا دەوڵەتێکی سەربەخۆیە. ئێمە چیدی دەستکەلای ئیمپریالیزم نین."

ئینجا هەر لە کۆشکەکەوە بە ترومبێلێک «تاگەر»یان گەیاندە فڕۆکەخانە. هێشتاش باوەڕی بەوەی ڕوویدا نەدەکرد. ئەوان خستیانە فڕۆکەیەک بەرەو بەیروت، لەوێشەوە بۆ نیقۆسیا بۆ قوبرس و لەکۆتاییشدا لە ئیسرائیل دابەزی. لە فڕۆکەخانەکەشدا دۆست و هاوڕێکانی لەپێشوازیدابوون. ئەوان چاوەڕێی ئەوەیان دەکرد، پیاوێکی تێکشکاو ببین، پاشماوەی ڕووخانی ئادەمیزادێک، بەڵام ئەوەی لە پەیژەی فڕۆکەکەدا دابەزی، هەمان پیاوە بە جۆش و دۆستانە و خەندە لەسەرلێوەکەی جاران بوو، کە بەلای کەمییەوە نۆ ساڵ بوو نەیاندیتبوو. ئەوان لێیان پرسی ئەرێ چۆن بەرگەت گرت؟ چۆن لەشساغی و گەشبینی خۆت پاراست؟ ئەویش سادەییانە پێیگوتن: "من دەمزانی ئێوە لەوێ دەرمدەهێنن."

بە گەڕاندنەوەی «تاگەر» بۆ نیشتمان، سەرۆکی مۆساد بە توندوبەندی دەستی بە بنەمایەکی چەسپیوی دەستپێکەوە گرت: بۆ ئەوەی خەڵکانی خۆمان بگەڕێنینەوە نیشتمان، دەست لە هیچ مەپارێزن، لە هیچ هەوڵ و تەقەللا و قوربانیەکیش سڵ مەکەنەوە.

پاشان «تاگەر» لە ئیسرائیل ژنی هێنا، چووە نێو ژیانی خێزانی، دوای بڕینی کارنامەیەکی لێهاتووی دیپلۆماسییانە، بووە مامۆستایەکی زانکۆ.

✡ ✡ ✡

هەرچەندە بە هیچ شێوەیەکیش «ڕێوڤن شیلواهـ» دەستی لە تراژیدیای بەغدادا نەبوو، کەچی لە کۆتایی ١٩٥٢دا دەستی لەکارکێشایەوە. دوای ئەو، ئەستێرەیەک، کە تازە لە جیهانی سێبەری دەزگەی نهێنی ئیسرائیلدا سەریهەڵدابوو، جێیگرتەوە.

ئەویش ئیسەری بچووک بوو.

# بەندی چوار: سیخوورێکی دووسەرەی سۆڤێتی و تەرمێک بۆ ناو زێ

«زیڤ ئاڤنی» تامەزرۆ بوو ببێتە ئاژانێکی مۆساد.

کاتێکیش لە ڕۆژێکی باراناوی لە ئەپریلی ١٩٥٦دا گەیشتە مەکۆی سەرەکی مۆساد، لە ناخی دڵیەوە ئارەزووی ئەوە بوو، کە لە باڵەخانەکە بێتەدەر وەک کارمەندێک لەوێ وەرگیرابێ. بۆ چەندین ساڵ بوو لە هەوڵ و تەقەللادا بوو ببێتە یەکێک لەو ژمارە دەستنیشانکراوانەی مۆساد، ئەمەش لە ژیانیدا گرنگترین ئامانجی بوو.

«وۆلف گۆلدستاین» لە (ڕیگا) لە لاتڤیا لەدایکببوو، لە سویسڕاش گەورەببوو، لە ماوەی جەنگی دووەمی جیهانیدا خزمەتی سەربازی لە ڕیزی سوپای سویسریدا بوو، پاشان لە ١٩٤٨دا کۆچی کردبووە ئیسرائیل. لەوێش ناوی خۆی گۆڕیبوو، ناوێکی عیبریانە «زییڤ ئاڤنی» بۆ خۆی هەڵبژاردبوو. دوای دوو ساڵ ژیان و کارکردن لە کیبوتی[80] «کازۆریا»دا، پەیوەندیکرد بە وەزارەتی کاروباری دەرەوە و دواتر وەک کارمەند لە بروکسل دامەزرا. کەسیایەتییەکی ڕێکوپێک، خوێنەرێکی باش، بە چەندین زمان دەیخوێندەوە، کاربەدەستە پلەباڵاکانی بە کەسایەتی و شێوازە لێزانی و کارامەییەکەی خۆی سەرسامکردبوو، بۆیە خواست و داواکارییەکانی بە باشی بەڕێوەدەچوون، بەتایبەتیش لەو پەیوەندیانەی

[80] کیبۆت مەبەست لەو گوند، کۆمەڵگە یان ئۆردوگایانەی ئیسرائیلە کە ژیانێکی هەرەوەزیانەیان بەسەردەبرد و کاروبارەکانیشیان بە زبارە بوو، کۆژین. وەرگێڕ.

لەگەڵ مۆسادا. هەر کاتێک دیپلۆماتێک پێویستی بە ڕێنوێنێکی کاری نهێنی هەبووایە، بۆ کارێکی زۆر پێویست و بەلەز و بۆ هەر شارێک، بۆ ئەوەی بەڵگەنامانەی تایبەتی سەرداپۆشراو بگەیەنێتە دەستی مۆساد لەهەر شوێنێکی ئەوروپادا بێ، ئەوا «ئاڤنی» یەکەمین کەس بوو، خۆبەخشانە دەستی خۆی بۆ کارەکە هەڵبڕێ. ئەو هاوڕێکییە بەردەوامەی لەگەڵ ئەو کارانەیدا وای لێکردبوو بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ببێتە پیاوەکەی ئەوان لە ئەوروپا؛ کاتێکیش کاروبارەکەی گوازرایەوە بۆ باڵوێزخانەی ئیسرائیل لە «بێلگرادۆ»ی پایتەختی یۆگسلافیا، پەیوەندییەکانی لەگەڵ دەزگەی مۆساد چڕوپڕتر بوون. لە چەندین نامە بۆ «ئیسەر هارل» ڕامساد (سەرۆک)ی مۆساد، «ئاڤنی» پێشنیازی ئەوەی کردبوو هۆبەیەکی مۆساد لە بێلگرادۆدا بکاتەوە. بەڵام «ئیسەر هارل» ڕەتیکردەوە: ئاخر مۆساد پێویستی بەوە نەبوو وێستگەیەک لە بەلگرادۆدا دابمەزرێنێ، کەچی «ئاڤنی» هەر کۆڵی نەدا. لە ١٩٥٦ یشدا بەسەردانێکی تایبەت هاتەوە ئیسرائیل و داوای کرد *ڕامساد* ببینێ. داواکەشی پەسەندکرا، ئەوێ ڕۆژێش، یەکەمین جاری بوو کە ئیسەر هارل ببینێ.

بە گرژی و شڵەژانەوە چووە نووسینگەی «هارل» کە لە خانوویێکی کۆنی تەلئەبیبدا بوو، کاتی خۆی بۆ کاروانسەرای ئەڵمانەکان دروستکرابوو. «هارل»یش چوار ساڵ دەبوو *ڕامساد* بوو، بەڵام هەمیشە هەر ئەفسانەیەک بوو بۆخۆی. خەڵک هەم بەو پیاوە کورتەباڵا و تەلیسماوییە سەرسام بوون هەم دەشترسان؛ چیرۆکی ڕاستی و هەڵبەستراویشیان سەبارەت بەو لەنێوان داڵانەکانی دەزگەی مۆساددا کەوتنەسەر زار و زمانان. ئاڤنیش کەم تاک زۆر شتی دەربارەی «هارل» بیستبوو، ئەو هارلەی نازناوەکەی بە "ئیسەری بچووک" ڕۆیشتبوو. ئەوەش لەبەرئەوەی بوو بەشێکی لە بەدناوی و سامناکی ئیسەری گەورە

هەبوو. ئاڤنیش لە ڕوبەڕوبوونەوەکە ترسا، ئاخر دەنگۆی زۆر لەبارەی کەڕەپبوون[81]، شێوازی سەیروسەمەرە و هەڵوێستی نائاسایی ئیسەری بچووک هەبوون.

بەڵام پیاوە کورتەباڵا، لەڕو لاوازە سەرکەچەڵەی خاکی لەبەرە قۆڵکورتەکە، کە لە نووسینگە یەکڕەنگییەکەیدا پێشوازی لە ئاڤنی کرد، بە نەرمونیانی دوا و کابرایەکی میهرەبان دەرچوو. ئەو پێی لەوەنا کە کەوتۆتە بن باندۆری ڕەفتاری ئاڤنی و کارامەییە سیاسیەکەی. ئەوسا هۆکاری ئێستای هاتنەوەی بۆ ئیسرائیلی لە ئاڤنی پرسی، ئەویش بۆی ڕوونکردەوە، کەوا کچەکەی لە ژنی یەکەمی داوای لێکردووە سەردانی بکا.

- ئیسەریش بە خەندەوە لێپرسی: "کیژەکەت تەمەنی چەندە؟"
- "هەشت ساڵ."
- "هەشت؟"

دیاربوو (ئیسەر) بە وەڵامەکە سەرسامبوو. ئاخر شتێکی سەیر بوو، دیپلۆماتێک هەر لەبەر ئەوەی کچە بچکۆلانەکەی غەریبی کردبێ و داوای کردبێ، بەلەز[82] لە دەرەوەی وڵات بێتەوە وسەری لێبدا. ئینجا ئاڤنی وردەکاری ئەو پەیوەندییە ئاڵۆزوبڵۆزەی لەگەڵ ژنی یەکەمی، لەگەڵ منداڵەکەی و هەروەها لەگەڵ ژنەکەی ئێستای ڕوونکردەوە. (ئیسەر) خەریکبوو هەدادانی[83] نەمێنێ، قسەکەی پێبڕی، پێیگوت هیچ وێستگەیەکی مۆساد لە بێلگرادۆدا دانامەزرێ. هەرچی دەربارەی ئایندەی «داڤنی»ش

[81] کەڕەپ: نەسەلمێن، سەرەق، عیناد.

[82] بە لەز: بە پەلە، خێرا.

[83] هەدادانی نەما: حەوسەڵەی نەما، ئۆقرەی لەبەر هەڵگیرا.

بوو، پێیگوت: "ئێمە سەیر دەکەین، بزانین دوای ئەوەی تۆ ئەرکەکانت لە یۆگسلاڤیا تەواودەکەیت، چی دەبێ." ئاڤنیش هەستیکرد هیوابڕاو بووبێ.

هەرچەندە بەرلەوەی ئاڤنی، نووسینگەی *ڕامساد* بەجێبێڵێ، پێیگوت لەماوەی یەک دوو ڕۆژی دیکەدا دەیبینێتەوە، "بەڵام نەوەک لەم خانووەدا، چونکە لێرە خەڵکێکی زۆر دێن و دەڕۆن. بەڵکو تۆ لە نووسینگە نهێنییەکەم لە ناو شاردا دەمبینیەوە، ئەوکات شوفێرەکەم بەدواتدا دێ."

ئاڤنیش بیریکردەوە، کەواتە هێشتا هیوا ماوە. خۆ ئەگەر وانەبێ، باشە بۆچی دەیەوێ جارێکی دیکە بمبینێتەوە.

یەک دوو ڕۆژ، دواتر ئاڤنی لەناو جەرگەی تەلئەبیبدا بەنێو باڵەخانەیەکی ناپێشچاودا دەڕۆیشت. ئەمجارەیان هیچ هۆکارێکی نەبوو لە «ئیسەر» بترسێ؛ خۆ هەر هیچ نەبێ، جاری یەکەم دۆستانە لەگەڵی جووڵایەوە.

لەوێ «ئیسەر» چاوەڕێی دەکرد و لەگەڵ خۆی بردییە ژوورێکی گەورە: دیوارێکی ڕەق و ڕووت، مێزێک، دوو کورسی و پەنجەرەیەکی شکاو. ئاڤنی لەسەر کورسیەکە دانیشت، ئینجا لە هیکەوە ئیسەر لێیبووە گاجوتێکی چاوسووری تووڕەی شێتوهار. دەموچاوی گۆڕا، پەنجەکانی دەستی بۆ یەک هێنانەوە و کردییە مست و بە مێزەکەی بەردەمی دادا و هاواریکرد: "تۆ ئاژانێکی سۆڤیەتیی! دەی دانی پێدابنێ!" دیسان هەر بە چاوسوورکردنەوە لێی دووپاتکردەوە: "دانی پێدابنێ دەی!" ئەو هێشتا بە مشتەکۆڵەکەی وەک چەکوچ بە مێزەکەی دادەدا و دەیشیڕاند[84]: "من دەزانم، سۆڤیەتیەکان تۆیان ناردووە! من دەزانم تۆ سیخوڕی ئەوانی! دەی هەر ئێستا دانی پێدابنێ!"

---

[84] دەیشیڕاند، شیڕاندن: هاوارکردن.

ئاڤنیش وەک هەورەتریشقە لێیدابێ لە شوێنی خۆی گۆدبوو[85]. هەستیکرد ناتوانێ وشەیەکیش دەربدا.

- "دەی دانیپێدابنێ! خۆ ئەگەر هاوکاریم لەگەڵدا بکەی، ئەوا یارمەتیت دەدەم، بەڵام ئەگەر...."

ئیدی دڵی ئاڤنی لەنێو قەفەسی سینگیدا شێتانە کەوتە لێدان. ئارەقەیەکی ساردی دەردا و هەستیکرد زمانی بۆتە قورقوشم. ئەو لەوە دڵنیابوو، کە دوا ساتەکانی ژیانی هاتووە و «ئیسەر»یش دەیەوێ بیکوژێ.

لە کۆتاییدا خۆی کۆکردەوە و چەند وشەیەکی گۆ کردن.

بە منگەمنگەوە گوتی: "من دانی پێدادەنێم. بەڵێ، من بۆ ڕووسەکان کاردەکەم."

ئینجا (ئیسەر)دەرگە گاڵەدراوەکەی کردەوە، دوو لە باشترین ئاژانەکان و ئەفسەرێکی پۆلیس هاتنەژوور. ئەفسەرەکە «ئاڤنی» گرت، لەگەڵ خۆی بردی بۆ ژووری لێکۆڵینەوە. ئینجا هەنگاو بە هەنگاو، ناسنامەکەی خۆی و ئەو ئامانجەی بۆی هاتبوو، ئاشکراکرد. ئەو هەر لە تافی مێردمنداڵییەوە کۆمۆنیستێکی عەودالْ بووە، لەلایەن GR (دەزگەی هەواڵگری سوپای سوور)ی سۆڤییەتیەوە کراوەتە ئاژان، لە ماوەی جەنگی دووهەمی جیهانیشدا سووسەکاری بۆ یەکێتی سۆڤیەت کردووە. وایلێکراوە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن جاسووسێکی دووسەرە بێ. بۆ ساڵانێکی دورودرێژ، چاوەڕێی ئەوەی دەکرد پەیامێکی لە مۆسکۆوە پێبگا، بەڵام سەرداری دەزگەی سووسەکاری ڕووسی چاوەڕێبوو تا ئەوکاتەی «داڤنی» لە بروکسل دادەمەزرێ. ئەو لەوێ زانیاری گرنگی سەبارەت بە

[85] گۆدبوو: سڕبوو.

بەشداری ئیسرائیل لە F.N بەرنامەی پیشەسازی چەک لە بەلجیکا، هەروەها زانیاری سەبارەت بە کۆدەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئیسرائیلی، تەنانەت ناوی دوو لە نازییە کۆنەکانی ئاڵمانی بۆ ئاشکراکردبوون کە سیخوڕێتیان لە وڵاتی میسر بۆ ئیسرائیل دەکرد. بۆ مایەی سەرسوڕمانی ئەوانەی کاریان لەگەڵدا دەکردن، هەر زوو ئەو دوو کەسە ئاڵمانە لە میسر دەرکران، بەڵام ئەمە بەتەنیا بەس نەبوو بۆ ئەفسەرە ڕووسەکانی فایلی «ئاڤنی». ئەوان دەیانەویست پیاوەکەیان دزەبکاتە نێو مۆسادیش، هەر بۆیەش «ئاڤنی» زۆر تێدەکۆشا، بچێتە ناو ڕیزەکانی مۆساد، تا ئەوکاتەی «ئیسەر» هاواری بەسەردا کرد : "دەی دانی پێدابنێ!"

ئەو کاتەی دانی پێدانا، نەیدەزانی ئاخۆ کامەیان سامگرتیترینیانە: ئاخر خۆ بەپێی خۆی کەوتبووە نێو داوەکەی «ئیسەر» و وەک دەڵێن بە دەندووک پێوەبوو! *ڕامسادەکەی* مۆساد تەنانەت بچووکترین بەڵگەی لەسەر سیخوڕایەتی ئەو بۆ نەهێنابووەوە، تەنها هەر گومانێ بوو، هیچ سەرەداوێکی جاسووسیەتی «ئاڤنی»ان لەبەردەستدا نەبوو. ئەوەش ڕاستبوو، کە ماوەیەکی زۆر لەمێژ بوو، یەکێک بە ئیسەری گوتبوو، کەوا «ئاڤنی» بۆیە لە کیبۆتەکە دوورخراوەتەوە، چونکە ڕامانێکی زۆر کۆمۆنیستانەی هەبووە، بەڵام سیخوڕێتی بۆ سۆڤیەت؟

«ئیسەر» هەر بە هەستی خۆزایی[86] خۆی جووڵابووەوە. سووربوونی بێهوودەی «ئاڤنی» لەسەر چوونەڕیزی مۆساد؛ ئەو سەردانە سەیرەی بۆلای کچەکەی، هەوڵ و تەقەللای بۆ ئەوەی قەناعەت بە ئیسەر بکا، تا وێستگەیەکی مۆساد لە بێلگرادۆدا بکاتەوە... هەموو ئەمانە دنەی عەقڵە

[86] خۆزایی: خۆڕسکی، لەخۆوە، فیترەت.

تیژەکەی ئیسەری دا بگاتە بەرەنجامێکی وێنەچوو: ئاخر سیخوڕێکی دووسەرە، ناپاکێک، خەریکبوو دزەبکاتە نێو جەرگەی پیرۆزییەکانیان.[87]

لە دادگاکەشیدا، «ئاڤنی» بە تەواوی و بەوردی ددانی پێدانا و بڕیاری دادگا بە زیندانیکردن بۆ ماوەی چواردە ساڵی بۆ دەرچوو. بەڵام دوای نۆ ساڵ زیندانی، بەر لێخۆشبوون کەوت، ئینجا بووە هاوڵاتییێکی خاکی و بووە دەروونناسێک. ئیسەر بەو کەسەی کە بایۆگرافییەکەی دەنووسیەوە گوت؛ ئاڤنی دژوارترین سیخوڕ بووە کە لە ئیسڕائیلدا گیرابێ، بەڵام "کەشخەترینیشیان بوو،" بە نەرمی دەربارەی ئەو وەک "سیخوڕێکی جێنتلمان" دوا.

«ئاڤنی» بەخۆی بە ئێمەی ڕاگەیاند، کەوا دوای چەندین ساڵ، ئەفسەرە پلە باڵاکانی پۆلیس و شاباک (دەزگەیەکی لێکۆڵینەوەی توندوبەندی هاوشێوەی FBIئەمریکی) ببوونە باشترین دۆستی.

ئۆپەراسیۆنی پیگمالۆن[88] کە ناوی گۆڵمزەکەی «ئاڤنی» بوو، بۆ ساڵانێکی زۆر فایلێکی هەرەنهێنی پارێزراوی مۆساد بوو. بەڵام بۆ کەمێک لەوانەی بە دۆزەکە ئاشنابوون، یەکێ بوو لە بەڵگە هەرە سەرسامەکانی هەستی خۆزاییێتی ئیسەر.

---

[87] نووسەرەکان لێرەدا دەستەواژەی (Sanctum Sanctorum)ی لاتینیان بەکارهێناوە، کە واتای نێوجەرگەی پیرۆزییەکان دەدا، یان دایکی پیرۆزییەکان. یاخود پیرۆزی هەموو پیرۆزیەکان دەدا، ئەمەش شوێنێکە دەکەوێتە ئۆرشەلیم. مەبەست لێرە ئەوەیە، کە ئاڤنی خەریکبووە لەنێو مۆساددا وەربگیرێ، بەمە دەستی بە نهێنییەکان ڕابگا. وەرگێڕ.

[88] Pygmalion

بەڵام ئاخۆ ئەو ئیسەرە بچووکە کێ بوو؟ کەسێکی کەمدوو[89]، شەرمن، کەڕەپ وەک هێستر، دەگوترێ لە قەڵایەکی کۆنینەی شاری «داڤینسک»، لە ئیمپراتۆریەتی ڕووسی لەدایکبووە؛ دەنگۆ هەیە کەوا کاتێ لە تەمەنی هەژدە ساڵییدا بەرەو ئیسرائیل کۆچ دەکا، ئەو لەنێو باڵۆرە نانەکەی کۆڵەپشتی دەمانچەیەکی شاردبووەوە. سەرەتا ئیسەری بچووک لە کیبۆتی شەفایم[90] نیشتەجێکراوە، هەر لەوێش (ڕیڤکا)، ئەو ژنەی ئەسپی بەخێودەکردن، خواستووە. بەشێوەیەکی ڕەق، نەسەلمێن و بەخۆڕاپەرمووانە بەخۆی و ژن و منداڵەکەی بە هۆیەکی نەزاندراوەوە بە تەنها و بە جلی بەریانەوە کیبۆتەکەیان بەجێهێشتووە. لە ماوەی جەنگی دووەمی جیهانیشەوە چووەتە ڕیزی «هاگانا»، هەرزووش لەبەر لێهاتوویی بووەتە سەرۆکی هۆبەی (شای) جولەکەیی، کە بەدوای ناپاک و هەڵگەڕاوەکاندا دەگەڕان. "هەڵگەڕاوەکان"یش ئەندامی ئیرگون و گرووپی «ستێرن» بوون، دوو ڕێکخراوی باڵی ڕاستی نەیاری دەسەڵاتی داود بنگۆریۆن و ڕێکخراوی کۆمەڵگەی جوو بوون. ئیسەری گەورەش، ئیسەری بچووکی کردبووە سەرۆکی شاباک، دەزگەی ئاسایشی ناوەخۆ.

هێشتا زۆر بەسەر دەستبەکاربوونی مۆساددا تێنەپەڕیبوو، کە بنگۆریۆن لە جووڵەیەکی کتوپڕدا، دەستلەکارکێشانەوەکەی «ڕێوڤن شیلواهـ»ەی پەسەندکرد و ئیسەری بچووکی وەک سەرۆکی مۆساد دانا. هۆکاری فەرمی گۆڕینەکە ڕوداوی هاتوچۆ بوو کە شیلواهەی پەکخستبوو، بەڵام دەنگۆ لەنێو مۆساددا وەها بڵاوببووەوە، کە ئیسەر قۆچێکی لە «شیلواهـ»ە داوە و دەریکردووە، دوای ئەوەی توانیویەتی قەناعەت بە بنگۆریۆن بکا، کەوا *ڕامسادەکە* هەرچەندە پیاوێکی دانا و کۆکە بەڵام

[89] کەمدوو، کەسێک کەم قسەبکا.

[90] Shefayim

لەوەدا ناتوانایە سەرپەرشتی ئاژانە کاراکتەرە ڕەقەکانی بکا و ئۆپەراسیۆنی نهێنی بەئەنجام بگەیەنێ.

لەژێر سەرپەرشتی ئیسەردا، ئەو دەزگە هەواڵگرییە، شەقڵە تیژەکەی خۆی وەرگرت. جڵەوی پێنج دەزگەی گرتەدەست: مۆساد، شاباک، ئامان (هەواڵگری سەبازی)، هۆبەیەکی تایبەتی پۆلیس و بەشی لێکۆڵینەوە لە وەزارەتی کاروباری دەرەوەدا. لەوانەش تەنیا مۆساد، ئامان، و شاباک گرنگ بوون؛ باقی دوو بەشەکانی دیکە بەو پلە باڵایە سەیرنەدەکران. بەڕێوبەرەکانی هەر پێنج دەزگە و جێگرەکانیان "کۆمیتەی سەرانی دەزگەکانیان" پێکدەهێنا. ئیسەریش کرابووە سەرۆکیان. بنگۆریۆن ناونیشانێکی تایبەتی بۆ سەرۆکەکە دانابوو، ئەویش مەمونە[91]– بەرپرسی ڕاپەڕێنەر بۆ کاروباری ئاسایش بوو. کاتێکیش بنگۆریۆن بۆ یەکەمین جار، ئیسەری بچووکی بۆ ئەو پۆستە دەستنیشانکرد، تێبینی ئەوەیدا: "هەڵبەتە، تۆ هەروەک بەڕێوبەری شاباک بەردەوام دەبی، هەرچەندە تۆ ئێستا مۆسادیشت لەبەردەستە." ئیسەریش بەڕێوبەرێکی نوێی بۆ شاباک دانا، هەرچەندە جڵەوی هەردووکیان، هی مۆساد و شاباکی لەبن دەستی خۆیدا هێشتەوە.

کەواتە، ئیسەری بچووک بووە قەڕاڵی دەزگەی هەواڵگری ئیسرائیلی.

گۆبەندی «پیگمالۆن»یش هەر تەنها یەکێک بوو لەو ئۆپەراسیۆنە دەروازەییانە، کە ئیسەر لە ساڵە بەراییەکانی سەرهەڵدانی دەوڵەتی ئیسرائیل ئەنجامیدان، زۆربەشیان دژی سیخوڕەکانی سۆڤیەتی بوون بەوەی ژمارەیەکی زۆریان گرتن، زیندانیکردن و دووری خستنەوە.

---

[91] memunneh

بەڵام خۆ هەموو سیخوڕەکانیش هەر کاریان بۆ سۆڤیەت نەدەکرد، هەروەها چیرۆکی هەر سیخوڕێکیش وەک ئەوەی «ئاڤنی» بە خۆشی کۆتایی نەهات.

✡ ✡ ✡

دوانیوەڕۆیەکی سەرەتای مانگی دیسێمبەری ١٩٥٤، فڕۆکەیەکی بارهەڵگر بە تەنیا بەسەر بەشی ڕۆژهەڵاتییەکەی دەریای سپی ناوەڕاستدا دەسووڕایەوە. کاتێکیش فڕۆکەوانەکە دڵنیابوو لەوەی هیچ ئاماژەی کەشتی و بەلەم لەناو دەریادا بەدی ناکا، ئەوسا یەکێ لە دەرگەکانی پشتەوەی فڕۆکە بارهەڵگرەکە کرایەوە و شتێکی قەبە و زل، تەرمێک، فڕێدرا نێودەریا.

فڕۆکەکە بە ڕێگەی خۆیدا گەڕایەوە، ئینجا لە دوای سەعاتێک، لە ئیسرائیل نیشتەوە. ئەمەش نیشانەی کۆتایهاتنی ئۆپەراسیۆنی ئەندازیار بوو (کە ناوە ڕاستیەکەی خۆی نەبوو)، ئەو ئۆپەراسیۆنەی بۆ ماوەی زیاتر لە پەنجا ساڵ، زۆر بە نهێنی و متمانەداری مایەوە.

لە ١٩٤٩دا، سێ برای سەر بەماڵباتێک لە بولگاریاوە گەیشتنە «حەیفا». برا گەورەکەیان ناوی «ئەلێکساندەر ئیسرائیل»، تازە لە خوێندنگەی ئەندازیاری لە «سۆفیا» دەرچوو بوو. ئەو ناوی لەنێو سوپادا هاتەوە، پلەی کاپتنیشی پێدرا و لەنێو سوپای دەریاوانی ئیسرائیلدا داندرا. «کاپتن ئیسرائیل» گەنجێکی جوان و تابلێی ڕووخۆش بوو. ئەو لەلایەن بەرپرسەکانی بەرز نرخێندرا و ڕێگەی پێدرا ببێتە سەردەستەی لێکۆڵینەوەی نهێنی بۆ کەلوپەلی ئەلیکترۆنی و پەرەپێدانی چەکی نوێ. کارەکەش لەبن چاودێری ئاسایشپارێزییێکی پلەباڵادا بوو، بەم جۆرە ئەو دەستی بەهەندێ ماددەی زۆر هەستیاردا ڕاگەیشت. ئیدی پێشناوەکەی

خۆی کردە عیبری و بوو بە (ئاڤنەر) و لە ١٩٥٣شدا «ماتیلدا ئاردیتی»، کچە شۆخ و شەنگە بەڕەچەڵەک تورکەکەشی خواست. ئیدی ئەم دوو جووتە لە حەیفا، لەنزیک بنکەی دەریاوانی جێگیربوون. (ماتیلدا) زۆر مێردە خۆشڕووەکەی خۆی خۆشدەویست، بەڵام کەمتر بە لایەنی شادمانی کەسایەتییەکەی ئاشنابوو.

ژنەکەی نەیدەزانی مێردەکەی تۆمارێکی دوورودرێژ و ڕەنگینی پۆلیسیی هەیە. «ئاڤنەر ئیسرائیل» لەیەک کاتدا بەوە تاوانبارکرا، کە هەمان ئەپارتمانی زیاتر لە جارێک و دوان بەکرێداوە؛ خۆشی وانمایشکردبوو کە نوێنەری کۆمپانیای بەفرگرەیە تا پارەی ئەو ساردکەرەوانە وەربگرێ کە هێشتا ڕادەستنەکراون؛ ئیدی ئەم جۆرە سەروسەودایانە. یەکێک لەو دۆزانە گەیشتە دادگا، ئەویش بانگی دادگا کرا کە ئیفادەی خۆی تێدا بدا، ئەمەش لە ٨ی نۆڤێمبەری ١٩٥٤دا بوو.

«ماتیلدا»ی دووگیانیش، هیچی لەبارەی گەندەڵی مێردەکەی نەدەزانی، هەروەها هیچیشی دەربارەی ئەو پەیوەندیەی نێوان مێردەکەی و کارمەندەکەی کونسولخانەی ئیتالیایی لە حەیفادا نەدەزانی. تەنانەت «ئاڤنەر» پێشنیازی بۆ کیژە ئیتالیەکە کردبوو بیخوازێ، ئەویش بە یەک مەرج قایلبوو، کەوا سەرەتا دەبێ ببێتە کاسۆلیک.

بۆ «ئاڤنەر»ی گەنج ئەم کارە هیچ گرفتێکی گەورە نەبوو. ئاخر ئەو پێشتر جارێکیان لە وڵاتی بولگاریادا لە دینەکەی خۆی هەڵگەڕابووەوە، ئەو کاتەی ناچاربوو بۆ قەناعەتپێهێنانی کچەکە تا بیخوازێ، ببێتە کریستیان. ئاخرماڵباتە تووڕەکەی کچەکە وایانخواست، ئیدی لەژێر هەڕەشەی لوولەی تفەنگدا، دینەکەی خۆی گۆڕی و کیژەکەی مارەکرد. هەر ڕاستەوخۆش دوای ژنهێنانەکەی لە سۆفیا هەڵات، ژنەکەش لە داخان خۆیکوشت، ئەوسا گەڕایەوە سۆفیا و بووەوە جووەکەی جاران.

ئەمجارەیان دیسان وایکردەوە. لەگەڵ یارەکەیدا سەفەری ئۆرشەلیمی کرد و لە کڵێسای تێرا سانتادا، سەرانشۆ[92] کراو کرایە کریستیان و ناوەکەشی کردە «ئیڤۆر»[93]. ئەو بەڵگەنامانەی بەکارهێنان کە کڵێساکە بۆی دەرهێنا، ئیدی ئەو کاپتنە ڕووخۆشەکە لە وەزارەتی کاروباری ناوخۆدا بۆ پاسپۆرت بەناوێکی نوێ، بەناوی «ئەلێکساندەر ئیڤۆر» ناوی خۆی تۆمارکرد.

خۆی و یارە ئیتالییەکەی، ڕۆژی ٧ی نۆڤێمبەری ١٩٥٤یان وەک ڕۆژی هاوسەرایەتی دەستنیشانکرد. هەرچی دادگاکەی حەیفاشی بوو لە ٨ی نۆڤێمبەر بوو. ئاڤنەر ئیسرائیل، کە لەهەمان کاتدا بەناوی ئەلێکساندەر ئیڤۆریش دەناسرا، مەیلی لێنەبوو ڕێزی هیچ کام لەو پابەندبوونانەی بگرێ. ئیدی کاتی ئەوەی هات خۆی بزر بکا.

لە کۆتایی ئۆکتۆبەردا، کاپتن ئیسرائیل دوو هەفتە مۆڵەتی وەرگرتبوو. ڤیزای دەرچونیشی نەبوو، بەڵام بە ناوی «ئەلێکساندەر ئیڤۆر» ڤیزا و بەڵگەنامەی تەواو ڕێپێدراو، کە هەندێکیان ڕاستەقینە و هەندێکیشیان ساختەکراوی هەبوون پەیداکردن. بلیتێکی فڕۆکەی بۆ گەشتێک بۆ ڕۆما کڕی و لە چواری نۆڤێمبەریشدا گەشتەکەی کرد. لەم کارەیدا نە ژنەکەی و نە یارەکەشی بە دەرچوونەکەیان نەزانی. یارە ئیتالیەکەی شێت بوو، بە پرسنییەوە[94] بەدوایدا گەڕا. لەکۆتاییدا خۆی گەیاندە پۆلیسی حەیفا، لە ڕێی ئەوانەوە ناوونیشانەکەی دۆزیەوە، کاتێکیش بەگوێرەی ناوونیشانەکەی چووە ماڵی، بە دیتنی خانم «ماتیلدا ئیسرائیل»

---

[92] سەرانشۆ: تەعمیدکردن، ڕێوڕەسمێکی بە کریستیانی بوون.

[93] Ivor

[94] پرسنیی: فزوڵی.

هێدمەگرتی بوو، ئاخر ژنەکەی لە مانگی حەفتەمی چاوەڕوانی دووگیانی خۆیدابوو.

لە ڕۆماش «ئاڤنەر ئیسرائیل» بزربوو، بەڵام زۆری پێنەچوو. ئاخر ئاژانێکی مۆسادی نیشتەجێی ئەوێ سەرچاوەی زۆر باشی لەنێو کۆمەڵگەی دیپلۆماتە عەرەبەکانی ئیتالیادا هەبوو. لە ١٧ی نۆڤێمبەردا برووسکەیەکی بەپەلە گەیشتە بارەگای سەرەکی مۆساد لە تەلئەبیب، کەوا: "ئەفسەرێکی ئیسرائیلی، ئەلێکساندەر ئیڤۆر یان ئیڤۆن یاخود ئیڤی لێرەیە، هەوڵدەدا زانیاری سەربازی بە پاشکۆی میسری لە باڵوێزخانەی میسر لە ئیتالیا بفرۆشێ."

*ڕامسادە*کە و سەرۆکی نوێی شاباک، «ئامۆس مانۆر»[95]، ئاگاداری هێزەکەی کردەوە، ئاخۆ کەسەکە کێیە. لە ماوەی چەند ڕۆژێکی کەمدا ناسنامەکەیان دۆزییەوە، لەوەش زۆر تووڕە بوون کە زانیان ئەفسەرێکی هێزی دەریاوانی ئیسرائیلییە. بروسکەیەکی دیکە لە ڕۆماوە هات کە زیاتر دۆخەکەی شێواند: ئاژانە مۆسادەکە ڕاپۆرتیدا، کەوا «ئیسرائیل» وردەکاری پلانی بنکە بەرفراوانەکەی سوپای بەرگری لە ئیسرائیل، بە ١٥٠٠ دۆلار فرۆشتۆتە میسرییەکان بە جۆرێک پارەکەشی بۆ بخرێتە سەر ژمارە حیسابی بانکە سویسرییەکەی. هەروەها بەڵێنی بە میسرییەکان دابوو زانیاری زیاتریشیان بداتێ و قایلیش بووە کە بەرەو میسر بفڕێ، تا بەشێوەیەکی باشتر زانیاریەکانیان پێڕابگەیەنێ.

دوای یەک دوو ڕۆژ، برووسکەیەکی دیکە هات: "باڵوێزخانەی میسری دوو بلیتی فڕۆکەی بۆ قاهیرە بۆ کۆتایی مانگی نۆڤێمبەر لەلای ئاژانسی

---

[95] Amos Manor

TWA بەڕاپانداون[96]. وەهاش پێدەچی هەردوو ڕێبوارەکەش پاشکۆی سەربازی میسری و ئەفسەرە ئیسرائیلییەکە بن."

ئیدی زەنگی هۆشداری لە بارەگای سەرەکی مۆساد لێدرا. بۆ ئیسەری سەرۆکی مۆساد، جیاوازییێکی زۆر لەنێوان پرسیار و وەڵامی پاشکۆیەکی سەربازی لە باڵوێزخانەیەک و لەگەڵ بردنی خودی هەواڵدەرەکە هەیە، چونکە کاتێ ببردرێتە پایتەختی میسر و لەوێ لەلایەن شارەزایانی بواری هەواڵگری لێپپرسرێتەوە و لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکرێ، دەکرێ زانیاری زۆر دژواری لەبن زمان لێوەدەرێنن. ئەوسا ئیسەر بڕیاریدا بەهەر نرخێک بێ ڕێ لەوە بگرێ (ئاڤنەر ئیسرائیل) بەرەو قاهیرە بفڕێ.

ئیسەر بڕیاریدا تیمە ئۆپەراسیۆنەکەی خۆی بنێرێتە ڕۆما. تا ئەو ڕۆژگارەش هێشتا مۆساد تیمی ئۆپەراسیۆنی تایبەت بەخۆی نەبوو، بەڵکو دەبووایە یەکەی ئۆپەراسیۆنەکانی دەزگەی (شاباک) بەکاربهێنێ. فەرماندەی دەزگەکەش یەکێک لە باشترین ئاژانە ئیسرائیلیەکان بوو. «ڕافی ئیتان» لەچاو پیاوەکانیدا پیاوێکی ئەفسانەیی بوو. ئەو لە کیبوتێک لەدایکببوو، کەسێکی قەڵەوی کورتبەنەی چاویلکەلەچاو، کەیفساز و وردیلەی ئازا و چالاک و دڵڕەق بوو. بەر لە ساڵەکانی سەربەخۆیی، جەنگاوەرێکی (پالماخ) بوو، بە قووڵیش بە ئالیا بێت[97] گرێدراو بوو، «ئالیا بێت»یش ئەو ڕێکخراوە نهێنییە بوو، کە جووەکانی لە دەرەوەی وڵات بەقاچاخی و سەرەڕای ئەو ڕێسا توندوبەندانەی ماندانی بەریتانی دەهێنایە فەلەستین. ئەو کۆچبەرانە دەبووایە بە بەلەمی شەقوشڕەوە لە

---

[96]لێرەدا وشەی بەڕادانم پڕبەپێستی orderی ئینگلیزی زانی، بۆنمونە فلانە شتم ئۆردەرکردووە، واتە بەڕادانم داوە.

[97] Aliya Beth

ئەورووپاوە و دوور لە چاوی کەشتیگەلی جەنگی بەریتانییەوە، بگەیەندرێنە کەناراوەکانی فەلەستین، لەوێ لەسەر کەنارێکی چۆلوهۆڵدا دابەزێندرێن، ئەوسا هەر بەدزیەوە بگوازرێنەوە و بخزێندرێنە نێو ئاکنجییە جووەکانی وڵات. ناوبانگی زۆری «ڕافی ئیتان» بۆ تەقاندنەوەی ئەو ڕادارە چاودێرییە بەریتانییەی سەر کێوی (کارمل) لە حەیفا دەگەڕێتەوە، کە هاتنی بەلەمەکانی ڕێکخراوی (ئالیا بێتی) دەدۆزیەوە. بۆئەوەی بگاتە ڕادارەکەش دەبووایە بەنێو زێرابێکی پیس و پۆخڵدا بڕوا، هەربۆیە ناوی لەخۆی نابوو "رافیە بۆگەنەکە". چالاکیەکانیشی لە میانەی جەنگی سەربەخۆییدا نیشانەی ئازایەتی و زیرەکی هەواڵگریەکەی نیشاندا. کاتێکیش «ئیسەر» تیمە ئۆپەراسیۆنەکەی کۆکردەوە، خەڵکانێکی پاشخانجیاوازی تێدا کۆکردنەوە: ئەوانەی لە هۆلۆکۆست دەربازببوون، جەنگاوەرە دێرینەکانی پالماخ و هاگانا، ئەندامی پێشووی گرووپەکانی ئیرگون و گرووپی ستێرن، کە گرووپی لابالی ڕاسترەوی میلیشیاکان بوون کە بەر لە خەباتی دەوڵەتەکە ڕاودەندران. (یەکێکیش لەو کەسانەی هێندرایە ڕیز، «ئیسحاق شامیر»ی فەرماندەی پێشووی گرووپی ستێرن بوو، پاشان بووە سەروەزیر.)

«ڕافی ئیتان» بە بەرپرسی تیمی ئۆپەراسیۆن دەستنیشان کرا.

ئەویش لەگەڵ ئاژانەکان؛ ڕافێل مێدان و ئامانۆئێل (ئێما) تالمور بەرەو ڕۆما فڕین. زۆری پێنەچوو چەند ئاژانێکی دیکەشیان گەیشتنێ. دەستبەجێ بۆسەیەکیان لە فڕۆکەخانەی «فیومیکۆ» لە ڕۆما بۆ دانایەوە. لەدوا خەبەری بەر لە دەرچوونیان لە تەلئەبیب، «ئیسەر» فەرمانی پێکردبون کە «ئاڤنەر ئیسرائیل» لە فڕۆکەخانەکە بوەستێنن. "بەهیچ شێوەیەک نابێ پێی بگاتە نێو فڕۆکەکە. تەشقەڵەیەکی پێبکەن، بەرزەفتی

بکەن، ئەگەر پێویست بکا بریندایشی بکەن. خۆ ئەگەر هەموو ئەم کردەوانەش دادی نەدا، تەقەی لێبکەن و بیکوژن!"

ئەمەش یەکەمین جار بوو ڕێگە بە ئاژانەکانی ئیسرائیل بدرێ، کەسێکی خۆیان بکوژن.

بەڵام خۆ پەلاماردانی فڕۆکەخانەکە ڕوویندا. دیاربوو ئەو زانیاریانەی سەبارەت بە گەشتەفڕینەکەی میسر درابوو، هەڵەبوو؛ کابرا جارێ هەر لەڕۆما مایەوە، پاشان لەپڕ ڕۆمای بەجێهێشت و گەشتێکی بەنێو ئەورووپادا کرد و تیمەکەی «ڕافی ئیتان»یشی بەدواوەبوون. بۆئەوەی ڕاوەدونەرەکانی بهەژێنێ، کابرا چووە زیوریخ، جنێڤ، گیۆنا، پاریس، ڤیەنا...

ئەوسا و لەپڕ «کاپتن ئیسرائیل» دیارنەما. ئاژانەکانی مۆساد هەموو کون و قوژبنێکی بەدواداگەڕان، بەڵام نەیاندۆزیەوە. پاشان بەخت هەروەک جاران یاوەری ڕافی ئیتان بوو. لە ڤیەننا نێردەیەکی ئیسرائیلی هەبوو لە ڕێکخراوی نهێنی، بەناوی «ناتیڤ»، ئەرکەکەشیان گەڕان و دۆزینەوەی ئەو گەشتە فڕینانە بوو کە جووەکانیان لە ڕووسیا و بلۆکی ڕۆژهەڵاتەوە دەگواستنەوە ئیسرائیل. پیاوەکەی «ناتیڤ» پەیوەندییەکی توندوتۆڵی لەگەڵ مۆساددا هەبوو. لە ڕۆژێکی نۆڤێمبەردا، ژنەکەی کە لە بولگاریا لەدایکببوو، بەشتێک سەرسامی کرد.

"ئەوەی دەیڵێم هەرگیز بڕوا ناکەی،" ژنەکە بە ڕووگەشیەوە وای بە مێردەکەی خۆی گوت؛ "ئەم بەیانییە بەسەر شەقامەکەدا دەڕۆیشتم، ئیدی لووتم بە لووتی برادەرێکم لە سۆفیا چەقی. چەندین ساڵە نەمبینیوەتەوە. ئێمە کاتی خۆی بەیەکەوە دەچووینە قوتابخانە، هاوپۆلیش بووین! ئای چ ڕێکەوتێکی سەیرە، ئەرێ بەڕاست تۆش هەروای نابینی؟"

مێردەکەیشی لێپرسی: "بەڕاست؟ برادەرەکەت ناوی چیە؟"

– "«ئەلێکساندەر ئیسرائیل». بەیانی بۆ نانی نیوەڕۆ دیدارێکمان هەیە."

ئەو ئەندامەی «ناتیڤ» دەیزانی، گەڕان و پشکنینە نهێنیەکەی «ئیتان» ڕێک لەگەڵ ئەو کەسەدا دێتەوە کە ژنەکەی وەسفی بۆکرد، بۆیە ڕاستەوخۆ زەنگی هۆشداری لێدا. بۆ ڕۆژی پاشتر پیاوەکانی مۆساد بۆ کاتی نانی نیوەڕۆ چوونە هەمان چێشتخانە و لەبەردەم مێزێک دانیشتن کە زۆر لە هی «ئەلێکساندەر ئیسرائیل» و هاوڕێی تافی منداڵێتیەکە دوور نەبوو، کە یادگاریان بۆ یەک دەگێڕایەوە. کاتێکیش ئیسرائیل لە چێشتخانەکە هەڵسا و ژنی کابرای ناتیڤی بەجێهێشت، ئاژانەکان وەک سایەی بەدوایدا خشان.

یەک دوو ڕۆژ دواتر، «ئەلێکساندەر ئیڤۆر» سواری فڕۆکەیەکی هێڵی ئاسمانی نەمساوی بوو، بەرەو پاریس فڕی. لەسەر کورسییەکەی تەنیشت ئەودا کچێکی شۆخوشەنگی سەرنجڕاکێش دانیشبوو. «ئیڤۆر»یش ئەو پیاوە بوو، دەیزانی چۆن لەگەڵ ئافرەتاندا بێتەوە، سەری قسەی لەگەڵ کچەکەی تەنیشتی داهێنا، کچەکەش بە خۆشحاڵییەوە لەگەڵی کەوتە قسان. ئیدی بڕیاریاندا دوای گەشتەکە دیسان لە پاریس بۆ شەوەکەی لەناو شاردا یەکدی ببیننەوە. بەرلەوەی لە فڕۆکەکەش دابەزن، کچەکە ڕووی خۆی لە «ئیڤۆر»ی ئەفسەر کرد و پێیگوت: "چەند برادەرێکم لە فڕۆکەخانەکە بەدوامدا هاتوون. حەزت لێیە لەگەڵمان بێی؟ من دڵنیام لەناو ترومبێلەکەدا جێی تۆش دەبێتەوە."

ئیڤۆریش پێیخۆش بوو. لە فڕۆکەخانەکەدا، دوو جێنتلمانی ڕێکپۆش چاوەڕێی خاتوونەکەیان دەکرد. ئیدی هەر چواریان سواری ترومبێلەکە

بوون و بەرەو پاریس لێیانخوڕی. «ئیڤۆر» لە تەنیشت شوفێرەکە دانیشت. شەویش داهاتبوو؛ لێخوڕەکەش تێبینی کرد پیاوێک لە دووڕیانە نیوە ڕووناکەکە وەستاوە و دەستی بۆ هەڵبڕیوە، وەک ئەوەی بیەوێ لەگەڵیان سواربێ. شوفێرەکەش وتی؛ "دەی دەبا لەگەڵ خۆماندا هەڵیگرین." ترومبێلەکەی وەستاند، ئەوسا لەهیکەوە ئەو کابرایەی دەستی بەرزکردبووە لەگەڵ یەک دوو پیاوی دیکە، لەنێو تاریکایی وەدەرکەوتن، دەوری ترومبێلەکەیاندا، لەوکاتەشدا ترومبێلێکی دیکەش لەپشت ئەوان پەیدابوو.

ئیڤۆریش هاواریکرد: "ئێمە ڕفێندراین! "ئینجا لەپڕێکەوە ئەو پیاوەی لەپشت ئەوەوە دانیشتبوو، دەستی لە ئەوکی ئیڤۆرەوە نا. ئیڤۆریش بەدەست پەلاماردانەکە گیرۆدەبوو. دەرگەی ترومبێلەکە کرایەوە، ئەو پیاوانەی لە دەرەوە وەستابوون بازیاندایە و ئیڤۆریان بەرزەفتکرد. ئینجا یەکێکیان دەمانچەکەی دەرهێنا و بە زمانی عیبری تێیخوڕی[98]: "هەر یەک جووڵەیەکی دیکە بکەی، کوژراوی!"

«ئیڤۆر» کە وای بیست، لە جێی خۆی گۆد بوو. پارچە پەڕۆکێکی بە دەرمانیان بەسەر دەموچاو دادا، «ئیڤۆر» خەوێکی قووڵی لێکەوت. ئەوسا بە نهێنی بردرایە یەکێک لە ماڵە پارێزراوەکانیان[99] لە پاریس، لەوێ پیاوەکانی «ڕافی ئیتان» لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا کرد. ئەویش ددانی پێدانا کە بەڵگەنامەی زۆر نهێنی فرۆشتۆتە میسرییەکان، هەموو ئەم کارانەشی لەپێناوی پارەدا کردوون. لە ئیسرائیلیشەوە، ئیسەر بروسکەی کرد کە بیگەڕێننەوە وڵات. تەنانەت ناپاکێکی سادەش بڕوای وابوو دەبێ دادگایەک

[98] تێخوڕین ، بەسەرداهاوارکردن، ئاگادارکردنەوە.

[99] ماڵی سەلامەت: ئەو خانوانە بوون کە ئاژانسەکە بۆ کاری نهێنی خۆی بەکاریدەهێنان.

هەبێ و مافە قانونییەکانی پێشێل نەکرێن. «ئیتان» و پیاوەکانی «ئاڤنەر»یان ڕاکێشا و خستیانە سندووقێک و لە فڕۆکەیەکی بارهەڵگری هێڵی ئاسمانی ئیسرائیلی (داکۆتا)یان بارکرد، ئەم جۆرە فڕۆکەیەش لە هەفتەیەکدا یەکجار لەنێوان پاریس و تەلئەبیبدا دەفڕی.

ڕێگەی گەڕانەوە بۆ نیشتمان درێژ و تاقەتپڕوکێن بوو. دەبوایە فڕۆکەکە لە ڕۆما و ئەسینا پڕبەنزین بکرێتەوە. دکتۆرێکی ناسراو -بەنجلیدەرێک بەناوی ئۆنا ئیلان- لەگەڵ گروپەکەدا بوو. بەر لەهەر دابەزین و هەڵستانێکدا دەبووایە دکتۆرەکە دەرزییێکی سڕکردن لە ڕێبوارەکەدا بدا. دوای هەڵفڕینەکەی ئەسینا، خراپ قەوما. «ئاڤنەر ئیسرائیل» بێهۆشکەوت و لەپڕ بە قورسی هەناسەی دەدا، لێدانی دڵی زیادیکرد و ناڕێکیش بوو. دکتۆر «ئیلیان» زۆر تێکۆشا بارودۆخەکەی جێگیربکاتەوە، هەوڵیدا بەهۆشخۆی بێنێتەوە، لێدانی دڵی ئاسایی بکاتەوە، بەڵام بێهودە بوو. هێشتا زۆریان مابوو بگەنە ئیسرائیل، دەستبەسەرەکە گیانی لەدەستدا.

هەر دوای دابەزینەکەو دەستبەجێ، ئاژانەکانی مۆساد ئیسەریان لە مردنی ئیڤۆر «ئیسرائیل» ئاگادارکردەوە. *ڕامساد*ەکەش فەرمانیدا کە هەر بە فڕۆکەکە تەرمەکە هەڵبگرن و دوور فڕێی بدەن. ئەوسا دوور لە کەناراوەکانی ئیسرائیل تەرمەکەیان فڕێدایە نێو دەریا.

ئەم کارە زیانبەخشە لەدەستدەرچووە چاوەڕواننەکراوە، بووە مایەی مقۆمقۆ لەنێو بارەگای سەرەکی مۆساددا. ئەمە وایکرد ئیسەر خێرا بچێتە لای نووسینگەی «موشێ شارێت»ی سەروەزیر، داوای لێکرد لە دەرەوەی وڵات پەڕاوێک بۆ لێکۆڵینەوە لە ئەفسەرەکانی مەرگی «ئیڤۆر» بکاتەوە. «شارێت»یش دوو پیاوی بۆ ئەم کارە دەستنیشانکردن، ئەوانیش لەدواییدا بێخەتایی ئاژانەکانی مۆسادیان لە هەموو هەڵەیەک ڕاگەیاند. هەموو ئەوانەی پیاوەکانی مۆساد کردیان، ئەوەبوو پیاوەکە بپێچنەوە و

بۆ دادگاییکردن بیهێنەوە وڵات؛ ئەوان لە مردنی «ئیڤۆر» سووچبار[100] نەبوون. وەک لە لێکۆڵینەوەکەدا دەرکەوت، هۆی سەرەکی مردنی کابرا ئەوەبوو، دکتۆرەکە بڕێکی زیادی دەرمانی بێهۆشکردنی داوەتە دەستبەسەرەکە. دوای ساڵانێکیش، کاتێک لە دکتۆرەکە پرسیارکرا، کە کابرای تایین بۆچی مرد، ئەویش گوتی؛ مردنەکە بەهۆی گۆڕانی کتوپڕی پاڵەپەستۆی هەوای ناو فڕۆکەکەوە بوو. (لە ١٩٦٠یشدا هەمان دکتۆر، جارێکی دیکە لە کردەیەکی دیکەی بەنجکردنی گیراوێکی دیکە بەشداربوو، لە بەنجکردنی «ئەدۆلف ئایخمان»، کاتێ لە ئەرجەنتینەوە ڕفاندیان و هێنایانە ئیسرائیل.)

پیاوەکانی ئیسەر لە کاغەز و بەڵگەنامەکانی «ئاڤنەر ئیسرائیلیان» کۆڵییەوە، ئیفادەکە و ئەو نامە سەلمێندراوانەیان بۆ دەرکەوتن کە لە کڵێسای کاسۆلیکی ئۆرشەلیمەوە دەرچوبوون؛ دوای فرۆشتنی بەڵگەنامەکان بە میسرییەکان. کابرا بەنیازبووە بەرەو باشووری ئەمریکا هەڵبێ. لەنێو هەگبەکەیدا بلیتێکی گەشت بەکەشتی بۆ بەڕازیلی تێدابوو.

کێشەی دوای ئەوە کە بەرۆکی ئیسەری گرت، خێزانەکەی کابرا بوو. دەبووایە بانگی ماتێلدای بکردبایە و تەواوی سەربردە ڕاستییەکەی بۆ گێڕابایەوە. بەڵام سەرۆکی مۆساد، لە کۆتایی گۆبەندەکە و لە داوای لێبوردنکردن وەڕەز بوو، بۆیە بە باشی زانی بەردێک لەسەر چیرۆکەکە دابنێ و لەمەشدا پشتگیری تەواوی سەروەزیری هەبوو. مۆساد چیرۆکی هەڵبەستراویان لەبارەی کاپتن «ئاڤنەر ئیسرائیل» بۆ ڕۆژنامەوانی دزەپێکرد. ئاماژەیەکی وایان دا گوایە دوای ئەوەی کاپتنەکە کەوتۆتە بن قەرزوقۆڵە و دوای ئەوەی تووشی داوی گۆبەندێکی ڕۆمانتیکی بووەتەوە،

[100] سووچبار: خەتابار.

له ئیسرائیل هەڵاتووە. ئەم چیرۆکانەش بە خەتی درشت بوونە سەردێڕی ڕۆژنامەکان.

بۆ چەندین ساڵیش، «ماتیلدا» و براکانی مێردەکەی و کوڕەکەی «موشێ ئیسرائیل ئیڤۆر» نەیانزانی چی قەوماوە. ئەوان لەو بڕوایەدابوون، هێشتا هەر لەژیاندا مابێ، لەوانەیە لە باشووری ئەمریکا بێ. ئەو درۆیەش هی لەبیرچونەوە نەبوو.

یەکەمین شکستی ئەو ئەرکە، چۆنیەتی ڕەفتارنواندن بوو لەگەڵ «ئیڤۆر ئیسرائیل»، تەنانەت لەگەڵ ئەوەی کە ناپاکیش بووە؛ شکستی دووەم پیلانی بێدەنگبوونەکە بوو، سڕینەوەی ناوی تەواوی کابرا لەنێو تۆماری سەربازیدا، لەخشتەبردنی ژن و برایەکانی. «ڕافی ئیتان» و چەندین ئەفسەری مۆساد بە توندی بڕیارەکەی *ڕامسادە*کەیان ڕەتکردەوە بەوەی تەرمەکەی فڕێبدرێتە نێو دەریا و خێزانەکەی لە خشتە ببردرێ، بەڵام چاریان نەبوو دەستیان بەسترابوون. "ئاخر ئیسەری بچووک ئەوێ ڕۆژێ سەرداری ئاسایش بوو." «ئیتان» وای بە ئێمە گوت و لەسەریشی ڕۆیشت: "ئەو دەسەڵاتداری ڕەهای دەزگەی نهێنی بوو، کۆمەڵگەی هەواڵگیریش هەرگیز لە بڕیارەکانی دەرنەدەچوو."

دوای ساڵانیکی زۆر، بڵاوکردنەوەی ئەم چیرۆکە، ئەوە نمایش دەکا کە چەند سەختە، بە ئەنقەست بوونی کەسێک شوێنبزر بکرێ. تەنانەت دوای مردنیشیان، هەندێ جار لە پشت گۆڕەکەشیانەوە شتمان پێدەڵێن.

ئەمە هەمووی لەبن سەری پەیوەندییێکی خۆشەویستییەوە بوو.

لە بەهاری ١٩٥٦دا، «لوسیا بارانۆڤسکی» بە تەواوی گیرۆدەی داوی خۆشەویستی بوو لەگەڵ «ڤیکتۆر گراڤسکی»ی ڕۆژنامەنووسە کەشخەکە. شووکردنی «لویزا» بە جێگری سەروەزیری پۆلەندای کۆمۆنیست لەسەر لێواری هەڵوەشانەوەدا بوو، ئەوان بە ئاستەم یەکدیان دەبینی. خۆی «لویزا» وەک سکرتاریەتی «ئێدوارد ئۆخاب»[101]ی سکرتێری گشتی پارتی کۆمۆنیستی پۆلۆنی کاری دەکرد. ئەندامانی ستافی سکرتێری گشتییش بە سەردانە لەسەریەکەکانی «ڤیکتۆر»ی قۆز و کەشخە بۆ لای دۆستەکەی ڕاهاتبوون. ئیدی شتێک بەنهێنی لە گۆڕێدا نەمابۆوە کە «لویزا» هەستی بۆ لای کوڕە قۆزەکە دەبزوێ.

ڤیکتۆریش نووسەرێکی لە پێشی ئاژانسی هەواڵی پۆلۆنی (PAP) بوو، ئیشەکەی پەیوەستبوو بە سۆڤیەت و کاروباری ئەورووپای ڕۆژهەڵات. لەڕاستیشدا ئەو جوو بوو، ناوە ڕاستەقینەکەشی «ڤیکتۆر شپیلمان» بوو. بەڵام چەند ساڵێک پێشتر، کاتێک هاتبووە ڕیزی پارتی کۆمۆنیستەوە، برادەرێکی ئاگاداری کردبووەوە، لەوانەیەبە پاشناوێکی وەک «شپیلمان» هیچ پێشکەوتن لەبواری کارنامەکەی بەدەست نەهێنێ. بۆیە ناوەکەی کردە «گراڤسکی»، کە ناوێکی پۆلۆنی بوو.

---

101 Edward Ochab

کاتێکیش لەمیانەی جەنگی دووهەمی جیهانەوە، سوپای ئاڵمان بەسەر پۆلەندا کشا، ئەو منداڵ بوو. ماڵباتەکەی توانیبووی لەوێ هەڵبێ و بچێتە ڕووسیا، بەمجۆرە بەئاستەم لە کارەساتی هۆلۆکۆست دەربازببوو. دوای جەنگیش، گەڕانەوە پۆلۆنیا. لە ١٩٤٩شدا، دایبابی[102] ڤیکتۆر و خوشکە بچکۆلانەکەی بەرەو ئیسرائیل کۆچیانکرد. بەڵام ئەو کە کۆمۆنیستێکی دڵسۆز و پەرۆش بوو هەر لەوێ مایەوە؛ ئەو کەسێک بوو بە ستالین کارانگاز بوو، حەزی لەوە بوو لە دروستکردنی بەهەشتی کرێکاراندا یارمەتی بدا.

بەڵام خۆ نە برادەر و هاوڕێکانی، تەنانەت نە یارەکەشی نەیاندەزانی، کە بێمەیلی و دوورکەوتنەوە لە کۆمۆنیستی لە کانگەی دڵییەوە خەریکی چەکەرەکردن بوو. لە ١٩٥٥دا سەردانێکی ماڵباتەکەی خۆی لە ئیسرائیل کرد و لەوێ جیهانێکی دیکەی بینی، جیهانێکی ئازاد، پەرەسەندوو، دەوڵەتێکی دیموکراسی جوو، خەونگەلێک جیاوازبوو لەوەی پڕوپاگەندەی کۆمۆنیستی جاڕی بۆدەدا. لە گەڕانەوەی بۆ پۆلۆنیادا، ڤیکتۆری تەمەن سی ساڵە، لە هەڵسەنگاندنی ڕەوشی کۆچکردندابوو بۆ ئیسرائیل.

سپێدەیەکیان لەسەرەتای مانگی ئەپریلی ١٩٥٦دا، «ڤیکتۆر» هەروەک جاران، بە شێوەیەکی ئاسایی لە نووسینگەی سکرتێری گشتی حیزبی کۆمۆنیستی سەرێکی خۆشەویستەکەی دا. لەوێ لە گۆشەیەکی سەر مێزەکەدا، بڵاوکراوەیەکی بینی کە بە بەرگێکی سوور داپۆشرابوو، ژمارەیەک لەسەر بەرگەکە هەبوو، بە مۆرێکی سووریش ئەم دەستەواژەیەی لەسەر هەڵکەندرابوو: زۆر تایبەت و نهێنی.

---

[102] دایباب: دایک و باوک.

لە یارەکەی پرسی: "ئەریٚ ئەوە چییە؟"

ئەویش بێباکانە وەڵامی دایەوە: "ئۆو، ئەوە دوانەکەی خرۆشۆفە."

ڤیکتۆر لەجێی خۆی سڕبوو. ئەو هەواڵی دوانەکەی خرۆشۆفی بیستبوو، بەڵام کەس نەدیبوو، کە گوێی لە وتارەکە بیٚ یان تاکە دێڕێکیشی لێخوێندبێتەوە. ئاخر دوانەکە یەکیٚ لە شتە هەرە نهێنیپارێز و هەڵگیراوەکانی بلۆکی کۆمۆنیستی بوو.

ڤیکتۆر دەیزانی، «نیکیتا خرۆشۆف» سکرتێرە گشتییە دەسەڵاتدارەکەی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤێتی، لە بیستەمین کۆنگرەی حزبەکەیدا وتارێکی لە کرێملین و لە مانگی فێبرایری پێشوودا دابوو. لە ٢٥ی فێبرایەردا، کەمێک بەر لە نیوەی شەو، هەموو میوانە بیانییەکان و سەرانی هەموو پارتە کۆمۆنیستەکان داوایان لێکرا هۆڵەکە جێبێڵن. ئیدی لە نیوەی شەودا، خرۆشۆف، قسەی بۆ ١٤٠٠ نێردەی سۆڤیەت کرد. دەگوترا دوانەکەی شتێکی سەرسامانە و سامناکانە بوو بۆ هەموو ئەوانەی لەویٚ گوێیان لێگرتبوو.

تۆبلێی چی گوتبیٚ؟ بەگوێرەی ڕۆژنامەنووسێکی ئەمریکی کە ڕاپۆرتەکانی بۆ ڕۆژئاوا لەبارەی سۆڤیەتەوە دەنووسی، لە بەرایی ڕاپۆرت و هەواڵەکاندا بوو، دوانەکە چوار سەعاتی خایاندووە و خرۆشۆف بە وردەکارییەوە وەسفی هەموو ئەو تاوانانەی ئەو پیاوە «ستالین»ی کردبوو کە لە سەرتاسەری جیهاندا بە ملیۆنان کەس پێیەوە سەرسام بوون. بەپێی دەنگۆکان، خرۆشۆف لە دوانەکەیدا، ستالینی بە قەتڵوعامکردنی ملیۆنان کەس تاوانبارکردبوو. هەندیٚ کەس بەچرپەوە

کاتێ گوێیان لە دوانەکە بوو گریان و لە نامرادییان پرچی سەری خۆیان ڕادەکێشا؛ هەندێکیان دڵیان لەخۆ بووەوە یان تەوژمی دڵ لێیدان، بەلای کەمیش دوو کەسیان دوای شەوەکە خۆیان کوشت.

بەڵام تاکە وشەیەکیش لەو دوانە ڕاشکاوانەی خرۆشۆف لە میدیاکانی سۆڤیەتییەوە ڕانەگەیەندرا. ئیدی بەندوباو لە مۆسکۆ پەیدابوو، گوایە هەندێک بڕگە و لاپەڕەی وتارەکە لە دانیشتنی تایبەتی و لەنێو ئۆرگانە هەرە باڵاکانی حزبییەوە خوێندراونەتەوە و باسیان لێوەکراوە. بەڵام تەواوی وتارەکە پارێزراو بوو، وەک نهێنییەکی دەوڵەت هەڵگیرابوو. هەواڵنێرە بیانییەکان بە ڤیکتۆریان گوتبوو، کەوا دەزگە نهێنییەکانی ڕۆژئاوا هەموو هەوڵێکی خۆیان خستۆتەگەڕ بەڵکو دەقی وتارەکەی خرۆشۆف بەدەستبێنن. تەنانەت سی ئای ئەی لە پاداشتی بەدەستخستنی دوانەکەدا یەک ملیۆن دۆلاری تەرخانکردبوو. وا دەخەملێندرا کە بڵاوکردنەوەی وتارەکە لە جەرگەی شەڕی ساردا ببێتە مایەی بومەلەرزەیەکی سیاسی لەنێو وڵاتە کۆمۆنیستەکان و دەرگەی قەیرانێکی بێپێشینەیان لەسەردا بکاتەوە. بەسەدان ملیۆن کۆمۆنیست لەنێو ڕووسیا و دەرەوەیدا، نابینایانە ستالینیان دەپەرست. ئیدی پەردەهەڵدانەوە لەسەر ئەو تاوانانەی ئەو، دەبووە مایەی ڕووخاندنی ئەو بڕوایەی بەویان هەبووە و لەوانەشبوو ببێتە هۆی لەیەکهەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤیەت.

بەڵام خۆ هەموو هەوڵێک بۆ پەیداکردنی دەقی وتارەکە بەفیڕۆچووبوو.

لەدواییدا «ڤیکتۆر» تێگەیشت، کەوا خرۆشۆف بڕیاریدابوو چەند دانەیەکی ژمارەدار بۆ سەرکردەکانی حیزبە کۆمۆنیستەکان لە ئەورووپای

ڕۆژهەڵاتدا بنێرێ، هەر بۆیەشە ئەو بڵاوکراوە، کە لە زەرفێکی سوور وەرپێچراودا گەیشتۆتە سەر مێزی خاتوو «لویزا».

✡ ✡ ✡

کاتێکیش «ڤیکتۆر» چاوی بە زەرفی دوانەکە کەوت، بیرۆکەیەکی شێتانە لە کەللەی دا. داوای لە «لویزا» کرد بەڵکو فایلەکەی بۆ یەک دوو سەعات بداتێ، بۆ ئەوەی بەهێواشی دوور لە ژاوەژاوی نووسینگەکە، لەماڵ بیخوێنێتەوە. بۆ مایەی سەرسامی خۆی، کچەکە بە داواکەی قایلبوو. ئاخر کیژەکە خواخوای بوو دڵی یارەکەی خۆش بکا... "پێیگوت: "دەتوانی لەگەڵ خۆتی ببەی، بەڵام بەر لە سەعات چواری ئێوارە دەبێ بۆمی بگێڕیتەوە. من دەبێ لەنێو دۆلابەکەدا بە باشی و پارێزراوی هەڵیبگرم."

ڤیکتۆر، لە ماڵەوە دوانەکەی خوێندەوە. هەر بەڕاستی مایەی واقوڕمان بوو. خرۆشۆف بە ئازایی و بێبەزەییانە ئەفسانەی «یوسف ڤیسارینۆڤیج ستالین»ی شکاندبوو. خرۆشۆف پەردەی لەسەر ئەو ساڵانەی دەسەڵاتی ستالین هەڵدابووەوە، کە چ تاوانگەلێکی قێزەون و دژەمرۆیی کردووە، فەرمانی بە کوشتنی ملیۆنان کەس داوە. ئەو هێشتا ئەو وتارەی لینینی لەبیرمابوو، ئەوکات لینین باوکی شۆڕشی بەلشەفی حیزبەکەی لە ستالین ئاگادار دەکاتەوە. خرۆشۆف لە وتارەکەیدا ئەو ڕێبازە کەسایەتیەی ستالین شەرمەزار دەکا کە بە "ڕۆڵەی نەتەوەکان" بانگی بۆ هەڵدەدرا و پەسند درا. ئەو باسی ئەو گردبوونە زۆرەملێیەی سەرتاپای گرووپە ئەتنییەکان لە یەکێتی سۆڤیەتی کردبوو، کە سەریکێشا بۆ مردنێکی بێژمار؛ لە هەڵمەتی "پاککردنەوەی مەزن"ی (١٩٣٦-١٩٣٧)دا لەو کاتەی یەک ملیۆن و نیو کۆمۆنیست گیران و لەنێویاندا ٦٨٠٠٠٠ کەسیان

لەسێدارەدران. لە ١٩٦٦ نوێنەری کۆنگرەی حزبەکەدا، ٨٤٨ کەسیان بە فەرمانی ستالین لەسێدارەدران، لەنێویاندا ٩٨ یان لەو ١٣٨ بەربژارە کۆمیتەی ناوەندی حیزبەکەدا بوون. هەروەها خرۆشۆف باسی دکتۆرە پیلانگێڕەکانیشی کردبوو، ئەو تاوانبارکردنە هەڵبەستراوانەی دژی هەندێ لە پزیشکە جووەکان کە تۆمەتی کوشتنی ستالین و سەرکردەکانی دیکەی حیزبەکەیان درابووەپاڵ. وتەکانی خرۆشۆف دەریانخستبوو ستالین بکەری کۆمەڵکوژییە، کە ملیۆنان کەسی لە ڕووس و نەتەوەکانی دیکە، کە زۆریشیان کۆمۆنیستی دڵسۆز بوون لەناوبردووە. لە چوار سەعاتدا ئەو فریادڕەسە[103] بەدگۆڕانێکی[104] بەسەرداهات و بوو بە دێوەزمە.

وتارەکەی خرۆشۆف دوا کەڵکەڵەی ڤیکتۆری سەبارەت بە کۆمۆنیزم تێکوپێکشکاند. لەوێدا پەی بەوەبرد، شتێکی خۆتەقێنەری وای دەستکەوتووە، سەرتاپای ئۆردوگای سۆڤێتی لە بناغەوە دەهەژێنێ. سەرەتا بڕیاریدا بڵاوکراوە زەرفە سوورەکە بۆ «لویزا» بگەڕێنێتەوە. بەڵام هەر لەسەر ڕێی خۆی، بیرۆکەی دووەمی بۆ هات، ئیدی پێیەکانی هەڵهێنان تا گەیشتە شوێنێکی دیکە، ڕۆیشت ڕۆیشت تا بەردەم

---

[103] لێرەدا وشەی Messiah بەکارهێندراوە. ئەم وشەیەش لە واژەی عیبری Mashiachەوە هاتووە، کە واتای "ئەو کەسەی بە ڕۆن لێیفرێسمێراوە یان ئەو کەسەی هەڵبژێردراوە" دەگەیەنێ. لە تەوراتدا پێغەمبەرەکان، پاشاکان و کەشیشەکان بە ڕۆن لێینادەفرێسمرا بۆ ئەوەی ئەو ئەرکەی سەرشانیان بە باشی ڕایی بکەن. لە کریستیانێتیشدا و لە ئینجیلی یۆحەننادا بە عیسا گوتراوە مەسییا یان مەسیح و بەعیسای گوتوە و کەوا مەسیحێکیان بۆ هاتووە تا فەرمانی خوا بەجێبگەیەنێ. دواتر بەو کەسانە گوتراوە کە مژدەردەر یان ڕزگارکەر یان فریادڕەس بوون. منیش لێرەدا وشەی فریادڕەسم پڕبەپێست زانی.

[104] بەدگۆڕان: مەسخ، میتامێرفۆس. مامۆستا جەلیل کاکەوەیس لە وەرگێڕانی شاکارەکەی کافکادا، ئەو وشە جوانەی داڕشتووە.

باڵوێزخانەی ئیسرائیل. بە بڕوابەخۆبوونێکەوە بەرەو باڵوێزخانەکە ڕۆیشت و دیواری پۆلیسی پۆلۆنی و پیاوانی دەزگەی نهێنی بڕی و لێیگەڕان بچێتەژوور. هەرچەند خولەکێک دواتر، گەیشتە نووسینگەی «یاکۆڤ بارمۆر»، سکرتێری یەکەمی باڵوێزخانەکە، بەڵام لەڕاستیدا ئەو (یاکۆڤ)ە نوێنەرایەتی دەزگەی (شاباک)ی دەکرد لە پۆلۆنیا.

لەوێ «گراڤسکی» فایلەکەی ڕادەستی کابرا کرد. کاتێکیش لاپەڕەکانی هەڵدانەوە، لەجێی خۆی چاوی لێزەق بوون. لە بەرانبەرەکەی پرسی، دەکرێ چەند خولەکێک بوەستی، ئەوسا دەستی گەیاندە بڵاوکراوەکە و ژوورەکەی بەجێهێشت. پاش یەک سەعات هاتەوە. گراڤسکی تێگەیشت کە وێنەی لەبەر بڵاوکراوەکە گرتۆتەوە، بەڵام هیچیشی لێنەپرسی. دەستی دایەوە زەرفەکە و لەبن چاکەتەکەی شاردەوە و لەوێ ڕۆیشت. لەکاتی خۆشیدا گەیشتەوە نووسینگەی «لویزا»، کیژەکەش زەرفەکەی خستە شوێنی پارێزراوی خۆیەوە. کەس نە سەخڵەتی کرد و نە پرسیاریشی لێکرا، ئاخۆ بۆچی بە هەڵەداوان خۆی بە باڵوێزخانەی ئیسرائیلدا کرد.

✡ ✡ ✡

دوای نیوەڕۆیەکی زووی ڕۆژی هەینی، ١٣ی ئەپریلی ١٩٥٦، (زێلیخ کاتس) لێوەژوور نووسینگەی «ئامۆس مانۆر»ی سەرۆکی شاباک کەوت. «کاتز» یاریدەرەی تایبەتی «مانۆر» بوو. بارەگای سەرەکی شاباکیش لە باڵەخانەیەکی گەڕەکی کۆنی عەرەبان بوو لە یافا، زۆر لە بازاڕە سەیر و سەمەرە گەڕۆکەکەوە دوور نەبوو. «مانۆر»یش پرسیاری ڕۆتینی هەینییانەی[105] لە «کاتز» کرد. : "هیچ شتێکت لە ئەورووپای ڕۆژهەڵاتەوە

---

[105] هەینییانە: ئەوشتانەی تایبەتبن بە ڕۆژانی هەینیی.

پێیە؟" هەینیش ئەو ڕۆژە بوو کە دیپلۆماتەکە ڕاپۆرتی سەبارەت بە وڵاتەکانی پشت پەردە ئاسنینەکە[106] بۆ شاباک دەهێنا.

«زێلیخ»یش بێئەوەی هیچ خۆی تێکبدا پێیگوتەوە، هەرچەند خولەکێکی کەم دەبێ پۆستێک لە «وارش»ۆوە پێگەیشتووە. "دوانێکی خرۆشۆف لە کۆنگرەی...." هێشتا قسەکەی تەواو دەرنەبڕیبوو، کە «مانۆر» بە بازدانێک لە شوێنی خۆی هەڵسا و گوتی: "چی؟" و هاواریکرد "دەی هەر ئێستا بیهێنە!"

«مانۆر» پیاوێکی گەنجی بەژندرێژی کەشخە بوو، هەر تەنیا پێش چەند ساڵێک هاتبووە ئیسرائیل. «ئارسەر مێندۆلۆڤیچ» لە ڕۆمانیا لە خێزانێکی حاڵخۆش لەدایکببوو، ئەو نێردرابووە «ئاوشویتز»، کە سەرتاپای ماڵباتەکەی بە دایباب، خوشک و هەردوو براکەی لەوێ کوژرابوون. ئەو مابۆووەوە، لەناونەچووبوو، کاتێکیش ئۆردوگاکە ڕزگارکرا، کێشەکەی هەر ٣٦ گیلۆگرام دەبوو. گەڕایەوە بۆ «بوخارست»، لەوێ کاری بۆ ڕێکخراوی «ئالیا بێت» کرد، کە ئاوارە جووەکانیان بە قاچاخ دەگەیاندە سەرخاکی فەلەستینی ژێر دەسەڵاتی منداتی بەریتانی. ئەو نازناوی جەنگی خۆی ئەوکات «ئامۆس» و چەندین ناوی دیکەشی بەکاردەهێنا، بۆئەوەی ببێتە مایەی شوێنبزرکردنی کەسایەتی ڕاستەقینەی خۆی. کاتێکیش نۆرەی ئەوهات بێتە ئیسرائیل، دەسەڵاتدارانی ڕۆمانی لە ١٩٤٩دا ڕێگەیان پێنەدا وڵات بەجێبێڵێ. پاشان توانی خۆی بە پاسپۆرتێکی ساختەی چیکی بەناوی «ئۆتۆ ستانێک» دەربازکرد. برادەرەکانی هەر

[106] پەردە ئاسنین: مەبەست بلۆکی سۆڤیەتی ئەوکات بوو. وەرگێڕ.

پێیان دەگوت: "ئەو پیاوەی هەزار ناوی هەیە." لە ئیسرائیلیش ناوی «ئامۆس مانۆر»ی بۆخۆی لێگرت.

بە خێرایش لە نێو دەزگەی نهێنی ئیسرائیلدا بە پلەکانی کارنامەدا سەرکەوت. ئیسەر پێی سەرسام بوو. «مانۆر»یش کەسێک بوو پێچەوانەی ئەو. «ئیسەری بچووک» بوو، ئەو کەڵەگەت. ئیسەر توند و ڕەق، ئامۆسیش نەرم و شارستان. ئیسەر وەرزشی نەدەکرد، لەکاتێکدا مانۆر مەلەوانی، دووگۆلی و تێنس و باسکەی دەکرد. ئیسەر بە ڕووسی و یدیشی[107] دەدوا، هەرچی مانۆر بوو حەفت زمانی دەزانین. ئیسەر ئەندامێکی دڵسۆزی پارتی کرێکاران بوو، ئامۆسیش گرنگی بە سیاسەت نەدەدەدا. ئیسەر لە جلوبەرگدا پیاوێکی خاکی بوو، ئامۆس ڕێکپۆشبوو لەسەر ستایلی ئەورووپییانە. بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانە، ئەو کەسێکی ڕۆشنبیر و پڕ زانیاری و سەرچاوە بوو. ئیسەر لە ١٩٤٩دا (مۆنۆر)ی هێنایە ڕیزی شاباک، هێشتا چوارساڵیش بەسەر کارنامەیدا تێنەپەڕیبوو، کە بنگۆریۆن لەسەر ڕاسپاردەی ئیسەر کردییە بەڕێوبەری دەزگەکە. هەروەها بەرپرسیارێتی ئەوەشی خرایە ئەستۆ، کە پەیوەندی دەزگەی هەواڵگری نهێنی وڵاتەکەی لەگەڵ سی ئای ئەی گرێبدا.

✡ ✡ ✡

لەو ڕۆژە هەینییە باراناویەدا، «مانۆر» سەری بەسەر بارستە کاغەزەکەی وتاری خرۆشۆفدا داگرت. ئەو هیچ کێشەی لە

[107] Yiddish زمانی یدیش یان یدیشی، لە مێژوودا زمانی جووە ئەشکەنازییەکان بووە، لە سەدەی نۆهەمی زایینییەوە ڕیشەی لە ئەورووپای ناوەند داکوتاوە، تێکەڵەیەکی زمانەکانی ئاڵمان، سلاڤی و عیبرییە، جووەکانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات پێی دەدوان.

خوێندنەوەکەیدا نەبوو، ئاخر یەکێک لەو حەفت زمانانەی دەیزانین، ڕووسی بوو. بە خوێندنەوەی لاپەڕەکان، لەو هەموو زانیارییە زۆر و گرنگانەی نێو وتارەکە گەیشت. ئینجا بەلەز هەڵسا و چووە نێو ترومبێلەکەی، یەکسەر بۆلای ماڵی بنگۆریۆن لێیخوڕی.

لەوێ بە سەروەزیری گوت: "پێویستە ئەمە بخوێنیتەوە. "بنگۆریۆنیش کە ڕووسی دەزانی، وتارەکەی خوێندەوە. بۆ ڕۆژی پاشتر، شەممە (شابات) بوو، بە پەلە بنگۆریۆن بانگی «مانۆر»ی کرد. پێیگوت: "ئەمە بەڵگەنامەیەکی نازدارە. ئەوە هەموو شتێک دەسەلمێنێ تەنیا ئەوە نەبێ کە ڕووسیا لە ئایندەدا ببێتە دەوڵەتێکی دێموکراسی."

لە ١٥ی ئەپریلدا وتارەکە گەیشتە دەستی ئیسەر، ڕاستەوخۆش وایبینی کەوا گەنجینەیەک کەوتۆتە دەست ئیسرائیل. ئەمەش واتای ئەوەی دەگەیاند کە پەیوەندییەکانیان بە سی ئای ئەی کە لە ١٩٤٧ دامەزرابوو، توندوتۆڵتر ببێ. کاتێک بنگۆریۆن لە ١٩٥٢دا سەردانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای کرد، بانگی ژەنەڕاڵ والتەر بێدێل سمیسی کرد، ئەو کەسەی کە لە کۆتایی جەنگی دووهەمی جیهاندا لە ئەورووپادا بینیبووی. «بێدل سمیس» بەڕێوبەری دەزگەی سی ئای ئەی بوو (لەسەروبەندی ئەوەشدا بوو «ئاللن دەلەس» جێگەی بگرێتەوە. دەلەسیش OSS[108]ێکی دێرین بوو، برای وەزیری داهاتووی کاروباری دەرەوە بوو). بێدل سمیس بە دوودڵییەوە قایلبوو بەوەی پەیوەندییێکی هاوکاری سنووردار لە نێوان سی ئای ئەی و مۆساددا دابمەزرێنێ. توخمە

[108] دەزگای هەواڵگری نهێنی ئەمریکا بەر لە پێکهاتنی سی ئای ئەی و لە کاتی جەنگی دووهەمی جیهاندا.

سەرەکییەکەی هاوکارییەکەیان ئەو زانیاریانە بوون کە ئیسرائیلیەکان لەڕێی لە کۆچبەرانی یەکێتی سۆڤێتی و بلۆکی ڕۆژهەڵاتی بەدەستی دەکەوتن. زۆریشیان لەوانە ئەندازیار، تەکنیکار و تەنانەت ئەفسەری سوپا بوون، کە لە دامەزراوەکانی سۆڤیەت و بلۆکی وارشۆدا کاریان دەکرد و دەیانتوانی زانیاری ورد لەسەر سوپای بلۆکی ڕۆژهەڵاتی بەدەستبهێنن. ئەو زانیاریانەش بەردەوام بۆ ئەمریکییەکان دەنێردران و پێیشی سەرسامبوون؛ سی ئای ئەی کەسێکیان بۆ پەیوەندییەکان لەگەڵ ئیسرائیلییەکان دانا، ئەویش جێمس جیسس ئەنگلتن[109]، کەسە تەلیسماوییێکی بەرپرسی دژەهەواڵگری (دژەجاسووسی) سی ئای ئەی بوو. «ئانگلتن» سەردانی ئیسرائیلی کردبوو، بە سەرانی دەزگەی هەواڵگرییەکەیشی ئاشنا ببوو. پەیوەندییێکی دۆستانەشی لەگەڵ «ئامۆس مانۆر» دروستکردبوو، تەنانەت بۆ یەک دوو شەویش بوتڵە وێسکی سکۆتلەندیشی بۆ ژوورە دوو چرپایەکەی ناردبوو.

بەڵام ئەمجارەیان ئیسەر و ئامۆس زانیاری زۆرتریان لە هی کۆچبەران پێبوو. ئەوان بڕیاریاندا، وتارەکەی خرۆشۆف ڕادەستی ئەمریکییەکان بکەن، بەڵام نەوەک بیدەنە پیاوەکەی سی ئای ئەی لە تەلئەبیب، بەڵکو ڕاستەوخۆ لە واشنتن بیاندەنێ. «مانۆر» دانەیەکی لەبەرگیراوی وتارەکەی بە پەیکی تایبەت بۆ «ئیزی دۆرۆت»ی نوێنەری مۆساد لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نارد، ئەویش خێرا خۆی گەیاندە لای «ئانگلتن» و پۆستەکەی ڕادەستکرد. لە ١٧ی ئەپریلییشدا، «ئانگلتن»

[109] James Jesus Angelton

وتارەکەی گەیاندە «ئاللن دەلەس»، هەر هەمان ڕۆژیش هەندێ بەدرەنگەوە، وتارەکە گەیەندرایە سەر مێزەکەی سەرۆک ئایزنهاوەر.

شارەزا ئەمریکییەکانی بواری سووسەکاری زۆر سەرسام بوون. ئاخر دەزگەیەکی بچکۆلەی هەواڵگری ئیسڕائیل بتوانێ ئەو دەستکەوتە گەورەیە بەدیبێنێ، کەچی دەزگەیەکی زەبەلاحی ئاڵۆز و پەلهاوێژی وەک هی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بەریتانیا و فەرەنسا ئەوەیان پێنەکرێ. بە گومانەوە ئەفسەرە پلەباڵاکانی سی ئای ئەی بەڵگەنامەکەیان لەڕێی پسپۆڕەکان تاقیکردەوە، ئەوانیش بە یەکدەنگی ڕاستی و دروستی شتەکەیان سەلماند. لەسەر بنەمای ئەو بەڵگەنامەیەدا، سی ئای ئەی هەواڵێکی بۆ ڕۆژنامەی نیویۆرک تایمز دزە پێکرد، ڕۆژنامەکەش لە ڕۆژی ٥ی حوزەیراندا لەلاپەڕەی یەکەمیدا بڵاویکردەوە. ئیدی بڵاوکردنەوەکە جۆرە بوومەلەرزەیەک بوو لە جیهانی کۆمۆنستییدا. ئەمەش هانی ملیۆنان کەسی دا کە پشتی خۆیان لە یەکێتی سۆڤیەت بکەن. هەندێ لە مێژوونووسان پێیانوابوو، کە ڕاپەڕینە خۆڕسکییەکەی پۆلۆنیا و هەنگاریا لە پایزی ١٩٥٦دا دنەی ئەو ئاشکراکردنەی خرۆشۆڤ بوو کە وتارەکەی بۆ تەرخانکردبوو.

ئەو کودەتا هەواڵگرییە بووە خاڵێکی وەرچەرخان لە پەیوەندییەکانی مۆساد بە هاوتا ئەمریکیەکەیەوە، ئیدی ئەو بڵاونامە خاکییە کە «لویزا»ی ناسک و نازدار نیشانی ڤیکتۆری کەشخە و قۆزی دا، بووە مایەی ئەوەی ژینگەیەکی ئەفسانەیی بۆ مۆسادی ئیسڕائیلی بێتەکایە.

✡ ✡ ✡

بگەڕێینەوە بۆ وارشۆ، کەس گومانی بۆ «ڤیکتۆر گراڤسکی» نەچوو بەوەی وتارەکەی خرۆشۆفی بەقاچاغ ئاودیوی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کردبێ. لە ینایری ١٩٧٥شدا ڤیکتۆر کۆچی کردە ئیسڕائیل. بە پێزانینەوە یارمەتیاندا کە کارێک لە هۆبەی ئەورووپای ڕۆژهەڵاتی وەزارەتی دەرەوە بۆ ببیننەوە. کەمێک دوای ئەوەش، وەک نووسەر و هەواڵنێری بەشی پۆلۆنی لە دەنگی ئیسرائیل، ڕادیۆی سەر بە دەوڵەت کارێکی دیکەشی پێدرا.

بەڵام هەرزوو دوای ئەوە، سێیەمین کاریشی دەستکەوت. کەمێک دوای کۆچکردنی بۆ ئیسڕائیل، یەک دوو دیپلۆماتی سۆڤیەتی لە «ئەلپان» بینی. ئەلپانیش ئەو پەیمانگەیە بوو کە کۆچبەران و بیانییەکان فێرە زمانی عیبری دەبوون. وارێکەوت یەکێ لە دیپلۆماتە ڕووسەکانی لە دالانی وەزارەتی کاروباری دەرەوەدا بینی، دیپلۆماتەکە بەوە سەرسامبوو کە چۆن ئەم کۆچبەرە نوێیە کارێکی وا گرنگی لە وەزارەت دەستکەوتووە. هەر دوای ئەو دیدارە، ئاژانێکی کەی گی بی و هەر بەڕێکەوت، لە شەقامێکی تەلئەبیب تووشی ڤیکتۆر هات. ئیدی لەگەڵ ڤیکتۆر کەوتە قسەوباس و ڕۆژانی ڕابردووی لە پۆلۆنیا بەبیر هێنانەوە، کە کاتی خۆی کۆمۆنیست و دژە نازی بووە. ئینجا شتێکی بۆخستەڕوو: وەرە ببە ئاژانێکی کەی گی بی لە ئیسڕائیل. گراڤسکیش بەڵێنی پێدا بیری لێبکاتەوە، ئینجا ڕاستەوخۆ بایدایەوە لای بارەگای سەرەکی مۆساد و لێی پرسین: "باشە ئێستا من چی بکەم؟"

پیاوەکانی مۆسادیش بەم هەواڵە دڵخۆش بوون. "زۆر نایابە،" وا وەڵامیان دایەوە. لەگەڵیدا برۆ و بە داواکە "قایل ببە!" ئاخر دەیانەویست

«گراڤسکی» ببێتە سووسەکارێکی دووسەرە، کە زانیاری ساختەکراو بداتە ڕووسەکان.

بەم جۆرە کارنامەیەکی دوورودرێژی «ڤیکتۆر گراڤسکی» کەوتەڕێ. بۆ چەندین ساڵ بوو ئەو زانیارگەلێکی دەدایە ڕووسەکان، کە بە فلتەری مۆساددا تێدەپەڕی و بە هۆنینەوەی ئەوان دەڕازایەوە. برادەرەکانی کەی گی بی ڤیکتۆریان لە دارستانەکی دەوروبەری ئۆرشەلیم و ڕامەڵلا، لە کڵێسای ڕووسی و پەرستگاکەی لە یافا، لە ئۆرشەلیم و تەبەریا دەبینی، لەوێ بەوەی گوایە لەنێو ئاپۆرای خەڵکەکە لە چێشتخانەیەکی جەنجاڵدا لە ئاهەنگی دیپلۆماسیانەدا ئەوانی دەبینین. هیچ کەسێک لە دەزگەی هەواڵگری لە ماوەی ئەو چواردە ساڵەی گراڤسکی وەک جاسووسێکی دووسەر کاری دەکرد، گومانی نەکرد کەوا، کابرا لە دژی ئەوان بەکارهێندراوە. ئەوان جار لەسەر جار پێزانینیان بۆ هەبوو، پاداشتیان دەکرد سەبارەت ئەو زانیارییە نایابانەی ڕادەستی دەکردن؛ دەنگۆی وا بڵاوببووەوە کەوا یەکێتی سۆڤیەت ئاژانێکیان لەنێو بازنەکانی حکوومەتی ئیسرائیلدا هەیە.

لەماوەی ئەو هەموو ساڵانەدا هەرگیز ڕەخنە لە گراڤسکی، لە پیاوە باوەڕپێکراوەکەی سۆڤیەت نەگیرا. تاکە ڕیزپەڕ لەو حاڵەتە لە ١٩٦٧دا ڕوویدا، کاتێک دەزگەی هەواڵگری ڕووسی ڕاپۆرتە زانیاریەکەی ئەویان پشتگوێخست، ئەویش گەیشتە بەرەنجامێکی تەوسدار؛ ئەوەش ئەوکاتە بوو کە زانیارییێکی ڕاست و دروستی ڕادەستی سۆڤیەتییەکان کرد. لە میانەی "ماوەی چاوەڕێکردن"ی ١٩٦٧ و بەر لە شەڕی شەش ڕۆژەدا، جەمال عەبدولناسری سەرۆکی ئەوسای میسر، بە باوەڕێکی هەڵەوە

پێیوابوو، کە ئیسرائیل بە تەمایە لە مانگی ئایاردا پەلاماری سووریا بدا. بۆیە هێزەکانی خۆی لە سینا کۆکردەوە، ئەو هێزە ئاشتی پارێزەی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان، کە لەوێ چاودێریی دۆخی نێوان هەردوو وڵاتەکەیان دەکرد، وەدەرنا، ڕێگەی گەرووەکانی دەریای سووریشی بەسەر کەشتیەکانی ئیسرائیلدا داگرت و هەڕەشەی لەناوبردنی ئیسرائیلیشی کرد. ئیسرائیلیش لەلای خۆیەوە بەتەما نەبوو پەلاماری میسر بدا، پەرۆشبوو خۆی لە شەڕی میسر بەدوور بگرێ. ئەوسا سەروەزیرەکەیان، «ئەشکۆل» داوای لە مۆساد کرد کە سۆڤیەت ئاگاداربکاتەوە، ئەگەر هاتوو میسرییەکان ڕێکارە دەستدرێژیکارییەکانیان هەڵنەوەشێننەوە، ئەوا ئیسرائیل جەنگیان لەدژ بەرپادەکا؛ سەروەزیر هیوای وابوو، سۆڤیەتییەکان کە کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر میسردا هەبوو، بەڵکو بتوانن ناسر لە شوێنی خۆی ڕابگرن. ئینجا ڤیکتۆر گراڤسکی بەڵگەنامەیەکی گەیاندە دەستی کەی گی بی کە نیازی ڕاستەقینەی ئیسرائیلییەکانی تێدا بەیانکرابوو. بەڵام یەکێتی سۆڤیەت هەڵسەنگاندنێکی شاشی بۆ ڕەوشەکە کرد؛ مۆسکۆ ڕاپۆرتەکەی گراڤسکی پشتگوێخست و هانی ناسری دا لەسەر دوژمنکارییەکەی سوورتر بێ.

ئەم کاتەش لێکەوتەی خۆی هەبوو، ئیسرائیل دەستی خۆی پێش خست، پەلاماری میسری دا و سوپای میسری، سووری و ئوردنی تێکشکاند و خاکی زیاتری لێداگیرکردن. ئەوسا یەکێتی سۆڤییەتیش دۆڕاوی گەورە بوو؛ چونکە سەلمێندرا کە چەکەکەی ناتوانایە، ڕوسیا لە بەڵێنەکانی خۆی پاشگەز بووەوە و نەیتوانی پشتگیری هاوپەیمانەکانی بکا کە زەبری گورچکبڕیان پێکەوت.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو پەیوەندییە دووردودرێژەی نێوان گراڤسکی و کەی گی بی هەر لەو ساڵەدا گەیشتە لووتکەی خۆی. گراڤسکی بانگکرا بۆ ئەوەی لە دارستانێ لە ناوەڕاستی ئیسرائیلدا برادەرە سۆڤیەتیەکانی ببینێ. لە دیدارەکەدا ئاژانەکەی کەی گی بی بە ڕێز و شکۆوە پێیڕاگەیاند، کەوا حکوومەتی سۆڤیەت دەیەوێ سەبارەی بەو خزمەتە دڵسۆزانەی سوپاسی بکا و بڕیاریداوە پاداشتێکی بەرزی گەورەی بکا بەوەی مەدالیای لینینی پێببەخشێ!

ڕووسەکان داوای لێبوردنیان لێکرد و پاساویان بۆ هێنایەوە کە ناتوانن لە نێو ئیسرائیلدا ئەو مەدالیایەی بە بەرۆکدا بدەن، بەڵام بەڵێنیان پێدا کە مەدالیاکەی ئەو لە مۆسکۆ بۆ هەڵگیراوە، هەر کاتێکیش بچێتە ئەوێ، وەریدەگرێ. گراڤسکیش بە باشی زانی هەر لە ئیسرائیل بمێنێتەوە.

لە ساڵی ١٩٧١یشدا خۆی لە گەمەی سووسەکاریدا بەرکەنارکرد.

بەڵام هێشتا فەرامۆش نەکرابوو. لە ٢٠٠٧دا بانگی بارەگای سەرەکی (شاباک) کرا، لەوێ لە لایەن گرووپێک کە پێکهاتبوون لە بەڕێوەبەرەکانی کۆن و نوێی شاباک و مۆساد، لەگەڵ زۆر لە برادەر و هاوڕێ و خزمەکانی بە گەرمی بەخێر هێندرا. بەڕێوبەری شاباکی ئەوکات، «یوڤال دیسکین» بوو، کە پاداشتێکی بەرچاوی سەبارەت بەکارە ناوازەکانی ڤیکتۆر لە خزمەتی دەزگەی هەواڵگیریدا، پێشکەشکرد، بەم جۆرە گراڤسکی تاکە ئاژانێکی نهێنی بوو کە دوو جاران پاداشت بکرێ: لەلایەن وڵاتەکەی خۆی، کە بەوپەڕی دڵسۆزییەوە بە ژیان خزمەتیکرد، هەروەها لەگەڵ نەیارە بەرانبەرەکەشی، کە سەرباری هەموو سەرچڵی و مەترسییەکان، توانی دەستخەڕۆیان بدا.

هەواڵنێرەکەش وای بانگکرد: "ئەو پیاوەی سەرەتای کۆتاییهاتنی ئیمراتۆریەتی سۆڤیەتی بوو." بەڵام گراڤسکی وا هەستینەکرد. بەڵکو گوتی: "من پاڵەوان نیم، منیش مێژووم دروستنەکرد. ئەو کەسەی مێژووی دروستکرد، خرۆشۆف بوو. من تەنها بۆ یەک دوو سەعات مێژووم بینی، پاشان ڕێگەکانمان لەیەک جیابوونەوە."

ڤیکتۆر گراڤسکی لە تەمەنی هەشتاویەک ساڵیدا مرد. لەوێش لە شوێنێک لە کرملین، لەنێو سندوقێکی بچکۆلانەدا مەدالیەکە بە پارچە مەخمەڵێکی سوور داپۆشرابوو، کە وێنەی ڤلادیمیر ئیلیچ لینینی لەسەر هەڵکەندرابوو، داندرابوو، پێدەچوو هێشتا هەر چاوەڕێی ڤیکتۆر بکا.

## بەندی شەش: "لە زەمین بێ یان لە ئاسمان، هەر دەمەوێ ئایخمان[110]"

- "باشە ناوت چییە؟" کیژەکە وایلێپرسی
- "نیکۆلاس،" کوڕە دڵخوازە دەم بە خەندەکەش گوتی: "نیکۆلاس، بەڵام هەموو برادەرەکانم بە نیک، نیک ئایخمان بانگم دەکەن."

### *کیژی جووە نابینایەکە*

لە پایزی ۱۹۵۷دا، «ئیسەر هارل» پەیامێکی سەیری لە فرانکفۆرتی ئاڵمانەوە پێگەیشت. پەیامەکە ئەوەبوو کەوا «د. فریتز باوەر[111]»ی داواکاری گشتی لە «هیس»[112] خوازیارە هەندێ زانیاری نهێنی بۆ مۆساد بنێرێ. پیاوە درێژە کەشخە شەویلاگ شەڕانگێزەکە، بە ڕاودوونانی پەرۆش و شێلگیرانەی تاوانبارانی نازی ناسرابوو. سەر و پرچە شێرئاساییەکەی وایلێکردبوو لەیەکچوونێکی تەمومژاویان لەگەڵ بنگۆریۆندا هەبێ. «باوەر»یش بەخۆی جوو بوو، وەک جەنگاوەرێکیش لەدایکببوو. لە ۱۹۳۳دا لەگەڵ پەرەسەندنی مجێزی[113] هیتلەر بۆ دەسەڵات،

---

[110] وەرگێڕانی دەقاودەقی ئەم ناونیشانە: بە زیندی بێ یان بەمردی، ئایخمانم دەوێ!"یە بەڵام بە ڕاوێژ لەگەڵ پسپۆڕێکی زمان، هاتینە سەر ئەو ڕایە کەوا ئەم وەرگێڕانە، دەربڕینێکە پەیوەندی بە کلتوورێکی بێگانەوە هەیە، کورد زیاتر ئەو دەربڕینەی هەیە کە نووسیومانە.

[111] Fritz Bauer

[112] Hesse

[113] مجێز: چاوتێبڕین، تەماع.

ئەویان فرێدایە ئۆردوگایەکی زۆرەملێ. بەڵام ئەو ئەزموونە سامناکەی لە ئۆردوگا زۆرەملێیەکەدا بینی، ورە و گیانی تێکنەشکاندبوو. دواتر بەرەو دانیمارک و لەوێشەوە بۆ وڵاتی سوێد هەڵات. لە کۆتایی جەنگەکەشدا بڕیاریدا ژیانی خۆی بۆ بەدواداچوون و بە سزاگەیاندنی تاوانبارانی نازیزم تەرخان بکا. بە خۆی ڕاشکاوانە لە دەسەڵاتدارانی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا نامراد ببوو، چونکە شتێکی وایان نەدەکرد تا نازیزم ڕیشەکێش بکەن.

لە نۆڤێمبەری ١٩٥٧دا، ئیسەر، «شاول دارۆم» کە ئەفسەرێکی ئاسایشی ئیسرائیلی بوو، بۆ دیداری «باوەر» نارد. ئەویش گەیشتە فرانکفۆرت و گفتوگۆیەکی دووررودرێژی لەگەڵ جەنابی داواکاری گشتیدا کرد. یەک دوو ڕۆژیش دواتر، (دارۆم) چووە نووسینگەکەی ئیسەر لە تەلئەبیب. «دارۆم» بە ئیسەری گوت: "«د. باوەر» پێیگوتم، کەوا ئایخمان لە ژیاندا ماوە و ئێستا خۆی لە ئەرجەنتین شاردۆتەوە."

ئیسەر لێیەوە ڕاما. وەک ملیۆنان جووی دیکە، «ئەدۆلف ئایخمان»، ئەو کۆلۆنێلەی SS کە مەرگەساتە سامناکەکەی نازیزمی بەرجەستەکرد، دەناسی. ئایخمانی ئۆبەرستورمبیئەنفوهرەر[114] بە خۆی بەڕێوەبەرایەتی بەرنامەی "دوا چارەسەر" بوو کە بە شێوەیەکی سیستماتیک بۆ قڕکردنی جووەکانی ئەورووپا بوو. ئایخمان، شێتانە ژیانی خۆی بۆ لەناوبردن و کۆمەڵکوژکردنی شەش ملیۆن جوولەکە تەرخانکردبوو. دوای شەڕیش

[114] نووسەرەکان هەر هەمان وشە ئاڵمانیەکەیان بەکارهێناوە **Obersturmbannführer** واتە فەرماندەیەکی پلەباڵای یەکەی پەلاماردەر، ئەم پلە سەربازییە تایبەت بووە بە ئێس ئێسەکانی نازی و لە ئایاری ١٩٣٣ داهێندراوە.

خۆی ونکردبوو، کەس نەیدەزانی لە کوێیە؛ دەگوترا لە سووریا، میسر، کوەیت باشووری ئەمریکا.... دەژی.

«دارۆم» بە دوورودرێژی گفتۆگەکەی لەگەڵ «باوەر»دا گێڕایەوە. کەوا یەک دوو مانگ بەر لەئێستا، «باوەر» نامەیەکی لە وڵاتی ئەرجەنتینەوە پێگەیشتووە، نامەکەش هی کۆچبەرێکی ئاڵمانی نیوەجوو بووە، کە کاتی خۆی لەبن باری زۆرداری نازییەکاندا لە کاتی جەنگەکەدا ناڵاندوویەتی. ئەو کەسە ڕاپۆرتی ڕۆژنامەکانی لەسەر هەوڵە بێوچانەکانی «باوەر» بۆ بەدواداچوونی تاوانبارە نازییەکان خوێندۆتەوە، ئیدی تێگەیشتووە کە سەرلیستی ئەوانەی بۆ دادگا داواکراون ئەدۆلف ئایخمانە. کاتێکیش «سلڤیا»، کیژە نازدارەکەی پێیگوتبوو، کە تازە کوڕە گەنجێکی بە ناوی «نیک ئایخمان» ناسییوە، یەکسەر باوکەکە بە بیستنی ناوەکە حەپەساوە. باوکەکە پێیوایە کەوا ئەو گەنجەی بەناوی «نیک ئایخمان»ە پەیوەندی بەو بکوژە سەر و سۆراخ نادیارە هەبێ کە ئەدۆلف ئایخمانە. بۆیە نامەیەکی بۆ «باوەر» نووسیوە، کە دەتوانێ حەشارگەی ئایخمانیان نیشان بدا، ئاخر ئەوەش گوترابوو کەوا ئایخمان لەبن ناوێکی خوازراوەوە لە (بۆینس ئایرس)دا دەژی.

«باوەر»یش دەیزانی، کە ئایخمان دوای جەنگەکە لە ئاڵمان ڕایکردبوو. «ڤێرا»ی ژنی و هەر سێ کوڕەکەی هەر لە نەمسادا دەژیان، بەڵام هەر یەک دوو ساڵێک دەبێ سەر و سۆراخی ئەوانیش دیارنەماوە. لەکۆتاییدا «باوەر» بۆیدەرکەوت، ئەوان باریانکردۆتە ئەرجەنتین و لەوێدا «ڤێرا» جارێکی دیکە شووی کردۆتەوە. «باوەر» بڕوای بەوە هێنابوو کەوا خانمەکە خۆی گەیاندۆتە ئایخمان و هەرچی خەبەر و باسی

مێردکردنەوەکەشی بوو، هەڵبەستراو بوو. "دووەمین مێردەکەشی" هەر دەبێ ئایخمان بە خۆی بێ، کە لەوێ لە چاوەڕوانیاندا بووە.

«باوەر» لەوە دەترسا، ئەگەر هاتبا و داوای لە دەوڵەتی ئاڵمان بکردبا، بۆ ڕادەستکردنەوەی کابرا لە ئەرجەنتینەوە، ئەوا لە دەستیان دەردەچوو، لێیان بزر دەبوو. ئەو متمانەی بە دادوەری ئاڵمانی نەبوو، ئاخر هێشتا دەزگەی دادوەری پڕبوو لە کۆنە نازییەکان. هەروەها ئەو گومانی لە چەند کارمەندێکی باڵوێزخانەی ئاڵمانیش لە بۆینس ئایرس هەبوو. «باوەر» لەوەش دەترسا بەر لە داواکردنەوەی فەرمی بۆ ڕادەستکردنەوەی ئایخمان لە کاربەدەستانی ئەرجەنتینی، یەکێک لە باڵوێزخانەکە ئایخمان لە پرسەکە ئاگاداربکاتەوە و سەرلەنوێ خۆی شوێنبزر بکاتەوە.

«باوەر» ڕاشکاوانە لەگەڵ («شاول دارۆم» دوابوو. ئەو لە مۆسادی دەخواست، بە دوای هەواڵەکەدا بچن، ئاخۆ هەر بەڕاستی ئایخمان لە بۆینس ئایرسە؛ ئەگەر وابێ، دەکرێ ئیسرائیل داوای ڕادەستکردنەوەی بکا یان بە ئۆپەراسیۆنێک بە دزییەوە ئایخمان برفێنن.

"من دوای ئەوەی چەندین ڕۆژ و شەو لە گەڕان و سوڕانی خۆمدا قسەت بۆ دەکەم." «باوەر» بەمجۆرە دانپێدانانە سەری قسەی بۆ شاول دارۆم داهێنا؛ "لە ئاڵمانیادا تەنیا یەک تاکەکەس بەو بڕیارەم دەزانێ کە زانیارییەکانت بدەمێ، ئەویش سەروەزیری هیس، (جۆرج ئاگوستوس زین)ە؛ ئەو سەرۆکی پارتی سۆسیال- دیموکرات و سەرۆکی ئەنجوومەنی فیدرالی ئاڵمانی بوندەرستات بوو."

ئیدی دوای گفتوگۆکە، «شاول دارۆم» گەڕایەوە ئیسرائیل، تەنها یەک پارچە کاغەزی خستە سەرمێزی ئیسەر، کە وەسفی حەشارگەی ئایخمانی تێدابوو. چاوەکانی ئیسەریش بەتەنیا چوونە سەر یەک دێڕ: 4261 Chacabuco, Olivos, Buenos Aires Calle

لە سەرەتای یەنایەری ١٩٥٨دا، گەنجێک بە شەقامی «کالێ چاکابوکۆ»دا پیاسەی کرد. گەنجەکەش «ئێمانۆئیل (ئیما) تایلۆر»ی ئەندامی ئۆپەراسیۆنە تایبەتیەکانی مۆساد بوو. ئیسەر ناردبووی تا ڕاستی و دروستی پەیامەکەی باوەر بسەلمێنێ. «ئیما» کەیفی بەوەی بینی نەهات. ئاخر گەڕەکی «ئۆلیڤیۆس» هەژارنشین بوو، بەزۆری هەر کرێکار لەو گەڕەکەدا دەژیان. لە هەر دوو دیوە شۆستەنەکراوەکەی شەقامی «کالێ چاکاوبوکۆ»دا دەروازە کۆلێتی نمرەدار هەبوو، بە ژمارە ٤٢٦١یشیەوە. لە مەیدانە بچکۆلەکەدا «ئیما تالامور» ژنێکی جلشڕی قەڵەوی بینی.

"باوەڕناکەم ئەوێ خانووی یەکێکی وەک ئایخمان بێ،" ئەمە قسەی «تالمۆر» بوو دوای ئەوەی پاش یەک دوو ڕۆژ لە گەڕان و پشکنینەکە گەیشتەوە ئیسرائیل و لە نووسینگەکەدا وای بە ئیسەری سەرۆکی مۆساد گوت؛ "من دڵنیام کە ئایخمان وەک هەر نازییکی گرنگ و گەورە بەر لە هەڵاتن و کەوتنی دەوڵەتەکەیان ئامادەکارییان کردوە و پارەیەکی قەبەیان گواستۆتەوە ئەرجەنتین. باوەڕناکەم ئەو لە کۆلێتە قوڕوچڵپاوێکی وادا بژیێ. هەروەها ئەو ژنە قەڵەوەی لە مەیدانەکەشدا بینیم، نابێ «ڤێرا ئایخمان» بێ.

ئەو ڕەتکردنەوانەی «تالمۆر» قەناعەتی بە «ئیسەر» نەهێنا. ئیسەر ویستی لەسەر لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون بەردەوام بێ، بەڵام ئەو

پێویستی بەوە بوو پەیوەندی بە سەرچاوەکانی «باوەر» بکاتەوە. پەیوەندی پێوەکرد، ئەویش دەستبەجێ ناوو ناوونیشانی ئەو کەسەی خەبەرەکەی بۆ هێنابوو پێدا کە «لۆسەر هێرمان» بوو. ئەو ئێستا گواستویەتیەوە شارێکی دیکە، چۆتە «کۆرۆنێل سوارێز»، کە سێسەد میل لە بۆینس ئارسەوە دوورە. «باوەر» نامەیەکی سەروسۆراخکردنی بۆ «هێرمان» نارد، داوای لێکرد یارمەتی هەڵگری نووسراوەکەی بدا.

لە فێبرایری ١٩٥٨دا، «ئێفرایم فۆفستێتەر»، سەرۆکی لێکۆڵەرەوەکانی پۆلیسی تەلئەبیب بە کۆنفرانسێکی پۆلیسی ئینتەرپۆل هاتە ئەرجەنتین و قایلیشبوو لە بەدواگەڕانەکەیدا، هاوکاری ئیسەر بکا، بەڵام کارەکەی بە هەندێ خۆپارێزییەوە کرد. بۆیە کاتێک لە گەڕەکی «لیبراتەد ئەڤینیو»دا لە دەرگەی ماڵی کابرای برادەری «باوەر» دا، خۆی وەک ئەڵمانێک بەناوی «کارل هوپەرت» ناساند. لە ژووری دانیشتنی ماڵەکەدا پیاوێکی نابینای بینی، جلێکی سادەی لەبەردابوو، دەستی لەسەر مێزێکی دارینی گەورە دانابوو. «هۆسفتێیەر» چووە ژوور، پیاوە نابیناکەش گوێی لە دەنگی پێی میوانەکە بوو کە بۆلای ئەو دەچوو، ئیدی دەستی گرت. کابرای خانەخوێش «لۆسەر هێرمان» بوو.

"من برادەرێکی فریتز باوەرم،" هۆفستێتەر وای پێگوت. ئاماژەیەکی واشی دا، کە سەر بە دەزگەی هەواڵگری نهێنی ئاڵمانە.

هێرمانیش بۆیگێرایەوە، ئەو جوو بووە و تا نازییەکان دەسەڵاتیان لە ئەڵمانیا وەرگرت پۆلیس بووە. دایبابی کوژراون و ئەویش بۆ «داچاو» نێردراوە، لەوێدا ڕووناکایی چاوەکانی لەدەستداوە؛ پاشان لەگەڵ ژنە ئاڵمانەکەی کۆچیکردۆتە ئەرجەنتین. کاتێکیش ئەو ناوی ئایخمانی

بەرگوێ کەوت، پەیوەندی بە«باوەر»ەوە کرد. وەک لە قسەکانیدا باسیکرد، هاندەری سەرەکی لە خەبەردانەکە یارمەتیدان بووە تا تاوانبارە نازییەکان، ئەوانەی خێزانەکەیان قەتڵوعام کردووە سزابدرێن.

"بەڵێ وەک خۆت دەیبینی،" پیاوەکە وایگوت و پیلی «سیلڤیا»، کیژە خۆشەویستەکەشی گرتبوو کە هاتە ژوورەوە. "ئەو کیژە، ئەو کەسە بوو کە ئایخمانی بۆ تۆ دۆزییەوە."

کیژەکەش لە شەرمان سوورهەڵگەڕاو بە دڵەڕاوکێیەوە سەربردەکەی بۆ هۆفستێتەر گێڕایەوە.

کچەکە پێیڕاگەیاند، تا ساڵ و نیوێک بەر لە ئێستا، خێزانەکەی لە گەڕەکی ئۆلیڤۆس لە بۆینس ئایرسدا دەژیان. لەوێدا نیک ئایخمانی بینیبوو، کە کوڕێکی ژیکەڵە بوو، چەند ڕۆژێکی لەگەڵدا بووە. کیژەکە بە کوڕەکەی نەگوتبوو کەوا بنجووە[115]، ئاخر هێرمانەکان بە خێزانێکی ئاریایی دەناسران. نیکیش هیچی لە کچەکە نەشاردەوە. جارێکیان تێبینییێکی وایدا، کە دەبووایە کارەکەی خۆیان تەواوکردبایە و دەبووایە هەموو جووەکانیان لەناوببردبایە. لە بۆنەیەکی دیکەشدا ئاماژەیەکی وایکرد، کەوا باوکی ئەو لەماوەی جەنگی دووهەمی جیهانییدا وەک ئەفسەرێکی سوپای نازی کاریکردووە و ئەرکەکانی خۆی بەرانبەر نیشتمانەکەی بەجێهێناوە.

«نیک»ی گەنج ئازادانە ڕامانەکانی خۆی لەگەڵ سلڤیادا ئاڵوگۆڕ دەکرد، بەڵام قەت بانگهێشتی ماڵەکەی خۆی نەکرد. تەنانەت دوای ئەوەش کە

[115] بنجوو: ئەو کەسەی بە ڕەچەڵەک جووە.

ماڵەکەی لە بۆینس ئایرس باریکرد، نامەی بۆ کوڕەکە بە ئەدرێسی برادەرەکانی دەنارد.

ئەم ڕەفتارە سەیرە دنەی گومانەکانی «لۆسەر هێرمان»ی دا، بەوەی بەڵکو «نیک» کوڕەکەی ئایخمان بێ. ئیدی باوکە نابیناکە لەگەڵ کچەکەی سەفەرێکی بۆینس ئایرسیان کرد و بە پاس خۆیان گەیاندە گەڕەکی ئۆلیڤۆس. سلڤیاش لەڕێی یارمەتی هەندێ لە برادەرەکانی، ناوونیشانی نیک ئایخمانی دۆزیەوە و تەنانەت توانی بچێتە ماڵیشیان لەسەر شەقامی کاللێ چاکابوکۆ. بەڵام نیک لە ماڵێ نەبوو. لەوێدا کیژەکە پیاوێکی باریکی عەینەک لەچاوی بینی کە سمێڵێکی تەنکی هەبوو؛ پێیڕاگەیاند کەوا باوکی نیکە.

ئیدی هێرمان بە هۆفستێتەری گوت کەوا بۆ سەروسۆراخی لێکۆڵینەوەکەی ئامادەیە بە خۆی و سیلڤیا لەگەڵیدا جارێکی دیکە بچێتەوە بۆینس ئایرس. ئاخر سلڤیا پێویست بوو بۆ هەموو شوێنێک لەگەڵ باوکیدا بێ، بۆ ئەوەی نامەی بۆ بنووسێ و بۆشی بخوێنێتەوە. هۆفستێتەریش لیستێک شتی دانێ، کە بۆ ناسینەوەی ئایخمان پێویستبوو: وێنەکەی، ناوەکەی، شوێنی کاری، بەڵگەنامە فەرمییەکانی و پەنجەمۆری. ئینجا هێرمان و هۆفستێتەر سیستەمێکی سەلامەتیان بۆ گۆڕینەوەی نامەکانی نێوانیان دۆزییەوە، هەروەها هۆفستێتەر هەندێ پارەشی بۆ خەرجییەکان دانێ. لە کۆتاییشدا کارتێکی لەبەرکەی خۆی دەرهێنا و لەنێوەڕاستدا کردییە دوولەت. نیوەی کارتە دڕاوەکەی دایە هێرمان و پێیگوت: "ئەگەر کەسێک ئەو نیوە کارتەی لای منی بۆ هێنای، ئەوا هەموو شتێکی پێبڵێ. ئاخر ئەو کەسێکە سەر بە ئێمەیە."

پاشان هۆفستێتەر ئەوێی بەجێهێشت و گەڕایەوە ئیسرائیل و ڕاپۆرتی خۆی دایە ئیسەر.

یەک دوو مانگ دواتر ڕاپۆرتی «هێرمان» گەیشتە بارەگای سەرەکی مۆساد. ئەو بە پەرۆشەوە نووسیبووی کەوا هەموو شتێکی لەبارەی ئایخمانەوە دۆزیوەتەوە. خانووەکەی کالی چاکوبۆکۆ لەلایەن نەمساوییێک بەناوی فرانسیسکۆ شمیدت، دە ساڵ بەر لە ئێستا دروستکراوە. شمیدت خانووەکەی بەکرێ دابووە دوو خێزان: «داگوتۆ» و «کلێمێنت». هێرمان لە نووسینەکەیدا مکوڕبوو لەسەر ئەوەی کە «شمیدت» خۆی ئایخمان بوو. باوەڕی وابوو هەردوو ناوەکەی دیکە، «داگوتۆ» و «کلێمێنت» تەنها ناوگەلێک بوون بۆ شوێنبزرکردنی ناوە ڕاستەقینەکەی ئایخمان.

ئیسەریش داوای لە ئاژانەکەی خۆی کرد بچێ بە دوای ڕاستی و دروستی ناوەڕۆکی ڕاپۆرتەکەی هێرماندا بچێ. پیاوەکەش بروسکەی بۆ ئیسەر لێدایەوە: "هیچ گومانی تێدانییە، کەوا «فرانسیسکۆ شمیدت» ئایخمان نییە. ئەو لە خانووەکەی کالی چاکابوکۆ ناژی و قەتیش لەوێ نەژیاوە."

ئینجا ئیسەر هاتەسەر ئەو بەرەنجامە کەوا هێرمان هی بڕواپێکردن نییە و بڕیاریدا کۆتایی بە لێکۆڵینەوەکە بهێنێ.

## هەڵەکە

بڕیارەکەی ئیسەر هەڵەیەکی گەورە بوو، خەریکبوو دەرفەتی ئیسرائیل بۆ گرتنی ئایخمان لەدەستبدا. خۆ هیچ لە دەستی مرۆ نەدەهات، مرۆ لە

دەستی دەرچوو بوو، بەڵام شتێکی سەیروسەمەرەی هاوکات، سەبارەت بەو کورتهێنیەی قۆناغە بەراییەکانی ئۆپەراسیۆنەکە لەئارادابوو. ئاخر چۆن دەبێ لێکۆڵینەوەیەکی شاراوە و ئاڵۆز، لەسەر بڕواپێهێنانی پیاوێکی پیری نابینای نابەهرەمەند بنیات بندرێ؟ باشە چۆن مۆساد ئەو هەڵە کوشندەیەی لە ناسینەوەی ناسنامەی ئایخماندا کرد. باشە چۆن ئیسەر ئەو ڕاستییەی پشتگوێخست، کە سیلڤیا سەردانی کالی چوکابۆکۆ کردبوو و باوکی نیک ئایخمانیشی بینیبوو؟ لەجیاتی ئەوەی لێکۆڵینەوەیەکی پیشەمەند[116] بۆ بۆینس ئایرس بنێری تا ناسنامەی هەر دوو کرێچییەکە و خاوەنی خانووەکە بزانێ، ئیسەر زۆر بەئاسانی دەستی لە لێکۆڵینەوەکە شوشت. ئەم هەڵە کوشندەیە، بەشێوەیەکی تایبەت لە کەسێکی وەک ئیسەر نەدەوەشایەوە.

ساڵ و نیوێک دوای ئەم باسە، «فریتز باوەر» هاتە ئیسڕائیل. ئەمجارەیان نەیویست «ئیسەر هارل» ببینێ، چونکە لۆمەی ئەوەی لەسەربوو، کە لە گرتنی ئایخماندا بۆڕی خواردبوو[117]. ئەوسا «باوەر» ڕاستەوخۆ ڕێگەی داواکاری گشتی ئیسڕائیل لە ئۆرشەلیم، ژەنەڕاڵ «حایم کۆهن»ی گرت. لەوێدا کاتێک وەسفی هەوڵە کورتهێنیەکەی مۆسادی بۆ لێکۆڵینەوە لە ئایخمان کرد، بەتووڕەیی تەقیەوە.

حایم کۆهنیش بانگی هەریەک لە ئیسەر و «زڤی ئاهارۆن»ی سەرۆکی لێکۆڵەرەوەکانی شاباکی کردە ئۆرشەلیم. باوەر لە نووسینگەی کۆهن چاوەڕێی دەکرد و ئیسەری بە کەمتەرخەم لە دۆخی لێکۆڵینەوەکەدا

[116] پیشەمەند: لەسەر کێشی بەهرەمەند، بۆ موحتەریف، پرۆفیشیۆنال.

[117] بۆڕدان: شکستهێنان.

تۆمەتبارکرد. هەروەها گەفی ئەوەشی کرد، ئەگەر هاتوو مۆساد نەتوانێ بە ئەرکەکە ڕابێ، ئەوا هیچ بژاردەیەکی بەدەستەوە نامێنی، دەسەڵاتدارە ئاڵمانەکان ئاگاداردەکاتەوە. بەڵام خۆ ئەوە هەڕەشەکەی «باوەر» نەبوو کە هیسەر هارل لێکۆڵینەوەکەی لە دۆزەکە نۆژەنکردەوە، بەڵکو ئەو زانیارییە نوێیە بوو کە «باوەر» لەگەڵ خۆی هێنابوو: دیاربوو دوو وشە، مەتەڵە تەلیسماویەکی هەڵدەهێنا. وەک «باوەر» پەردەی لەسەر هەڵدایەوە؛ ناوە خوازراوەکەی ئایخمان لە ئەرجەنتین «ڕیکاردۆ کلێمێنت» بوو.

هەمووی و بەسەریەکەوە، ئیسەر پەی بەوەبرد کە چ هەڵەیەکی کردووە، هەروەها زانیشی پیاوەکانی لە کوێدا سەرچیخ چوونە. لەڕاستیدا ئایخمان یەکێک بووە لەوانەی بەکرێ چووەتە خانوەکەی کالی چاکابوکۆ. هەر بەتەنیا شمیدت نەبووە، بەڵکو کلێمێنت بووە.

ئەوەش ڕاستبووە کە کیژەکەی هێرمانی نابینا لەگەڵ کوڕەکەی ئایخماندا بووە، خێزانەکەی ئایخمانیش لە خانووەکەی کالی چاکابوکۆدا ژیاوە. بەڵام هێرمان نەیدەزانی کەوا ئایخمان ناوەکەی خۆی گۆڕیوە بۆ کلێمێنت، لەجیاتی ئەوەش بە هەڵە ئاماژەی بۆ فرانسیکۆ شمیدت داوە. خۆ ئەگەر ئیسەر کارەکەی خۆی بە باشی ڕاییکردبا و ئاژانێکی بەهرەمەندی بۆ لێکۆڵینەوە لە چیرۆکی هێرمان ناردبا، ئەوا دەمێک بو پەردەی لەسەر ناسنامەی ڕاستەقینەی ئایخمان هەڵدابووەوە.

ئیدی ئیسەر پێشنیازی بۆ کۆهن و باوەر کرد، کە لەمەودوا زڤی ئاهارۆنییش بخرێتە نێو بازنەی لێکۆڵینەوەکە. ئاهارۆنی پیاوێکی درێژی لاواز بوو بەڵام نیوچاوانێکی ڕوون و سمێڵێکی لاکێشەیی و مێشکێکی

تیژی هەبوو. خۆی جوولەکەیکی ئاڵمان بوو، زیاتر لە کۆهن نزیک بوو لەوەی لە ئیسەر. ئاهارۆنی هێشتا هەر لە ئیسەر توورە بوو، چونکە لە ١٩٥٨دا کاتێ بۆ دۆزێکی دیکە چووبووە بۆینس ئایرس، ئیسەر ئەرکی بەدواداچوونی لە گەواهیدانەکەی هێرمانی نابینا پێنەسپاردبوو. بەڵام خۆ ئەو حاڵەتە دەبێ لەبیر بکرێ. ئەمڕۆ ئیسەر بە پەرۆشەوە حەوجەی لێزانییەکەی «ئاهارۆنی»یە.

بەم جۆرە، لە فیبرایری ١٩٦٠دا، «ئاهارۆنی» لە فڕۆکەخانەی بۆنس ئایرس دابەزی. داوای لە برادەرێکی خۆی کرد، کە جوولەکەیکی نیشتەجێی ئەوێ بوو، چاوێکی لەسەر خانووەکەی کالی چاکابوکۆ بێ. پیاوەکە بە پەستی گەڕایەوە. ئاخر خانوەکە چۆڵوهۆڵ بوو، ئەو وا خەبەری دایەوە ئاهارۆنی. یەک دوو بۆیەچی و وەستایەک خەریکی نۆژەنکردنەوەی دوو ئەپارتمانەکەن، لە ڕاستیدا ئەپارتمانەکەی پێشوی کلێمینت بوو. بەڵام ئاکنجیەکانی لەوێ نەماون، شوێنەکەشیان نادیارە. ئێستاش «ئاهارۆنی» دەبوایە بە جۆرێک شوێنپێی کلێمێنت هەڵبگرێ، بێئەوەی هیچ گومانێک بوروژێنێ.

لە سەرەتای مارتدا، گەنجێکی ئەرجەنتینی لەبن جلێکی یەکپۆشی کارمەندی پۆستە و گەیاندندا سەرێکی لای خانووی «کالیێ چاکابوکۆ»ی دا. گەنجەکە دیارییەکی بچکۆلانەی وەرپێچراوی پێبوو کە ناوونیشانی نیکۆلاس کلێمێنتی لەسەربوو. پاکەتە دیارییەکەش، چەرخێکی گرانبەها و کارتێکی بۆنداری تێدابوو کە ئەم کورتە نووسینەی لەسەربوو: "ئازیزم نیک، ڕۆژی لەدایکبوونت پیرۆزبێ." دیاربوو پاکەتەکە دیاری ڕۆژی

لەدایکبوون بێ، لە کچێکەوە نێردرابێ کە نەیویستبێ ناوەکەی خۆی ئاشکرا بکا.

نامەبەرەکە هاتە نێو ئەپارتمانەکە، کە چەند بۆیەچی کاریان تێدادەکرد، پرسیاری خێزانی کلێمێنتی لێکردن، زۆربەی کرێکارەکان نەیاندەزانی کلێمێنتەکان چونەتە کوێ. بەڵام یەکێ لە بۆیەچییەکان بە کوڕە پۆستەچیەکەی گوت، پێیوایە ئەوان باریانکردبێتە گەڕەکی «سان فێرناندۆ» لە دیوەکەی دیکەی بۆینس ئایرسدا. ئینجا پۆستەچیەکەی بردە نزیک شوێنی کارێک، کە براکەی نیک ئایخمان کاری تێدادەکرد. ئەویش پیاوێکی کەژە[118]بوو بوو ناوی «دیتەر»، هەرچەندە کەسێکی ڕووخۆش و نەرمونیانیش بوو، کەچی ناوونیشانی کلێمنتەکانی پێنەگوت. ئەو «دیتەر»ە زۆربڵێیە بە کوڕە پۆستەچییەکەی گوت، کەوا باوکی بەشێوەیەکی کاتی لە شارێکی دوورەدەستی وەک «توجمان»دا کاردەکا.

کوڕە پۆستەچییەکە گەڕایەوە کالێ چاکابوکۆ و بۆیەچییەکەی جارێکی یدی پرسیارکوت کرد. لە کۆتاییدا لەگەڵی چووە لای پیاوێک کە بەشێوەیەکی تارماوی ناوونیشانی کلێمنتەکانی لەبیرمابوو. "ئەویش گوتی: "تۆ دەبێ بە قیتاری «سان فێرناندۆ» بڕۆی. پاشان سواری پاسی ژمارە ٢٠٣ ببی تا لە «ئاڤیجێندا» دەردەچێ. کاتێ شەقامەکەت بڕی کۆشکێکت[119] دێتەپێش. لەدەستە ڕاستدا بەشێک لە خانووەکانت لێدیارە، لەوێ خانوویێکی بچکۆڵەی بەخشت دروستکراو دەبینی. ئەوێ خانووەکەی کلێمنتە."

---

[118] کەژە: مووزەرد.

[119] مەبەست لە کۆشک، دووکانۆکەی سەرشەقامەکانە.

کوڕە نامەبەرەکە بە خۆشییەوە خێرا گەڕایەوە و ڕاپۆرتی خۆی دایە «ئاهارونی». بۆ ڕۆژی پاشتر «ئاهارونی» سواری قیتاری «سان فێرناندۆ» بوو، بەدوای ڕێنوێنی کابرای بۆیەچییەکەدا ڕۆیشت و خانووەکەی دۆزییەوە. لە کۆشکەکەی نزیک ئەویّ لایدا و پرسیاری ناوی شەقامەکەی کرد.

فرۆشیارە گەڕۆکەکەش پێیگوت ناوی «کالیّ گاریبالدی»[120]یە.

ئینجا لێکۆڵەرەوەکە بە ڕێگەی خۆیدا گەڕایەوە.

## کالیّ گاریبالدی

لە ناوەڕاستی مارتدا، «ئاهارونی» وەک بزنسمانێک ڕوی لە خانووەکەی شەقامی «کالیّ گاریبالدی» کرد، لەبەرانبەری خانوەکەی کلیمێنتدا لە دەرگەی ماڵێکی داو پرسی: "من نوێنەرایەتی کۆمپانیایەکی ئەمریکی دەکەم،" بەم قسەیە ڕوی لەو ژنە کرد، کە دەرگەکەی لێکردەوە؛ "ئێمە کارخانەیەکی ماکینەی درومان دادەنێین، بەدوای دروستکردنی کارخانەیەک لەو ناوەدا دەگەڕێین. حەزمان لێیە خانووەکەی تۆ بکڕین." ئینجا لەسەر قسەکەی ڕۆیشت و پەنجەشی بۆ ماڵەکەی کلیمێنت درێژکرد؛ "هەروەها ئەو خانووەی ئەویش. ئایا ئێوە خانووەکەتان دەفرۆشن؟"

[120] Calle Garibaldi

لەکاتێکدا «ئاهارونی» لەگەڵ خانمەکەدا قسەی دەکرد، پەنجەی لەسەر دوگمەی شتێکی بچکۆلە گیرساندبوو کە لەنێو جانتاکەیدا هەڵیگرتبوو. تومەز لەنێو جانتاکەدا کامێرایەکی شاراوەی دانابوو، وێنەی خانووەکەی کلێمێنتی لە چەند گۆشەیەکەوە گرت.

بۆ ڕۆژی پاشتر، «ئاهارونی» لە ئەرشیفی شارەکەی کۆڵیەوە، بۆی دەرکەوت، ئەو خانووەی کلێمێنتی تێدایە بەناوی خانم «ڤێرا لیبل دە ئایخمان»ە، ئەمەش بەڵگەبوو کە «ڤێرا» شووی نەکردۆتەوە، بەگوێرەی دابونەریتی ئەرجەنتینیانەش، خانمەکە تاپۆی خانووەکەی بە هەردوو ناوی کچێنی و ژنایەتی خۆی کردبوو، دیاربوو ناوی ریکاردۆ کلێمێنتی لە بەڵگەنامە فەرمییەکان نەهێنابوو.

پاشان «ئاهارونی» چەند جارێک، بە پیادە، بە ترومبێلی تایبەت، بە ترومبێلی بچووک هاتبووە شەقامەکە و کۆمەڵێ وێنەی خانووەکە، هی «ڤێراو» هی منداڵە بچکۆلانەکەی گرتبوو کە لە حەوشەکەیدا یاری دەکرد. ئەو هێشتا کلێمێنتی نەبینیبوو، بەڵام بڕیاریدابوو چاوەڕێی ڕۆژێکی تایبەت بکا: چاوەڕێی ٢١ی مارت بکا. ئاخر لەنێو فایلی «ئاهارونی»دا نیشانکرابوو، کە ڕۆژەکە ساڵیادی بیست و پێنج ساڵەی ژن و مێردایەتی ئەدۆلف ئایخمان و ڤێرا لیبیلە. چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد ئایخمان لە شاری «توجمان» بگەڕێتەوە، بۆ ئەوەی لەگەڵ خێزانەکەیدا ئاهەنگ بگێڕێ.

لە ٢١ی مارتدا ئاهارونی بە خۆی و کامێراکەی گەڕایەوە شوێنەکە. لە حەوشەکەدا پیاوێکی باریک، سەرکەچەڵ، بەرزییێکی مامناوەند، کە دەمێکی باریکەلە و کەپوویێکی گەورە و سمێڵێشی هەبوو بینی چاویلکەی لە

چاودایە. ئەم ئادگارانە هەمووی لەگەڵ وەسفەکانی نێو فایلی هەواڵگرییەکەیدا یەکی دەگرتنەوە.

بەڵێ ئایخمان.

ئەوسا لە ئیسرائیل، ئیسەر چووە ماڵی بنگۆریۆن. "ئێمە شوێنی ئایخمانمان دۆزیوەتەوە" وای بەسەروەزیر گوت. "پێموایە دەتوانین بیگرین و بیهێنینە ئیسرائیل."

بنگۆریۆنیش دەستبەجێ هاتە وەڵام. "بە زیندی بێ یان بەمردی، بیهێنن،" ئەو بۆ ساتێک بیریکردەوە پاشان ئەوەندەشی بۆ زیادکرد: "باشتر وایە بە زیندوویی بیهێنن. ئەمە دەبێتە شتێکی گرنگ بۆ گەنجەکانمان."

## تیمێکی پێشکەوتوو گەیشت

ئیسەر تیمێکی ئۆپەراسیۆنی پێکهێنا. هەر دوازدە ئەندامەکەی تیمەکە خۆبەخش بوون. هەندێکیان پاشماوەی ڕزگاربووی دەستی هۆلۆکۆست بوون، کە هێشتا ژمارەی ئۆرودوگا زۆرەملێکیانیان لەسەر باسک وەک تاتو هەڵکەندرابوو. چەقی بازنەی تیمەکەش یەکەی ئۆپەراسیۆنی دەزگەی ئاسایش بوو. سەرلیستی تیمەکەش دوو ئاژانی شاباک بوون. «ڕافی ئیتان» وەک فەرماندە دەستنیشانکرا. لەپاڵ ئەویشدا «زڤی مالکین»، کە «ئیتان» بە "ئازا، بە جەستە بەهێز و بەرجەستەی تاکتیک و چالاکی" وەسفی دەکرد، لەگەڵیدا بوو. ئەو پیاوە سەرکەچەڵەی برۆچڕوپڕ، شەویلاگە بەهێز، دوو چاوی قووڵ و مەلوول، بە باشترین جاسووسگر لەنێو شاباکدا ناسراو بوو. ئەو هەرگیز دەمانچەی هەڵنەگرتبوو (ئاخر

ئەگەر هەڵیگری مەیلی ئەوەت لە کەللە دەدا، بەکاریبێنی")، ئەو پشتی بە "هەستی هاوبەش، داهێنان و تەڕدەستی" بەستبوو، دەمامکی لەسەر دەموچاوی چەندین ئاژانی سۆڤیەتی هەڵدابووەوە. هەندێک لە تافی منداڵێتی لە پۆلۆنیا بەسەربردبوو، پاشان، لەدوای هەرای گرتن و کوشتنەکەی گوندی «گرانیک» لوبێلکسی بۆ ئیسرائیل کۆچیکردبوو. هەر بەتەنیا «فروما»ی خوشکی و خێزانەکەی لە پۆلۆنیا بەجێمابوون؛ پاشان هەموو ئەوان و خزمەکانی دیکەی «زڤی» لە هۆلۆکۆستدا فەوتان. ئەو لە «حەیفا» گەورەبوو، لە شەڕی ڕزگاریخوازیشدا جەنگا. لەنێو بەهرە زۆرەکانیدا، وێنەکێشان، نووسین "بە ناچاری" و نواندن بوو. لەو ماوەیەی لە نیویۆرکدا مایەوە، بە «لی ستراسبێرگ» ئاشنابوو، ستراسبێرگیش دامەزرێنەری ستۆدیۆی ئەکتەرەکان بوو، زۆر شت لەبارەی نواندن و ڕۆڵی ئەکتەرییەوە لەو فێرببوو. دواتر گوتی: "لە زۆر لە ئۆپەراسیۆنەکانی مۆساددا، ئەوانەی من تیایاندا بەشداربووم، رۆڵم تێدا دەبینی، وەک ئەوەی لەسەر سەکۆی شانۆ بم، کە دەمامک و ماکیاجم بەکاردەهێنا. لە ئۆپەراسیۆنەکانی دیکەشدا، هەستم دەکرد کە شانۆگەریەکە دەردەهێم. من فەرمانەکانی ئۆپەراسیۆنەکانم دەنووسینەوە وەک ئەوەی سیناریۆی فیلم بێ."

ئەندامێکی دیکەی تیمەکە، «ئاڤراهام (ئاڤروم) شالۆم» بوو، لە ڤیەننا لەدایکببوو، پیاوێکی کورتەبنەی قورس، پیاوێک بوو گورج دەڕۆیی، جێگری ئیتان بوو، پاشان بووە بەڕێوەبەری شاباک. ئەوانی دیکەش هەریەک لە «یاکۆڤ گات»، سەر بە بنکە نهێنییەکەی پاریس کە ئاژانێکی مەیدانی بوو؛ «موشێ تاڤۆر» سەربازی پێشووی سوپای بەریتانی و ئەندامی گروپی نهێنی "تۆڵەستێنەکان" بوو کە لە کۆتایی جەنگەکەدا ڕاوی

تاوانبارە نازییەکانیان دەنا، هەندێکیانی بەدەستی خۆی کوشت، هەروەها پیاوێکی دیکەی هێمن و بەخۆڕاپەرموو، «شالۆم دانی» نیگارکێشێکی بەهرەمەند بوو کە لە "ساختەکردنی بەڵگەنامەدا" پیتۆڵ بوو. هەندێک دەڵێن ئەو «شالۆم»ـە بەوە لە ئۆردوگا زۆرەملێکان دەربازی بووە، بە کاغەزی ئاودەست، بەڵگەنامەی ساختە کردووە و کاربەدەستانی لەخشتەبردن.

زۆر لە ئەندامانی تیمەکە خێزاندار بوون.

تیمەکە تیمێکی پیشەمەند بوو. «ئێفرایم ئیلانی» بە ئەرجەنتین ئاشنا بوو، باش بە شەقامەکانی بۆینس ئایرسی بەڵەدبوو. ئەو کلیلشکێنێکی بەهرەمەند بوو، پیاوێک هێزێکی فیزیکی زۆری هەبوو، ئاژانێک دەموچاوێکی "پاک و بێوەی" کەوای لە هەموو کەسێک دەکرد متمانەی پێبکا. «یەهودیت نیسیاهو»[121]، ژنێکی دیندار کە باشترین ئاژانی مێی مۆساد بوو، ئەویش خۆبەخشانە لە تیمەکەدا بوو. «یەهودیت» ژنێکی بێدەنگی شەرمنی سەرنجڕانەکێشی قەڵەوی کەتە بوو. ئەو خانمە چەندین جار پێشوازی لەیەکێ لە نووسەرەکانی ئەم کتێبە کردووە، هیچ جارێکیش وا دەرنەکەوت کە ڕەفتارێکی نائاسایی کردبێ.

دکتۆر «یۆنا ئیلان»، ئەو پزیشکەی چەندین جار لە ڕابردوودا لە ئۆپەراسیۆنەکانی مۆساددا بەشداربووە، ویستی یارمەتی تیمەکە لە پەلکێشکردنی ئایخمان بۆ ناو ئیسرائیل بدا. «زڤی ئاهارونی» خودی لێکۆڵەرەوەکەش ڕەگەڵ تیمەکە کەوت. بەڵام یەکەمین خۆبەخشی تیمەکە

[121] Yehudith Nissiyahu

«ئیسەر» بەخۆی بوو. حەزی لێبوو سەرکردایەتی تیمەکەی لەو ئۆپەراسیۆنە دژوارەی لە دەرەوەی وڵاتدا بکا. بەڵام ئەمجارەیان، زانی کە ئاراستەی کردەوەکە، پێویستی بەوە هەیە لەسەر ئاستی باڵادا و لەکاتی پێویستدا دەبێ بڕیاری لێبدرێ. هەروەها دەکرێ لێکەوتەکەشی زۆر لەودیو دەستکەوتی سیاسیانەوە بێ. بۆیە شتێکی چارەنووسسازانە بوو، ئیسرائیلییێک سەرپەرشتی ئەو تیمە بکا، کە بتوانێ لە کاتی پێویستدا بڕیاری سیاسیانە بدا. ئیسەر هەستی کرد دەبێ خۆی فەرماندە بەرپرسیارەکە بێ.

بەم جۆرە، لە کۆتایی ئەپریلدا، تیمە پێشکەوتووەکە کە لە چوار ئاژان پێکهاتبوون لە ئاراستەی جیاجیاوە چوونە نێو وڵاتی ئەرجەنتین. ئەوان کەلوپەل و تفاقی پێویستیان بە قاچاغ گەیاندە وڵاتەکە کە بریتیبون لە: وۆلکی تۆلکی، کەرەستە و ئامرازی ئەلیکترۆنی. داودەرمان، هەروەها لەگەڵ بەشێک لە تاقیگە دەوڵەمەندەکەی «شالۆم» دانی، کە بەهۆیەوە پاسپۆرت و ناسنامە و ئیفادەی پێدەردەهێندران.

ئەوان ئەپارتمانێکیان لە بۆینس ئایرسدا بەکرێگرت (کۆدەکەشیان بەناوی "قەڵایەکە" بوو)، دەبووایە چەندین ئەندامی تیمەکە تێدا بژی و کاربکەن، خواردن و ئازوقەشیان بۆ دابینکرد. بۆ ڕۆژی پاشتر هەر چوار کەسەکە ترومبێلێکیشیان بەکرێگرت و پێی چونە سان فێرناندۆ، سەعات حەفت و چل خولەکی ئەنگۆرە گەیشتنە ئەوێ.

دنیا تاریک بوو ئەوانیش تووشی سەرسامییێکی گەورە هاتن. چونکە کاتێک بە هێواشی بەسەر ڕێگەی ٢٠٢دا لێیاندەخوڕی، لە پڕێکەوە بینیان

ڕیکاردۆ کلیمێنت بەپێ بە ئاراستەی بەرانبەریان دەڕوا! ئەو هیچ ئاوڕی لەوان نەدایەوە، بە ئاسانی سووڕایەوە و چووەوە ماڵەکەی خۆی.

ئاژانەکانیش لێکیاندایەوە، لەوانەیە کابرا هەموو ئەنگۆرەیەک، نزیکەی ئەوکاتە بێتەوە ماڵ، ئیدی دەبێ کردەی ڕفاندنەکەی بە تاریکی لەنێوان ئەو ماوەیەی کە لە وێستگەی پاسەکە دادەبەزێ تا دەگاتەوە ماڵەوەی بکرێ.

بۆ شەوەکەی بروسکەیان بۆ ئیسرائیل بەم کۆدەیە لێدا: "ئامانجەکە دیارە."

## فڕۆکەیەک بۆ ئابا ئیبان

«ئیسەر» هەستی کرد بەختی هەیە. بیستی کەوا لە ٢٠ی ئایاردا ئەرجەنتین ئاهەنگی ساڵیادی سەد و پەنجا ساڵەی سەربەخۆیی دەگێڕێ. ئیدی لە هەر چوارگۆشەی دنیایێ، نێردەی پلە باڵا دێن تا بەشداری لە ئاهەنگەکەدا بکەن. نێردەیەکی ئیسرائیلیش بە سەرۆکایەتی ئابا ئیبان، وەزیری پەروەردە و فێرکردن دێتە سەر خوانی ئاهەنگەکە. «ئابا ئیبان»یش دڵخۆشبوو بەوەی کەوا ئەل ئال[122] فڕۆکەیەکی تایبەتی بە ناوی بریتانیا (زەبەلاحە بەسرتەکە)ی خستۆتە خزمەت. کەسیش

[122] Al Al فڕۆکەوانی مەدەنی ئیسرائیلی.

نەیدەزانی ئەو بەخشندایەتیەی کۆمپانیای ئەل ئال هۆیەکەی بۆ ئۆپەراسیۆنی ئایخمان دەگەڕێتەوە.

گەشتەفڕینی ژمارە ٦٠١ بۆ بۆینس ئایرس بەپێی خشتەی فڕین بۆ ١١ی ئایار داندرابوو. ئیدی بە وریاییەوە تاقمی فڕۆکەوانییەکان لێگرت و ئیسەریش نهێنییەکەی تەنیا بۆ دوو کەس لە ئەفسەرە پلەباڵاکانی ئەل ئال درکاندبوو، ئەوانیش «مۆردەخای بن ئاری» و «ئەفرایم بن ئارتیز» بوون. ڕاوێژیش بۆ فڕۆکەوان «زڤی تۆهار» کرا کە میکانیکیێکی کارامە لەگەڵ خۆی ببا، ئەوەش بۆ ئەو حاڵەتەی ئەگەر هاتوو لەپڕێک فڕۆکەکە بەبێ یارمەتی تاقمە زەمینییەکەی ئەرجەنتین لە فڕۆکەخانەکە هەڵبفڕێ.

لە ڕۆژی ١ی ئایاردا و لەبەرەبەیاندا، ئیسەر بە پاسپۆرتێکی ئەورووپی لە فڕۆکەخانەی بۆینس ئایرس دابەزی. بایەکی تەزی بەسەر ڕێڕەوی فڕۆکەخانەکەدا هەڵیکرد. لە ئەرجەنتیندا سەروبەندی وەرزی بەهار بوو. هەشت ڕۆژ دوای ئەوە، واتە لە ئەنگۆرەی ٩ی ئایاردا، چەندین ئیسرائیلی خۆیان خزاندە نێو ئەپارتمانە نوێیەکەی باڵەخانە درێژەکەی بۆینس ئایرس. ئەوان چوونە ئەپارتمانێک کە هەر یەک دوو ڕۆژ پێشتر بەکرێگیرابوو (کۆدەکەشی بەرزایی بوو). سەرجەم ئەندامانی یەکەی ئۆپەراسیۆنەکە ئامادەبوون. پێشتر ئەوان لەچەند هوتێلێکی دەوروبەری شارەکەدا دابەزیبوون. دواین کەس کە چووە نێو ئەپارتمانەکە، کە بۆ یەکەمین جاریش بوو بچێتە ئەوێ، ئیسەر بوو، بەم جۆرە دوازدەمینەکەیان تەواوبوو.

هەر لەو کاتەی ئیسەر پێی نابووە سەر خاکی ئەرجەنتین، شێوازێکی داهێنەرانەی بۆ پەیوەندیکردن بە تیمەکەی پەیڕەو کرد: لەنێو بەرکیدا،

لیستێکی بەناوی سێسەد قاوەخانەی لە بۆینس ئایرسدا هەبوو کە ناوونیشان و سەعاتەکانی کردنەوەشیاندا تێدا تۆمارکرابوو. هەموو بەیانییەک دەچووە دەر و پیاسەی دەکرد و لەنێوان قاوەخانەکاندا دەهاتوو دەچوو، بەگوێرەی ئەو خشتەیەی کە پێشتر ئامادەیکردبوو، دەڕۆیشت. بەم جۆرە پیاوەکانی دەیانزانی دەقاودەق ئاخۆ ئیسەر لەکوێیە و لە هەموو ساتێکی ڕۆژدا بە ئاسانی دەیاندۆزیەوە. تاکە شتێکی نائاسایی لە سیستمی ڕۆژانەکەیدا، ئەوەبوو دەبووایە *ڕامسادە*کە چەندان کوپ لە قاوەی ئەرجەنتینی هەڵقوڕێنێ. لەو قاوەخانانەدا ئیسەر ئامادەکارییەکانی کردەی ڕفاندنەکەی بەڕێوەدەبرد.

ئەو ڕۆژانە، ڕۆژی کاری پڕ لەجۆش و خرۆش بوون: هێنان و دانانی ئەو کەرەستە و ئامرازانەی کە بۆ گرتن و حەشاردانی بارمتەکراوەکە پێویست بوو، بەکرێگرتنی ترومبێل بۆ چاودێری و بۆ گرتنەکە، بەکرێگرتنی ئەپارتمان و ڤێلای لاپەڕگەی دیکە لە دەرەوەی شار، کاتێک ئایخمانیان دەکەوێتە دەست. گرنگترین ڤێلاش ("بنکەکە") لەسەر ڕێگەی فرۆکەخانەکە بوو. ڤێلاکە لە لایەن دوو ئاژانی مۆساد بەکرێگیرابوو، کە خۆیان وەک دوو گەشتیار نمایش کردبوو. یەکێک لەوان «یاکۆڤ مێدیاد (میۆ)» بوو، پیاوێکی چوارشانە بوو لە ئاڵمان لەدایک ببوو، کاتی خۆی دایبابی لە هۆلۆکۆست لەدەستدابوو، خۆیشی لەماوەی جەنگی دووهەمی جیهانیدا لەگەڵ سوپای بەریتانیا دژی نازییەکان لە شەڕدا بوو. ئەو ژنەی لەو کارەشدا یاوەری بوو، «یەهودیت نسیاهو» بوو. لەنێو ڤێلاکەدا، ئاژانەکان حەشارگەیەکیان بۆ ئایخمان و پاسەوانەکانی دروستکرد، بۆ ئەوەی ئەگەر هاتوو پۆلیسی خۆجێی لێکۆڵینەوەی کردبا، ئەوا ئەپارتمانی دووهەمیشیان وەک جێگرەوەیەک ئامادەکردبوو.

نەخشەکەیان وادانابوو، لە ١٠ی ئایاردا ئایخمان بگرن و بیڕفێنن، فڕۆکەکەی ئابا ئیبانیش لە ١١ی مانگ هەڵدەستا و لە ١٢ی مانگیشدا بۆ ئیسرائیل دەفڕی.

بەڵام لەدوا ساتدا نەخشەکە گۆڕا. لەبەر ئەو ژمارە زۆرە میوانانەی بۆ ئاهەنگی ساڵیادەکە دەهاتن، پڕۆتۆکۆلی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئەرجەنتین ئاگاداری نێردەی ئیسرائیلی کردەوە کەوا دەبێ گەیشتنی نێردەکە تا سەعات دووی دوای نیوەڕۆی ١٩ی مانگ دوابکەوێ. ئەمەش بۆ ئیسەر واتای ئەوەی دەگەیاند، گرتنی ئایخمان تا ١٩ی مانگ دوابخەن، یاخود دەبووایە نەخشەکەیان لە ١٠ی مانگدا جێبەجێبکردبایە، ئینجا دەبوو ڕفێندراوەکە بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ لە شوێنێک حەشاربدەن. هەڵبەت کارەکەش پڕ مەترسی بوو، بەتایبەتیش ئەگەر لەسەر داوای خێزانەکەی، لێکۆڵینەوەیەکی چڕوپڕ بۆ دۆزینەوەی لەلایەن پۆلیسی ئەرجەنتینەوە دەستپێکرابایە. مەترسییەکی دژواریش لە گۆڕیدا بوو، پۆلیسی ئەرجەنتینی ئایخمان و ڕفێنەرە ئیسرائیلییەکان بدۆزنەوە.

سەرباری ئەو هەموو هۆشداریە خۆپارێزانەش، ئیسەر بڕیاریدا لەسەر نەخشە بنەڕەتییەکەی خۆی بڕوا؛ بەڵام لەبەر ماندووبوونی و هیلاکی تاقمەکەی، بڕیاریدا یەک ڕۆژی دوابخا. ئیدی ڕۆژی گرتن و ڕفاندنەکەیان دانا، ڕۆژی ١١ی ئایار و سەعات ٧:٤٠ خولەکی شەو.

نەخشەی ئۆپەراسیۆنەکە داندرا، مایەوە سەر وردەکارییەکانی: ئایخمان هەموو ڕۆژێ ئێوارە درەنگ لە سەعات ٧:٤٠ خولەکدا لەسەر کار دەگەڕایەوە. ئەو لە گەڕانەوەیدا سواری پاسی ژمارە ٢٠٣ دەبوو، لەلای کۆشکەکە لەسەر شەقامەکەدا دادەبەزی و لەوێوە تا ماڵەکەی لە «کالێ

گاریبالدی» بەپێ دەڕۆیشت. شەقامەکەش ئەوکات تاریکبوو، قەڵەباڵغی سەرجادەش نەمابوو. دەبووایە ئۆپەراسیۆنەکەش لەلای ئاژانەکان بە دوو ترۆمبێل کرابایە: دەستەیەک بۆ ڕفاندن، دەستەکەی دیکە بۆ پاڵپشتی و ئاسایش و پارێزگاریلێکردن. ترۆمبێلی یەکەم دەبووایە لەسەر ڕێگەیەکە ڕاییگرتبایە و بۆنیتی هەڵبدابایەوە، ئیدی ئاژانەکانی لێودەردەکەوتن تا چاکی بکەنەوە. کاتێکیش ئایخمان دەگاتە ڕاستی ئەوان، ئەوا خۆی هەڵدەدەنەسەر، بەرزەفتی دەکەن و فڕێیدەدەنە نێو ترۆمبێلەکە. ئینجا دەستبەجێ لێیدەخوڕن، ترۆمبێلەکەی دیکەش بەدوایاندا بڕوا. دکتۆرەکەش لەگەڵ ترۆمبێلی دووەمدا دەبێ، لێیان نزیک دەبێ، چونکە لەوانەیە گیراوەکە پێویستی بە دەرزییێکی سڕکردن هەبێ.

ئیسەر بە دەنگێکی تۆکمە و کتومتەوە فەرمانەکانی بۆدەرکردن. "خۆ ئەگەر هەر کێشەیەکیشتان تووشهات، ئەگەر هاتوو پۆلیس ئێوەی گرت، پێیان بڵێن کەوا ئێوە ئیسرائیلین، لەسەر بەرپرسیارێتی خۆتان بەو کارە هەڵساون، بۆ ئەوەی ئەم تاوانبارەی نازی بدەنە دەست دادپەروەری." هەموو ئەوانەش کە لە گرتن دەربازبوون، ئەوا بەگوێرەی پلانەکە، ئەم وڵاتە جێبێڵن.

هەروەها فەرمانی بە «میداد» و «یەهودیت نیسیاهو» کرد، کە بچنە نێو ڤێلایەکە وەک جووتەیەکی گەشتیار هەڵسوکەوت بکەن. "زووزوو وەرنەدەر و بەخۆشی خۆتان نمایش بکەن و بە بابۆڵەی سەندەویچ و ڕۆژنامە بچنە چیمەنی ڤێلاکە."

ئینجا فەرمانی بە هەموو ئاژانەکانی دیکە کرد لە هوتێلەکان دەرچن و بەناوی دیکەوە بچنە ئەو خانووە سەلامەتانەی بۆیان داندرابوو.

## نزیکبوونەوە لە کاتەکە

سپێدەی ١١ی ئایار.

یەکەی ئۆپەراسیۆنەکە ئامادەباشی خۆی تەواوکردبوو. تەنانەت بەر لە سەعاتی سفریشیان، پیاوەکانی ئۆپەراسیۆنەکە ترومبێلەکانیان داپۆشیبوو. زۆر لەو ترومبێلانەی بەکرێیان گرتبوون، گەڕاندبوویانەوە. هەموو ئەندامانی دەستەکە بە دزییەوە لە شوێنەکە بوو، خۆیان شلکگۆڕکردبوو، سمێڵ، ڕیش و بارۆکەی ساختەیان دانابوو. هەر یەکێکیش ناسنامەیەکی نوێی پێدرا کە لەگەڵ ڕووخسارە نوێیکەی بوەشێتەوە. ئەو دوازدە کەسەی لە چەند ڕابردوودا گەیشتبوونە بۆینس ئایرس، ئەوانەی بەسەر شەقامەکاندا دەڕۆیشتن، ترومبێل و ئەپارتمانیان بەکرێگرتبون، لە هوتێلەکان دەگەڕان و بەبەردەم ماڵەکەی کالی گاریبالدیدا دەڕۆیشتن، نەمان و بزربوون؛ دوازدە کەسی دیکە، کە ڕووخساریان جیاواز بوو، بەڵگەنامەی جیاواز و ناوی جیاوازیان هەڵگرتبوو، شوێنی دوازدە کەسەکەی پێشتریان گرتەوە.

ئیسەر خۆیشی هوتێلەکەی جێهێڵا. ئەمڕۆش وەک هەر ڕۆژێکی دیکە بەنێو قاوەخانەکاندا گەڕا. جوڵەی ئەمڕۆی بۆ ناوچە بزنس و شوێنەکانی ڕابواردن بوو، لەوێدا لەهەر قاوەخانەیەک بۆ یەکێکی دیکە هەر پێنج خولەکی پێدەچوو.

- 1:00ی پاشنیوەڕۆ/ ئیسەر، ڕافی ئیتان و یەک دوو ئەندامی ئۆپەراسیۆنەکە بۆ دوایین تاووتوێ لە چێشتخانەیەکی گەورە

لەنێو جەرگەی شاردا یەکدییان بینی. هەموو ئەوانەش کە لە دەورەیان بوون، ئەرجەنتینی میهرەبانی دەم بەپێکەنین، سەرخۆش و ئەوانەی حەزیان لەگۆشتبرژاندن بوو. لە سەعات 2:00شدا تیمەکە بڵاوەی لێکرد.

- 2:30ی پاشنیوەڕۆ/ لە گەراجێکی گەورەی ناوشاردا، ئاژانەکان سواری ترۆمبێلی ڕفاندنەکە بوون، کە دوو سێ ڕۆژ بوو لەوێ ڕایانگرتبوو، لەوێوە بەرەو "بنکەکە" لێیانخوڕی. ترۆمبێلی دووەمیش لە گەراجێکی دیکە بەگەڕکەوت.
- 3:30ی پاشنیوەڕۆ/ هەردوو ترۆمبێلەکە لە "بنکەکە" ڕایانگرت و ئامادەی جووڵە بوون.
- 4:30ی پاشنیوەڕۆ/ دوایین هەواڵ لە "بنکە"کەوە. پیاوەکانی یەکەی ئۆپەراسیۆنەکە جلەکانی خۆیان گۆڕی، دەستیان دایە ناسنامەکان و ئامادەی دەرچوون بوون.
- 6:30ی ئێوارە/ هەر دوو ترۆمبێلکە لەیەکجیابوونەوە. چوار ئاژان لەنێو ترۆمبێلی ڕفاندنەکدا بوون کە ئەمانە بوون: زڤی ئاهارونی وەک لێخوڕ؛ ڕافی ئیتان وەک فەرماندە؛ موشێ تاڤۆروزڤی مالکین. سێ ئاژانەکەی دیکە لەنێو ترۆمبێلی دووەمدا بوون؛ ئەوانیش: ئاڤراهام شالۆم، یاکۆڤ گات و دکتۆر ئیلیان کە هەگبەیەکی داودەرمان و ئامێری بەنجکردنی پێبوو.

ترۆمبێلەکان بە لەیەکجیاوازی گەیشتنە شوێنەکە و لەلای دووڕیانەکە بەیەک گەیشتنەوە، کە زۆر لەماڵەکەی کلیمێنتەوە دوور نەبوو. ئاژانەکان

ناوچەکەیان پشکنی و دڵنیابون، هیچ خاڵێکی پشکنینی یان هێزەکانی پۆلیسی لێ نییە.

- 7:35ی ئەنگۆره[123]/ هەردوو ترومبێلەکە لە شەقامی کالێ گاریبالدی ڕایانگرت. تاریکایەکی چڕ باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشابوو. ترومبێلی ڕفاندنەکە کە شێڤەرلۆتێکی سیدانی ڕەش بوو، لە لای جادەی پیادەڕۆ ڕایگرتبوو، ڕووی لە ماڵی کلێمێنت بوو. لە ترومبێلەکەدا دوو ئاژان هاتنەدەر و بۆنیتەکەیان هەڵدایەوە؛ ئاهارونی هەر لەپشت سوکانەکەدا مایەوە، چوارەمین ئاژانیان لەنێو ترومبێلەکەدا خۆی نەویکرد و سێرەی چاوی لەو شوێنە گرت کە ئایخمان لە دوورەوە لەنێو تاریکاییەوە بەدەردەکەوت. یەکێک لە ئاژانەکان دەستکێشێکی تەنکی لەدەستکرد، بۆ ئەو حاڵەتەی کە دەست لە ئایخمان بدا؛ ئاخر دەستلێدانی وا هەستی بێزووبوونەوەی هەڵدەستا. لەودیوی جادەکەشدا تروومبێلەکەی دووەم بوو، بیوکێکی ڕەش. دوو ئاژان لێیهاتبوونەدەر لە دەوروبەری ترومبێلەکەدا خۆیان سەرقاڵکردبوو. سێهەمینەکەیان لەسەر کورسی شوفێرییەکەی مابووەوە، ئامادەبوو هەر ئایخمان دەرکەوێ و لێیان نزیکبێتەوە لایتەکەی لەچاو بدا نابینای بکا. ئیدی داوەکە داندرایەوە.

- 7:40ی ئەنگۆره/ پاسی ژمارە ٢٠٣ لە گۆشەکەدا وەستا، بەڵام هیچ کەسی لێدانەبەزی.

---

[123] ئەنگۆره: ئێوارەدرەنگ. مەبەست ئەو کاتەی شەوە و شەو نییە، کاتێ کە تاریک دادێ.

- 7:50ی ئەنگۆرە/ دوو پاسی دیکەش هاتن، یەک بەدوای یەکدا هاتن. کلێمێنت لە هیچ کامیاندا نەبوو. بە دردۆنگیەوە پستەپست لەنێو ئاژانەکان پەیدابوو. ئەوە چی ڕوویداوە؟ تۆبڵێی خوەکەی خۆی گۆڕیبێ؟ تۆبڵێی بۆنی مەترسی کردبێ و هەڵاتبێ؟

- 8:00ی ئەنگۆرە/ پێشتر ئیسەر بە دەستەکەی گوتبوو، ئەگەر هاتوو کلێمینت تا سەعات هەشت بەدیارنەکەوت، ئەوا کارەکە هەڵوەشێننەوە و بگەڕێنەوە. هەرچی ڕافی ئیتانی ڕەقوبەند بوو، بڕیاریدا تا سەعات هەشت و نیویش چاوەڕێ بکەن.

- 8:05ی ئەنگۆرە/ پاسێکی دیکە لە گۆشەکە بەدیارکەوت. سەرەتا ئیسرائیلییەکان هیچیان نەبینی. بەڵام «ئاڤروم شالۆم»، کە لەدەستەی دووەم بوو، لەهیکەوە تارماییێکی لەسەر جادەی کالێ گاریبالدیدا بینی، کلێمێنت! ئینجا لایتەکانی پێکردن، سێرەی فوللایتەکەی کە بەرانبەرەکەی نابینا دەکرد، لەو بیچمەی گرت کە دەهاتە پێش.

ڕیکاردۆ کلێمێنت بە پێ بەرەو ماڵ دەبووەوە. فوللایتەکە لەدەموچاویدا و چاوەکانی لەسەر لایتەکە لادا. بەردەوامیشبوو لەسەر ڕۆیشتن. تێبینی ئەوەی کرد، ترۆومبێلێک لە لای ڕێگەکە وەستاوە -لەوانەیە مەکینەکەی کێشەی تێکەوتبێ- و یەک دوو کەسیش بە دەوریەوە بوون. لەو ساتەدا پیاوەکەی لای شێفرۆلێتەکە ڕووی تێکرد و پێیگوت: "مۆمێنتۆ، سێنیۆر"

(بەڕێز یەک خولەک). ماخۆی[124] دەنگەکەش «زڤی مالکین» بوو، ئەو دوو وشە ئیسپانیەی بەکارهێنان، ئاخر هەر ئەو دوو وشەشی دەزانین.

کلێمنتیش دەستی بۆ لایتەکەی بەرکی برد، تومەز زۆر جار بۆ ڕێنوێنی لە تاریکایی شەقامەکەدا بەکاریدەهێنا. ئینجا هەمووی لەچاوتروکانێک قەوما. «مالکین» وایزانی کەوا کلێمێنت دەست بۆ دەمانچە دەبا. بازی دایە سەر کلێمێنت لەنێو تۆزوخۆڵی تەنیشت سەر ڕێگەکەدا تەختی کرد. «کلێمنت» دەنگێکی لێوەهات، بەس کورت بوو. هەر لەنێو ترۆمبێلەکەدا پیاوێکی دیکەش بازی دایە سەر. باسکێکی قەڵەو سەری کلێمێنتی گرت و دەمیان بەست. ئینجا فڕێیاندایە پشتەوەی ترۆمبێلەکە و لەوێ لەبەر پێی درێژیانکرد. شۆفێرەکەش سلفی لێدا و بەرەو پێشەوە بۆی دەرچوو. هەر تەنیا نیوخولەک لەنێوان دەرکەوتنی کلێمێنت و دەرچوونی ترۆمبێلەکە بوو.

بۆ چەند چرکەیەک دواتر، ترۆمبێلەکەی دووەمیش بەدوایاندا ڕۆیشت.

دەستێکی سووک هەر زوو دەست و پێیەکانی کلێمێنتیان بەستنەوە. یەکێکیش پارچە پەڕۆیەکی لەدەمدا ئاخنی. عەینەکەکەشیان لەچاو کردەوە، لەبری ئەوە چاویلکەیەکی ڕەشی تاریکیان لەچاودانا. دەنگێک لەبن گوێی کلێمێنت بە ئەڵمانی نەڕاندی: "یەک جووڵەی دی بکەی، کوژراوی!" ئەویش گوێڕایەڵ بوو؛ بۆ ڕێی گەڕانەوە هیچ خۆی نەبزاوت. لەو کاتەدا هەستیکرد دوو دەست گەیشتنە سەر ڕووتەی پێستی. ئەوە دەستەکانی «ڕافی ئیتان» بوون بەدوای جێشوێن برینێکی ئایخماندا دەگەڕان، کە

[124] ماخۆ: خاوەن.

لەبن هەنگڵدا هەیبوو، یەکێکیش لە لای دەستەڕاستی زگی هەبوو. ئیتان سەیرێکی «مالکن»ی کرد، ئەویش سەری بۆ لەقاند. ئەوان دەستی یەکدیان گوشی. ئیدی ئایخمانیان بەتەواوی کەوتە بندەست.

هەرچەندە ڕافی ئیتان هەستیکرد هەموو شتێکی جڵەوکردووە، بەڵام ئەوسا لە پڕێکەوە پەی بەوەبرد کەوا بردەبردێکی لێوەدێ، تومەز ئەوە سروودی جووە پارتیزانەکان بوو، کە لەکاتی شەڕ دژی نازییەکان دەیانگوتەوە، «ڕافی» هەر دووبارەی دەکردەوە: "ئێمە لێرەین! ئێمە لێرەین!"

ترومبێلەکە تیژ دەڕۆیشت، پاشان لەپڕ وەستا و هێشتاش مەکینەکەی هەر نەکوژابووەوە. کلێمێنتیش نەیدەزانی ئەوە لەبەر داری بەرزکراوی بەربەستی قیتارەکەیە. هەردوو ترومبێلەکە کە کابرایان ڕفاندبوو، دەبوایە چەندین خولەک بوەستن تا قیتارە دووروودرێژەکە تێدەپەڕێ. ئەم ساتەش بۆ هەستی ئاژانەکان کوشندەترین سات بوو لە سەرلەبەری ئۆپەراسیۆنەکە. ئاخر ترومبێلەکەیان بە چەندین ترومبێلی دیکە دەورەدرا، هەموویان هەر لەبەردەم بەربەستەکە وەستابوون. لەدەرەوە گوێیان لەدەنگەدەنگ دەبوو، بەڵام کلیمێنت لە شوێنی خۆی نەدەجووڵا. هیچ کامێکیش لە ئەرجەنتینییەکان تێبینیان نەکرد کە شتێکی سەیر و نامۆ لە پشتی ترومبێلە شیفرۆلێتەکەدا درێژکراوە. چەند خولەکێک دواتر، داری بەربەسەتی قیتارەکە هەڵدرایەوەو هەموو ترومبێلەکانیش بە تیژی بەرەو پێشەوە لێخوڕدران.

- 20:55ی شەو/ هەردوو ترومبێلەکە لە شوێنێکی "بنکەکە" وەستان. کلێمێنت هەروەک پیاوێکی کوێر لە نێوانی ڕفێنەرەکانیدا

بوو، هێندرایە نێوخانووەکە. ئەو ڕێگر نەبوو لەوەی گرتبویان و پیاوەکانیش جلەکانیان لەبەرداکەنین. ئەوان بە ئەڵمانی فەرمانیان بەسەردا کرد دەمی بکاتەوە. ئەویش گوێڕایەڵ بوو. ئەوان ناودەمیان پشکنی، بەدوای حەبی ژەهراوی دەگەڕان، نەبادا لەبن ددانەکانی دانابێ. هێشتاش هەر چاویلکە ڕەشە تاریکەکانی لەچاودابوون، هیچ شتێکی نەدەبینی، بەڵام هەستی بەدەستێک کرد کەوا جەستەکەی دەپشکنێ و دەست لە جێبرینەکان دەدا. شارەزایەک دەستێکی گەیاندە بن قۆڵی چەپەی و دەستی لەو جێبرینە بچکۆلەیەدا، کە هێشتا شوێنەواری هەر مابوو، ئەوەش یەک دوو ساڵ پێشتر بوو، ئەو کاتەی ویستبووی ئەو تاتووەی کاتی خۆی ئەفسەربووە لە نێوSSەکانەوە لابەرێ.

لەپڕێک دەنگێک بە ئاڵمانی نەڕاندی.

"قەبارەی شەپقەکەت... پێڵاوەکانت... ڕۆژو ساڵی لەدایکبوونت... ناوی باوکت.... ناوی دایکت...."

ئەویش هەروەک ڕۆبۆتێک بە ئەڵمانی بەرسڤدایەوە. تەنانەت کاتی لێیانپرسی: "ئایا ژمارەی سەر کارتی حیزبی نازییەکەت چەندە؟ ژمارەکەت لەنێو SS ـەکاندا؟" نەدەکرا بێدەنگی لێبکا

- ٤٥٣٢٦. ژمارەی دیکەش، ٦٣٧٥٢.

- "ناوت؟"

- "ڕیکاردۆ کلێمنت."

- "ناوەکەت/" دەنگەکە لێی دووبارە کردەوە.

- ئەویش بە هەڵلەرزینەوە: "ئۆتۆ هێنینگەر."

- "ناوەکەی خۆت؟"

- "ئەدۆلف ئایخمان."

ساتێکی بێدەنگی باڵکێش بوو. ئینجا هەر خۆی بێدەنگییەکەی شکاند. "من ئەدۆلف ئایخمانم،" دووبارەی کردەوە: "من دەزانم کەوتوومەتە دەستی ئیسڕائیلییەکان. هەروەها هەندێ عیبریش دەزانم، لە وارشۆ عیبریم خوێندووە..."

ئەو هەندێ کۆپلەی لە بایبل بە بیرهاتنەوە و بۆ ئەوانی گوتنەوە، تێدەکۆشا بە عیبری و بە گۆکردنێکی گونجاویش لەگەڵیان بدوێ.

بەڵام کەسی دیکە قسەی نەکرد. کوڕە ئیسڕائیلییەکان بە حەپەساویەوە لێیەوە ڕامابوون.

## پەیکێک بۆ سدی بۆکر

ئیسەریش لەنێو بۆینس ئایرسدا، هەر لە قاوەخانەیەکەوە دەچووە یەکێکی دیکە. درەنگی شەو بوو، کاتێ خۆی بە قاوەخانەیەکی دیکەدا کرد و لەسەر کورسییێک دانیشت و چاویشی لەسەر دەرکەی هاتنەژوور بوو. لە هیکەوە دوو کەس لە پیاوەکانی خۆی بینین هاتنەژوور. ئەویش لەجێی خۆی هەڵسا. «ئاهارونی» بە بەبزەوە پێیگوت: "دەستمانکەوت. ئەو

بەتەواوی ناسنامەکەی پشتڕاستکرایەوە و هەر بەخۆیشی دانی پێدانا کە ئەدۆلف ئایخمان خۆیەتی."

ئیسەریش دەستی گوشی و لە قاوەخانەکە دەرچوون. هەنووکە دەبووایە بگەڕابایەوە وێستگەی قیتار، جانتاکەی هەڵبگرتبا و بەناوێکی نوێوە چوبایە هوتێلێکی دیکە لە بۆینس ئایرس. هەوای شەو وشک و ساردبوو، بڕیاریدا هەر بەپێ بڕوا. دیاربوو سەرمای ببوو، سووکە تایەکی لێبوو، بەڵام هێشتا هەستیدەکرد کە زۆرخۆشە. ئەو بەتەنیا بە تاریکاییەکەدا ڕۆیشت، چێژی لە هەوای ساردی شەو وەرگرت، هەستی دەکرد لەسەر زەوی ناڕوا، هەستێکی مەستبوون کە هەرگیز لەبیری ناکا.

بۆ ڕۆژی پاشتر ترومبێلێک لە کابینە دارەکەی کیبۆتی (سدی بۆکر) وەستا. پیاوێکی لاوازی چاویلکە لەچاو، لە ترومبێلەکە دابەزی، ناسنامەی خۆی نیشانی پاسەوانەکان دا و لە ژووری خوێندنی بنگۆریۆندا وەژوورکەوت. کابراکە «یاکۆڤ کارۆز»ی دۆستە نزیکەکەی ئیسەر بوو.

بە داود بنگۆریۆنی گوت: "ئیسەر منی ناردووە. برووسکەیەکمان لەو پێگەیشتووە. ئایخمان لەبن دەستماندایە."

پیرەمێردەکە بێدەنگ بوو. پاشان لێیپرسی: "کەی ئیسەر دەگەڕێتەوە؟ من پێویستیم پێی هەیە؟"

بە سەیرکردنی ڕووخساری پەستی پیاوەکانی، ئیسەر تێگەیشت کە هەبوونی ئایخمان لەنێویاندا چەند مایەی دڵتەنگکردنیانە. تومەز دێوەزمە ئاڵمانەکە لەوێ بوو، هەنووکە هەر دیوارێکی تەنک بەینیان بوو، ئیدی پیاوەکان بەو هەبوونە هەستیان بە دەمارگرژی دەکرد، هەستیان دەکرد

خەریکن بڕشێنەوە. ئاخر ئەوان ڕانەهاتبون بە دوای کابرایەکدا بگەڕێن، کە لە چاوی ئەواندا، هێمای ئەهریمەن بوو؛ ئەو بۆ زۆر لە پیاوەکان بکوژی خزمە نزیکەکانیان بوو، بکوژی باب و دایکیان، هی براو خوشکیان بوو، هەر هەموویشیان لە تونی مەرگدا نقوومبوون. ئاخر چاودێریکردنی ئایخمان واتای ئەوەبوو بۆ بیست و چوار سەعات مشووری بخۆن. ئەوان نەیاندەتوانی مووسی ڕیشتاشینیشی بدەنێ، دەبووایە هەر خۆیان سەروڕیشیان بۆ بتراشیبا، نەدەکرا بۆ یەک چرکەش بەتەنیا جێیبهێڵن، نەبادا خۆی بکوژێ، ئەوان دەبوایە لەگەڵیدا بوونایە، تەنانەت بۆچونەسەر ئاویش بەجێیان نەهێشتبا. «یەهودیت نیسیاهو» چێشتی لێدەنا و ژەمەکانی ئایخمانی ئامادەدەکرد، بەڵام ڕەتیکردەوە ئەو قاپ و دەفرانە بشوا کە ئایخمان نانی تێدادەخوارد. هەستی قێزبوونەوە بەسەریدا زاڵبوو. «زڤی مالکین» لە قوژبنێک دانیشتبوو، دژە بێزوبوونەوەکەی خۆی بەوەدەردەبڕی کە لەسەر پەڕەی دانەیەکی کۆنی ڕێنوێنینامە بۆ باشووری ئەمریکا، وێنەی بیچمی ئایخمانی بکێشێ. پاسەوانەکانیش کە هەر بیستوچوار سەعات دەگۆڕدران، هەموویان بێتاقەت بوون، بۆیە بۆ هەر یەکێکیان ڕۆژێکی پشووی پێدان. دەی دەبا بەو ئاوهەوایە لە بۆینس ئایرسدا پیاسە بکەن، بە مەزەندەی ئەو گەڕان و سوڕان بەنێو ئەو شارە گەورەیەدا بۆ چەند سەعاتێک گیانیان پێدادەکاتەوە و بە گوڕ و تینەوە دەگەڕێنەوە بۆ "بنکە"کە.

ئاخر هێشتا دە ڕۆژی ڕەبەق مابوون، دەبوایە خۆیان لەو وڵاتە بێگانەیەدا حەشاردابایە، دەبوایە بە جۆرێک ئەو ماوەیە بژیابان لە کەمترین هەڵە بترسابان، چونکە کەمترین کەمتەرخەمی دەبووە مایەی ئەوەی پۆلیسی

ئەرجەنتینی بەدەنگ بێ و پاشان گۆبەند و شەرمەزارییێکی نێودەوڵەتی بە دوادا بێ.

## نەخشەدانان بۆ هەڵاتن

ئایخمانیان لە ژوورێکی بەتاڵوحەتاڵی بێ پەنجەرە دانا، بەشە و ڕۆژ بە تاکە گلۆپێک ڕوناککرابووەوە. ئەویش کەسێکی بەرئەمر بوو، هەموو ڕێنماییە پاسەوانەکانی جێبەجێدەکرد. واپێدەچوو خۆی دابێتە دەستی قەدەر. تاکە کەسێکیش کە قسەی لەگەڵدا دەکرد «ئاهارۆنی» بوو، دەربارەی ژیانی ئەو بەر لە گرتنەکەی لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا دەکرد. ئایخمانیش وەڵامی هەموو پرسیارەکانی دانەوە. بە ئاهارۆنی گوت، دوای بەزینی ئاڵمان لە ١٩٤٥دا، ئەو ناسنامەی کەسایەتی «ئەدۆلف کارل بارتی» هەڵگرت. پاشان خۆی بە لێوتنانتێکی پلە ٢١ی هۆبەی کاڤالێری SS بەناوی «ئۆتۆ ئێکمان» نیشاندا کە لە کەمپی POW گیرابوو. لەکۆتایی جەنگیشدا، کاتێک ناوەکەی وەک سەرلیستی داواکراوەکان پێشکەشی دادگای نیێورنبێرگ کرا، لە ئۆردوگاکە هەڵات. هەر بەناوی ئۆتۆ هێنینگەر مایەوە تا ساڵی ١٩٥٠ لە (زێلە) لە ساکسۆنی خوارەوەدا کە لە هەمان ساڵدا بەرەو ئەرجەنتین هەڵات، ڕێی هەڵاتنەکەشی بە ئیتالیادا بوو، ڕێوشوێنی هەڵاتنی تاوانبارێکی نازی گرتبووەبەر.

نۆ ساڵی بەسەردا تێپەڕین تا لە ئەرجەنتین خۆی دەرخست، ئەمجارەیان بە کراسێکی سپی، بۆینباخێکی لار، چاکەتێکی زستانە، چاویلکەی دژەڕۆژ و سمێڵێکی قەڵەمی وەرزشیانە خۆیدەرخست. ئەو چوار مانگ لە

گرتووخانەی «جورمان» لە گەڕەکێکی دەرەوەی بۆینس ئایرسدا بەسەری بردبوو، پاشان چوار مانگ لە ماڵی دۆستێکی ئەڵمانی بە ناوی «ڕیپلەر» ژیا. ئەوکات وێرای بەتەنیا لە بۆینس ئایرس باربکا و بچێتە «توجمان»، کە شارێکی بچکۆلانەی نزیکەی ٦٠٠ میل دووربوو. لەوێ لەلایەن کاپری کە کۆمپانیایەکی بیناسازی بوو کاری دەستکەوت، دەگوترێ کۆمپانیایەکی ڕووپۆش بوو، ئەرکەکەشی ئەوەبوو کار بۆ نازییە هەڵاتووەکانی ئاڵمان بدۆزێتەوە.

لە ٤ی ئەپڕیلی ١٩٥٢شدا ئایخمان ناسنامەی ئەرجەنتینی بەناوی ڕیکاردۆ کلێمنت وەرگرت، گوایە لە بۆلزانۆی ئیتالیا لەدایکبووبێ، سەڵت بوبێ و بە پیشەش میکانیکییە.

ساڵێک بەر لەو بەرواره، لەسەرەتای ١٩٥١دا، ئایخمان ناوێکی ساختەی بەکارهێناوە و نامەی بۆ ژنەکەی کە لە نەمسا بوو، ناردووە. ئەو بۆی نووسیبوو کەوا "مامی منداڵەکان، ئەو پیاوەی کە ژنەکەی پێیوابوو مردووە، لەڕاستیدا ماوە و ساغیشە." ڤێرا لیبلیش دەستبەجێ دەستخەتەکەی دەناسێتەوە و بە کوڕەکانی دەڵێ کە مام ڕیکاردۆ، ئامۆزای باوکە کۆچکردووەکەیان، بانگێشتی کردوون بەڵکو بگەنە لای ئەو لە ئەرجەنتین.

خانمەکە پاسپۆرتێکی قانونی بۆ خۆی و منداڵەکانی دەرهێنا. دەزگەی نهێنی نازی بە پەرۆشەوە دەستبەکاربوو، هەرزوو شوێنەواری ڤێرای ڕەشکردەوە. کاتێکیش لەکۆتاییدا ئاژانەکانی ئیسرائیلی دەستیان بە فایلی "ڤێرا لیبل: لە ئەرشیفی ئەرجەنتینیدا گەیشت، ئەوەی بینیان، هەر فایلێکی بەتاڵ بوو، پێدەچو سڕابێتەوە.

لە حوزەیرانی ١٩٥٢دا، ڤێرا لیبل و هەرسێ کوڕەکانی، هۆرست، دیتەر و کلاوس لە نەمسایان شوێنبزر بوون. لە سەرەتای تەمموزدا بۆ ماوەیەکی کورت سەریان لە گێنوای ئیتالیا دەرهێنا، دوای ئەوە لە ٢٨ی تەممووزدا گەیشتنە کەناراوی بۆینس ئایرس. لە١٥ی ئابیشدا بە سواری قیتارێک گەیشتنە وێستگە تەپوتۆزاویەکەی «توجمان».

«ڤێرا ئایخمان» موشی پیرمان وای لەنێو کتێبەکەی خۆیدا نووسیوە؛ "هێشتا لە یادەوەری خۆیدا وێنەی ئەفسەرە نازییە بەجۆشەکەی هەڵگرتبوو، کە دیارە لەبن جلە سەربازییە یەکپۆشەکانیدا پێڵاوەکانی بریسکەیان دەهات. بەڵام ئەو پیاوەی کە وێستگەی «توجمان» چاوەڕێی دەکردن، تەمەنێکی مامناوەندی هەبوو، جلێکی سادەی لەبەردابوو، ڕووخساری بزڕکابوو و چرچولۆچیشی لێپەیداببون، دەربڕینی ڕوخسارەکەی دڵتەنگ و بەهێواشیش ڕێیدەکرد. ئاخر خۆ ئەوە هەر ئەدۆلفەکەی خۆی بوو."

ئایخمانە بێزارەکە بە ئاستەم دەناسرایەوە. ئاخر لاواز ببوو، سەریشی ڕووتابووەوە، شەویلاگەکانیشی بەیەکدا قووپابوون و دەموچاویشی هەوای فیززلی لەدەستدابوو، کە خەسڵەتێکی ناسراوی ئەو بوو. ئەو بە بەدەستبەخۆداشۆڕکردنەوە و پەشێو دیاربوو؛ تەنها لێوە تەنکەکانی نیشانەی دڵڕەقی و شێتایەتی پێوەمابووەوە.

لە ١٩٥٣دا، کۆمپانیای «کاپری» نابووت بوو، دەبوایە ئایخمانیش بەدوای ئیشێکدا گەڕابا. سەرەتا لەگەڵ دوو کەسی نازیی دیکەدا هەوڵیدا جلشۆرییێک دابنێ، پاشان کاری لە کێڵگەیەکی کەروێشک بەخێوکردندا کرد، دوای ئەوە لە کارخانەیەکی شەربەتی ئاوی پرتەقال کاریکرد.

لەکۆتایشدا و بە دەستگیرۆیی ڕێکخراوێکی نهێنی نازییەوە، ڕیکاردۆ کلێمێنت بە بەرپرسی ئەنجومەنی مارسیدیس بێنز لە «سواریژ» داندرا. ئەوسا ئایخمان هاتەسەر ئەو بڕوایەی، کە دەکرێ باقی ژیانی بە ئاشتیانە بەسەر بەرێ. ئەم دۆخەشی تا ١١ی ئایاری ١٩٦٠ درێژەی کێشا.

لەو کاتەی کوڕەکانی ئایخمان، نەخۆشخانە، مەیتخانە و پۆلیسخانەکان بە دوای باوکیاندا دەگەڕان، ڕوویان لە ڕێکخراوێکی لاوانی فاشیستی «توکارا»دا کرد، ئەوانیش کەوتنە گەڕان و سوڕان. بەڵام هەرزوو کوڕەکانی ئایخمان گەیشتنە ئەو ئاکامە، باوکیان لەلایەن ئیسرائیلیەکانەوە ڕفێندراوە. ئینجا تێکۆشان قەناعەت بە ڕێکخراوێکی لایەنگری نازی بێنن، بەڵکو دژە کردەوەیەک بنوێنن، بەوەی باڵوێزی ئیسرائیل بڕفێنن و لەلای خۆیانی گل بدەنەوە تا ئەو کاتەی باوکیان ئازاد دەکەن، بەڵام لەم هەوڵەیاندا سەرنەکەوتن و ئەرجەنتینیەکان ڕەتیانکردەوە، کارێکی لەو جۆرە بکەن.

ئیسەر بە پیاوەکانی گوتبوو، ئەگەر هاتوو حەشارگەکەیان لە لایەن پۆلیسەوە ئاشکرابو، چی بکەن. هەروەک ئیسەر پێیگوتبوون؛ ئەگەر هاتبا و پۆلیس بەسەر "بنکە"کەی دادابا، ئەوا دەبووایە خێرا ئایخمان نێردرابا ژوورە نهێنییەکە، کە لەنێو خانووەکەدا دروستیانکردبوو. خۆ ئەگەر پۆلیس ماڵەکەی بپشکنیبایە، ئەوا ئایخمانیان بە دەرکەیەکی دیکەوە دەبردەدەر، تایبەت بۆ باری ناکاو دروستیانکردبوو. دەبوایە چەندین ئاژان لەگەڵ ئایخماندا هەڵبێن، لەکاتێکدا ئەوانی دیکە هەموو شتێکیان دەکرد بۆ ئەوەی ڕێ لە گەڕان و پشکنینەکە بگرن، وێڕای هەر سەرچڵییێکیش کە تووشی بێن.

بۆ هەر کەسێک کە لەگەڵ ئایخماندا بێ، قسەی ئیسەر ئەوەبوو: "خۆ ئەگەر پۆلیس حەشارگەکەی دۆزیەوە و بەسەری دادان، ئەوا بە کەلەپچەکە دەستی ئەو لە هی خۆت ببەستەوە و کلیلەکەش دوور فڕێبدە، بەم جۆرە ئەوان ناتوانن تۆ لە ئەو بکەنەوە. ئینجا پێیان بڵێ کەوا تۆ ئیسرائیلی، کە خۆت و برادەرەکەت ئەدۆلف ئایخمان، کە داواکراوترین تاوانبارە، گرتووە، بۆئەوەی بیبەنە بەردەم دادگا. ئینجا ناوی ڕاستەقینەی من -ئیسەر هارل- لەگەڵ ناسنامە ساختەکەم و ناوی ئەو هوتێلەی لێیدابەزیوم بدەنە پۆلیس. خۆ ئەگەر ئەوان تۆ و ئایخمان بگرن، ئەوا دەبێ منیش بگرن،"

یەک دوو ڕۆژ دواتر، ئایخمان قایلبوو بەڵگەنامەیەک واژۆبکا، کە بەڕەزامەندی خۆیەوە ئامادەیە ببردرێتە ئیسرائیل و لەوێ دادگایی بکرێ. بەڵگەنامەکەش بەم جۆرەبوو:

*"ئەز، ئەدۆلف ئایخمان، کە لە خوارەوە واژۆم کردووە، بە ئیرادەی ئازادانەی خۆمەوە ڕایدەگەیەنم: هەنووکە کە ناسنامەی ڕاستەقینەم ئاشکرابووە، پێیلێدەنێم کە هیچ دەرەتانێکی دیکە نەماوەتەوە لە ئاراستەی دادپەروەریدا لابدرێ. ئەز قایلم بەوەی بنێردرێمە ئیسرائیل و لەبەردەم دادگایەکی پسپۆڕدا دادگایی بکرێم. ئەوەش مایەی لێتێگەیشتنە کە یاریدەرییێکی پارێزەرانەم پێشکەش بکرێ و ڕێگەم بدرێ لەبەردەم دادگادا ئامادەبم، بەبێ ئەوەی ڕاستییەکان بشێوێندرێن، بەوەی ئەو ساڵانەی کۆتاییم لە خزمەتی ئاڵماندا، بەوەی کە وەسفێکی ڕاستگۆیانەی ئەو ڕووداوانە بۆ نەوەکانی داهاتوو بکرێ. من ئەم ڕاگەیاندراوە لەسەر*

*قایلبوونی خۆم دەردەکەم. هیچ بەڵێنێکم پێنەدراوە و هەڕەشەشم لێنەکراوە. خواستی من ئەوەیە لە کۆتاییدا و لە ناخەوە ئاشتی بدۆزمەوە.*

*خۆ ئەگەر نەشتوانم هەموو وردەکارییەکان یادبکەمەوە و کاتێکیش ڕاستییەکان دەردەکەون بشڵەژێم، ئەوا داوادەکەم بەڵگەنامە پەیوەندیدارەکان و ئیفادەکان بخرێنەبەردەست بۆ ئەوەی تێبکۆشم ڕاستییەکان بسەلمێندرێ.*

*ئەدۆلف ئایخمان،*

*بۆینس ئایرس، ئایاری ١٩٦٠."*

هەڵبەتە ئەم بەڵگەنامەیە لە ڕووی قانونیەوە نەیدەخوارد.

## فڕۆکەکە گەیشت

١٨ی ئایاری ١٩٦٠، سەعات ١١ی پێشنیوەڕۆ.

ڕێوڕەسمێکی فەرمی لە فڕۆکەخانەی لۆدی نێودەوڵەتی لەنزیک تەلئەبیب بەڕێوەچوو. چەندین کاربەدەستی پلەباڵا، بە خودی سوپاسالاری سوپا، بەڕێوبەری گشتی وەزارەتی کاروباری دەرەوە، باڵوێزی ئەرجەنتین لە ئیسرائیل هاتبوون، ئەو نێردە ناوازەیە ببینین کە بەرەو ئەرجەنتین دەڕوا، تا بەشداری لە ئاهەنگی سەد و پەنجاهەمین ساڵەی سەربەخۆییياندا بکا. فڕۆکە "زەبەلاحە بەچرپەکە"ی ئەل ئالیش لەکاتی خۆی هەڵفڕی، کە هەندێ سەرنشینی (ئاسای)یشی هەڵگرتبوون، کە لە فڕگەکانی دیکەدا دادەبەزین و سواردەبوونەوە.

زۆر کەم لە سەرنشینانی فڕۆکەکە، دەرکیان بەوەکرد، کە لە ڕۆما سێ سەرنشینی مەدەنی دیکە سواربوون. دوای دوو سەعات ئەو سەرنشینە نوێیانە بوونە ئەندامی تاقمی فڕۆکەی ئەل ئال و بە جلی یەکپۆشی لەنێوەڕاستی کورسی سەرنشیناندا دەهاتن و دەچوون. لەڕاستیدا ئەوان ئاژانی مۆساد بوون، لە ڕێگەدا بوون بۆ یاریدەدانی هاوکارەکانیان لە بۆینس ئایرس. یەکێک لەوان «یەهودا کارمل» بوو، ئەو پیاوە سەرکەچەڵەی کەپوویێکی نایابی لەگەڵ سمێڵێکی تەنکی هەبوو. ئەو زۆیش بە گەشتەکە شادمان نەبوو. ئاخر دەیزانی ئەو لەبەر بەهرەمەندییەکەی هەڵنەبژێردراوە بەڵکو لەبەر ڕووخسارە دیارەکەی. یەک دوو ڕۆژ پێشتر بانگکرابووە نووسینگەی بەرپرسەکەی، لەوێ دوو وێنەی لەسەر مێزەکە بینی، یەکیان هی خۆی بوو، ئەویدیکەشیان هی یەکێکی نەناسراو. هەردوو وێنەکەش بەیەکدەچوون. کاتێکیش پێیگوترا، کە وێنە هاوشێوەکە هی ئەدۆلف ئایخمانە، لە شوێنی خۆی لەرزی. ئەو کاتەش پێیگوترا دەبێ بچێ و ڕۆڵی ئەو ببینێ، زیاتر هەڵلەرزی. نەخشەی ئیسەر ئەوەبوو، «کارمل» وەک ئەندامی تاقمی فڕۆکەوانی ئەل ئال بگەیەندرێتە ئەرجەنتین، ناوو بەڵگەنامەی خۆی هەڵبگرێ، هەر ئەمەش بەکاربێنێ بۆ ئەوەی بتوانن بەهۆیەوە ئایخمان پەلکێشی نێو فڕۆکەکە بکەن. «کارمل» هەڵگری پەساپۆرتێکی ئیسرائیلی بوو بەناوی «زیڤ زیخرۆنی».

ئیسەر نەخشەی گەڕانەوەیشی ئامادەکردبوو. لەڕێی ناوبژیکارێکی دیکەوە، بانگی ئەندامێکی گەنجی کیبۆتنشین بە ناوی «مایەر بارهۆن» کرد کە سەردانی خزمەکانی دەکرد لە بۆینس ئایرس. داوا لە مایەر کرا بچێتە «بار گلۆریا» لە گەڕەکی «بارتۆلۆمە میترێ»، کە لەوێ دوو پیاو

چاوەڕێیان دەکرد؛ ئەوانیش ئیسەر و دکتۆر ئیلان بوون. ئیسەر ڕێنمایی پێدا کە: "کاتێ دەگەڕێیتەوە ماڵی خزمەکانت، زەنگ بۆ دکتۆر لێبدە و پێی بڵێ کەوا تووشی ڕووداوێکی ترۆمبێل بووی، بەهۆیەوە سەرودڵت تێکەڵوپێکەڵ بووە، سەرت دەسووڕێ، دەڕشێیتەوە و بە گشتی بێهێز بووی. دکتۆریش دەستبەجێ دەگاتە ئەو دەرەنجامە کە تۆ لە دەست هەژانی مێشک دەناڵێنی و دەیەوێ بتگەیەنێتە نەخۆشخانە. لە سپێدەی ١٩ی ئایاردا، زەنگی بۆ لێدەدەیتەوە کەوا باشتر بووی و دەتەوێ بگەڕێیتەوە ماڵ. ئینجا تۆ لە نەخۆشخانە دەردەکرێی و کاغەزێکت دەدەنێ بەوەی لە نەخۆشخانەکە لەبن چارەسەرکردندا بووی.

دکتۆر ئیلان بەکورتی لێکەوتە کتومتەکانی دەردی مێشک هەژانی بۆ بەیانکرد.

ئینجا مایەر بار گلۆریای جێهێشت و بەگوێرەی ڕێنماییەکانی ئیسەر سووڕایەوە. ئەو لەوێ لە نەخۆشخانە گەورەکەی بۆینس ئایرس داخل بوو، سێ ڕۆژان مایەوە. لە ١٩ی ئایاریشدا، لە نەخۆشخانەکە دەرکرا. پاش یەک سەعات لە دەرچوونی، ئیسەر بەڵگەنامەیەکی خەستەخانەی لەدەست نا کە بەناوی «مایەر بارهۆن»ـەوە بوو، ئەو بەڵگەنامەیە بوو، گوایە چارەسەرکراوە و دوای چاکبوونەوە لە ڕووداوی ترۆمبێل لە نەخۆشخانەکە ڕێگەدراوە بچێتەوە ماڵێ. بەم جۆرە، ئەگەر هاتبا و پەلکێشکردنی ئایخمان وەک ئەندامێکی تاقمی فڕۆکەوانی ئەل ئال بۆ ناوفڕۆکەکە سەری نەگرتبا، ئەوا ئیسەر دەیخستە سەر نەقالەیەک و بەناوی مایەر بارهۆن ڕایدەکێشایە نێو فڕۆکەکە، بەوەی گوایە نەخۆشێکە تووشی مێشکهەژانێکی کوشندە بووە.

١٩ی ئایار.

ئەو ئێوارەیە فڕۆکەی ئەل ئال لە فڕۆکەخانەی بۆینس ئایرس نیشتەوە. پڕۆتۆکۆلی فەرمی وەزارەتی کاروباری دەرەوە، جووە پەرۆشەکانی خۆجێی و منداڵان ئاڵایەکی بچکۆڵەی شین و سپیان هەڵگرتبوو لە هەر دوو لای مافوورە سوورەکەی دەروازەکە بەڕیز وەستابوون.

دوو سەعات دوای ئەوە، ئیسەر لەگەڵ «زڤی تاهور»ی فڕۆکەوان و ئەندامێکی ئەلئالی جێبەجێکار دوا و کاتی هەڵفڕینی فڕۆکەکەیان دانا: نیوەشەوی ٢٠ی ئایار.

ئیسەر نەخشەکەی خۆی خستەڕوو. دوای تاوتوێکردنێکی کورت، ئەوانیش بە پلانی A قایلبوون: ئایخمان وەک ئەندامێکی تاقمی فڕۆکەکە بهێنرێتە ناو فڕۆکەکە گوایە نەخۆشیشە. «یەهودا کارمل» کە شێوەی لەو دەکا هەر زوو جل و ناسنامەکەی گۆڕاوە و بووەتە «زیف زیخرۆنی»، ڕێنوێنی ئەل ئال لەنێو تیمەکەی مۆساد، «شالۆم دانی» ساختەکاری تیمەکەش بەڵگەنامەکانی والێکردبوون ڕێک لەگەڵ ئەوەی ئایخماندا بێتەوە. بەڵگەنامەی نوێش درایە «کارمل» و پێیگوترا، کە زۆر ناخایەنێ ئەویش لە ئەرجەنتین دێننەدەر.

ئەو ئەنگۆرەیە "بنکە"کە وەک کوورە هەنگێکی لێهاتبوو. دوای هەفتەیەک لە چاوەڕوانی هەراسان، ئاژانەکانی مۆساد کەوتنەوە جووڵە و بە تەوژم و گوڕ هاتنەوە. دەرزی سڕکردن لە ئایخمان دراو خەوێکی قووڵی لێکەوت. ئاژانەکان وریایانە کەلوپەلەکانیماڵەکەیان هەڵگرتەوە. ئامێر و

کەرەستەی جۆراوجۆریان لە بار یەک هەڵوەشاند و لەوێ لایانبرد. ئەو گۆڕانکارییەی بەسەر خانووەکەیان هێنابوو، وەک جاری جارانیان لێکردەوە. هیچ شتێکیان تێدانەهێشتەوە کە ئاماژەبێ بە ڕۆڵی ئەو ڤێلایە لەو هەشت ڕۆژەی ڕابردوودا. لە چەند سەعاتێکی کەمدا هەمان کار و کردەوەش دەرهەق خانوو و ئەپارتمانەکانی دیکە کران.

٢٠ی ئایار.

ئیسەر بۆ دوایین جار هوتێلەکەی بەجێهێشت، هەگبەکەی خۆی پشکنی و تاکسییێکی ڕاگرت بیگەیەنێتە وێستگەی قیتار. ئینجا دەستی بەهەمان گەڕان و سووڕان بەسەر قاوەخانەکاندا کردەوە. دەبووایە یەکەم جار پیاوەکانی ئەل ئال ئاگاداری بکەنەوە و بەیەکەوە ئامادەکاری نەخشەکە بکەن.

لە نیوەڕۆژدا دوا قۆناغی کردەوەکە بوو. ئیسەر بۆ پشکنین سەری بە دوو قاوەخانەدا کرد و دەستی دایە هەگبەکەی، لەوێوە بە تاکسییێک بەرەو فڕۆکەخانە بەڕێکەوت تا سەرپەرشتی ئۆپەراسیۆنەکە بکا. ئەو بەنێو تەرمینالەکەدا قەدەمی لێدا، لە شوێنێک دەگەڕا، جێیی فەرماندەییەکەی لێجێگیر بکا. ئەو بەنێو دوکان و شوێنی بلیت بڕیندا گەڕا، لە کۆتاییدا کافتێریای کارمەندانی فڕۆکەخانەکەی دۆزییەوە. لە دەرەوە هەوا زۆر ساردبوو و کافتریاکەش پڕی کارمەند و تاقمی زەمینی فڕۆکەخانە و تاقمی فڕین بوون، هەموویان هاتبوونە کافتریاکە شتێکی گەرم بخۆنەوە و خواردنێکی سەرپێیی و سووکیش بخۆن. ئیسەر دڵخۆش بوو. شوێنەکە

نموونەیی بوو. کەس تێبینی ئەوی نەدەکرد، کەسیش ئاگای لەو نەبوو ئاخۆ بە پەلە ڕاوێژ لەگەڵ پیاوەکانی دەکا. ئیسەر وەستا تا کورسییێک بە تاڵ دەبێ، ئیدی لەوێوە سەرپەرشتی دوایین جووڵەی لەسەر خاکی ئەرجەنتینیدا کرد.

### بەخێربێی، ئەل ئال

- 9:00ی شەو/ لە ماڵە سەلامەتەکەدا، هەموو شتێک ئامادەبوو. سەری ئایخمان شۆرابوو، ڕیشی تاشرابوو، جلی یەکپۆشی ئەل ئالی لەبەرکرابوو، لە گیرفانیشی ناسنامەیەک بە ناوی «زیڤ زیخرۆنی» داندرابوو. دەموچاویشی وا لێکرابوون، تەنانەت کوڕەکەی خۆیشی نەیدەناسیەوە. دکتۆرەکە و دوو لە ئاژانەکانیش بەرگی یەکپۆشی ئەل ئالیان پۆشیبوو. پزیشکەکە دەرزییێکی وای لە ئایخمان دابوو، نەگاتە حاڵەتی خەولێکەوتن، بەلام حاڵەتی بەرچاو تاریکبوون و تێکەڵبوونی هەستەکان. ئەو توانای دیتن و بیستن و تەنانەت ڕۆیشتنیشی هەبوو، بەڵام نەیدەتوانی قسە بکا، هەروەها بە باشیش لەوەی لە دەوروبەری ڕوویدەدا تێنەدەگەیشت.

«ئاهارونی»ش بەرگی یەکپۆشی ئەل ئالی کردبووەبەر. لە پشتی سووکانی ترومبێلەکە دانیشت و ئاژانێکیشی لە تەنیشت دانیشت. ئایخمان لە کورسی پشتەوە داندرا، لە نێوەڕاستی دکتۆر و ئاژانەکەی دیکە. سلفی ترومبێلەکە لێدرا و کەوتە جووڵە.

له هەمان کاتیشدا دوو ترومبێلی دیکە لە هوتێلێکی بە هەرمێن لە ناوەراستی شاردا دەرچوون. ئەو دوو ترومبێلانە هەر بەراستی تاقمی فرۆکەوانی ئەل ئال بوون. گەشتی ئەوان بە وردی و کتومت هاوزەمانبوو لەگەڵ جووڵە و بەرەوپێشەوەچوونی ترومبێلەکەی ئاژانەکانی مۆساد.

له شوێنی خۆیشی، لەو شوێنەی سەرپەرشتی ئۆپەراسیۆنەکەی دەکرد، ئیسەر خولەک لە دوای خولەک لە رەوتەکە ئاگاداردەکرایەوە. فەرمانی بە پیاوەکانی کرد، جانتاکانیان بگەیەننە فرۆکەخانە. ئاخر ئەو مشووری رێگەی راکردنی هەریەکە لە پیاوەکانی خواردبوو، بەڵام ئەگەر نەخشە سەرەکییەکە بە بێ گرفت رۆیشتبا، ئەوا هەر هەموویان بە فرۆکەی ئەل ئال دەگەرانەوە وڵات. شالۆم دانیش، لە شوێنێک کە زۆر لە ئیسەرەوە دوور نەبوو، کوپە قاوە رەشەکەی بەردەمی هەڵدەقۆراند. رێبوارێک کە بەتەنیشتیدا رەتبوو، بێئاگابوو لەوەی ئەو کەسەی لەسەر مێزەکە دانیشتووەو قاوەکە دەخواتەوە، دەبووایە زۆر شت رێکبخا: ئەو تاقیگەی ساختەکاری لەبەرچاوی هەمووان بوو؛ خەریکی ئەوەش بوو پاسپۆرتی ئاژانەکانی مۆساد چاکبکا، ئەو هەموو مۆرانەی لێدان کە رێگەی تێپەربوونیان بدرێ.

- 11:00ی شەو/ پیاوێک لە تەنیشت ئیسەر پەیدابوو. خەبەری دایێ، کەوا هەموو ترومبێلەکان، هی مۆساد و هی تاقمەکەی ئەل ئال گەیشتن. ئیسەر خێرا چووە لای پارکی ترومبێلەکان و لە گەیشتنی ترومبێلەکانی ئەل ئال دڵنیابوو. ئەندامانی تاقمەکە کڕ و بێدەنگ بوون. ئەوان هەستیانکرد، بەشداری شتێکی نائاسایی دەکەن، بەڵام نەشیاندەزانی چییە. ئەوان بەهێمنی گوێیان لە

ڕێنماییەکانی ئیسەر گرت و هیچ پرسیاریشیان لێنەکرد. ئیسەر چووە لای سێهەمین تڕومبێلیش، ئەوەی کە ئایخمانی بە گێژی لەنێو دوو ئاژانەکەدا بوو. پێیگوتن: "دەی بڕۆن، بەهیوای بەختێکی باش!"

هەر سێ تڕومبێلەکە بەڕێکەوتن، لەو کاتەشدا ئیسەر گەڕایەوە شوێنی خۆی. کاروانی سێ تڕومبێلەکە گەیشتە یەکەمین بەربەستی فڕۆکەخانەی ئەرجەنتینی؛ فڕۆکە ئیسڕائیلییەکەش لە ڕارەوی دەستنیشانی خۆی ڕاگیرابوو. یەکێ لە ئیسڕائیلییەکان بە کەیفەوە پێیگوتن: *سڵاو، ئەل ئال*!" پاسەوانەکانیش ئەوانیان ناسینەوە، لەڕاستیشدا لێڕاهاتبوون کە ئیسڕائیلییەکان ڕۆژانە بەوێدا دێن و دەچن. بە شەکەتی چاوێکیان لە سەرنشینەکانی هەر سێ تڕومبێلەکە کرد، هەموویان بەرگی ئەل ئالیان لەبەردابوو. سەرنشینەکان دوو لە تڕومبێلەکان گۆرانیان دەگوت، پێدەکەنین، بە دەنگی بەرز دەدوان، لەکاتێکدا لە تڕومبێلی سێهەمدا لە شوێنی خۆیان خەویان لێکەوتبوو.

داری زاڵگەکە هەڵدرایەوە و هەر سێ تڕومبێلەکە بەرەو ڕووی فڕۆکەکە ڕێگەدران. دەرگەی تڕومبێلەکانیان کرانەوە و دە دوازدە کەسێک بە جلی یەکپۆشییەوە بەیەکەوە بەرەو دەرگەی فڕۆکەکە چوون. ئایخمانیان لەنێوانی خۆیان گرتبوو، بەهۆی ئەوانەی لە دەوروخولیەوە بوون، هەر دیارنەبوو. دوو لە پیاوەکان پیلیان[125] گرتبوو، کۆمەکیان کرد تا لە پەیژەکانی فڕۆکەکە سەربکەوێ، ئینجا لەسەر کورسی لای پەنجەرە و لە کلاسی یەکەم دایاننیشاند. دکتۆرەکە و دەستەی ئاسایش بەسەر

[125] پیل: شان، باسک.

کورسییەکانی دەوروبەری ئەو دابەشبوون، وا خۆیان نیشاندا گوایە خەویان لێکەوتووە. خۆ ئەگەر ئەفسەرانی فەرمانگەی کۆچبەری بێن و چاو لە ناسنامە و کاغەزەکانیان بکەن، ئەوا پێیان دەگوترا کەوا ئەم پیاوانە ئەو کەسانە بوون کە لە شەفتی دووەمدا کاریان کردووە، پێویستیان بە سەرخەوشکاندنێکە تا بۆ فڕینی داهاتوو ساز و ئامادەبن.

- 11:15ی شەو/ ئیسەر گەڕایەوە سەر کورسیەکەی لە کافتریاکەدا، گوێی لە ئاماژەی لەرینەوەی جوڵەی "زەبەلاحە بە چرپەکە" بوو. فڕۆکەکە لە تەرمینالەکەی خۆی وەستابوو چاوەڕێی کردنەوەی دەرگەی هەڵفڕینی دەکرد. ئینجا ئیسەر بەخێرایی بەرەو هۆڵی دەرچوونی فڕۆکەخانەکە ڕۆیشت و سەیری دەوروبەری خۆی کرد. لە گۆشەیەکی نامۆدا پیاوەکانی خۆی بینین، لەلای جانتاکانیان وەستابوون. ئیسەریش بە دەوریاندا سووڕایەوە، کە دەگەیشتە هەر ئاژانێک، دەیچرپاند: "بڕۆ سواری فڕۆکەکە بە." ئەوانیش بە وریاییەوە ڕۆیشتن و خۆیان گەیاندە هێڵی کۆنترۆڵکردنی پاسپۆرتەکان. هەموو پاسپۆرتەکانیان ئامادەبوون. «شالۆم دانی» کارەکەی خۆی بەباشترین شێوە ڕاییکردبوو.
- 11:45ی شەو/ دەستەکە بەبێ کێشە بە لای پۆلیسی کۆچبەران و گومرگدا ڕەتبوون، بە دەروازەی تایبەتی چوونە لای دەروازەی فڕۆکەکە. ئیسەر دوایین کەس بوو دەستی دایە جانتاکەی بەرەو خاڵی پشکنینی پاسپۆرت ڕۆیشت و ئینجا بەرەو لای دەروازەی فڕۆکەکە، بە گەیشتنی ئەو، دەستبەجێ بە جووڵە کەوت.

- 0:00ی نیوەی شەو/ شەوی ٢٠ لەسەر ٢١ی ئایار فڕۆکەکە وەستێندرا. لەڕێی بورجی چاودێرییەوە فەرمانی دواخستن درا. ئاژانەکان هەموویان کەوتنە دڵەڕاوکێ. تۆبڵێی شتێک ڕوویدابێ؟ تۆبڵێی لەدوا ساتدا ئاماژەیەک بە پۆلیسی ئەرجەنتینی درابێ؟ تۆبڵێی فەرمانیان پێبکەن بگەڕێنەوە؟ بەڵام دوای چەند خولەکێکی کەم لە دڵەڕاوکێ و لەکۆتاییدا ڕێگەی فڕینی فڕۆکەکە درا. فڕۆکەی "زەبەلاحە چرپەدارەکە" بەسەر ئاوی زیوینی (ڕیۆ دە لاپاتادا) هەڵفڕی. ئینجا ئیسەریش ئاهێکی پێدا هاتەوە.

**"من دەبێ کنێست ئاگادار بکەمەوە..."**

٢٢ی ئایار. سەر لە بەیانی زوو، فڕۆکەکە لە فڕۆکەخانەی لۆد لە تەلئەبیب نیشتەوە.

لە سەعات نۆ و پەنجا خولەکی بەیانیشدا، ئیسەر بەرەو ئۆرشەلیم ڕۆیشت. سکرتێری بنگۆریۆن، «ئیسحاق ناڤۆن» یەکسەر بەرەو نووسینگەی سەرۆوەزیری برد.

بنگۆریۆن بە دیتنی ئیسەر سەرسام بوو. "کەی گەیشتییەوە؟"

- "دوو سەعات دەبێ. ئایخمانیشمان هێناوە."
- پیرەمێردە لێیپرسی: "لە کوێیە؟"

- "لێره له ئیسرائیله. ئەدۆلف له ئیسرائیله، ئەگەر تۆ پەسەندی بکەی، ڕاستەوخۆ ڕادەستی پۆلیسی دەکەم."

بنگۆریۆن کەمێک بێدەنگ بوو. ئەو وەک هەندێک له ڕۆژنامەنووسان بڵاویانکردەوە؛ ئەو نەیدایه پڕمەی گریان، نه سەرکەوتووانەش دایه قاقای پێکەنین. هەروەها ئیسەریشی له ئامێز نەگرت، ئەو هیچ هەستوسۆزێکی نیشان نەدا.

- لێیپرسی: "ئایا تۆ دڵنیای که ئەو ئایخمانە؟ چۆن ناسیتەوە؟"

ئیسەریش سەرسامانه به بەڵێ وەڵامی دایەوە. وردەکاری پێوەره ناسینەوەکانی بۆ بنگۆریۆن باسکرد که چۆن ئایخمانیان پێناسیوەتەوە، هەروەها خودی ڕفێندراوەکه به پەشۆکاویەوە دانی بەوەدانا که خۆی ئەدۆلف ئایخمانە. بەڵام هێشتا پیرەمێردەکه به تەواوی ئاسوودە نەبوو، پێیگوت ئەوەنده بەس نییه. بەر لەوەی ڕێگەبدا هیچ هەنگاوێکی دیکه بندرێ، ویستی یەکێک یان دوان، لەوانەی له نزیکەوە ئایخمانیان دەناسی، بیبینن و به فەرمی بیناسنەوە. ئەو خوازیاربوو سەد لەسەد دڵنیا بێ، نەشیدەویست بەر لەو دڵنیابوونه یەک وشەش به حکومەتەکەی خۆی بڵێ.

ئینجا ئیسەر ستافەکەی خۆی بانگی نووسینگەکەی کرد، بەڵکو به دوای چەند کەسێکدا بگەڕێن که له نزیکەوە ئایخمانیان بینیبێ و بیناسنەوە. لەو کاته بێ دەرەتانەشدا، ئەوان دوو ئیسرائیلییان دۆزینەوە که له ڕابردوودا ئایخمانیان له نزیکەوە بینیبوو و دەیانناسی. ئەوان بردرانه ئەو شوێنەی ئایخمانی تێدا بەندکرابوو، قسەیان لەگەڵداکرد و به فەرمی ناسیانەوە.

پاشان لە نیوەڕۆدا، تەتەرێکی ئیسرائیلی خۆی بە چێشتخانەیەک لە فرانکفۆرتدا کرد و چووە سەر مێزێک، کە لەوێ پیاوێکی سەرسپی، پێدەچوو هەندێ گرژ و وروژاوبێ، بەتەنیا دانیشتبوو. تەتەرەکە بە کابرا دانیشتووەکەی گوت: "بەڕێز «باوەر»، ئێستا ئەدۆلف ئایخمان لەبن دەستماندایە. پیاوەکانمان ئەویان گرت و بردیانە ئیسرائیل. لەئان و ساتیشدایە سەروەزیر لەبارەی ئەوەوە لە کنێست لێدوانێک بدا."

قسەکە بە قووڵی کاریتێکرد، «باوەر» ڕەنگی بزرکا و لەجێی خۆی هەڵسا. دەستەکانی لەرزین. ئەو پیاوەی کە ناوونیشانی ئایخمانی لە ئەرجەنتین دایە مۆساد، ئەگەر ئەو پیاوە نەبووایە، لەوانەبوو هەرگیز ئایخمان نەگیرابا، نەیتوانی جڵەوی خۆی بکا. دەمودەست دایە پرمەی گریان، شانی ئیسرائیلیەکەی گرت، باوەشی پێداکرد و ماچیکرد.

سەعات 4:00ی دوای نیوەڕۆ/ لە کنێست دانیشتنێکی کراوە بوو، بنگۆریۆن چووە سەر سەکۆی دوانەکە. بە دەنگێکی ڕوون و شێلگیرانە، کورتە لێدوانێکی خوێندەوە: "من دەبێ بە کنێست ڕابگەیەنم کە دەزگەی ئاسایشی ئیسرائیل هەر تازە دەستیان بەسەر گەورەترین تاوانباری نازییدا گرتووە، ئەدۆلف ئایخمانیان گرتووە، ئەو کەسەی لەگەڵ سەرکردە نازییەکانی دیکە بەرپرسیار بوو لەوەی پێیان دەگوت "دوا چارەسەر"، واتە قڕکردنی شەش ملیۆن جووی ئەورووپی. حاڵی حازر ئایخمان لێرە لە ئیسرائیل دەستبەسەرە. بەم زووانە لە ئیسرائیل بەگوێرەی قانونی تاوانی نازییەکان و هاوکارەکانیان دەدرێتە دادگا."

وشەکانی بنگۆریۆن وەک هێدمە و برووسکە وابوون، تەردەستانە بووە چەپڵەڕێزانێکی زۆر گەورە. ئیدی بە سەرسامی و خۆشییەوە ئەو هەواڵە

له کنێست و له جیهاندا بڵاوبووەوەوە. لەکۆتایی دانیشتنەکەی کنێستدا، پیاوێک که له جێی دەستنیشانکراوی حکوومەتدا بوو، لەسەر کورسیەکەی خۆی هەڵسا. زۆر کەم ڕووخساری ئەویان دەناسییەوە. ئەویش خۆی بوو، ئیسەر هارل بوو.

دادگاییکردنی ئەدۆلف ئایخمان لە١١ی ئەپریلی ١٩٦١دا کرایەوە، سەدو دە کەس له ڕزگاربووانی دەستی هۆلۆکۆست گەواهینامەی خۆیان لەسەر دا. هەندێک لەوانە، هەرگیز پێشتر پاشخانی خۆی هەڵنەدابۆوە، باسی ڕابردووی خۆیان نەکردبوو، کەچی هەنووکه سەربردە سامناکەکەی خۆیان گێڕایەوە. رەوشەکه وایلێهاتبوو، وەک ئەوەی تەواوی نەتەوەکه لەکاتی دادگایکردنەکەدا به ڕادیۆوە نووسابن، گوێیان له گێڕانەوەی به سوێ و سامناکی چیرۆکی مەرگەساتی گەواهیدەرەکان دەگرت. حاڵەتەکه وەک ئەوە وابوو، سەرجەم گەلی جوو لەگەڵ داواکاری گشتی «گیدۆن هانوسەر»دا یەکانگیر بن، بۆ ناسینەوە و ڕووبەڕووبوونەوەی تاوانباری نازی بەوەی نوێنەرایەتی هەر شەش ملیۆن قوربانییەکه بکەن.

له ١٥ی دیسێمبەری ١٩٦١یشدا بڕیاری مەرگی بەسەردادرا. داوای تێهەڵچوونەوەشی لەلایەن دادگای باڵاوە پوچەڵکرایەوە و داوای لێخۆشبوونیش لەلایەن سەرۆکی وڵات، «ئیسحاق بن زڤی» ڕەتکرایەوە. ئیدی له چاوە زیندانییەکەی خۆیدا، پیاوە تاوانبارە حوکمبەسەردادراوەکه یەک دوو کورتە نامەی بۆ خێزانەکەی نووسین و نیو بوتڵیشی له شەرابی سووری کارمل هەڵقوڕاند. لەسەروبەندی نیوەی شەویشدا، کەشیشە نائاساییەکه چووە ژوری ئایخمان، پێشتریش دەرفەتی ئەوەی هەبووە

لەگەڵیدا دابنیشێ. بەڵام ئەمجارەیان ئایخمان پێیگوت: "ئەمشەو من ئینجیل لەگەڵ تۆدا ناخوێنمەوە. کاتی وام نییە لە دەستی بدەم."

کەشیشەکە لە ژوورەکەی هاتەدەر، بەڵام میوانێکی چاوەڕواننەکراوی لێوەژوور ئایخمان کەوت، ئەویش «ڕافی ئیتان» بوو.

ڕفێنەرەکە لەبەردەم پیاوە حوکمبەسەردادراوەکە چەقی، کە جلێکی بۆرەی کاڵی زیندانیانی لەبەردابوو. «ئیتان» هیچی نەگوت. ئایخمانیش تەماشایەکی کرد و بە ئەڵمانی پێیگوت: "هیوادارم دوای من نۆرەی تۆش بێ."

ئینجا پاسەوانەکان ئایخمانیان بردە ژورێکی بچکۆلانە، کە دیاربوو کرابووە ژووری لەسێدارەدان. ئەو لەسەر پەیژەیەک داندرا و پەتێکیش لە بنمیچەوە شۆڕببووەوە، لە ملی کرا. دەستەیەکی کەمیش لە کاربەدەستان، ڕۆژنامەنووسان و پزیشکێک ڕێگەیاندرا لەکاتی لەسێدارەدانەکەدا ئامادەبن و گوێیان لە دوا وشەکانی ئەو بێ، بەگوێرەی دابونەریتی نازیانە گوتی: "دیسان یەکدی دەبینینەوە... من ژیام، باوەڕیشم بە خودایە... بەرئەمری قانونەکانی جەنگ و دڵسۆزی بەیداخەکەم..."

دوو ئەفسەری پۆلیس لەپشت شاشەکەوە دوو دوگمەیان داگرت، تەنها هەر یەکێکیشیان پەیژەکانی بەرپێی ئایخمانی لادەدا. هیچ کام لە دوو ئەفسەرەکان نەیاندەزانی کامە دوگمە هی کۆنترۆلکردنە، بەم جۆرە ناوی لەسێدارەدەرەکە بە نەناسراوی مایەوە. ڕافی ئیتانیش کردەی لەسێدارەدانی نەبینی، بەڵام گوێی لە دەنگی تەپەی هاتنەخواری پەیژەکانی بن پێی ئایخمان بوو.

دوای ئەو، تەرمی ئایخمان لە فڕنییێکی ئەلەمنیۆم لە حەوشەی زیندانەکەدا سووتێندرا. یەکێک لە هەواڵنێرە ئەمریکییەکان نووسی: "دووکەڵێکی ڕەش بەرەو ئاسمان هەڵچوو. کەس هیچی نەگوت، بەڵام ئەوە شتێکی نەکردە بوو، کە سووتاندن و توونی مەرگی «ئاوشویتز» یادنەکرێتەوە..."

ئیدی کەمێک بەر لەوەی زەردەی بەیان دابکەوێ و لە ١ی حوزەیرانی ١٩٦٢دا، بەلەمێکی خێرای پاسەوانەکانی کەناراوی ئیسرائیل لە ئاوە هەرێمیەکەی ئیسرائیل تێپەڕی. کە لە ئاوی هەرێمی ڕەتدا، مەکینەکەی کوژاندەوە، لەو کاتەی بەلەمەکە بەبێدەنگی سەرئاوکەوتبوو، ئەفسەرێکی پۆلیس، خۆڵەمێشی ئایخمانی فڕێدایە نێو ئاوی دەریای سپی ناوەڕاست.

با و شەپۆلەکانی دەریا باقی پاشماوەی خۆڵەمێشی کابرایان پەرتکرد، ئەو پیاوەی بیست ساڵ پێشتر بە دڵخۆشییەوە جاڕی دابوو: "من لە گۆڕیشدا بە پێکەنینەوە باز دەدەم، دڵخۆشم بەوەی شەش ملیۆن جوو قڕکران."

«زڤی مالکینی»ش کە دایکە نەخۆشەکەی لە ئاویلکەدابوو، بیری لە خزمەکانی دەکردەوە، بیری لە «فروما»ی خوشکی و منداڵە وردیلەکانی دەکردەوە، ئاخر هەر هەموویان لە هۆلۆکۆستدا فەوتابوون. بۆیە چووە لای پیرەدایکەکەی و چرپاندیە بن گوێی: "دایکە، من ئایخمانم گرت. تۆڵەی «فروما» کرایەوە."

پیرەژنەکەش کە لەگیانەلادا بوو، هەر بە سرتەوە پێیگوتەوە: "کوڕم، دەمزانی تۆ خوشکەکەت لەبیر ناکەی".

## بەندی حەفت: ئەریێ یوسێل لە کوێیە؟

لە کاتێکدا ئیسەر، ئاژانەکانی، ئایخمانی دەستبەسەر لە خانوویێکی سەلامەتی بۆینس ئایرس لە چاوەڕوانی فڕۆکەی بریتانی "زەبەلاحە بەسرتەکە" بوون کە لە تەلئەبیبەوە هەڵدەستا، *ڕامساد* لە ئیسرائیل بە پڕۆژەیەکی دیکە سەرقاڵ بوو. ئیسەر بڕیاریدابوو لەو دەنگۆیانە بکۆڵێتەوە کەوا تاوانبارێکی دیکەی نازی لە هەمان شارەکەدا بێ، ئەویش ناوی دکتۆر«جۆسف مێنگل» "فریشتەکەی مەرگ" بوو؛ ئەو دکتۆرە دێوەزمەیەی بە کۆ سەیری ئەو کاروانە جووە دەستبەسەرانەی سەر شۆستەی وێستگەی قیتاری ئاوشویتز دەکرد، بۆئەوەی ساغەکانیان بۆ بێگاری بنێرێ و لەڕو و لاواز، ئافرەت و منداڵ و پیرەکانیشیان بۆ تونی مەرگ، بۆ ژوورەکانی گاز ڕەوانە بکا. «مێنگل» ببوە هێمای دڵڕەقی و شێتوهاربوونی «ڕایخی سێیەم»[126]. لە دوای جەنگدا ئەویش بزربوو، ئەگەری زۆر بوو لە ئەرجەنتین بێ.

«مینگل» سەر بە خانەوادەیەکی دەوڵەمەند بوو. لەو کاتەی ئەو لە حەشارگەدا بوو، خانەوادەکەی پشتگیری دەکرد، بڕە پارەی زۆریان بۆ دەنارد. ئاژانەکانی مۆساد بە دوای هەناردنی بڕە پارەکان کەوتن، سەروسۆراغەکەش تا «بۆینس ئایرس» سەرکێش بوو؛ لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا ئەوەندە دووربوو، نەیانتوانی بیدۆزنەوە، لە سەروسۆراخکردنی «مینگل»دا شکستیان هێنا.

بەڵام ئەم جارەیان ئەوان بەختیان هەبوو. لە ئایاری ١٩٦٠دا، کەمێک بەرلەوەی فڕۆکەی بریتانیا لە فڕۆکەخانەی بۆینس ئایرسدا بنیشێتەوە،

---

[126] ناوە باوەکەی ئەڵمانی بۆ دەسەڵاتی هیتلەر لە ١٩٣٣تا ١٩٤٥. وەرگێڕ

ئاژانەکانی ئیسەر ناوونیشانی مێنگلیان دۆزیەوە. پیاوەکە لە بۆینس ئایرسدا و لەبن ناوی ڕاستەقینەی خۆیدا دەژیا! دیاربوو لەوە دڵنیا بوو، کە کەس هەقی بەسەردا نییە و ڕاوەدوو ناندرێ. ئینجا ئیسەر یەکێ لە باشترین لێکۆلەرەوەکانی خۆی، «زڤی ئاهارونی» نارد تا ناوونیشانەکە پشتڕاست بکاتەوە، بەڵام ئەوێ ڕۆژێ «مینگل» لە ماڵێ نەبوو. درواسێکەیان بە ئاهارونی گوت؛ مینگل و ژنەکەی یەک دوو ڕۆژ دەبێ ماڵەکەیان جێهێشتووە، بەڵام زۆر ناخایەنێ، دەگەڕێنەوە. بە شادمانییەوە ئیسەر بانگی «ڕافی ئیتان»یشی کرد و پێیگوت: "دەی چاودێری ئەو پیاوە بکەن و ببنە سایەی. کاتێکیش «مینگل» دەگەڕێتەوە، ئەویش دەڕفێنین و لەگەڵ ئایخماندا دەیبەینەوە ئیسڕائیل."

«ڕافی» ئەمەی ڕەتکردەوە. ئاخر ئۆپەراسیۆنەکەی «ئایخمان» زۆر ئاڵۆزبوو. ئەمە قسەی «ڕافی ئیتان» بوو بە ئیسەری گوت؛ ئێمە پیاوێکمان گرتووە، دەرفەتێکی باشیشمان هەیە سەربکەوین و بە فڕۆکە بیبەینەوە ئیسڕائیل. بەڵام ئۆپەراسیۆنێکی دیکە بۆ گرتنی دووەمین کەس، مەترسی سەرچڵییەکە زۆر زیاد دەکا. ئەمە خۆی لەخۆیدا دەبێتە هەڵەیەکی کوشندە.

لە ئاکامدا ئیسەریش دەستبەردار بوو، بەڵام «ڕافی» پێشنیازی جێگرەوەیەکی دیکەی خستەبەردەم: "خۆ ئەگەر تۆ ئایخمانت گەیاندە ئیسڕائیل و تا یەک هەفتە هەواڵەکەت بە نهێنی هێشتەوە، ئەوسا «مینگل»یشت بۆ دێنم."

- ئیسەریش لێیپرسی: "چۆن ئەم کارە دەکەی؟"
- "ئێمە هێشتا یەک دوو ماڵی پارێزراومان بۆ ئۆپەراسیۆنەکەی ئایخمان لە بۆینس ئایرسدا هەن، کە هیچ کەس نایزانێ. لێگەڕێ با ئەوانە وەک خۆیان هەر بمێننەوە. کاتێک تۆ ئایخمان دەبەی، لە

ڕێگەی گەڕانەوە بۆ ئیسرائیل، من لەگەڵ «زڤی مالکین» و «ئاڤراهام شالۆم»دا ڕوودەکەینە وڵاتێکی دراوسێی ئەرجەنتین. تۆش دەگەیتە ئیسرائیل و هێشتا هەواڵەکە بە کەس نالێی، کەسیش نازانێ کە ئێمە ئەو کارەمان کردووە و کەسیش بەدوای ئێمەدا ناگەڕێ و چاوی لەسەر ئێمە نابێ. پاشان ئێمە دەگەڕێینەوە بۆینس ئایرس و مینگلیش دەگرین. کە گرتمان لە ماڵێکی ئارام دایدەنێین و دوای یەک دوو ڕۆژ ئەویش دێنینەوە ئیسرائیل."

ئیسەر قایلبوو. کاتێکیش فڕۆکەی بەناو بریتانیا بە ئایخمانەوە بەرەو ئیسرائیل فڕی. ئیتان و مالکینیش بەرەو «سانتیاگۆ» پایەتەختی وڵاتی چیلی دراوسێی ئەرجەنتین فڕین. ئەوان بە تەمابوون[127] ئەگەر ڕفاندنی ئایخمان هەر بە نهێنی بهێڵنەوە، دوای ڕۆژێک یان دووان بگەڕێنەوە ئەرجەنتین و ئۆپەراسیۆنی مینگلیش بخەنە سەرپێ.

بەڵام بۆ بەیانیەکەی هەموو میدیای جیهانی بەسەر درێژ و مانشێتی گەورۆنە گەورۆنە ڕایانگەیاند؛ ئیسرائیلیەکان ئایخمانیان لە ئەرجەنتینەوە ڕفاندووە. دەبوایە ڕافی و برادەرەکانیشی پڕۆژەکەیان هەڵبوەشاندبایەوە و بگەڕابانەوە ئیسرائیل.

پاشان «ئیسەر هارل» بە ڕافی ئیتانی ڕاگەیاند، داوای لە بنگۆریۆن کردبوو کە گرتن و ڕفاندنی ئایخمان بۆ ماوەی یەک هەفتە بە نهێنی بهێڵنەوە، بەڵام پیرەمێرد ڕازی نەببوو. دەگوترا بنگۆرین وای بە ئیسەر گوتبێ: "ئێمە ناتوانین ئەو نهێنییە بۆ هەفتەیەک بهێڵینەوە. بڕیارم داوە، ئەم دوای نیوەڕۆیە، کنێست لە گرتنەکە ئاگادار بکەمەوە."

---

[127] بە تەمابوون: بە نیازبوون.

ئیدی گرتنەکەی ئایخمان ئاشکرا کرا و بەم جۆرە ئیسرائیل دەرفەتی هێنان و دادگاییکردنی یەکێک لە کەسە هەرە تاوانبارە سادییەکان لە مێژوودا لەدەستدا.

هەر کەمێک دوای ئاشکرابوونی گرتنی ئایخمان، مێنگل هەستیکرد زەوی لە بن پێیدا دەلەرزێ. بۆ لە ئەرجەنتین باردەکا و دەچێتە پاراگوای، لەوێ خۆی شوێنبزرکرد تا بیست ساڵ دوای ئەو کاتە و لە فێبرایری ١٩٧٩دا، بە لێدانی دڵ دەمرێ.

✡ ✡ ✡

لە سەرەتای ئازاری ١٩٦٢دا داود بنگۆریۆن بانگی ئیسەر دەکا. پیرەمێرد، بە گەرمی بەخێری دێنێ، بۆ ماوەیەک سەبارەت بە باسوخوای هەمەڕەنگ قسەی لەگەڵدا دەکا. باشە تۆبڵێی چی بوێ؟ ئیسەر لە دڵی خۆیەوە مەراق مابوو. ئاخر ئەو باش بنگۆریۆنی دەناسی، دڵنیاش بوو بۆیە بانگی نەکردوە کە کورتە باسێکی لابەلای لەگەڵدا بکاتەوە. ئەوانە هەردووکیان کورتەباڵا بوون، دوو پیاوی کەڕەپ و لێبڕاو بوون، وەک سەرکردەی پیاوگەلێک لە دایکببوون، خۆیان بۆ ئاسایشی ئیسرائیل تەرخانکردبوو؛ هەردووکیشیان هی ئەوە نەبوون نە کات و نە قسەی خۆیان بە فیڕۆ بدەن. لەو کاتەی ئایخمانیش گیراوە، ئەو دوو پیاوە زیاتر لە یەک نزیک بوونەتەوە.

ئیدی هەمووی هەر لە هیکەوە، لە نێوەڕاستی قسەکانیان ڕوویدا، بنگۆریۆن ڕووی دەمی لە ئیسەر کرد و پێیگوت: "دەی پێم بڵێ، دەتوانی منداڵەکە بدۆزیەوە؟"

ئەو، نەشی گوت ئاخۆ باسی چ منداڵێک دەکا، بەڵام دەستبەجێ «ئیسەر» لێی تێگەیشت. ئاخر لەو دوو ساڵانەی دووایدا، یەک پرسیار ببووە بنێشتە

خۆشەی بن ددانی خەڵکی ئیسرائیل، سەردێری ڕۆژنامەکانیش هەر ئەوە بوو، لە سەر سەکۆی کنێستیش هەر هاواری ئەوەی لێ هەڵدەستا، گەنجە سیکولارەکان بە دەموچاوی جووە ئۆرسەدۆکسە[128] پەڕگیرەکان دەتەقینەوە و دەیانپرسی: "ئەرێ یوسێل لە کوێیە؟"

«یۆسێل»، ناوی «یۆسێل شوماخەر» بوو، تەمەنی هەشت ساڵ بوو لە شاری «هۆلۆن» دەژیا، کە لە لایەن جووە نەریتپارێزە ئۆرسۆدەکسە پەڕگیرەکان ڕفێندرا، هەڵمەتی ڕفاندنەکەش لە لایەن باپیریەوە سەرپەرشتی کرا. ئەو پیرە (هاسید[129])ەی دەیویست یۆسێل بە گوێرەی دابونەریتی ئۆرسەدۆکسی توندڕەوەوە پەروەردە بکرێ، بۆیە کوڕەکەی لە دایک و باوکی ڕفاند. لەو کاتەی کوڕەکە ڕفێندرا، بێسەروسۆراخ مایەوە. هەموو ڕۆژێک کە بیر لە ونبوونەکەی دەکرێتەوە، کێشە سەرهەڵدەدا و گەورە دەبێ، گرفتەکە لە کێشەیەکی خێزانی پەرەدەسێنی بۆ کەتن و گۆبەندێکی نیشتمانی، تا دەگاتە شەڕ و دەمەقاڵێ ڕووبەڕووبوونەوە لە نێوان سیکولارەکان و جووە ئۆرسەدۆکسە پەڕگیرەکان. هەبوو ترسی ئەوەی لێ نیشتبوو، کێشەکە سەربکێشی بۆ هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ و نەتەوەکە پارچە پارچە بکا. لەدوایین گفتوگۆشدا، بنگۆریۆن ڕووی لە ئیسەر کرد.

[128] Orthodox ئۆرسەدۆکس وشەیەکی گریکییە بە واتای "بیروبۆچوونی ڕاست" دەگەیەنێ. ئەمەش پەیوەستە بە ڕاستکردنەوە یان قایلبوونە بە مەزهەببە بنەڕەتییەکان. لە لای کریستیانەکان گەڕانەوەیە بۆ ڕێنماییەکانی کڵێسەی بەرایی. لە ئایینی جووایەتیشدا گەڕانەوەیە دابونەریتی هەرە کۆن، بۆ قانون و ڕێسای گرێدراو بە تەورات کە بە دەقەکانی تەلموود ناسراوە. وەرگێڕ.

[129] Hasidic, Hasidism هادیسک، یان هاسیدیزم وشەیەکی عیبرییانەی ئەشکەنازییە بو واتای تەرکەدنیا «تەقوا» دەگەیەنێ، ئەمانە گرووپێکی جوون، بەشێوەکی کاتی ئەم ڕەوتە پارێزگارە لە ماوەی سەدەی هەژدەهەم لە نێو جووەکانی ڕۆژئاوای ئۆکراین سەریهەڵدا، پاشان بە تەواوی بە ئەورووپای ڕۆژهەڵاتدا بڵاوبووەوە.

ئیسەریش پێیگوتەوە: "ئەگەر وات پێباش بێ، هەوڵێک دەدەم." ئینجا گەڕایەوە نووسینگەکەی خۆی و فایلی ئۆپەراسیۆنێک کرایەوە. ئۆپەراسیۆنەکەش بەناوی ئۆپەراسیۆنی بەچکە پڵنگ بوو.

✡ ✡ ✡

یۆسێل کوڕێکی لەشساغ و کەیفخۆش و بزێو بوو. پێدەچوو تاکە هەڵەی ئەو ئەوە بووبێ، کە دایک و بابێکی هەڵەی هەبوون. لەڕاستیدا ئەمە بۆچوونی «ناهمان شتارکس»ی باپیرەی بوو. ئەو «شتارکس»ە پیرە ڕیشدارە و چاویلکەلەچاوە، هاسیدێکی توندڕۆ بوو، پیاوکی ڕەق وتوند و کەڕەپ. کەس نەیتوانی تێکیبشکێنێ، تەنانەت نە تاقمە توندوتیژەکەی «کەی گی بی» و نە ئۆردوگای بێگاری بەستەڵەکی سیبێریای ڕووسیش کە بەشێکی جەنگی دووەمی جیهانی تێدا بەسەربرد. لە سیبێریادا چاوێکی لەدەستدا بوو، سێ پەنجەی پێیشی سڕ ببوون، بەڵام ورەی ساغ و سەلیم بوو؛ ئەو گۆڕانکارییە بەردەوامە تەنها وای لێکردبوو زیاتر ڕقی لە سۆڤییەت ئەستوورتر بێ، کە لووتکەی ڕقەکەکەی ساڵی ١٩٥١دا بەئاکام گەیشت، ئەو کاتەی تاقمێکی تاوانکار کوڕەکەیان دایە بەر چەقۆ و کوشتیان. سەبووری و دڵنەوایی بە دوو کوڕەکەی دیکە بە «شالۆم و ئۆڤادیا» و بە کیژەکەی بەناوی (ئیدا) دەهات، کچەکەشی شووی بە بەرگدروییێک کردبوو.

ئەو جووتە، واتە کیژەکەی شتارکس و زاواکەی بۆ ماوەیەک لە خانوویێکی کۆن لە «لڤۆڤ» دەژیان، دوای ئەوەی بە نیو پۆلۆنیا و ڕووسیا بە ئاوارەیی دەسووڕانەوە، لەکۆتاییدا لەوێ جێگیر بوون. لەوێدا وله ١٩٥٣دا دووەمین منداڵێکی خێزانی «شوماخەر» لەدایک بوو: ناوەکەشی «یوسێل» بوو.

کاتێ کوڕەکە لەگەڵ دایبابیدا باریان کردە ئیسرائیل تەمەنی چوار ساڵان بوو. شتارکسەکان، داپیرە و باپیرە و شالۆمی کوڕیان یەک دوو مانگ پێشتر گەیشتبوونە ئیسرائیل. «ناهمان شتارکس» کە سەر بە دەستەیەکی ئۆلی برێسلاوی هاسیدیزمی بوون، لە گەڕەکی «میا سێاریم» کە مەزهەبێکی ئۆرسەدۆکسی پەڕگیری لێبوو، لە ئۆرشەلیم دامەزران. ئەوێش جیهانێکی دیکە بوو، پیاوەکانیان پاڵتۆی درێژی ڕەش یان کراسێکی درێژی ئاوریشمی بە لفکەیان لەبەردەکرد و شەپقەی ڕەش یان کڵاوی پێستەیان لەسەر دەنا ڕیشی چڕوپڕیشیان دەهێشتەوە؛ هەرچی ئافرەتەکانیش بوون، کەوای[130] درێژ کە پرچی سەریان بە بارۆکەیەک دادەپۆشی؛ جیهانی کۆمەڵگەی یەشیڤاس[131]، کەنیشتە و ئەنجومەنی دادوەرانی ڕابینەکان بوو. «شالۆم» چووە فێرگەکەیان، «ئۆڤادیا»ی براشی چووە ئینگلستانێ.

«ئیدا» و «ئالتەر شوماخەر»یش لە «هۆلدۆن» جێگیر بوون. لە دواییدا «ئالتەر» کارێکی لە کارخانەی ڕستن و چنین لە ناوچەی تەلئەبیب دەستکەوت؛ «ئیدا»ی ژنیشی کاری لای وێنەگرێک دەکرد. بە هەردووکیان ئەپارتمانێکی بچووکیان کڕی و تێدەکۆشان بیکەنە شوێنی ئاکنجی بوون. ئەوان بە خراپی کەوتبوونە بن باری قەردوقۆڵ. بۆ ئەوەی کۆتایی بەمە بهێنن، «زینا»ی کیژیان ناردە پەیمانگەیەکی ئاینی لە «کفر هاباد» و یۆسێلیی کوڕیشیان بە داپیرە و باپیرە سپارد.

---

[130] کەوا: جلێکی ژنانەی ئاودامان درێژە.

Yeshiva [131] یەشیڤا، خوێندنگەی دەقە دینییە نەریتییەکان، بە تایبەتی تەلموود و تەورات.

لەبن بارە قورسەکەدا شانیان چەمایەوە، ئیدا و ئالتەر شوماخەر نامەیان بۆ دۆستەکانیان لە ڕووسیا نووسی و دادەدادیان[132] بوو لەدەست باری گوزەران، خۆزگەیان خواستبوو نەهاتبانایە ئیسرائیل. یەک دوو لەو نامە دەردەدڵییانە کەوتنە دەستی «ناهمان شتارکس». ئەویش وای لێکدایەوە، کەوا شوماخەرەکان بە نیازن بە خۆیان و منداڵەکانیان بگەڕێنەوە ڕووسیا. ئیدی باپیرە گڕی گرت، بڕیاریدا یۆسێل لای خۆی گلبداتەوە و ڕادەستی دایک و باوکیان نەکاتەوە.

هەرچەندە لە کۆتای ١٩٥٩دا بارودۆخی ئابووری شوماخەرەکان باشتر ببوو. لەوە باشتریان بۆ ڕێکنەدەکەوت، بۆیە بڕیاریان دا ئەندامانی خێزانەکەیان یەکخەنەوە. ئینجا لە دیسەمبەری هەمان ساڵدا، «ئیدا» چووە ئۆرشەلیم تا منداڵەکەی خۆی بێنێتەوە، بەڵام نە «یوسیل» و نە باپیرە لە ماڵ نەبوون. دایکی «ئیدا» پێیگوت: "خەم مەخۆ، بەیانی «شالۆمی» برات دێت و کوڕەکەت بۆ دێنێتەوە. ئێستا «یوسیل» لەگەڵ باپیرەی لە کنیشتە و ناشبێ هەراسانی بکەی."

بۆ ڕۆژی پاشتر، «شالۆم» بە تەنیا چووە «هۆلۆن» بە خوشکەکەی ڕاگەیاند، کە باوکیان بڕیاریداوە یۆسێلیان وێنەدەتاوە. ئیدی «ئیدا» بە پەستی لەگەڵ مێردەکەی بە پەلەپڕوزێ خۆیان گەیاندە ئۆرشەلیم. ئەوان پشووی کۆتایی هەفتە لە ماڵی شتارکسەکان بوون، ئەو کاتیش یوسێل لەوێ بوو. بۆ شەوی شەممە، ئەو کاتەی ئەوان باسی ڕۆیشتنیان دەکرد و کوڕەکەشیان لەگەڵ خۆیان بەرنەوە، دایکی «ئیدا» ڕازی نەبوو، پێیگوتن: "ئێستا هەوای دەرێ زۆر ساردە. دەی لێگەڕی با کوڕەکە بۆخۆی بنوێ، بەیانی خۆم بۆتی دەهێنمەوە." ئەوانیش بەم قسەیە قایل

---

[132] دادەداد: سکاڵا و ناڕەزایی.

بوون. «ئیدا» کوڕەکەی خۆی ماچ کرد کە خۆی لەناو جێگەدا گرمۆڵە کردبوو. پاشان بەخۆی و مێردەکەی لەوێ ڕۆیشتن. ئاخر چۆن دەیزانی کە چەندین ساڵ تێدەپەڕن تا جارێکی دیکە ڕۆڵە بچکۆلانەکەی خۆی ببینێتەوە؟

بۆ ڕۆژی دوایی، نە یۆسێل و نە داپیرە لە هیچ کونێک دیارنەبوون. دیسان «ئیدا» و مێردەکەی بەرەو ئۆرشەلیم لێیانخوڕییەوە. بەڵام بێهودە بوو. منداڵەکە ون ببوو، شتارکسە پیرەکەش بە توندی ڕەتیکردەوە منداڵەکەیان بداتەوە، هەرچەندە «ئیدا» گریا، لێ هەر دادی نەدا. کوڕەکەی لەدەست دەرچوو.

دوای چەندین هاتن و چوون، «ئیدا» لەوە تێگەیشت، پیرەمێردەکەی باوکی کوڕەکەیان ناداتەوە یاخود شوێنی حەشاردانەکەشیان بۆ ئاشکرا ناکا. بۆیە بە ناچاری لە ینایری ١٩٦٠دا، بڕیاریاندا ڕوو لە دادگا بکەن. ژن و مێرد داوایان لە دژی «ناهمان شتارکس» گەیاندە دادگای ڕابایینی تەلئەبیب. شتارکس وەڵامی نەدانەوە. ئینجا لەوێوە ڕەوشێکی ڕموزنیی هاتە ئارا...

- ١٥ی ینایر/ دادگای باڵای ئیسڕائیل بڕیاریدا، کە شتارکس لە ماوەی ٣٠ ڕۆژدا کوڕەکە بۆ دایبابی بگێڕێتەوە و لە دادگاکەش ئامادە بێ. ئەویش دوای دوو ڕۆژ بەرسڤی دایەوە: "من لەبەر باری لەنگی تەندروستیم ناتوانم بێمە دادگا."
- ١٧ی فێبرایر/ خێزانەکە سکاڵای خۆی گەیاندە پۆلیس، داوایان کرد «ناهمان شتارکس» بگیرێ و دەستبەسەر بکرێ تا کوڕەکەیان دەداتەوە. دادگای باڵاش فەرمانی بە پۆلیس کرد بە

دوای منداڵەکەدا بگەڕێ و بیدۆزێتەوە. دوای دە ڕۆژ، پۆلیس فایلێکی بۆ «یوسیل» کردەوە و کێوماڵکردن دەستیپێکرد.

- ٧ی ئەپریل/ پۆلیس شوێنپێی کوڕەکەی پێ هەڵنەگیرا و داوای لە دادگای باڵا کرد، واز لە کردەی گەڕانەکە بهێنێ.
- ١٢ی ئایار/ دادگای باڵا بە پەستییەوە فەرمانی بە پۆلیس کرد لەسەر گەڕانەکەیان بەردەوام بن و ناهمان شتارکسیش بگرن. ئیدی بۆ ڕۆژی دواتر پیرەمێردیان دەستبەسەر کرد.

بەڵام خۆ ئەگەر کەس لەو بڕوایەدا بووبێ، پیرەمێردەکە لە گرتووخانەدا تێکدەشکێ و کێشەکە چارەسەر دەبێ، ئەوا سەرچیخ چووە. ئەو پیرەپیاوە ڕەق و توندە یەک قسەشی نەدرکاند.

دەستبەجێ ئەم حاڵەتە بووە بەڵگە کەوا شتارکس بە خۆی منداڵەکەی شاردۆتەوە و لە لایەن ڕایەڵەی جووە ئۆرسەدۆکسە پەڕگیرەکانیش کۆمەک کراوە کە پۆلیسیان لە خشتەبردووە. هەموویان لە چالاککارییێکی پیرۆزدا بەشدار بوون: بۆ ئەوی وەک شتارکسەکان بە پۆلیس و بە خەڵکیان گوت ڕێ لەوە بگرن، کوڕەکە ببردرێتەوە ڕووسیا و لەوێ بکرێتە کریستیانی یان شتێکی ئاوەها. تەنانەت خودی ڕابی «فرانک»، گەورەڕابی ئۆرشەلیمیش پشتگیرینامەیەکی بۆ شتارکسە پیرەکە بڵاوکردەوە و داوای لە کۆمەڵگەی ئۆرسەدۆکسی جوو کرد بە هەموو جۆرێک بێ، یارمەتیان بدەن.

✡ ✡ ✡

لە ئایاری ١٩٦٠یش پرسەکە گەیشتە ئەجێندای کنێست و ڕۆژنامەگەریش کردیە ڕۆژی خۆی. سەرەتا ترس لە لێکەوتە بەدواداگەڕانەکە هەبوو کە بەرۆکی نوێنەرایەتی حزب و لایەنە ئۆلییەکانی بگرێتەوە. «شلۆمۆ

لۆرێنزی» ئەندام پەرلەمان هەستیکرد، ڕفاندنی منداڵەکە لەوانەیە ئاگری شەڕێکی دینی لە نێو ئیسرائیلدا هەڵبگیرسێنێ. بۆیە داوای لە هەر دوو خێزانی شتارکس و شوماخەر کرد، وەک ناوبژیوانێک بچێتە نێوانیانەوە. ئەو پێشنووسی ڕێککەوتننامەیەکی لەگەڵ خۆی بردە لای شتارکسی پیرەمێرد، کە هێشتا هەر لە بەندیخانەدا بوو، بەڵێنی ئەوەی تێدا بوو، دایبابەکە، کوڕەکەیان بنێرنە بەر خوێندنێکی ئۆرسەدۆکسییانەی جوو. شتارکسش بەم خستنەڕووە قایلبوو کاغەزەکە واژۆ بکا، ئەمما بەیەک مەرج: (ڕابی مایزش) کە یەکێک بوو لە ڕابیە پەڕگیرەکانی ئۆرشەلیم، فەرمانبدا بیکا.

ئیدی «لۆرێنز» بە هەڵەداوان ڕووی لە ئۆرشەلیم کرد و ڕابیەکەی بینی. «مایز»یش گوتی ئەو ڕێککەوتننامەکە بەیەک مەرج پەسەند دەکا، بەوەی نابێ هیچ لێکەوتەی قانونی بەرۆکی ڕفێنەرانی بگرێ.

ئینجا «لۆرێنز» خۆی گەیاندە لای «یوسف ناهمیا»ی بەرپرسی پۆلیس. ئەویش گوتی: "من قایلم. دەی برۆ ترومبێلەکەم ببە و منداڵەکە بێنەوە. تۆ پارێزبەندی پەرلەمانیت هەیە، کەسیش ڕێ لە ترومبێلەکەی من ناگرێ، بەم جۆرە ئەو کەسانەی دەستیان لە ڕفاندنەکە دایە بە نە ناسراوی دەمێننەوە."

لۆرێنزیش بە کەیفسازیەوە گەڕایەوە لای ڕابی مایزیش، بەڵام ئەمجارەیان ڕابیەکە ڕای خۆی گۆڕی. بەم جۆرە لۆرینزیش گەڕایەوە چوارگۆشەی یەکەم. ئەو زانی لەوانەیە منداڵەکە لە یەکێک لە کۆمەڵگە ئۆلییەکان، لە قوتابخانەیەکی تەلموودی یان لە گوندێکی ئۆرسەدۆکسی حەشار درابێ. بەڵام بەو دیوارە بێدەنگییەی بە دەوری شوێنبزرکردنی منداڵەکە هەڵنرابوو، دۆزینەوەکەی ببووە ئەرکێکی نەکردە.

له ١٢ی ئەپریلی ١٩٦١دا ناهمان شتارکس لەبەر باری تەندروستی لە زیندان ئازادکرا، ئەمەش دوای ئەوەی بەڵێنی دابوو هەوڵبدا کوڕەکە بدۆزرێتەوە. بەڵام ئەو خاوەنی قسەی خۆی نەبوو، جارێکی دیکە دادگای باڵا فەرمانی گرتنی دایەوە، بنەمای لێدوانی دادگاش ئەوە بوو کە ڕفاندنەکە "بەد و سەرسامهێنە." لە ئابی ١٩٦١دا، کۆمیتەیەکی نیشتمانی بۆ گەڕاندنەوەی یوسیل پێکهێنرا و دەستی بە پەخشکردنی بڵاوکراوە کرد و کۆبوونەوەی جەماوەری بۆ سازدا و میدیاشی لێ ئاگادارکردەوە. بە هەزاران واژۆ کۆکرایەوە؛ دیاربوو سایەی ئەهریمەنانەی شەڕێکی وێرانە ئاسۆی وڵاتی داپۆشی.

لە ئابی ١٩٦١دا پۆلیس بەسەر گوندی «کۆیمویتی هاسید»یدا دا، تەنها ئەوەیان بۆدەرکەوت، کە باڵندەکە لە قەفەزەکەی خۆی نەماوە. ئاخر یوسیل ساڵ و نیوێک پێشتر لەو گوندەدا حەشاردرابوو، لە دیسێمبەری ١٩٥٩شدا کاتێک شالۆم، خاڵی منداڵەکە بردبوویە ماڵی «زالمان کۆت»، ئیدی لەو ڕۆژەوە بە ناوی «ئیسرائیل هازاک» شاردرایەوە.

لەو نێوەشدا، منداڵەکە لابردرابوو، شالۆم شتارکسیش وڵاتی بەجێهێشتبوو، لە نێو کۆمەڵگەیەکی هاسیدسی لە «گۆلدەرس گرین»ی لەندەندا جێگیر ببوو. لەسەر داوای پۆلیسی ئیسرائیلیش، شتارکس لەلایەن پۆلیسی بەریتانیەوە گیرا؛ کاتێکیش یەکەمین کوڕی بەناوی «کالمن» لەدایکبوو، باوکەکە لە گرتووخانەدا بوو، بۆیە خێزانەکەی کۆرپەلەکەیان بردە گرتووخانە تا ڕێوڕەسمی ئۆلییانە بە گوێی دابونەریتەکەیان بۆ ساز بدەن.

بەڵام، خۆ یوسێل بێئەوەی شوێنپێی هەڵبگیرێتەوە ونبوو. هەندێک بڕوایان وابوو، بە قاچاخ ئاودیوی هەندەران کرابێ، یان تەنانەت نەخۆش کەوتبێ و مردبێ. پۆلیسیش ببوە گاڵتەجاڕ. پێکدادانی توندوتیژ لەنێوان سیکولار و

جووه ئۆرسەدۆکسەکان بەرپابوو. لەسەر جادە لەلایەن ڕێبوارانەوە قوتابییەکانی کۆمەڵگە دینییەکانی یەشیڤا دەگیران و لێیان دەدرا. گەنجە سیکولارەکان بەسەر مێردمنداڵە ئەرسەدۆکسەکانیان هاوارا دەکرد: "ئەرێ یوسێل لە کوێیە؟"

تووڕەبونی جەماوەری ئیسرائیل گەیشتە لووتکە. دەمەتەقێیەکی توند کنیستی هەژاند.

هەر بۆیە و بۆ ئەم پرسە داود بنگۆرۆن بانگی ئیسەری کرد.

✡ ✡ ✡

کاتێکیش ئیسەر ڕازی بوو، لێکۆڵینەوە بۆ دۆزینەوەی یوسیل بخاتە سەر پێ، پەی بەوە نەبردبوو کە شتێکی هەرە سەخت و ئاڵۆزی لە کارنامەی ژیانی خۆیدا واژۆ کردووە. ئەو هەرگیز باسوخواسی ئۆپەراسیۆنەکانی لەگەڵ«ڕیڤکا» ژنیدا نەدەهێنایە گۆڕێ؛ بەڵام ئەم جارەیان پێیگوت: "دەسەڵاتی حکوومەت لەسەر سەنگی مەحەکە." «ئاڤراهام شالۆم»، کە یەکێک لە باشترین ئاژانەکانی بوو، بۆچوونێکی جیاوازی لەو بارەیەوە هەبوو: "ئیسەر ئەوەی دەوێ، لە کوێ پۆلیس شکستی هێناوە، لەوێدا تێهەڵبچێ و سەربکەوێ."

پۆلیسیش زۆری پێخۆش بوو ئەو ئەرکە نەخوازراوەی لێوەربگیرێتەوە. «جۆزیف ناحمی»ی بەڕێوەبەری دەزگەی پۆلیس لە ئیسەری پرسی: "ئەرێ هەر بە ڕاست بڕوات وایە کە ئەگەری دۆزینەوەی منداڵەکە هەیە؟" «ئامۆس مانۆر» سەرۆکی دەزگەی شاباک و هاوکاری نزیکی ئیسەر دژی سەرلەبەری پێشنیازی لێکۆڵینەوەکە بوو. زۆر لە ئەفسەرەکانی مۆساد و شاباکیش پەسەندیان کرد. هەمووان لەو باوەڕەدا بوون، ئەو بەڵێننامەیە بۆ گەڕان و سوڕان بە دوای منداڵەکەدا لە دەرەوەی بازنەی

ئەرکەکانی ئەوانە؛ ئاخر ئەوان دەبوایە بۆ ئاسایشی ئیسرائیل تێبکۆشابان، نەوەک شوێنپێهەڵگرتنی منداڵێکی قوتابخانەی هاسیدیکی. ئەوان بە پێچەوانەی ئیسەر، بڕوایان نەدەکرد، کە دەزگەی هەواڵگری نهێنی لە خزمەت پاراستنی ناووڕوومەتی دەوڵەتی ئیسرائیل دایە. هێشتاش، جارێکی دیکە ئیسەر لە کەللەی دایەوە، ئەوان نەیانتوانی بڕیارەکەی پێبگۆڕن. ئاخر دەسەڵاتەکەی ئەو ڕەهابوو، هی بەرپەرچدانەوە نەبوو.

ئیسەر و یاریدەدەرانی هێزێکی نیازکردییان لە نزیکەی چل ئاژان پێکهێنا، کە لە باشترین لێکۆڵەرەوەکانی شاباک، ئەندامانی تیمی ئۆپەراسیۆنەکان، ئاژانی دیندار یان کەسانێک وەها دیاردەکران، تەنانەت کەسانێکیش لە مەدەنییەکان کە خۆبەخشانە ئامادەی ئۆپەراسیۆنەکە بوون. زۆر لە خۆبەخشەکان ئەندامی کۆمەڵگەی خودی ئەرسەدۆکسی بون، ئەوانەی دەرکیان بەوەکردبوو، ڕفاندنی یوسیل زیانێکی کوشندە بە نەتەوەکە دەگەیەنێ. بەڵام یەکەمین ئۆپەراسیۆنەکەیان بە شکست گەیشت. ئاخر ئەوان زۆر سادەییانە ویستیان دزە بکەنە نێو بنکەکانی ئەرسەدۆکسە پەڕگیرەکان، کەچی دەستبەجێ ناسرانەوە، گاڵتەیان پێکرا و ڕەتکرانەوە. یەکێک لە ئاژانەکانی ئیسرائیلی گوتی: "من هەستم کرد وەک ئەوەی لەسەر مەریخ دابەزیبم،" ئەو وەک ئەوەی بە نابینایی کەوتبێتە نێو ئاپۆرایەک لە خەڵکی کورتەبنەی کەسک پۆش، بێ ئەوەی هیچیش تێبینی بکا.

ئیسەر بە حەوسەڵەوە لە دۆزەکەی کۆڵیەوە، فایلەکەی هەڵدایەوە، هەموو بەڵگەنامەکانی لەسەر یەک خوێندنەوە. لەوێدا هیچ شوێنەوارێک نەبوو، کە یوسیل لە ئیسرائیل مابێ. لە کۆتاییدا ئیسەر بە ئاکامێک گەیشت: منداڵەکە بردراوەتە دەرەوەی وڵات.

باشە، بردراوەتە دەرەوەی وڵات، بەڵام کوێ؟ کۆپلە هەواڵێکی کورت سەرنجی ڕاکێشا. لە ناوەڕاستی مارتی ١٩٦٢دا، گرووپێکی گەورەی جووە هاسیدیکەکان لە سویسڕاوە هاتنە ئیسرائیل. ژمارەیەک لە پیاو، ژن و منداڵ بە یاوەری ڕابیە ڕێزلێگیراوە مردووەکەیان هاتن و تا لە خاکی پیرۆزدا بینێژن. ئیسەر گومانێکی بۆ پەیدابوو، بەڵکو بۆنەی بەخاکسپاردنەکە هەر چیرۆکێک بووبێ بۆ پەردەپۆشکردنی کردەوەی ڕفاندن، بۆ ئەوەی دوای یەک دوو هەفتە لە گەڕانەوەیان، یوسیل لەگەڵ خۆیان ببەن و لە وڵاتی دوور بخەنەوە. ئیسەر خەڵکی خۆی ناردەفڕۆکەخانە، تیمێکی بچکۆلەی دیکەشی بە سەرپەرشتی ئاڤراهام شالۆم ڕەوانەی زیوریخ کرد بۆ ئەوەی لەکاتی گەڕانەوەدا چاودێری ئەو گروپە هاسیدیکە بکا کە دەگەڕێنەوە. تەنانەت ئاژانەکانی مۆساد بەشی ناوەخۆی قوتابخانەی منداڵانیش گەڕان و چوونە حەوشەکە و تەنانەت سەریان بە ژووری منداڵەکاکانیشدا کرد. دواتر شالۆم گوتی: "ئێمە گەیشتینە ئەو کۆمەڵگە جووە هاسیدییەی قووڵایی دارستان. ئێمە بە پەنجەرەکانیان نووساین و دەشمانزانی لەوانەیە شکلگۆڕیشیان کردبێ، بەڵام لە منداڵانی هاوتەمەنی ئەو دەگەڕاین." دوای هەفتەیەک لە سەرچڵی شەوگەڕی[133]، ڕاپۆرتی خۆی بۆ ئیسەر بەرزکردەوە، تیایدا هاتبوو، کە یوسیلی لەنێو منداڵە سوسیراییەکاندا نەناسیوەتەوە.

ئیسەر بڕیاریدا هەر بە خۆی سەرەداوی فەرماندەیی ئۆپەراسیۆنەکە بگرێتە دەست. ئینجا هەموو شتەکانی خستە بەردەستی یاریدەدەرەکانی، بنکەیەکی لە پاریس جێگیر کرد و پیاوەکانی بە جیهاندا بڵاوکردنەوە. ئیدی ئەوان لە وڵاتەکانی فەرەنسە، ئیتالیا، سویسڕا، بەلجیکا، ئینگلستان، باشووری ئەفریقا، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و باکووری ئەفریقای

[133] شەوگەڕی: گەڕان و پشکنین بە شەو.

بەدواداگەڕان. بەناو و ڕووپۆشی جیاجیاوە، تێکۆشان دزەبکەنە نێو کۆمەڵگە جووە ئەرسەدۆکسەکان، بەڵکو لە شوێنێک لەو بنکانە شتێک لەبارەی شاردنەوەی یوسیلەوە ببیستن. کوڕە گەنجە جوویێکی ئەرسەدۆکسی لە ئۆرشەلیمەوە گەیشتە کۆمەڵگە جووە ئۆرسەدۆکسە بەناوبانگەکەی ڕابی سۆلۆویچیک لە سویسرا، خۆی وا دەرخست کە خوێندکارە و دەیەوێ تەورات لەسەر دەستی مامۆستای گەورەدا بخوێنێ. خاکیترین ژنە دینداریکی تەرکەدونیا و سۆفی گەیشتە لەندەن، نامەی گەرموگوڕی ڕاسپاردەیی خەسووی شالۆم شتارکسی پێبوو، کە جێگەی متمانەی بوو. ئیدی لە لەندەن لە لایەن خێزانی شتارکسەوە بەخێرهێندرا و داوای لێکرا وەک میوان لە لایان بمێنێتەوە. ئاخر خێزانەکە نەیدەزانی کە ژنە نێردراوەکە «یەهودیت نیسیاهو»ی باشترین ژنە ئاژانی ئیسەرە و لە ڕفاندنی ئایخمانیشدا بەشدارببوو.

ئەوێ ڕۆژێ «یوهیدیت» تاکە ئاژانی مۆساد نەبوو لە لەندەن. ئاخر لەندەن مەڵبەندی هەرە گرنگی ئەرسەدۆکسە پەڕگیرە هاسیدیکەکانی مەزهەبی «ساتمار» بوو (ئەمەش ناوی گوندێکی ڕۆمانی بوو «ناوی ساتو مێیر»، مەزهەبەکە کاتی خۆی لەوێ سەریهەڵدابوو). ئیسەر دەستە ئاژانێکی دیکەشی ناردە گەڕەکی هاسیدینشین لە لەندەن. دەستەیەکی دیکەشی بۆ ئیرلەندا نارد. لە میانەی ئۆپەراسیۆنەکەی ئینگلستانێ، پیاوەکانی ئیسەر بەسەر ژن و پیاوێک ڕاگەیشتن کە لە پڕ خانوویێکی لاپەڕگەیان لە ئیرلەندا بەکرێگرتبوو. ئاژانەکانی مۆساد بڕوایان وابوو خانووەکەی جوتەکە لەوانەیە شوێنی حەشاردانی یوسیل بێ، بۆیە بە وردی پلانی بەسەرردادان و ڕفاندنی منداڵەکەیان داڕشت. هەر خێراش ئەوان ئەپارتمانێک و ترومبێلیان بەکرێگرت، کەلوپەلی پێویستیان بە قاچاخ

برده ئەویَ، بەڵگەنامەی ساختەیان ئامادەکرد. نەخشەی ورد و درشتی پلانەکەیان دارِشت

بەڵام دوایی وەها دەرنەچوو.

یەکەمین تیم، کە دەستبەتاڵ و بێئومێد گەڕایەوە، تیمەکەی ئیرلەندا بوو. دەرکەوت ئەو "جووتە دیندارە" هەر بەڕاستی جووتێکی دیندار بوون. ئەوان تازە بڕیاریاندابوو پشووەکەیان لە ئیرلەندا بەسەربەرن. یەهودیت نیسیاهۆش لەوەدا سەرنەکەوت، هیچ زانیارییێک لە بن سەری خێزانەکەی شتارکسدا دەربهێنێ، ئەو گەنجەی ڕەوانەی فێرگە پیرۆزەکەی سویسڕا کرابوو بە چاوڕوونی گەڕایەوە بەڵام بە دەستی بە تاڵوحەتاڵ. لە هەموو سووچ و کەنارەکانی دنیاوە، هەر وەڵامی نەریَ بۆ بنکە سەرەکییەکەی مۆساد لە ئیسڕائیل دەنێردران. منداڵەکە خەریک بو ئاووئاو دەچوو.

خراپترین چارەنووسیش هی ئەو تیمەبوو، کە ویستیان دزە بکەنە نێو هاسیدیکەکانی ستامار لە لەندەن. هەندیَ لە قوتابییە نەوجەوانەکانی کۆمەڵگەی جوو لە گەڕەکی ستامفۆرد هیل، لەپڕ بەسەر میوانە داوانەکراوەکانی خۆیان هاوارکرد: "دەی زایۆنستەکان وەرنە ئێرە! وەرن، ئەوە یوسیلە لێرەیە!" تەنانەت بانگی پۆلیسی لەندەنیشیان کرد. یاریدەدەرانی ئیسەر ڕەنجی زۆریان دا تا هاوڕێکانیان لە زیندانی شاژنی خاوەن شکۆی بەریتانیا دەربهێنن.

ئیدی بەم جۆرە یەک لە دوای یەک دەبووایە ئیسەر هیوای بە پشتگیری بۆ ڕاییکردنی بەڵێنەکەی نەمێنیَ. پێیانگوت: "ئیسەر، کار وا ناچێتەسەر. تۆ

دوای کڵاوی بابردوو کەوتووی. تۆ لە دەرزییێک دەگەڕێی کە کەوتۆتە نێو کادینێک[134]. ئێمە منداڵەکە نادۆزینەوە."

بەلام ئەو بێئومێد نەبوو. وەک کەللەڕەقێکی نەسەلمێن، هەموو گومانەکانی دەڕەواندنەوە، لەسەر نەخشەکەی بەردەوام بوو، لەسەر بەدواداچوونەکە سوور بوو، لەگەڵ ئەو هەموو شتە سەیر و دژانەی ڕووبەڕوی دەهاتنەوە، بڕوای وابوو منداڵەکە هەر دەدۆزێتەوە.

✡ ✡ ✡

ئیسەر لە پاریس بانگی «یاکۆڤ کارۆز» بەرپرسی ویستگەی مۆسادی ئەوێی کرد. «کارۆز» لە ڕۆمانیا لەدایک ببوو، دایک و باوکی لە هۆلۆکۆست فەوتابوون، هەر لەو کاتەی لە زانستگەی عیبری لە ئۆرشەلیم خوێندکار بوو، دەستی لەگەڵ مۆساددا تێکەڵکردبوو. ئەو کەسێکی زیرەک، نێوچاوان ڕوون، بیچمێکی ناسکی چاویلکەلەچاو بوو. ڕووخساری «کارۆز» لە ڕۆشنبیر دەچوو. ئەو سەرۆکی پێشووی هۆبەی تێڤێل (بونەوەر) بوو، کە هۆبەیەکی مۆساد بوو، بەرپرسیارێتی داپۆشینی پەیوەندییەکانی مۆسادی لەگەڵ دەزگە هەواڵگرییە نهێنیەکانی دیکە لە ئەستۆدا بوو، هەندێ لە نهێنیترین و چاوەڕواننەکراوترین هاوپەیمانی مۆسادی لەنێو بازنەی کاردا بوو. ئەو "پەیمانێکی لاوەکی" لەنێوان ئیسرائیل و ئێران، ئەسیوپیا، تورکیا تەنانەت سوداندا هەبوو (هەمووشیان دەوڵەتی ناعەرەب بوون لە کەمەری ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا)[135]؛ ئەو هاوڕێکییێکی دۆستانەی لەگەڵ سەرانی دەزگە هەواڵگرییەکانی هەر یەک لە فەرەنسا، بەریتانیا، و ئەڵمانیا پەیداکردبوو؛ ئەو هاوپەیمانێتیشی لەگەڵ

[134] کادین: کارین، شوێنی داکردنی کا.

[135] مایەی تێبینییە، نووسەرەکان سودانیشیان بە دەوڵەتێکی ناعەرەب لە قەڵەم داوە. و.

ژەنەڕاڵ «ئوفقیر»[136]، وەزیرە سامناکەکەی ناوخۆی مۆراکۆ[137] بەستبوو، بە نهێنیش سەردانی «شا حەسەن»، پاشای مۆراکۆی کردبوو؛ تەنانەت ئەو یارمەتی «هیلاسی لاسی»، ئیمپڕاتۆری ئەسیوپیاشی دابوو لەوەی هەوڵێکی کودەتای یاریدەدەرە هەرە نزیکەکانی سەرکوت بکا. لە میانەی ئەو ئۆپەراسیۆنە سەردانەپۆشراوەی ئەلجەزائیریش، دەکەوێتە داوی ئافرەتێکی گەنج بە ناوی «یولیتا (ییل)» و دواتر دەبێتە ژنی. «کارۆز» بە نەرمی قسەی دەکرد، ئەو بەڕێزێکی لەخشتەبەر بوو. ئەو لە بن قات و بۆینباخدا لە کاری جاسووسییدا وەستا بوو، هەرگیزیش وەک ئاژانێکی سەر مەیدان کاری نەکردووە؛ پیاوێکیش بوو بە ڕەوانی بە زمانەکانی فەرەنسی و ئینگلیزی دەدوا، ئەمەش بووە مایەی بایەخێکی زۆر بۆ ئیسەر.

ئیسەر وەک میلی سەعات کاری دەکرد. ژوورێکی لە هوتێل بەکرێگرت، بەڵام زۆربەی ڕۆژ و شەوەکانی لە ئەپارتمانێک بەسەر دەبرد کە ببووە بنکەی ئۆپەراسیۆن. یاریدەدەرەکانی پاڵتۆیەکی نووشتاوەیان بۆ هێنا (پییان دەگوت، پێخەفی یوسیل)، جارێکیشیان لەکاتی سەرخەوشکاندنێکدا لەسەر قەنەفەکە کەوتەخوار. ئەم حاڵەتەش چەندین مانگی خایاند. زۆربەی کات بەسەر ڕاپۆرتەکاندا دەچووەوە، برووسکەی لێدەدان، قسەی لەگەڵ پیاوەکانیدا دەکرد، کە بە هەرچوار کەناری دنیایدا بڵاوی کردبوونەوە. بەیانیانیش دەگەڕایەوە نووسینگەکەی خۆی لە هوتێلەکە، ئاوێکی بەخۆدا دەکرد، ئینجا سەر لە نوێ دەستی بە کار دەکردەوە. لە یەکەمین شەودا کاتێ لە سەعاتی بەرەبەیاندا گەڕایەوە هوتێلەکە، کارمەندی پرسگەکە بە خەندەیەکەوە لێیڕوانی. پێدەچوو ئەو پیاوە

---

[136] Aufkir

[137] مۆراکۆ: وڵاتی شانشینی مەغریب

کورتەباڵایە خۆشی لە شەوی پایزەی پاریس بینیبێ. لە شەوی دووهەمدا کارمەندەکە ڕێگەی بە خۆیدا چاوێکی دۆستانەی لێبکا. بەڵام کاتێ شەوە سەرچڵییەکان درێژەیان کێشا، سێیەم و چوارەم و پێنجەمی تێپەڕاند، ئیدی کارمەندەکە هەر چاویشی لێنەکرد. کاتێکیش ئیسەر لە بەرەبەیاندا گەڕایەوە، چاوەکانی لە بەر نەخەوتن سوور ببون، ڕووی گرژ بوو، جلەکانی چرچ و لۆچ ببوون، ئینجا کارمەندی پرسگەکە تیاترۆئاسا شەپقەکەی بۆ داگرت، هەندێکی بۆ چەمایەوە و پێیگوت: "مسیۆ، ڕێزمان!"

پاشان سپێدەیەکی مانگی ئەپریل، ڕاپۆرتێکی سەرنجڕاکێش گەیشتە دەستی ئاژانەکانی مۆساد. ڕاپۆرتەکە لە لایەن گەنجە جوویێکی نوێی ئۆرسەدۆکسی بە ناوی «مایەر»، لە شاری «ئەنتوێرپن»ی بەلجیکاوە ڕەوانەکرابوو. لەوێدا کابرا بە گرووپێکی ئەڵماسفرۆشی دیندار ئاشنا ببوو، کە شوێنکەوتەی ڕابی «ئیسحاق» بوون، وایان لە ڕابیەکە دەڕوانی کە پیاوێکی پیرۆزە. کاتێکیش ئەوان خەریکی چارەسەرکردنی کێشەوگرفتی بزنسەکەیان دەبوون، بۆ دادگاکانی دەوڵەت نەدەگەڕانەوە، بەڵکو داوایان لە ڕابیەکە دەکرد بەڵکو دارێکیان بەنێواندا بهێنێ[138]، زۆر جاریش ئەم کارە دەستهەقەکەی بە ملیۆنان دۆلار بوو. قسەی ڕابیەکە بۆیان قانون بوو. تەنانەت لە ڕۆژگارێکی مۆدێرنی ئەورووپاشدا، ئەو گرووپە بازرگانە لەسەر شەقڵ و ڕێوشوێنی نەریتە کۆنەکان دەڕۆیشتن.

«مایەر» توانی دزە بکاتە نێو بازنەی شوێنکەوتوانی ڕابانەکە و زانیشی، لە ماوەی جەنگی دووەمی جیهانیدا، ئەوان وەک کۆمەڵەیەکی ژێرزەمینی دژەنازی جووڵاونەتەوە، چەندین جوویان لە دەستی «گێستاپۆ»ی[139]

[138] ئیدیۆمێکی کوردییە بە واتای نێوبژیوان، ئاشتکردنەوە.

[139] Gestapo گێستاپۆ، پۆلیسی نهێنی نازی ئەڵمان.

ئاڵمان قوتارکردووە. دوای کۆتایی هاتنی جەنگیش، گرووپەکە لەسەر هەمان شەقڵ و ڕەوتی کارکردنیان بەردەوامبوون، ئەزمونی خەباتی ژێرزەمینی خۆیان وەک ڕێکخراو بۆ پەیوەستبوون بە کاروباری بازرگانی خۆیان لەسەرتاسەری جیهاندا ڕاپی کرد. بازرگانانی ئەڵماس چیرۆکی سەیروسەمەرەیان دەربارەی ژنە فەرەنسیە کەژە چاوشینەکە بۆ گێڕابووەوە، ئەو ژنە کاسۆلیکییە کە لە میانەی جەنگەکەدا ئەندامێکی ڕێکخراوەکە بووە، یارمەتی داون بۆ ڕزگارکردنی جوو لە دەستی هیتلەر. ژنەکە بە توندی کەوتبووە ژێرکاریگەری کاریزمایی ڕابانیەکە؛ پاشان بۆتە جوو، بۆتە ئۆرسەدۆکسێکی دڵسۆز، لەوەش زیاتر، ژنەکە یارمەتیدەرێکی بێوێنەی گرووپەکە بوو. ژنەکە لەو ساڵانەی خەباتی ژێرزەمینیدا، شتگەلی زۆر فێرببوو؛ ژنێکی بیرتیژ، ئازا، دەیزانی چۆن پەرێز[140] بەدوای خۆی جێنەهێڵێ، خۆی شکڵگۆڕ بکا و بەهرەکانیشی وەک چەکێک بەکار بهێنێ. ویڕای ئەمانەش، ژنەکە بە خۆڕسک بۆ بزنس دەستی دەدا و بە ئاگاهییە سروشتییە قووڵەکەی خۆی زۆر باش سەری لێدەردەچوو. خانمەکە بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی گروپی «ئەنتوێرپن» بە پاسپۆرتە فەرەنسیەکەی بە وڵاتانی دنیادا گەڕابوو. جوویەکی شاری ئەنتوێرپن بە «مایەر»ی گوتبوی: "خانمێکی پیرۆز (قەدیس)ە. هەروەها ئەوەشیان پێگوتبوو، کەوا خانمەکە سەردانی ئیسرائیلیشی کردووە؛ ئاخر «کلاود»ی کوڕیشی لە مێردی یەکەمی بۆتە جوو، ئیدی دوای خوێندنی لە قوتابخانەی کۆمەڵگە جووەکەی سویسرا و لە «ئایکس لێس بابیس»دا، هەنوکە بووەتە خوێندکاری خوێندنگەی تەلمود لە ئۆرشەلیم. بەڵام ئێستا تەنانەت خودی خەڵکی ئەنتوێرپنیش نازانن ئاخۆ ئەو ژنە پیرۆزە بەنرخە لە کوێیە.

---

[140] پەرێز، شوێنەوار.

ئینجا چیرۆکی ئافرەتەکە کەڵکەڵەی خەیاڵی مۆسادی جووڵاند. هەر بۆ ڕاستی، هیچ شتێک لە نێو ئەو ڕاپۆرتەدا نەهاتبوو کە پەیوەندی ئەو ژنە فەرەنسیە بە یۆسیلەوە هەبێ. بەڵام لە چاوەکانی ئیسەردا، ژنەکە بە کەسێکی بە توانا و بەهرەمەند دەرکەوت، ژنێک بە هەزار ڕووەوە. لەوانەشە ژنەکە خدری زیندەی[141] سەرکردە ئۆرسەدۆکسەکان بێ، لەو کاتەی ئەوان پێویستیان بە کەسێک بێ، کە ئەرکێکی نهێنی لەبارەی یوسیلەوە بە ئەنجام بگەیەنێ.

ئیسەر بڕیاریدا بە دوای هەستی خۆزایی خۆیدا بڕوا، هەموو سەرەداوەکانی دیکە بەلاوە بنێ و تیشکۆی هزری نیازکردەی خۆی بخاتە سەر تەلیسمە داپۆشراوەکە. بەو وردەکارییانەی دەیزانی، بروسکەی بۆ ئیسرائیل لێدا، کە سەروسۆراخی کوڕی ئەو ژنەی بۆ بکەن و بۆی بیبیننەوە.

دوای یەک دوو ڕۆژ، وەڵامەکەی بۆ هاتەوە. ناوی کوڕی ئافرەتەکە «ئارییێل»ـە و هەر بە ڕاستیش ئێستا لە ئیسرائیلە. هێشتاش کەس نازانێ دایکی لە کوێیە. ناوی خانمەکە لە بنەڕەتدا «مادلین فێرایل»یە؛ لە ئیسرائیلیش پێی دەڵێن «ڕەث بن دایڤد».

ئیدی ڕاپۆرت بەسەر بنکەی سەرەکی ئیسەردا ڕژان، وردەکاری زیاتریان لە بارەی «مادلین فێرایل» تێدابوو. ئەو خانمە گەنجە جوانەیە، جوگرافیا و مێژووی لە زانکۆی «تولۆز» و «سۆبۆن» لە پاریس خوێندبوو. شووی بە «هنری» هاوپۆلە خۆشەویستەکەی کردبوو. کوڕەکەشیان کەمێک دوای بەرپابوونی جەنگی دووەمی جیهان لەدایکببوو. «مادلینا» لە

[141] دەستەواژەیەکی دیکەی وەک دیاری خواوەند بەکار هاتبوو، بەڵام لە کوردەواریدا دەستەواژەی خدری زیندە وەک فریادڕەس پڕ بە پێستیەتی.

میانەی جەنگەکەدا چووبووە ڕیزی بەرهەڵستاکارانی«ماکویز»، ئیدی ئەم کارە ژێرزەمینیەی بە جووەکانی فەرەنسی و بەلجیکی ئاشنا کردبوو، لەنێو ئەوانیشدا پەیوەندی لەگەڵ گرووپەکەی ئەنتوێرپندا پەیدا کردبوو. لە کۆتایی جەنگەکەشدا، دەستپێشخەری ئەوەی بۆ کردن کە سەرچڵی هاوردەکردنی شتە بەنرخەکانیان بۆ هەندێکیان بکا.

لە ١٩٥١یشدا لە هینری جیابووەوە، ئەمەش دوای ئەوە هات، کە گیرۆدەی داوی خۆشەویستی ڕابیێکی گەنج بوو لە شارە بچکۆلانەکەی «ئالستاتیان». ڕابیەکەش زایۆنیستێکی بەجۆش بوو، دەیویست کۆچ بکاتە ئیسرائیل، ئیدی هەر دوو خۆشەویستەکە بڕیاری بۆ یەکبوونیان دا و لەوێ زەماوەند بکەن. پێشتر ژنەکەی لە دینەکەی خۆی هەڵگەڕابووەوە، ببووە جوو، ئەم هەڵگەڕانەوەیە لە خۆشەویستی دینەکەدا نەبوو ئەوەندەی لە پێناوی خۆشەویستی پیاوەکەیدا بوو. لەو دواییانەشدا «رەث بن دایڤید» لە تیفتیفە و کەژایەتیەکی هەڵگەڕایەوە وجلە کەشخەکانی فڕێدان و جلێکی سادەی ئۆرسەدۆکسە جووەکانی پۆشین، هەندووانی[142] بە دوای یارەکەی کەوت بۆ خاکی پیرۆز. لێ گەلۆ، لە ئیسرائیل پەیوەندییە خۆشەویستیەکەیان ئاوەژوو بووەوە، ڕابینە گەنجەکە ژنەکەی جێهێڵا، ئیدی خانمەکە تەنیاباڵ و دڵشکاو مایەوە؛ تەنگژە تایبەتییە کەسییەکەی خۆی وای لێکرد زیاتر بچێتە نێو بازنەی پەرگیرەکانی ئۆرشەلیم و سەرکردەکەیان کە ڕابی «مایزیش» بوو. ئاخر ژنەکە لەنێو بازنە دیندارەکاندا ڕێزی زۆری لێدەگیرا دوای ئەوەی کە پاسپۆرتە فەرەنسییەکەی بۆ پەڕینەوە بۆ بەری ئوردن بەکارهێنا و لە بەردەم دیواری سکاڵادا نوێژ و نزای خۆی کرد.

[142] هەندووانی: پەندێکی کوردی هەیە دەڵێ: "مێرد هەندووە، ژن لە دووە!"

له سەرەتای پەنجاکاندا، ژنەکە گەڕایەوە فەرانسە و بە بەرفراوونی دەستی بە گەشتەکان کردەوە. ئاژانەکانی مۆساد تێبینی ئەوەیان کرد، کە بە بەردەوامی لە «ئایکس لێس باینس» یان لە پەیمانگەی خانمە دیندارەکان لە نزیک پاریس دەمێنێتەوە. بەڵام خودی ژنەکە ناوونیشانێکی جێگیری نەبوو.

کاربەدەستانی دامودەزگەی کۆچبەران بە پیاوەکانی ئیسەریان گوت، لەو یەک دوو ساڵەی دواییدا «ڕەث» دوو جاران سەردانی ئیسرائیلی کردووە. دووەمین جاریش لە ٢١ی حوزەیرانی ١٩٦٠دا بووە. ئەوێ دەمێ، خانمەکە بەخۆی و کچێکی بچکۆلانە لە ئیسرائیل هاتەدەر، ئەو کیژۆڵەیەش وەک کچی خۆی ناوی لەنێو پاسپۆرتەکەی هاتبوو. ئەوێ دەمێ بە گەشتەفڕینی «ئەلئیتالیا» گەشتی کردبوو ئامانجەکەشی «زیوریخ» بوو. بەڵام تۆ بڵێی کیژۆڵەکە کێ بووبێ؟ «بن دایڤد» هیچ کیژی نەبوو. ئیسەر هەستی کرد بە دوای شوێنپێی ڕاستدا دەگەڕێ. بۆیە بە یاکۆڤ کارۆزی گوت: "دەی بیدۆزەوە؟"

«کارۆز»یش لەگەڵ ئاژانێکی دیکە و بەو زانیارییە وردەکاریانە بەرەو «ئایکس لێس باینس» کەوتنە ڕێ. بەڵام کاتێک چوونە نێو شارە بچکۆلەکە، شتێکی سەرسامیان بینی. «ڕەث بن دایڤید» یاخود بە پێی پەڕاوی دۆزەکە «مادلینە فێرایل» بە جلێکی ڕێکپۆشەوە بینیان لەسەر جادە دەڕوا! ئەوانیش پێیان سەیر بوو. ژنە شۆخ و شەنگەکە پەنجەی هەڵبڕی بەڵکو لەسەر ڕێگەی فەرەنسا ترومبێلێک ڕابگرێ، ئەو دیمەنانەش دانسقە بوون. شوفێرەکە دەستبەجێ وەرسوڕایەوە و بەرەو لای خانمەکە لێیخوڕی. بەڵام بەر لە ترومبێلەکەی ئەوان، یەکێکی دیکە بۆی ڕاگرت و ژنە شۆخەکەی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرت.

ئاژانەکان بەم جۆرە بە دەستی بە تاڵ لە شارە بچووکەکەی« ئایکس لێس باینس» گەڕانەوە؛ بەڵام لەسەرچاوەی دیکەوە پێیان ڕاگەیەندرا، کە ژنەکە پەیوەندییێکی دۆستانەی لەگەڵ «جوزیف دامب»دا هەیە؛ ئەو پیاوەش دوژمنێکی سەرسەختی ئیسرائیلە. پیاوەکە سەر بە مەزهەبی ساتاماری هاسیدیکە، کە کەسێکی متمانەدار ۆ باوەڕپێکراوی ڕابییەکەی ساتامارە لە نیویۆرک، هەروەها زۆرینەی دەمراسەتەکانی ساتمار لە کۆمەڵگە هەمەجۆرەکانی ئەورووپادا دەناسێ. یەکێک لە شارەزایان بە ئیسەری گوت: "ئەگەر ڕابی ساتمار لە نیویۆرکدا پاپا بێ، ئەوا «دامب»یش کاردینالەکەیەتی."

ئینجا ئیسەر پەی بەوە برد، کە هەموو ڕێگەکان دەچنەوە لەندەن. ئاخر لەوێ دوو کوڕی شتارکس دەژین. بنکەیەکی کارای مەزهەبی ساتماری لێیە کە لە لایەن دامبەوە ڕابەرایەتی دەکرێ. لەوێدا «ڕەث بن دایڤد»یش بیندراوە، لەوانەشە یوسێلی بە قاچاخ ئاودیوی لەندەن کردبێ. ئیسەر گومانی نەمابووەوە: هەر دەبێ ساتماری هاسیدیزم لە ئیسرائیل و ئەورووپا نەخشەداڕێژی ڕفاندنی کوڕیژگەکە بن. «دامب»یش دەستی لە ئۆپەراسیۆنەکەدا هەیە. «رەث بن دایڤد»یش ئامرازی ڕفاندنەکەیە، چونکە بەهرەکانی، ئەزموونەکەی و پاسپۆرتە فەرەنسییەکەی هەمووی هی ئەوەن توانیبێتی کردەی ڕفاندنی کوڕەکە پێ پەردەپۆش بکا.

ئەو گومانەی ئەو بە هۆی ئاژانێکی شاباکەوە پشتڕاست کرایەوە، کاتێ چەندین نامەی ژنەکەی کەوتنە بەردەست، کە بۆ کوڕەکەی نووسیبوون؛ لە نامەکاندا هەندێ ئاماژەی شاراوەی سەبارەت بە یوسیل شوماخەر تێدابوو.

هێشتاش ئیسەر پێویستی بە زانیاری زیاتر هەبوو؛ بڕیاریدا دزە بکاتە نێو ساتمارە هاسیدییەکان. پیاوەکانی ئەو لە لەندەن کەسێکیان ناسی کە

«مۆهێل» بوو واتە: ئەو ڕابییەی تایبەتمەندە بە سونەتکردنی[143] کوڕە جووە تازە لەدایکبووەکان. مۆهێلەکە بەناوی «فریەر» بوو (بەڵام ناوی ڕاستەقینەی خۆی نەبوو. ئەو کەسێکی زۆربلێ بوو، پیاوێک بوو لە ژێر پاڵتۆ ڕەشەکەی حەزی لە ژیانی خۆش و زەوق بوو، بە لای کەمییەوە، ئەو پیاوێک بوو لە «دامب» نزیکبوو، وەهاش خۆی نمایش دەکرد، گوایە دەزانێ یوسێل لەکوێیە.

ئیسەر دەستی بە ئۆپەراسیۆنێکی ئاڵۆز کرد، بەنیاز بوو «فریەر» بێنێتە پاریس: یەکێ لە پیاوەکانی کە وەک شازادەیەکی مۆراکۆیی خۆی نمایشکرد، بە نهێنی هاتە لای «فریەر» و پێیگوت، کەوا کەوتبووە داوی خۆشەویستی کچێکی جوو. گوایە ئەوان بە نهێنی بوونەتە ژن و مێردی یەکدی، لەماڵیش لە «مۆراکۆ» هەر بەگوێرەی ئاینی جووایەتی دەسووڕێنەوە. ئێستاش ژنەکەی کۆرپەیەکی بووە و پێویستیان بەوە هەیە سونەتی بکەن، بەڵام خۆ ناتوانن ئەمە بەئاشکرا لە مۆراکۆدا بکەن؛ ئاخر ماڵباتەکەی ئەگەر بە پرسەکە بزانن ئەوا دەیکوژن... ئێستاش خۆی و ژنەکەی و ساوایەکەیان هاتوونەتە پاریس، ئایا دەکرێ ڕابی«فریەر» بێت و کوڕەکەیان خەتەنە بکا؟ لە بەرانبەریشدا بەخشندانە پاداشت وەربگرێ.

«فریەر»یش بە داوایەکە قایل بوو. پاش یەک دوو ڕۆژ گەیشتە پاریس. لەو ساتەی پێی نایە ئەو ئەپارتمانەی گوایە هی "شازادە مۆراکۆی"یەکەیە، لەلایەن ئاژانەکانی مۆسادەوە گیرا. ئەوسا بردیانە ژوورێکی بە تاڵ و حەتاڵ و بۆ چەندین سەعات لەلایەن «ڤیکتۆر کۆهن»، سەرۆکی هۆبەی لێکۆڵەرەوانی شاباک کەوتە بن لێکۆڵینەوە. ئەو "مۆهێل"ـە سونەتکەرە[144]

---

[143] سونەتکردن: خەتەنەکردن.

[144] کاتی خۆی لە گوندان کە سونەتکەر دەهاتن ، دەیانگوت سەیدی سونەتکەر هاتن!

له مردن ترسا، هیچ بەرگرییێکی نیشان نەدا، ئامادەبوو قسە بکا. بەڵام کاتێک پرسیاری یوسێلیان لێکرد، دەستی خۆی بەرزکردەوە و گوتی: "هەر بەڕاستی داوای لێبوردن دەکەم. من هیچی لێ نازانم."

لەڕاستیشدا دەرچوو «فریەر» هیچ سەبارەت بە کوڕی ڕفێندراوەکە نازانێ، هەموو ئەو فشەفشانەی هەر بۆ ئەوە بوو سەرنجی برادەرەکانی خۆی ڕابکێشی. دیسان ئیسەر سەری خۆی لە دیوار دایەوە.

کەچی بۆ مایەی سەرسامی هەر دوای ئەوە، تیمێکی دیکەی ئیسەر، ئالْتوونیان دۆزییەوە. بە یارمەتی دەزگەی هەواڵگری نهێنی فەرەنسی، توانیان چەندین نامە کە بۆ «مادلین فێرایل» نێردرابوون بەدەست بخەن، لە یەکێک لە نامەکاندا ئەو دەرفەتەیان دۆزیەوە کە بەدوایدا دەگەڕان. ئەویش وەڵامدانەوەی ڕۆژنامەیەک بوو بۆ خستنەڕووی فرۆشتنی خانووە لادێیەکەی لە «ئۆریلانس» شارێکی جوان و ڕازاوە "باخەکەی فەرانسە"ی «لۆیەر ڤاللی». ئیدی ئەوان نامەیەکیان بەو سندوقی پۆستەدا نارد کە لە ڕاگەیەندراوی ڕۆژنامەکدا هاتبوو، نرخێکی واشیان تێدا نووسیبوو، کە زیاتر بوو لەوەی ئەو بۆ خانووەکەی داوای دەکرد؛ ئەوان نووسیبوویان گوایە بازرگانی نەمساوین و بە دوای شوێنێک بۆ پشوودان دەگەڕێن. مادلین فێرایلیش وەڵامی دانەوە، ناوونیشانی ماڵەکەی دانێ؛ هەر زووش دوای ئەوە، ئەوان نامەیان بۆ نووسییەوە، کە سەردانی خانووەکەیان کردووە و بە دڵیان بووە. ئینجا دیدارێکیان لەگەڵدا دانا تا لە ٢١ی حوزەیرانی ١٩٦١دا لە هۆڵی هوتێلێکی گەورەی پاریس بۆ سەر و سەودایەکە یەکدی ببینن.

بە یەک دوو ڕۆژیش بەر لە ڕۆژی دیدارەکە، پیاوەکانی ئیسەر گەیشتنە پاریس، یەک لەدوای یەک هەر یەکەش بە چالاکییێکەوە. ئەوان ترومبێل و خانووی پارێزاویان لە نێو پاریس و گەڕەکی دەرەوەی پاریس

بەکرێگرتن، ڕێگەی هەڵاتنیشیان مسۆگەر کرد، بەڵگەنامە و کەرەستە و ئامرازەکانیشیان حازر کردن، لە ئیسڕائیلیشەوە شارەزای گەڕان و پشکنین و لێکۆڵینەوەیان هێنان.

هەروەها ئیسەر بڕیاریدا کە باشترین شێواز بۆ ئەوەی «رەث بن دایڤید» والێبکا نهێنییەکان بدرکێنێ، لەڕێی کوڕەکەی خۆی بوو. «ئارییێل» لە فێرگەی کۆمەڵگەی یەشیڤا لە ئیسڕائیل دەیخوێند، پێدەچوو شت زۆر لەبارەی یوسێلەوە بزانێ. ئیسەر بڕیاریدا لەگەڵ ڕفاندنی دایکی لە فەرەنسادا کوڕەکەیشی بگرێ. ئارییێل ئۆرسەدۆکس بوو، بەڵام ئەوەندەی دایکی پێداگیری ئایین نەبوو. ئیسەر سیستمێکی پەیوەندی وای دانا، کە بە هۆیەوە بتوانن ئاژانەکانی مۆساد لێپرسینەوە لە «ڕەث» هاوزەمان بکەن لەگەڵ ئەو پرسیارانەی لە ئیسڕائیل لە کوڕەکەی دەکەن، تا بتوانن وەڵامی کوڕەکە بۆ پرسیارکردن لە دایکەکە بەکاربێنن.

هەر بەڕاستیش، لە بەیانی ڕۆژی ٢١ی مانگدا، خانمە بەژندرێژە شۆخەکە بەنێو ڕاڕەوی هۆڵی هوتێلەکەی پاریس هاتەژوور. ئەوە خۆی بوو، مادلین فێرایل.

ژنە ڕووخۆشە فەرەنسییەکە خۆی بە دوو نەمساویەکە ناساند کە لەوێ چاوەڕێیان دەکرد. یەکێک لەوان «هێر فوبەر» و ئەوی دیکەش «هێر شمیدت» بوو. خانمەکە بە ئینگلیزییێکی بێ گرێوگۆڵ قسەی دەکرد، هەروەها بەسەر زمانی ئەڵمانیشدا زاڵ بوو. خانمەکە هەرگیز گومانی لە ناسنامەی ئەو کڕیارەی بەردەمی نەکرد. هەر زووش سەبارەت بە فرۆشتنی خانووەکە گەیشتنە ڕێککەوتن، بەڵام پارێزەری کڕیارەکان دواکەوت. «فوربەر» لە ڕێی چاوە تەلەفۆنەکانی هوتێلەکە زەنگی بۆ لێدا؛ کاتێکیش گەڕایەوە لای خانمەکە، گوتی کەوا پارێزەرەکە بە داوای لێبوردنەوە عوزرخوازی دەکا. ئاخر ئەو لە ماڵەکەی خۆیدا بەهۆی چەند

شتێکەوە دەستی بەستراوە. داوای کردبوو بچنە ماڵەکەی ئەو لە «چانتیلی»، کە زۆر لە شارەکە دوور نییە و ناوونیشانەکە و وردەکاری ئاراستەی ڕێگەشی دابووە کابرا. ئەو حەزی لێبوو هەر ئێستا لە پێشوازییان دابێ و هەموو کاغەزە پێویستییەکانیش لەوێ واژۆ بکەن.

ئینجا «فوربەر» پرسی: "دەی بڕۆین؟"

مادلینەش قایل بوو. ئەوان سواری ئەو تڕومبێلە بەکرێگیراوەی دوو نەمساویەکە بوون، بەرەو ڤێلای پارەزێرەکە لێیان خوڕی. بەڵام خەریک بوو ژنە فەرەنسییەکە ببێتە مایەی شکستپێهێنانی سەرلەبەری ئۆپەراسیۆنەکە. سووکان لە دەستی «فوربەر»ی ئاژان بوو، جوانی و نازداری «مادلینە» سەرنجی ڕاکێشا، خەریک بوو لە گڵۆپی سووری ترافیک بدا. فیکە تیژەکەی پۆلیس بە ئاگای هێنایەوە. ئینجا ئەفسەرە قەڵەوەکەی پۆلیس بە تووڕەبوونەوە بەرەو ڕوویانەوە هات، فیکەکەی لێدایەوە ئاماژەی بە گڵۆپە سوورەکە کرد.

«فوبەر»یش تڕومبێلەکەی وەستاند، چەندین ختووکەی بۆ هاتن. باشە ئێستا چی بکا؟ خۆی لە وڵاتێکی بێگانە دایە، بە کاغەزی ساختەکراو تڕومبێلێکی بەکرێگیراو لێدەخوڕێ و ژنێکیشی پێیە کە دەیەوێ بێسەروشوێنی بکا. ئاخر ئەگەر کارتێک وەربگرێ، ئەوا لە پۆلیس داوای لەسەر بەرز دەکرێتەوە، هەروەها... بەڵام مادلین فێرایل کە هۆکاری بەزمەکە بوو، هەر خۆیشی چارەسەری کێشەکە بوو. ئەوسا سەری خۆی لە تڕومبێلەکە دەرهێنا، بە ڕووخۆشی بەڕووی پۆلیسەکە پێکەنی و بە گفتێکی شیرینەوە بانگی کرد" جەنابی پۆلیس، ئەم پیاوە گەشتیارە. لە وڵاتێکی بیانییەوە هاتووە، لەگەڵ ژنێک سەفەر دەکا، هەوڵ دەدا چیرۆکی خۆش خۆشی بۆ بگێڕێتەوە... بەدڵنیاییەوە لە ڕەوشەکە تێدەگەی، تکایە

لێیخۆش بە..." ئەفسەری پۆلیسیش سەرنجی بۆ سەر ژنەکە ڕۆیشت، لێیگەڕا ئاژانە سامگرتییەکە بەبێ کارتی سزادان بە ڕێگەی خۆیدا بڕوا.

پاشان زۆری نەبرد ترومبێلەکە گەیشتە نێو شارە جوانەکەی چانتیلی، ئەو شوێنەی گوایە "پارێزەرەکە"ی لێدەژیا. ئەوسا گەیشتنە ڤیلای کابرا و لێی چوونەژوور و لەبەردەم دەروازەکەشدا ترومبێلەکەی ڕاگرت. هەردوو بزنسمانەکە بە ڕێزەوە یارمەتی میوانەکەیان دا لە ترومبێلەکە دابەزێ، تا ناو خانووەکە ڕێنوێنیان کرد، کە دەرگەکە کرایەوە، خانمەکە لێ چووەژوور.

خانمەکە بردرایە "نووسینگەی پارێزەرەکە."

بەشە ڕۆڵی پارێزەرەکە لە لایەن «یاکۆڤ کارۆز» نمایش کرا. ئەویش بە فەرەنسی گوتی : مەدام، تۆ بۆ ئەوە لێرە نیت کە باسوخواسی خانووەکەی ئۆریلانس تاوتوێ بکەی، بەڵکو بۆ پرسێکی دیکە لێرەی."

- "چی؟ ئەوە چی ڕوودەدا؟"
- "من دەمەوێ دەربارەی منداڵەکە، دەربارەی یوسیل شوماخەر قسەت لەگەڵدا بکەم."

لەو ساتەدا، دوو پیاوی دیکە لەلای ژنەکە پەیدا بوون. کاتێکیش ژنەکە گەڕایەوە دوا، پەی بەوە برد کە هەر دوو "بزنسمانەکە" بێ سەروشوێن بوون. ئیدی ترس دایگرت.

- بە سرتە هەنسکێکەوە بە فەرەنسی گوتی: "من بەداوەوە بووم!"
- کارۆزیش پێیگوتەوە: "مەدام، تۆ کەوتویتە دەستی پیاوەکانی دەزگەی هەواڵگری ئیسرائیلی."

هاوزەمان لەو ساتەدا، ئەفسەرانی پۆلیس «ئارییێل بن دایڤد»، کوڕی ژنە فەرەنسییەکەیان لە شاری «بیر یاکۆڤ» لە ئیسرائیل گرت.

✡ ✡ ✡

لە «چانتیلی»یشدا، «کارۆز» ڕووی لە خانم «رەث بن دایڤد» کرد و پێیگوت: "خانم، تۆ دەستت لە ڕفاندنی یۆسیل شوماخەردا هەبووە. ئێمە منداڵەکەمان دەوێتەوە!"

ژنەکەش لێبڕاوانە وەڵامی دایەوە: "من هیچ شتێک نازانم و هیچ شتێکیش ناڵێم." دوای ئەو سەرسام بوونە سەرەتاییە، هەندێ بە خۆی هاتەوە. «کارۆز»یش خوشکی ژنەکەی کە پەرستارێکی ڕاهێنراو بوو لەگەڵ خۆی هێنابوو، بۆ ئەوەی لە باری ناکاودا یارمەتی بدا.

ئیسرائیلییەکان لەوە گەیشتبوون، کە خانم ڕەث دوایین چڵە ئومێدی دەستیانە. بەڵام دەشیانزانی، ئەو ژنە پۆڵایینە بە ئاسانی ناڕووخێ، ئیدی شەوەکە بە هێمنی بەسەرچوو. پاشان ژنەکە درایە دەستی یەهودیت نسیاهوو، کە تازە لە لەندەنەوە گەیشتبووە فەرەنسا. نیسیاهوش بە باشی ڕەفتاری لەگەڵدا کرد، وەک ژنێکی دیندار مشووری پێویستییەکانی خواردن. ئاژانە ژنەکە کتێبی نوێژ و درود و مۆمی بۆ ڕۆژی شەممە (شابات) بۆ هێنا و هەر بەخۆیشی خواردنی بۆ ئامادەکرد. ئەو لاباڵە خانووەی ئەو لێیبوو، هیچ پیاوی تخوون نەکەوت[145]. ژنە پەرستارەکەش لە ژووری تەنیشتیان بوو.

ئینجا لێکۆڵینەوەکە دەستپێکرا. ژنە لە دین وەرگەڕاوەکە بە چەندین سەعات بۆ لێکۆڵینەوە لەبەردەم ئاژانەکاندا بوو، بە زۆریش یاکۆڤ کارۆز

[145] تخوون نەکەوت: نزیک نەکەوت.

و ڤیکتۆر کۆهین بوون، کە بە زمانی فەرەنسی پرسیاریان لێدەکردن. خانمەکە پێی سەیر بوو کەوا ئیسرائیلییەکان ئەو هەموو شتەی لە بارەوە دەزانن؛ بەڵام نەسەلمێنانە ڕەتی کردەوە هیچ زانیارییێک لەبارەی یوسیلەوە بدرکێنێ. "من هیچ ناڵێم." بەردەوام هەر ئەو قسەیەی دووبارە دەکردەوە. ژنەکە بە ڤیکتۆر کۆهنی گوت «فلیک»[146] کە بە فەرەنسی جوێنێکە بە واتای "هەیتە". ژنەکە نەسەلمێنانە هەموو پەیوەندییێکی بە ڕفاندنی کوڕەکە ڕەتکردەوە. ڤیکتۆر کۆهین دواتر وا باسی لێکۆڵینەوەکەی کرد: "من دەستم پێکرد باسی هەموو جۆرە بابەتێکی لەگەڵدا بکەم. هەر بۆ ئەوەی نەرمی بکەم. من ویستم لێتێبگەم، چۆن کچێکی کریستیانی بۆتە جوویێکی ئۆرسەدۆکسی وا توندڕۆ. ئاخر ئەمانە دوو جیهانی لەیەک جیاوازن. لە سەرەتاوە کاتێ قسەمان کرد، سوور بوو لەسەر ئەوەی کە دەبێ ژنێک بێت و لەگەڵمان دانیشێ. پاشان قایل بوو بە تەنیا لەگەڵمدا بمێنێتەوە، بەڵام بە مەرجێک دەرگەکە لەسەر گازەرای پشت بێ.

یەکێک لە لێکۆڵەرەوەکان ئەرکێکی ناخۆشی هەبوو بەوەی چەندین تۆمەتی بە ڕوودا بدا، هەر بۆ ئەوەی دۆخە ئارامییەکەی لێ بشێوێنێ. پیاوەکانی مۆساد منێی[147] ئەوەیان دەکرد، بەڵکو ژنەکە لە ئەنجامی تۆمەتبارکردنەکدا تەڕدەستانە کاردانەوە بنوێنێ و هەڵبچێ، شتەکانی لێ تێکەڵ و پێکەڵ بێ و مەبەستی نەبێ شتێک بڵێ، بەڵام لێی دەربچێ؛ دەکرا هاوزەمان لێکۆڵینەوەکەی ئیسرائیل لەگەڵ کوڕەکەی دەکرا، لەدژی ئەو بەکاربێنن.

---

[146] flic

[147]: منێ کردن: خواخوابوونی شتێک، بەهیوابوون.

هەر بەڕاستیش وا کەوتەوە، لێکۆڵینەوە لەگەڵ ئارییێل بن دایڤید بەرهەمی لێپەیدابوو. بەرپرسی لێکۆڵینەوەکان لە ئیسرائیل «ئاڤراهام هادار» بوو، کەسێکی ڕەقی ناجۆر کە کۆدەناوەکەی «پاشۆش[148]» بۆقژە[149] بوو.. کابرا بە مێردمنداڵەکەی گوت کەوا دایکی خۆی داوە بەدەستەوە. "دایکت دانی بە هەموو شتێکدا ناوە." وای بە کوڕەکە گوت: "درۆیەکانی تۆ ناتگەیەنێتە هیچ شوێنێک. دەی ڕاستی بڵێ!"

ئینجا دوای ماوەیەکی کەم، کوڕەکە ڕووخا. پێیگوتن دەزانی کە چی بەسەر منداڵەکەدا هاتووە و دەیەوێ لەو بارەیەوە قسە بکا: "ئەمەش تەنیا ئەگەر من و دایکم پارێزراو بین."

« پاشۆش» پێیگوتەوە؛ "ئەوە بۆ تۆ!" ئینجا دەستبەجێ کوڕەکەی بردە لای «ئامۆس مانۆر»، سەرۆکی دەزگەی شاباک. کاتێکیش لە نووسینگەکەی چوونە ژوور، «مانۆر» بەسەر ئاریلیدا قیژاند: "پاشۆش هەر بەڵێنێکی پێدابی، لای من پەسەندە. دەی هەنووکە پێمان بڵێ، کوڕەکە لە کوێیە؟" ئاریلێش شڵەژا. لەدواییدا دانی پێدا نا کەوا دایکی ئەو، یۆسێلی بە قاچاخ لە ئیسرائیل بردۆتە دەرەوە، بردنەکەش بەوە بووە یۆسێلی لەبن بەرگی کچێک بەناوی «کلاودیا» بردووە. دایکەکە ناوی یۆسیلی کردۆتە کلاودیا، هەروەها ڕۆژی لەدایکبوونەکەشی گۆڕیوە بۆ ئەوەی لەگەڵ تەمەنی یوسیلدا بگونجێ، کوڕەکە دەیزانی کەوا یۆسێلیان بردۆتە وڵاتی سویسڕا.

دەستبەجێ دانپێدانانەکەی ئارییێل ڕەوانەی «چانتلی» کرا و لێکۆڵەرەوەکان ڕاستییەکانیان ڕووبەڕووی «ڕەث بن دایڤید» کردەوە.

---

[148] Pashosh

[149]بۆقژە: نەخۆشییەکی منداڵانە، کێم و خویزا و لە پێست دەردەچێ و مایەی تەنینەوەشە.

"ئاریێل لەبن دەستماند دایە." ڤیکتۆر کۆهین بوو وای بە دایکەکە گوت. "ئەو ڕووبەڕووی سزایەکی قورس دەبێتەوە. ئەو دانی بە هەموو شتێکدا ناوە. باشە تۆ خەمی ئەوەت نییە، کە چی بەسەر کوڕەکەتدا دێ؟"

خانمەکەش بە منگەمنگەوە: "ئەوە چیدیکە کوڕی من نییە." ئەو هێشتا نەڕووخابوو. لێکۆڵەرەوەکانیش بەخۆیان نەبوو، بەو هێزە لە بن نەهاتووەی خۆڕاگری ژنەکە سەرسام نەبن.

پاشان وردە وردە ڕەوشەکە وایلێهات، هی بەرگری لێکردن نەبوو. دیاربوو چارەسەرەکە نزیک کەوتبێتەوە، لەگەڵ ئەوشدا هێشا لێکۆڵەرەوەکان هەستیان دەکرد، ڕەنگە کۆتایی دۆزەکە نوشستی بێ.

لە کۆتاییدا ئیسەر بڕیاری دا، کاتی ئەوە هاتووە کە سەرەداوەکە بەخۆی بگرێتە دەست.

✡ ✡ ✡

لە ژوورێکی بەتاڵی تاریکدا، ئیسەر هارل و رەث بن دایڤد لەسەر مێزێک ڕووبەڕووی یەکدی بوونەوە. هەندێ لە ئاژانەکانی مۆساد لە پشتیان وەستابوون؛ کۆهن و کارۆزیش وەک وەرگێڕ لەوێ بوون.

ئیسەر لێبڕاوانە لەو بڕوایەدابوو، کە ئەو ژنەی بەردەمی بە شێوەیەکی گردەبڕانە بڕیاریداوە بۆ هیچ گەف و هەڕەشەیەک شل نەکا. بە گوێرەی لێکدانەوەی ئیسەر تاکە هۆکاری نەرمبوونی، هەر ئەوەیە بە شێوەیەکی ڕەوشتییانە قەناعەتی پێبهێنێ. ئاخر خانمەکە کەسێکی دیندار بوو، هەرواش بوو، لە دوایدا دەیویست گوێی لە لۆژیک بێ، چونکە لە بنەڕەتەوە ژنەکە سەر بە جووە ئەرسەدۆکسە توندەڕەوەکان نەبووە و ئەو ئەم مەزهەبگەرایە توندڕەوەشی هەر لەگەڵ لەدایکبوونەوە تێکەڵی خوێنی نەبوو، واتە لە دەمارەکانی نەدەگەڕا. ئەو خانمێکی تێگەیشتوو بوو،

ژنێکی زۆرزان بوو، هەرواشی پێخۆش بوو بەو جۆرە ناوی بهێنن و دەنگی بدەن.

ئینجا ئیسەر لە کاتی گفتوگۆکردندا هەموو وشەیەکی خۆی هەڵدەسەنگاند و وردەکارییانە هەڵی دەبژاردن: "من نوێنەرایەتی حکوومەتی ئیسرائیلی دەکەم. کوڕەکەشت هەموو شتێکی پێگوتووین. ئێمەش زانیاری زۆرمان لە بارەی تۆوە لەبەردەستە. بەشی هەرە نهێنییەکانی تۆ بۆ ئێمە ئاشکرایە. داوای لێبووردنیش دەکەین کە ئێمە بە زۆرەملێ تۆمان ڕاکێشی ئێرە کردووە. تۆ بوویتە جوو، جووایەتیش واتە ئیسرائیل. بەبێ ئیسرائیلیش، جوایەتی نامێنێ. ڕفاندنی یوسیلیش زەبرێکی کوشندەی لە کۆمەڵگەی دینداری ئیسرائیلی داوە. ئاخر هەستی دژبەرایەتی لە بەرانبەر ئۆرسەدۆکسەکاندا وروژاندووە. دەکرێ تۆ ببیتە مایەی خوێنڕشتن و براکوژی. خۆ ئەگەر کوڕەکە نەگەڕێنیتەوە، ئەوا دەرەنجامەکەی هەر خوێننامەیە. دەی هەر بیرێک لە منداڵەکە بکەرەوە ئاخۆ چی بەسەردێ! لەوانەیە نەخۆش بکەوێ، تەنانەت بشمرێ. باشە ئەوکات تۆ بە چ ڕوویێک دایبابی کوڕەکە دەبینیتەوە؟ خۆ لەو حاڵەتەدا تا لە ژیاندا ماوی، تارماییەکە وەک سایە بەدواتدا دەخشێ و خەو و خۆراکت لێ حەڕام دەکا. ئیدی گەردنت هەرگیز ئازاد نابێ!

"تۆ هەم خانمی و هەم دایکیشی. خۆ ئەگەر یەکێک ڕای لە چۆنیەتی بەخێوکردنی کوڕەکەت نەبێ و و بیڕفێنێ، هەستت چۆن دەبێ؟ ئایا شەو خەوت لێدەکەوێ؟

"ئێمە دژی دیین نین. تاکە ئامانجی ئێمە دۆزینەوەی منداڵەکەیە. هەر کاتێکیش منداڵەکەمان کەوتەوە دەست، تۆ ئازادی، کوڕەکەشت ئازاد دەبێ، ئەوسا ئیسرائیلیش لەنێو خۆیدا دیسان یەکدەگرێتەوە."

ئیسەر سەیری ڕووخساری خانمەکەی کرد، کە لە ناخیدا خۆدژایەتییێکی لێ پەیدابوو. دیاربوو لەبەر هەستە دژبەیەکەکان دەناڵێنێ. ژنەکە لەبارێکی گرژی و هەستیاردا بوو، وەک کەسێکی بەهێز کە پێشتر ئامادەی هیچ سازشێک نەبوو، ڕووبەڕووی خۆی دەبووەوە.

ئاژانەکانی مۆسادیش لەوێ ڕەقوتەق وەستابون هەروەک ئەوەی کۆتەڵ بن. ئەوانیش لەو بڕوایەدا بوون، دۆخەکەی لە ترکزە دایە، ساتی ئاشکرابوونی ڕاستییەکان لە ئان و ساتی خۆیدایە.

ئینجا «ڕەث» سەری بەرزکردەوە. "ئاخر من چۆن بزانم کە تۆ هەر بەڕاستی نوێنەرایەتی دەوڵەتی ئیسرائیل دەکەی؟ چۆن متمانەت پێبکەم؟"

ئیسەریش بەبێ چاو لەیەکدان، پاسپۆرتە دیپلۆماتییەکەی دەرهێنا، کە بەناوە ڕاستەقینەکەی خۆی بوو، دایە دەستی خانمەکە.

پیاوەکانی ئیسەر بەم کارە تاسان. تۆبڵێ شێت بووبێ؟ ئاخر چۆن دەبێ ناوە ڕاستەقینەکەی خۆی و پاسپۆرتەکەی بداتە دەست ئەو خانمە، ئەمە سەرچڵییێکی لە ئەندازە نەهاتووە! ئیسەریش هەستی وابو هەر تەنیا بەو کارەی، بەوەی ناوی ڕاستەقینەی خۆی نیشان بدا و لە بەردەمیدا وەک کەسێکی ڕاستگۆ دەربکەوێ، لەوانەیە دەرفەتی سەرکەوتنی هەبێ.

بۆ ساتێکی دێژ ژنەکە سەیری مۆرە ئیسرائیلیەکەی سەر پاسپۆرتەکەی کرد. لێوەکانی خۆیشی گەزین، دڵۆپە خوێنێکیشی لە دەم هاتەخوار. ئینجا منگەیەکی لێوەهات: "من چیدی بەرگە ناگرم. من خەریکە تێک بشکێم...."

پاشان لە هیکەوە سەری خۆی بەرزکردەوە. "منداڵەکە لە لای خێزانی «گێرتنەر»ـە، ماڵیشیان لە ژمارە شەست و دووی شەقامی «پێن ستریتە»، لە بروکلین، لە نیویۆرک. لەوێ پیدەڵێن «یانکەلە»."

بە بیستنی ئەم قسەیە، ئیسەر یەکسەر لەشوێنی خۆی هەڵسا. پێی گوت: "هەر کاتێک دەستمان بەکوڕەکە گەیشت، تۆ ئازادی."

ئینجا ژوورەکەی بەجێهێشت.

✡ ✡ ✡

ئیدی هێڵی بروسکە و بروسکەی ئاگاداری لە نێوان ئۆرشەلیم، نیویۆرک و واشنتن گەرم بوو. ئیسەر زەنگی بۆ «ئیسرائیل گور ئاری»، ئەفسەری ئاسایشیی سەر بە ئەرکە دیپلۆماتەکانی ئیسرائیل لە باکووری ئەمریکا کرد، لێدا. کە بنکەکەی لە نیویۆرک بوو. بە دوای ناوونیشانی بروکلیندا ڕۆیشت؛ بروسکەی لێدایەوە کەوا ناوونیشانەکە ڕاستە و ئەوێش ماڵباتی گرێنتەری لێدەژی لە ناوەندی گەڕەکێکی ساتمارە هاسیدییەکان. لە ئۆرشەلیمیش بروسکەیەک بۆ ئاڤراهام هارمان، باڵوێزی ئیسرائیل لە واشنتن لێدرا، ڕاسپێردرا پەیوەندی بە FBIیەوە بکا و داوایان لێبکا منداڵەکەی بدەنەوە و بیگەڕێننەوە ئیسرائیل.

«گور ئاری» هەر بەخۆی پەیوەندی بە هاوتایەکەی لە نێو FBIدا کرد و هەموو وردەکارییێکی دایێ، تەنانەت "منداڵەکە چی دەخوا و چیش لەبەردەکا" هتد.. ئاژانەکەی FBIیش وەڵامی کابرای ئیسرائیلی دایەوە: "باشە ئەگەر ئەو هەموو زانیارییەی لە بارەوە دەزانی، بڕۆ بەخۆت بیهێنەوە." گور ئاریش بەرسڤی دایەوە: "دەی ڕێگەم پێبدە." بەڵام ئاژانەکەی FBI ڕەتی کردەوە ڕێگەی پێبدا.

ئیدی بروسکەی وروژێنەر بەسەر بنکەی سەرەکی ئیسەردا ڕژان. ئەمریکاییەکان دوودڵن، ئەمە وەڵامی «گور ئاری» و باڵوێزەکەیان بوو لە واشنتن. ئەوان پرسیاری ئەوە دەکەن، ئایا ئێوە بە تەواوی دڵنیان کەوا منداڵەکە لە ناوونیشانە دیارکراوەکە دایە؟ باشە چی دەبێ ئەگەر بەسەر

ماڵەکەمان دادا و کوڕەکەش لەوێ نەبوو؟ FBI هەندێ لەو بارەیەوە لەبەر ئاماژەکانی هەڵبژاردنی کۆنگرێسمانەکان خۆپارێزە. ئاخر ئەو مەزهەبە جووەی ساتمار بە تەنیا جڵەوی سەدهەزار دەنگی لەبەردەستدایە و میریش نایەوێ سەرچڵێیک بنوێنێ لەخۆیان دوورخاتەوە.

لە «چانتلی»دا خەریکبوو ئیسەر حەوسەڵەی خۆی لەدەست بدا. بۆیە لەنیوەی شەودا دەستی دایە تەلەفۆن و فەرمانیدا: "دەی هێرمانم لە واشنتن بۆ وەرگرن."

کاتێکیش پەیوەندیەکە گرێدرا، ئەو دەهری ببوو. "هێرمان،" ئەو وەها هاتە قسە: "ئەوە «ئیسەر هێرل»ە قسەت لەگەڵدا دەکا. من دەمەوێ هەر ئێستا پەیوەندی بە ژەنەڕاڵ ڕۆبەرت کەنەدی، داواکاری گشتییەوە بکە، بەناوی من پێی بڵێ کە FBI دەستبەجێ منداڵەکە ڕادەست بکاتەوە."

هێرمانیش سەری سوڕما. "ئیسەر، ئاخر چۆن دەبێ بەو شێوەیە قسە بکەی؟" ئەو ئاماژەیەکی وای پێدا، لەوانەیە دەزگەی هەواڵگری نهێنی ئەمریکا چاودێری وتووێژەکەیان بکا.

ئیسەریش پێیگوتەوە: "باشتریش. خۆ من هەر بۆ تۆ قسە ناکەم." ئەو خواخوای بوو ئەمریکییەکان گوێیان لێڕاگرتبێ، ئیدی ئەو بەخۆڕاپەرمووانەی وایان لێبکا بجووڵێن.

هێرمان هەر دوودڵ بوو، هەوڵیدا ئیسەر لە ئاڵۆزییە دیپلۆماتییەکان ئاگادار بکاتەوە.

ئیسەر خێرا قسەکەی پێبڕی: "خۆ من داوای ڕاوبۆچوونت لێناکەم. پێیان بڵێ ئەگەر دەستبەجێ کوڕەکە نەدەنەوە، ئەوا خۆیان بەرپرسیارن لە هەر شتێک کە ڕوویدا."

دوای یەک دوو سەعاتی دیکە، تەلەفۆن بۆ ئیسەر کرایەوە. تەلەفۆنەکەش لە نیویۆرکەوە بوو. کاربەدەستانی کۆنسولخانەکە خەبەریان دایەوە، کە ڕۆبەرت کەنەدی دەستبەجێ دەستبەکار بووە. تیمێک لە ئاژانەکانی FBI بە یاوەری ئەفسەری ئاسایشەکەی ئیسرائیلی چوونەتە «برۆکلین». هەر بەڕاستیش کوڕەکەیان لەوێ لە ماڵەکە دۆزیەوە و لەگەڵ خۆیان گەیاندویەتیانە ماڵێکی پارێزراو. منداڵەکەش یوسێل بوو.

هەواڵنێرێکی گەنج بەناوی « ئیلی ویسل» (کە دواتر بوە هەڵگری خەڵاتی نۆبل[150]) تەلەفۆنی بۆ گور ئاری کرد. "بیستوومە تۆ منداڵەکەت دۆزیوەتەوە." گور ئاریش، سوێندی خواردبوو شتەکە بە نهێنی بهێڵێتەوە، لێبڕاوانە هەواڵەکەی ڕەتکردبووەوە. ئیدی «ویسل» لەسەر ئەمە، چەندین ساڵ بوو هەر لێی خۆش نەبوو.

✡ ✡ ✡

لە چواری تەمموزی ١٩٦٢دا پشووی نیشتمانی ئیسرائیل بوو، لەو ڕۆژەدا فڕۆکەیەک کە یوسیلی هەڵگرتبو لە فڕۆکەخانەی «لۆد» نیشتەوە. میدیاش بە پەرۆش و جۆشەوە هەوڵی کاریگەری دەزگەی هەواڵگری نهێنییان بڵاوکردەوە. ئیسرائیل بوە یەکەمین دەوڵەت کە سەرتاپای خەڵکەکەی بەم جۆرە بە دەزگە هەواڵگریە نهێنییەکان کارانگاز بن و خۆشیان بوێن.

---

[150] Elie Wiesel (١٩٢٨-٢٠١٦) نووسەرە جوویێکی ئەمریکی کە لە ڕۆمانیا لە دایک ببوو. نووسەر، پرۆفیسۆر، چالاکوانی سیاسی، ڕزگاربووی دەستی هۆلۆکۆست و هەڵگری کۆمەڵێ پاداشت و خەڵات، لەوانە خەڵاتی نۆبل بۆ ئەدەبیات لە ١٩٨٦.

«شلۆمۆ کۆهێن زیدۆن»، پارێزەرێکی بەناودەنگی ئیسرائیلی بوو، نامەیەکی بۆ بنگۆریۆن نووسی، سوپاس و پێزانینی بۆ دۆزینەوەی کوڕەکەی تێدا بەیان کردبوو. لە نامەکدا هاتبوو: "پێویستە تۆ سوپاسی دەزگەی هەواڵگریەکەمان بکەی، لەپێش هەمووانیشدا مەزنەکەیان، کە ڕۆژ و شەوی بۆ ئەرکەکە تەرخانکردبوو، لەگەڵ ئەوەی یاریدەرەکانی بێهیوا ببوون، ئەو کۆڵی نەدا، تا ئەو کاتەی منداڵەکەی لە حەشارگە دەرهێنا، ئەمەش کارێکی ئاسان نەبوو."

کاتیک هەمووان لە ئیسرائل ئاهەنگیان بە هۆی ڕزگارکردنی یوسێلەوە گێڕا، ئیسەر لە پاریس، لە کاتێکدا پیاوەکانی ئاهەنگێکی خنجیلانەیان بۆ سازدا. یەکێک لە ئاژانەکان پێکێکی هەڵدا و گوتی: "بە خۆشی منداڵەکە کە گەڕایەوە نیشتمان، بە خۆشی ئەو پیاوە پۆلاینە کە دۆزیەوە. بە خۆشی ئەو دەوڵەتەی کە دەزانێ چۆن هاوولاتییەکانی خۆی بپارێزێ." ئاژانێکی دیکەش دیارییەکی پێشکەش ئیسەر کرد، کە بەچکە بەورێکی بووکەڵە بوو؛ ئینجا یاوەرەکانی دیارییەکان گەیاندەوە تەلئەبیب، چونکە شەوگەلێکی زۆربوو نە ڕازا بوو[151].

✡ ✡ ✡

ئیدی خۆ هەر ئەوە نەبوو کە کوڕەکە دۆزرایەوە، بەڵکو سەرلەبەری ڕاستییەکە کەوتە بەر تیشکی.

هەموو شتەکەش بە برووسکەیەک دەستی پێکرد.

[151] نەڕازابوو: نە خەوتبوو.

له بەهاری ١٩٦٠دا، لەو کاتەی یوسێل بە دزییەوە لە سەر خاکی ئیسرائیل لە یوشیڤا[152]یەک دەبردرایە یەکێی دیکە، «ڕەث بن دایڤید» لە ڕابی مایزشەوە برووسکەیەکی بۆهات: "دەستبەجێ وەرە ئۆرشەلیم. من شتێکی باشم بۆ تۆ هەیە." کاتێکیش خانمەکە دەگاتە، بۆی دەردەکەوێ کە "شتەکە" ئەرکێکی نهێنییە، ئەویش: بە قاچاخ ئاودیوکردنی یوسیلە لە ئیسرائیل بۆ دەرەوە.

خانمەکەش گەڕایەوە فەرەنسا، دەستکاری پاسپۆرتەکەی خۆی کرد، ناوی کوڕەکەی خۆی لە کلاودی بۆ کلاودینا گۆڕی و ڕۆژی لە دایکبوونیشی لە ١٩٤٥ەوە کردە ١٩٥٣. ئەوسا هەم ناوەکەی خۆی و هەم جلەکانی خۆیشی گۆڕین، ناوەکەی خۆی کردە مادلین فێیرا. ئەو لە ئیسرائیلەوە بەرەو گینوای ئیتالیا فڕی، لەوێوە بلیتی ژوورێکی لەسەر پشتی کەشتییێک کڕی کە ڕێبوار و کۆچبەری بەرەو ئەوێ هەڵگرتبوو.

لە گینوادا ژنەکە دەستی بە یاریەکە کرد، لەوێ هەر بە ڕێکەوت؛ کیژێکی هەشت ساڵانەی خێزانێکی کۆچبەری دۆزیەوە. لەو کاتەی سەر کەشتیەکە دەکەوتن، ڕێبوارەکان کێشەی قەڕاپەستانێی هەگبە و شتومەکەکانیان هەبوو، ئیدی مادلینای شۆخ و شەنگ دەستی کیژۆڵەکەی گرت و لەگەڵ خۆیدا بردیە سەر پشتی کەشتییەکە. ئەفسەرەکانی دەزگەی کۆچی ئیتالیاش سەیری پاسپۆرتەکەیان کرد و تێبینیان کرد کەوا لەگەڵ کچێکی بچکۆلانەدا سەرکەوتووە. لە ئیسرائیلیش هەمان بەزمی دووبارەکردەوە، لەوێش بەرپرسانی کۆچ و کۆچبەران بە دروستی ئەو سەرنجەیان دا، کە خانمەکە لەگەڵ کیژێکی بچکۆلانەدا لە کەشتییەکە دابەزیوە.

[152] کۆمەڵگەی مەزەبگەری جوو.

یەک دوو ڕۆژ دواتر، مادلین لەگەڵ "کلاودیای کچی" لە فڕۆکەخانەی لۆدا سواری فڕۆکە بوو. تومەز ئەو کلاودیایە هەر یوسیل شوماخەر بوو، بەڵام جلی کچانەیان لەبەرکردبوو هەندێکیش ڕووخساریان گۆڕیبوو.

بەم جۆرە یوسێل نزیکەی دوو ساڵ لە قوتابخانەیەکی ئەرسەدۆکسە توندڕەوەکان لە سویسرا و فەرەنسادا بەسەربردبوو. بەڵام کاتێک گەڕان و سوڕان بە دوای یوسێل لە ئیسرائیل پەرەیسەند، دیسان مادلین دەرکەوتەوە، ئەمجارەیان لە قوتابخانەی «میوکس» کە منداڵەکە لەوێ بە ناوی میناحیم، منداڵێکی هەتیوی خێزانێکی سویسرِی تۆمارکرابوو.

دیسان لەوێ جلی کچانەی کردنەبەر و ئەمجارەیان بەرەو ئەمریکا فڕین. لەوێ لەلایەن مەزنی مەزهەبی ساتمار، و لەلایەن ڕابی «جویل تایتەلبوم»یارمەتیان درا، لەوێ ڕاستەوخۆ بردیانە ماڵی گرێنتەر و ناوی کوڕەکەش بووە «یانکل»، ئیدی وەک ئامۆزایەکیان ناسرا کە لە ئەرجەنتینەوە هاتووە و بۆ ماوەیەکی زۆریش لەلای ئەوان دەمێنێتەوە.

شارەزایانی مۆساد پەییان بەوە برد کە ڕایەڵەی تەونی نهێنی جووە ئەرسەدۆکسە توندڕەوەکان بە هەموو ئەمریکا و ئەورووپادا بڵاوبۆتەوە، دەکرێ بە ڕێکخراوێکی هەواڵگری نهێنی هەرە باش بەراورد بکرێ. زۆرینەشیان بە ڕەث بن دایڤدەوە سەرسام بوون. ئەو توند بە ڕێساکانی پیلانگێڕیەوە نووسابوو: هەرگیز ناوونیشانێکی جێگیری نەبوو، هەموو کاغەز و بەڵگەنامە پێویستییەکانی خۆی لەنێو جانتای خۆیدا بوون، بە

ئاسانی ناسنامەی و جلەکانی خۆی دەگۆڕین. ئەو ژنە فەرەنسییە «ماتا هاری[153]» جیهانی ئەرسەدۆکسی بوو.

لە کاتێکیش هەموو ئیسرائیلیەکان بە گەڕانەوەی شادمان بوون کە یوسێل گەڕێندراوەتەوە لای دایک و باوکی، خانم «ڕەث بن دایڤید» هەستی بە تێکشکان کرد و بەزی. بە هەنسکەوە بە برادەرەکانی خۆی گوت: "ئەز تاوانبارم. من ناپاکیم لە دۆزەکەمان کرد. هەرگیز ناتوانم لەخۆم خۆش بم. من گەنجینەیەکی بەهاداری متمانەم هەبوو، نەشمتوانی بیپارێزم."

مادلین فێرایل/ ڕەث بن دایڤید بەو هەموو توانستانەی ئەوەندە بەسەر ئیسەرەوە کاریگەر بوو، داوای لێکرا بێتە ڕیزیکانی مۆسادەوە. بەلام کار لەکار ترازابوو. ڕەث گەڕایەوە ئۆرشەلیم و لەنێو کۆمەڵگەی ئەرسەدۆکسە توندڕەوەکاندا ون بوو. پاش سێ ساڵ بەسەر ڕووداوەکەدا، مێردی بە ڕابی «ئامرام بلاو» کرد، کە تەمەنی حەفتا و دوو ساڵ دەبوو، سەرۆکی «نێوترای کارتا» توندڕەوترین لقی نێو پەڕگیرەکان بوو.

هەر پاش نۆ ساڵ لە دوای ئەو گۆبەندەدا، ئیسەر و یوسیل شوماخەر یەکیان بینییەوە، ئەو کاتەی یەکێک لە نووسەرەکانی ئەم کتێبە ئاهەنگێکی لەسەر شەرەفی ئیسەر ڕێکخستبوو، یوسیلیشی بانگهێشت کردبوو. یوسل، هەنووکە بۆتە سەربازێکی پلە یەکی هۆبەی تانک، دەستی ئیسەری گوشی و ڕایگەیاند: "من لە ناخەوە کاریگەرم. ئیسەر هارل گرنگترین

---

[153] Mata Hari (١٨٧٦-١٩١٧) ناوی تەواوی خۆی مارگرێتا گرتیودا بوو، سەماکارێکی زۆر سەرنجڕاکێشی سەردەمی خۆی بوو، دوایی بووە سیخوڕ، لە ماوەی جەنگی یەکەمی جیهانیدا ڕۆڵێکی ناوازەی لە دنیای سووسەکارییدا بۆ ئەڵمانەکان بینیوە. وەرگێر

کەسی نێو ژیانم بووە. بەبێ ئەو من هەرگیز ئێستا لە نێو ئێوەدا نەدەبووم."

## بەندی هەشت: پاڵەوانێکی نازی لە خزمەتی مۆساددا

لە ڕۆژێکی گەرمای خنکێنەری ئابی ١٩٦٣دا، دوو پیاو لە نووسینگەی کۆمپانیایەکی ئەندازیاری لە «مەدرید» وەژوورکەوتن و داوای دیتنی خاوەنەکەیان کرد، کە نەمساوییێک بوو بە ناوی «ئۆتتۆ سکۆرزینی». ئەوان وەک دوو ئەفسەری هەواڵگری «ناتۆ» خۆیان بە «سکۆرزینی» ناساند، پێیانگوت لەسەر ڕاسپاردە ژنە دوورکەوتووەکەی هاتوون. داوایەکیان خستە بەردەم کابرای نەمساوی کە پێینەدەکرا ڕەتی بکاتەوە ...

ئیدی هەر زوو کابرا بزنسمانە عەینەک لەچاوەکە تێگەیشت، میوانەکانی هەموو شتێکی لەبارەوە دەزانن بە ڕابردوویەکەشییەوە. لەمیانەی جەنگی دووەمی جیهاندا «سکۆرزینی» ئەفسەرێکی SSەکان و یەکێک لە پاڵەوانە مەزنەکانی ئاڵمانیای نازی بوو - ئەگەر مەزنترینیشیان نەبووبێ -. ئەو پیاوە بەژندرێژە ڕووخۆشە وەزشوانە، دەموچاوی جێبرینی یاری شمشێربازی پێوەبوو، کابرا ببووە فەرماندە ئەهریمەنێکی نەترس کە چەندین ئۆپەراسیۆنی ناوازەی بە ئاکام گەیاندبوون. لە ١٢ی ئەیلوولی ١٩٤٣شدا لەگەڵ بەتالیۆنی پەرەشووتوانەکاندا لەسەر لوتکەی «گران ساسۆ»، بەرزترین لوتکەی زنجیرە چیای «ئاپنۆ»ی ئیتاڵی دابەزیبوو، لەوێوە بەسەر هوتێلی «کامپۆ ئیمپراتۆر»یاندا دا، ئەو شوێنەی کە دیکتاتۆر «بێنیتۆ مۆسۆلینی» لەلایەن حکوومەتە نوێیە دژە نازییەکەی ئیتالیاوە بەندکرابوو. «سکۆرزینی» کاپتنی SSەکان، مۆسۆلۆنی ڕزگارکرد و هێنایە لای هیتلەری سوپاسگوزار. ئەویش لە پاداشتدا مەدالیای بەکاپتنەکە بەخشی و پلەکەشی بەرزکردەوە. لە شەڕی بەلجیکا و لە کۆتایی ١٩٤٤یشدا، «سکۆرزینی» ببوە کۆلۆنێلێکی وافن SS،

لەبەرەی پێشەوە لەگەڵ بیست کەسێک لە پیاوەکانی و بە جلی سەربازی ئەمریکییەوە کارێکی وایان بەسەر ڕیزەکانی هاوپەیمانان هێنا، تووشی پشێوی و شڵەژان و پاشاگەردانی زۆری کردن. ئۆپەراسیۆنەکانی ئەو وایان لێکرد ببێتە "کوشندەترین پیاوی ئەورووپا". لەدوای جەنگ و لە دادگای «داچاو»یشدا بە تاوانبار لەقەڵەم نەدرا، بۆیە بۆ ئیسپانیا کۆچی کرد، لەوێ لەژێر سایەی دەسەڵاتی «فرانکۆ»ی دیکتاتۆردا حەسایەوە و هەر لەوێش کۆمپانیای ئەندازیاری خۆی دامەزراند.

ئەوێ ڕۆژێ لە ١٩٦٣دا، میوانەکانی کاتی خۆیان بە وردە قسە نەکوشت. یەکێک لە دوو کەسەکە بە ئەڵمانییەکی ڕەوان پێیگوت: "ئێمە کتومت سەر بە هێزەکانی ناتۆ نین. لەڕاستیدا، ئێمە سەر بە دەزگەی هەواڵگری نهێنی ئیسرائیلین." پیاوەکانیش «ڕافی ئیتان» و «ئاڤراهام ئاهیتوڤ»ی بەرپرسی وێستگەی مۆساد بوو لە ئاڵمان.

«سکۆرزینی»یش ڕەنگی لێ زەرد بوو. ئاخر هەر ساڵێک پێشتر بوو، ئیسرائیلییەکان ئەدۆلف ئایخمانیان ڕفاندبووە ئیسرائیل و ملیان بە قەنارەوە کردبوو. ئێستاش بەدوای ئەودا هاتوون؟ هەرچەندە لە دادگادا بە پەرێزپاکی دەرچووبوو، بەڵام هەندێک دەیانگوت؛ ئەو لە «کریستالن ناختی» نۆڤێمبەری ١٩٣٨دا بەشداری لە بەشێک لە سوتاندنی کەنیشتەی جووەکاندا کردووە.

بەڵام ئەو پیاوە بەژنکورتەی لەبەرانبەری دانیشتبوو، ترسەکەی ڕەواندەوە. پێیگوت: "ئێمە پێویستیمان بە کۆمەکی تۆ هەیە. ئێمە دەزانین تۆ پەیوەندی باشت لەگەڵ میسردا هەیە." ئینجا هەردوو پیاوەکە بۆ کۆلۆنێلە پێشووەکەی SSەکانی ڕوونکردەوە کە دەوڵەتی ئیسرائیل پێویستی بە کۆمەکەکەکانی پیاوەکە هەیە.

✡ ✡ ✡

له ٢١ی تەمموزی ١٩٦٢داو هەر دوو هەفتە دوای گەڕانەوە سەرکەوتووانەکەی یوسیل بۆ ئیسرائیل، میسر جیهانی بە هەڵدانی چوار ڕۆکێتی دوورهاوێژ سەرسام کرد. دوو لەو مووشەکانە جۆری الظفر (سەرکەوتوو) بوون کە مەداکەیان ٣٥٠ مایل بوو. ئەو موشەکە زلە بە ئاڵای میسری وەرپێچرابوو، بە شانازیەوە لە ساڵڕۆژی شۆڕشەکەیان و لە٢٣ی تەمووزدا بەنێو شەقامەکانی قاهیرەدا بە تەپڵ و موزیکی ئاهەنگەوە دەڕۆیشت. سەرۆک جەمال عەبدولناسریش لەنێو ئاپۆرا جۆشخواردووەکەدا خۆی هەڵدەکێشا، بەوەی ئەو ڕۆکێتە دوورهاوێژانە دەتوانن ئامانجی خۆیان لە "باشووری بەیروت"دا بپێکن.

باشووری بەیروت، ئەم دەستەواژەیە بووە مایەی تاسان و وروژانی سەرکردەکانی ئیسرائیل. کەواتە هەر بەڕاستی مووشەکە دوورهاوێژەکانی ناسر دەتوانن هەر ئامانجێکیان بوێ لەنێو ئیسرائیلدا بپێکن. ئەمەش بووە مایەی سەرسامییێکی تەواو بوو بۆ ئیسرائیل، هەروەها لە دالانی دەسەلاتی توورەی ئیسرائیلدا، بە ڕەقییەوە قسە دەرهەق «ئیسەر هارل» کرا. ڕەخنەکان وەها بوون؛ لەکاتێکدا ناسر خەریکی ڕۆنانی مووشەکە کوشندەکانی بوو، ئیسەری بچوکیش بە ڕاوەدوونانی یوسییلەوە سەرقاڵ بوو. لەکاتێکدا مەترسییکی دژوار ڕوبەڕووی هەبوونی دەوڵەتی ئیسرائیل بووەتەوە، کەچی باشترین ئاژانەکانی ئیسەر لە کۆمەڵگەیەکی یەشیڤیاوە بۆ یەکێکی دیکە بە دەمامکی ئۆرسەدۆکسە پەڕگیرەکان دەگەڕێن و دەسووڕێن. ئیدی بنگۆریۆنی نیگەران بانگی ئیسەر هاڕلی کردەوە، ئەویش بەڵێنی پێدا بەزووترین کات هەموو زانیارییێک سەبارەت بە پرۆژەی میسرییەکانی بۆ بێنێ. ئینجا ئیسەر گەڕایەوە نووسینگەکەی، باشرین ئاژانەکانی بە ئەرک ناردن،

سیخوڕە دووسەرەکان و سووسەکارەکانی لە میسر بەگەڕخستن. هەر بە ڕاستیش ئەوەبوو، بە کەمتر لە ماوەی مانگێک لەدوای هەڵدانی مووشەکە دوورهاوێژەکەی میسر، لە ١٦ی ئابدا، ئیسەر بەخۆی و ڕاپۆرتی وردەکارییەکانەوە گەڕایەوە لای داود بنگۆریۆن.

ئیسەر ڕاپۆرتەکەی خۆی دا، کە مووشەکەکان لەلایەن زانا ئاڵمانەکانەوە دروستکراون.

لە ١٩٥٩دا ناسر بڕیاریدابوو جبەخانەیەکی چەکی نائاسایی (ناتەقلیدی) بنیاد بنێ. ئەو، ژەنەڕاڵ محەمەد خەلیل، کە فەرماندەیەکی پێشووی دەزگەی هێزەکانی هەواڵگری بوو، کردە بەرپرسی نووسینگەی بەرنامەی تایبەتی سەربازی، بۆ ئەوەی بەوپەڕی نهێنییەوە پەرە بە چەکی تازە بدا وەک فڕۆکەی شەڕکەر، ڕۆکێت و ڕۆکێتی دوورهاوێژ، هەروەها ماددەی کیمیایی و تیشکدەرەوەکانیش. بۆ نووسینگەکەش بودجەیەکی قەبە تەرخانکرا.

یەکەم ئەرکی خەلیلیش ئەوەبوو، ئەو پیاوانە بدۆزێتەوە، کە ئەو جۆرە چەکانەی بەڕاستی بۆ بەرهەم بهێنن. دەیزانی بۆ ئەم مەبەستە ڕوو لە کوێ بکا.

پیاوەکانی خەلیل بە سەدان کەسیان لە زانا و شارەزا ئەڵمانەکان هێنانە ڕیزی بەرنامەکەی خۆیان و زۆر لەو کەسانەش لە کارخانەی مووشەکەکان و ئاشکراکردنی لێکۆڵینەوەی پەیمانگە و تاقیکردنەوەکانی ئەڵمانیای نازی کاریانکردبوو. زیاتر لە سێسەد ئاڵمان لەڕێی مووچەی زۆر، پاداشت، ئیمتیازاتی تایبەتییەوە فریودران و هێندرانە میسر بەڵکو یارمەتی «ناسر» بدەن تا دامەزراوە نهێنییەکەی بخاتە سەر پێ.

یەکەمین هەوڵیش، کارخانەی ژمارە ٣٦ بوو، لەوێدا فڕۆکە دروستکەرێکی پیتۆڵ بە ناوی «ویلی مێسەر سخیمت» فڕۆکەیەکی شەڕکەڕی میسری لەیەک دا. ئاخر ناوبراو لە ماوەی جەنگی دووەمی جیهاندا مامۆتکی فڕۆکە شەڕکەرە دژوارەکانی هێزی ئاسمانی نازی بوو. محەمەد خەلیلیش لە ٢٩ی نۆڤێمبەری ١٩٥٩دا گرێبەستی لەگەڵ «مێسەر سخیمت» واژۆ کرد.

دوەمین وێستگەیان بە کۆدی ژمارە ١٣٥ ناسراو بوو، ئەویش ئەندازیارێک بوو ناوی «فێردیناند براندەر» کە مەکینەی جێتی بۆ فڕۆکەکانی مێسەر سخمیت دروست دەکردن. «براندەر» چەندین ساڵی لە ڕووسیا بەسەربردبوون؛ دوای گەڕانەوەشی بۆ ئاڵمان، محەمەد خەلیل لە ڕێی «د. ئێکارت»ی بەڕێوبەری «داملەر بێنز»دا پەیوەندی بە فێردیناندی ئەندازیارەوە کرد.

بەڵام شتە هەرە نهێنییەکەیان کارخانەی ٣٣٣ی ناوچەیەکی دوورەدەستی بیابان بوو. لەوێدا منداڵە پەڕجووەکانی هیتلەر خەریکی دروستکردنی چەکێکی پەڕجوو بوون، ئەویش ڕۆکێتی مامناوەند مەودا بوو.

بەگوێرەی سەرچاوەکانی ئیسەر، پڕۆژەی میسرییەکان لە دیسامبەری ١٩٦٠دا گەیشتە خاڵی وەرچەرخانی خۆی. لەو مانگەدا فڕۆکەیەکی u2ی چاودێری ئەمریکی وێنەیەکی لە ئاسمانەوە هی باڵەخانەیەکی زۆر قەبەی دیمۆنای ئیسرائیلی گرتبوو، کە پێدەچوو کارلێککەری ناوەکی لێبێ. ئیدی میدیای جیهانی ئەو دۆزینەوەیان بەسەر هێڵی درشت بڵاوکردەوە؛ ئاخر کەس بڕوای بە لێدوانی فەرمی ئیسرائیل نەدەکرد بەوەی شوێنەکە کارخانەیەکی ڕستن و چنین بێ. میسر و چەندان دەوڵەتی عەرەبی دیکە هەڕەشەی توندیان لە ئیسرائیل کرد. بەڵام خۆ بەتەنیا هەر گەف و هەڕەشە بەس نەبوو، بەڵکو میسر هیوای وابوو پڕۆژە نهێنییە

ناوەکییەکەی ئیسرائیل بە بەرجەستەکردنی پەرەپێدانی چەکی نائاسایی خۆی لاشەڕ بخا.

سەرۆکی دەستەی زانا دروستکەرەکانی ڕۆکێتەکانی میسر، پرۆفیسۆر «ئێوگن سانگەر»ی بەڕێوەبەری پەیمانگەی لێکۆڵینەوەی «جێت پرۆپولژن» بوو لە «شتوتگارت». دوای جەنگی دووەمی جیهانی، «سانگەر» یەک دوو ساڵان لە فەرەنسەدا ژیا، لەوێدا ڕۆکێتی ڤێرۆنیکی، کە وێنەیەکی لەبەرگیراوەی ڕۆکێتی v2ی ئاڵمانی بوو، بەرهەمهێنا. ئینجا بە خۆی و یاریدەرەکەی -پرۆفیسۆر پاول گورکە- کە شارەزایەکی ئەلەکترۆن ڕێنوێنی بوو لەگەڵ «ولفانگ پیلز» ئەندازیاری پێشووی دامەزراوەی «پینیومدە»، ڕۆکێتی v-2ی ئاڵمانیان پەرەپێدا، هاتە وڵاتی میسر. ڕێنوێن و شارەزایەکی دیکەی ڕۆکێت بەناوی «د. هانز کلاینواختەر» کە ڕێنوێنی سیستمی پەرەپێدانی ڕۆکێتی دوورهاوێژی لە شاری «لۆراخ»ی سەر سنوری سویسرا دەکرد، یارمەتی هاوڕێکانی دا و ئەویش هاتە میسر. هۆبەی پیشەسازی کیمیایی بەرنامەکە لەلایەن ئەفسەری پێشووی SS، «د. ئەرمین دایو» بەڕێوەبردرا. ئاڵمان و میسریەکان چەندین کۆمپانیایان بەناوەکانی «ئینترا، ئینترای بازرگانی، پاتوێخ و لیندا» دامەزراند تا پارچە و کەرەستە و یەدەگ بۆ پڕۆژەی ڕۆکێتەکە بهێننە میسر. بەڕێوبەری «ئینترا هاندل»یش «د. هاینز کرەگ» بوو، کە لە پەیمانگەی جێت پرۆپیولژنی لە شتوتگارت بەڕێوە دەبرد.

حەسەن کامیل، ملیۆنلێری میسری لە سویسڕا دەژیا، ئەویش وەک ڕوخسارێکی کارەکە خرایە لیستەکە و پێیوە پەیوەست بوو. لەڕێی ئەو سەرمایەدارەوە، میسرییەکان دوو کۆمپانیای خوازراویان لە سویسڕا دامەزراندن. یەکێکیان بەناوی «MECO و MTP» کە بۆ کاری ماشێن و دەزگە و ماتۆڕ و تۆربایین و پۆمپ کڕین بوون، ئەرکەکەشیان

دابینکردنی کەرەستە و ئامێرە سەرەکییەکان بوو، کە لەلایەن شارەزا و پسپۆڕەکانەوە داوا دەکرا. بەڕێوبەری ئەو سێ کۆمپانیایانە هەریەک لە مێسەر سخمیدت، براندنەر و حەسەن کامیل بوون.

لە ١٩٦١دا، سانگەر و سەدان لە ئەندازیار، تەکنیکار و کرێکارە میسرییە خۆجێییەکان دەستیان بە دروستکردنی ڕۆکێتە دوورهاوێژەکان کرد. بەڵام لە کۆتایی ساڵەکەدا، حکوومەتی ئاڵمان پەیوەندییێکی نهێنی پرۆژەکەی میسر و پەیمانگەی فڕۆکەوانی جێت پرۆپیولژن لە شتوتگارت بەدیکرد. ئینجا دەسەڵاتدارە ئاڵمانەکان سانگەریان ناچارکرد دەست لەکار بکێشێتەوە، بگەڕێتەوە ئاڵمان و هەموو چالاکییەکانیشی سڕبکا. دوای ئەو پرۆفیسۆر «پیلز» سەرۆکایەتی پرۆژەکەی میسری گرتەئەستۆ.

لە تەمموزی ١٩٦٢شدا، کارخانەی ٣٣٣، ٣٠ ڕۆکێتی دوورهاوێژی بەرهەمهێنا. چوار لەو ڕۆکێتانە لەبەردەم حەشاماتێکی گوڵبژێر و میوانانی حکوومەت و ڕۆژنامەوانان، هەڵدران؛ بیستەکەی دیکەش بە ئاڵای میسرییەوە بە نمایشێک لەنێو شەقامەکانی قاهیرەدا سوڕێندرانەوە.

کاتێکیش لە مانگی ئابدا، ئیسەر هاتە لای بنگۆریۆن، نامەیەکی پێبوو کە لە پیلزەوە بۆ «کامیل عزاب» بەڕێوبەری کارخانەی ٣٣٣ ناردبوو، ڕافی ئیتان و پیاوەکانی توانیبوویان نامەکە کۆپی بکەن. لە نامەکەدا لە بەرانبەر ٣،٧٠٠،٠٠٠ فرانکی سویسڕیدا داوای کەرەستە و ئامێری پێویست بۆ دروستکردنی پێنجسەد ڕۆکێتی دوورهاوێژ لەجۆری ٢ و چوارسەد ڕۆکێتیش لە جۆری ٥ کرابوو.

نۆسەد ڕۆکێتی دوورهاوێژ! ڕاپۆرتەکەی ئیسەر بووە مایەی نیگەرانییێکی زۆر لەنێو وەزارەتی بەرگری ئیسڕائیلدا. شارەزا ئیسڕائیلییەکان دڵنیابوون لەوەی میسرییەکان بەنیاز نین ئەو ڕۆکێتانە هەر بەکڵاوەی

تەقینەوەی ئاسایی (تەقلیدی) باربکەن و هەڵیانبدەن؛ ئاخر خۆ نابێ بە ملیۆنان دۆلار بۆ دروستکردنی ڕۆکێتەکان خەرج بکەن تا هەر یەکەیان نیو تۆن لە دینامێت هەڵبگرێ و بیتەقێنێتەوە. خۆ دەکرێ فڕۆکەی بۆمباهاوێژ ئەم کارە بە ڕادەیەکی دەقاودەقتریش جێبەجێبکا. شتەکە ڕوون و ئاشکرا بوو، کە میسرییەکان بە نیازن ڕۆکێتەکان بە کڵاوەی ناوەکی یان هەندێ ماددەی قەدەغەکراو بەگوێرەی قانونی نێودەوڵەتی، وەک گازی ژەهراوی، بەکتریا یاخود تیشکی رادیۆئەکتیڤی کوشندە هەڵبدەن.

بەگوێرەی لێکدانەوەی ئیسەر، زانا ئاڵمانەکان کار لەسەر نەخشەیەکی شاراوە بۆ لەناوبردنی ئیسڕائیل دەکەن: ئەوان چەکێکی شووم پەرەپێدەدەن، ڕۆکێتی زەبەللاح دروست دەکەن، کڵاوەی تیشکدەرەوەی دەخەنەسەر بۆ ئەوەی "هەموو زیندەوەرێک لەناو ببا" و هەوای ئیسڕائیل بۆ چەندین ساڵ ژەهراوی بکەن؛ ئەوان کار لەسەر تیشکی دژوار و هەر دژەکردەوەیەکی جەهەننەمیانە دەکەن.

دواتر ژەنەڕاڵ «زڤی زوور»ی سوپاسالار دانی پێدا نا: "ئێمە ئەوانمان زۆر بەهەند هەڵگرت. زاناکانی ئێمەش ئارەزوومەند بوون، نەیاندەزانی چۆن لەگەڵ ئەو زانیاریانەدا بجووڵێنەوە." ویڕای ئەوەش ئیسڕائیلییەکان پڕۆژەیەکی دژواری میسرییەکانیان دۆزییەوە، کە هێشتا ئاڵمانەکان لەوەدا سەرنەکەوتبوون، سیستمێکی ئاراستەکردنی دەقاودەق بۆ ئامانجشکاندنی ڕۆکێتەکان بدۆزنەوە. تا ئەو کاتەش بەسەر بەربەستەکەدا زاڵ نەبن، ناکرێ ڕۆکێتەکان هەڵبدرێن.

ئیسەر هارلیش ئەو پیاوەی جاران نەمابوو، کە پیاوەکانی دەیانناسی و پێیەوە کارانگاز بوون. لە کاتی گرتنی ئایخمانەوە، ئەو بەتەواوی گۆڕابوو. ئەو پیاوە سەر ساردە، کە بەوە ناسرابوو گوایە دەمارەکانی لە پۆلان، هەنووکە ئەڵمانیای بە دوژمنی هەمیشەیی ئیسرائیل و گەلی جوو داناوە. شێلگیرانە لەو بڕوایەدا بوو، کە حکوومەتی هاوچەرخی ئاڵمان پشتگیری زاناکانی خۆی لە وڵاتی میسر دەکا، بۆئەوەی ئیسرائیل لەناوببەن. *ڕامساد*[154]ەکە داوای لە بنگۆریۆن کرد هۆشداری بداتە «کۆنراد ئادیناوەر»ی ڕاوێژکاری ئاڵمان و داوای لێبکا دەستبەجێ چالاکی زاناکانی بوەستێنێ. بنگۆریۆنیش ئەمەی ڕەتکردەوە. ئاخر زۆری بەسەرنەچووبوو، کە ئاڵمان قەرزێکی قەبەی بە بڕی ٥٠٠ ملیۆن دۆلار دابووە ئیسرائیل بۆ پەرەپێدانی بیابانی نەقەب؛ بنگۆریۆن و ئەدیناوەریش پەیوەندییێکی دۆستانەی متمانەدار و ڕێزلێگیراوی لەگەڵ یەکدیدا پەیداکردبوو؛ ئەدیناوەر و وەزیری بەرگرییەکەی «فرانز جۆزێف شتراوس» ژمارەیەکی زۆر چەکی تازەیان دابووە ئیسرائیل کە بایی ملیۆنان دۆلار بوون، چەکەکەش لە تانک، تۆپ، هەلیکۆپتەر، فڕۆکە پێکهاتبوو، هەر هەمووشی بە بێ پارە بوو، ئەمەش هەوڵێکی نهێنیانە بوو لەبەرانبەر هۆلۆکۆست و تاوانەکانی ئاڵمان دژی گەلی جوو. بنگۆریۆن متمانەی بە حکومەتی هەنوکەیی ئاڵمان هەبوو، نەیدەویست ئەو پەیوەندیانەی بەو جۆرە تۆمەتبارکردنانە و بە داوای دەستوەردان لە کاروباری میسردا تێکبدا. بنگۆریۆن فەرمانی بە «شیمۆن پێرێز» جێگری وەزیری بەرگری کرد، نامەیەکی تایبەتییانە بۆ «شتراوس» بنووسێ و بەنهێنی داوای یارمەتی لەو بارەیەوە لێبکا.

---

[154] Ramsad ڕامساد: وشەیەکی عیبرییە واتای سەرۆکی مۆساد دەگەیەنێ.

بەڵا خۆ ئەم کاردانەوەیە بۆ ئیسەر بەس نەبوو، ئەو کەسەی بڕیاریدا بوو لای خۆی هەڵمەتێک بۆ لەباریەک هەڵوەشانەوەی چالاکی ئاڵمانەکان لە میسردا سەرپێ بخا.

لە ١١ی ئەیلوولی ١٩٦٢دا و لە سەعات ١٠:٣٠ بەیانیدا، کەسێکی ڕەشپێست کە بیچمێکی ڕۆژهەڵاتیانەی هەبوو، چووە نووسینگەی «ئینترا» لە شیللەرشتراسەی میونیخ. کارمەندی پرسگەکە کە لەگەڵێدا چووە لای بەڕێوبەری کۆمپانیاکە، لای «د. هاینز کرەگ»، پێیڕاگەیەندرا کەوا لەلایەن کۆلۆنێل «نەدیم»ـەوە نێردراوە، نەدیم ئەفسەرێکی میسری بوو، پەیوەندییێکی تۆکمەی لەگەڵ «کرەگ»دا هەبوو. دوای نیو سەعات کابرای میسری لەگەڵ «د. کرەگ»دا لە نووسینگەی کۆمپانیاکە هاتنەدەر. خاتوونە کارمەندێکی کۆمپانیای گەشتەفڕینی یەکگرتتوی عەرەب، بینی هەردوو پیاوەکە چوونە لای نوسینگەی بلیتی فڕۆکەوانییەکە. کارمەندەکە دوا کەس بوو کە دکتۆر کرەگی بینیبێ.

بۆ سپێدەی ڕۆژی دوایی، خێزانی بەڕێز کرەگ ئاگاداری پۆلیسی کرد، کەوا مێردەکەی ونبووە. دوو ڕۆژ پاش خەبەردانەکە، پۆلیس مارسیدسەکەی «د. کرەگ»ی لە گەڕەکێکی دەرەوەی شاری میونخ دۆزییەوە. ترومبێلەکە لە قوڕ شێلدرابوو و تانکیەکەشی یەک دڵۆپ بەنزینی تێدا نەمابوو. تەلەفۆنێکی نەناسراو بۆ پۆلیس کرا، ڕایگەیاند: "دکتۆر کرەگ مردووە." بەڵام هەندێ زانیاری دیکە لە سەرچاوەی دیکەوە هاتن، بڕوای وایان دروستکرد کە دکتۆرە ناوبراوەکە لەلایەن ئاژانەکانی مۆسادەوە بۆ ئیسرائیل ڕفێندرا بێ. ئەمڕۆش گومان لەوەدا نییە کە «کرەگ» مردووە.

لە ٢٧ی نۆڤێمبەریشدا، «هانەلۆر وێندە» سکرتێری پیلز لە کارخانەی ٣٣٣دا، زەرفێکی ئەستووری لە پۆستەکەدا بینی؛ نێرەرەکەش پارێزەرێکی

ناسراوی هامبۆرگ بوو. هانەلۆریش زەرفەکەی کردەوە. تەقینەوەیەکی زۆر بە دەنگ نووسینگەکەی هەژاند. خانمە سکرتێرەکە بە سەختی بریندار بوو، هەرزو گەیاندیانە نەخۆشخانە. لەوێ چەندین مانگ مایەوە تا لەکۆتاییدا بە کوێری و بەکەڕیی و ڕووخساری شێواوەوە خەستەخانەکەی بەجێهێشت.

بۆ ڕۆژی پاشتر، پۆستێکی دیکی قەبە، کە "کتێب"ی لەسەر نووسرابوو گەیشتە کارخانەی ٣٣٣، کاتێک کارمەندێکی میسری زەرفەکە دەکاتەوە، یەکسەر دەتەقێتەوە و پێنج کەس دەکوژێ. ناوونیشانی نێرەرەکەش کە دەزگەی وەشانێکی شتوتگارد بوو، دەرچوو ساختە کرابوو.

بۆ ڕۆژانی دواییش ئەو پۆستە تەقینەوانە بەردەوام دەگەیشتن. هەندێکیان لە ئاڵمانەوە نێردرابوون، ئەوانی دیکەش لەنێو میسر خۆی. هەندێکیان تەقینەوە و زیانیان گەیاند، هەندێکیشیانە لایەن شارەزا بەئاگا میسرییەکانەوە پووچەڵ کرانەوە کە کارخانەی ٣٣٣ی ئاگاداری کردبوونەوە. ناسنامەی نێرەرەکان بە فەرمی دیارنەکرا، بەڵام میسری و ڕۆژنامەنووسەکان دڵنیابوون لەوەی کەوا بۆمبەکان لەلایەن ئاژانەکانی مۆسادەوە ئامادەکراون و نێردراون. زۆر دوای ئەوە، ئەوە سەلمێندرا کە زۆر لەو نامە بۆمبڕێژکراوانە لەلایەن "هەڵمەتی سیخوڕ"ەوە نێردراون. ئەویش ئاژانێکی ئیسرائیلی بوو بەناوی «زییڤ گور ئاری» کە لە میسر لە ژێر دەمامکی «ولفانگ لوتز»دا دەستبەکار بوو، ئەو ناوەش ئەڵمانێک بوو کێڵگەیەکی ئەسپ بەخێوکردنی لە نزیک قاهیرە هەبوو. خۆی بە ئەفسەریکی پێشووی SS دانابوو، لە قاهیرەشدا بەخۆی و ژنە ئەڵمانیەکەی پەیوەندییەکی تۆکمەی لەگەڵ کەسایەتییە باڵاکانی کۆمەڵگەی میسری و فەرماندە سەربازیەکانی گرێدابوو.

نامە بۆمبارەکان بە تەواوی زانا ئاڵمانەکانی شەپرێو کردبوو، هەستییان کرد ژیانیان لە مەترسی دایە. زۆر لەو زانایانە زەنگی نەناسراویان بۆ هات و هەڕەشە لە خۆیان و ماڵ و منداڵیان کرا ئەگەر هاتوو لەسەر پڕۆژەکەی میسر بەردەوام بن. ڕێکاری زۆر توند و نهێنی لە سێ لە "کارخانەکانی" میسری و هاوکارانیان لە ئەورووپا گیرانەبەر. کاتێک زاناکان سەردانی ئەورووپایان دەکردەوە بە کۆمەڵ دەهاتن و دەچوون و ئەفسەرانی ئاسایشی ئاڵمانیش یاوەرییان دەکردن. ئەم ڕێگرە کردەییە بووە مایەی ڕزگارکردنی ژیانی پرۆفیسۆر «پلز» لەو گەشتەی لە کۆتایی ١٩٦٢دا بە ئەورووپادا کردی. ئاخر گرووپێک لە کەسانی غەوارە لە ئاڵمان و ئیتالیادا بەدوایەوە بوون، بەڵام ئەو دەرفەتەیان بۆ هەڵنەکەوت لێی نزیکببنەوە.

ئیسەر هەموو پایز و زستانەکەی ١٩٦٢ لە ئەورووپا بەسەربرد، لەوێ سەرپەرشتی چەندین ئۆپەراسیۆنی مۆسادی کرد کە مەبەست لێی وەرگرتن و بەدەستهێنانی زانیاری زۆر ورد و دەقاودەق بوو. ڕافی ئیتان لەوەدا سەرکەوت دزە بکاتە نێو ئەرکێکی دیپلۆماسی کە سەروکاری لەگەڵ نامە و پۆستی زانا ئاڵمانەکاندا هەبوو. ئەو جۆرە ئۆپەراسیۆنانەش لە شتە پێشنۆرەکانی ئەو بوون. ئەو لەو بارەیەوەوە گوتی: "ئەم کارانە زۆر باشترن لە هێنانەڕیزی ئاژانەکان. کاتێ تۆ ئاژانێک دەهێنیتە ریزی مۆساد، دەبێ مەشقی پێبکەی، واشی لێبکەی خۆی بسەلمێنێ، لە شوێنێک دەیچێنی و کاتێکیشی پێدەدەی تا ڕایەڵەی تەونی پەیوەندییەکانی خۆی ڕابچێنێ... بەڵام خوێندنەوەی نامەو پۆستی دوژمنەکەت زۆر باشترە، چونکە دەستبەجێ بە ئاکام دەگەی و کەرەستەی دەستی یەکەمت دەستگیر دەبێ."

بۆ ئەو ئۆپەراسیۆنە نائاساییانە، ئیتان پێویستی بە هەندێ لە ئامرازی ئەلەکترۆنی زۆر ئاڵۆزوبڵۆز و پێشکەوتوو هەبوو، نەشی دەزانی ئەو جۆرە شتانە لە کوێ پەیدابکا. ئەو ئامێرانە کە سی ئای ئەی و دەزگە هەواڵگرییەکانی دیکە بەکاریان دەهێنان، لە عەمبار و کۆگاکانی بازاڕی ئاساییدا دەستنەدەکەوتن. کاتێکیش لە نووسینگەی پاریس ڕۆژنامەی دەخوێندەوە، شتێکی ورد سەبارەت بە «مایەر لانسکی» کە جوویێکی بزێو و چەتوون و بەدناو بوو، بەرچاو کەوت، کابرا ڕاهێنەری چەقاوەسووەکانی میامی بوو لە ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا. لە کەڵکەڵەی ئەو ئاژانە فێلبازەدا دەرفەتێک پەیدابوو. یەکسەر دەستی بۆ تەلەفۆن برد و پێیگوتن: "«مایەر لانسکی»م لە «میامی»یەوە بۆ وەربگرن!"

پاش سێ خولەک، «لانسکی» هاتە سەر هێڵی تەلەفۆن. ئیتانیش پێیگوت: "مایەر، شالۆم. من ئیسرائیلیم، لە پاریس کاردەکەم، بۆ دەوڵەتی ئیسرائیل پێویستیم بە یارمەتی تۆ هەیە."

"کێشە نییە." ئەمەش وەڵامی لانسکی بوو. "لە ماوەی مانگێکدا دێمە لۆزان لە سویسرا، با لەوێ یەکدی ببینین."

ئیتان لە لۆزان لاندسکی بینی و پێیگوت کە پێویستیان بە چی هەیە. لانسکیش ناوونیشانێکی دڵنیای لە شیکاگۆ دایێ. پێشی گوت: "ئەو، ئەو شتەت بۆ پەیدا دەکا، کە پێویستیت پێی هەیە." دوای هەفتەیەک، ئیتان بەفڕۆکە لە شیکاگۆ نیشتەوە و بەرەو ناوونیشانی کابرایەکە ملی لێنا. پاشان ئیتان قسەکانی وەها پوختکردنەوە: "ئەو ئامێر و کەلوپەلانەی لە کابراکەمان دەستکەوت بەکەڵکی ئۆپەراسیۆنەکانمان دژی زانا ئاڵمانەکان هات."

یەکێ لە ئۆپەراسیۆنەکان ناوێکی نوێی خستە بەردەم ئیسەر هارل، ئەویش: «د. ئۆتتۆ جۆکلیک» بوو. بەگوێرەی سەرچاوەکە، «جۆکلیک» زانایەکی نەمساوی پسپۆڕی تیشکی ناوەکی بوو. دەگوترا «د. جۆکلیک» لەلایەن پڕۆژە هەرە نهێنییەکەی میسرییەوە داواکراوە بۆ ئەوەی لە ماوەیەکی پێوانەییدا چەکی ناوەکی بەدەست بخەن. میسرییەکان بە تەمابوون کۆمپانیایەک بۆ ئەم مەبەستە لە نەمسا بۆ «جۆکلیک» دابمەزرێنن، تا کەرەستە و تفاقی تیشکی کارا، رادیۆئەکتیڤ بۆ پڕۆژەکەی «جۆکلیک» دابین بکرێ و پاشان بە کەشتی بۆ میسر بگوازنەوە. بەم جۆرە کۆمپانیای «ئاوسترا» لە «ئینترا»ی پێشتر جیاکرایەوە. ئەمەش بۆ ئەوەی نەبادا لەلایەن کاربەدەستە ئاڵمانەکان لێبکۆڵدرێتەوە. ئەرکی «جوکلیک» ئەوەبوو دوو تاقیکردنەوەی ناوەکی بۆ میسرییەکان ئەنجام بدا و چەندین بۆمبی ناوەکی کە بۆ کڵاوەی موشەکە دوورهاوێژەکان دەست بدەن، دروست بکا.

هەموو ئەم شتانە نیشانی دان، کە جوکلیک پیاوێکی چەند مەترسیدارە، بەڵکو لە مەترسیدارترین زانا ئەڵمانەکانە. ئیدی فەرمانێکی مەحکەم بۆ هەموو وێستگەکانی مۆساد لە ئەورووپا دەرچوو: «جۆکلیک» بدۆزنەوە!

بەڵام ئەوان بە ڕێکەوتێکی چاوەڕواننەکراو سەرسام بوون. ئاخر لە ٢٣ی ئۆکتۆبەری ١٩٦٣دا، کابرایەکی غەریبە لە دەرگەی باڵوێزخانەیەکی ئیسرائیلی لە ئەورووپای دا و داوای کرد ئەفسەری ئاسایشەکەیان ببینێ: "من ناوم «ئۆتۆ جوکلیک»ە. ئامادەم ڕاپۆرتی تەواوتان سەبارەت بە چالاکییەکانی هەوڵەکانی چەکی جەنگی لە میسر بدەمە دەستتان."

پاش دوو هەفتە، لەبن چاودێرییێکی توندی ئاسایشپارێزی، «جوکلیک» لە فڕۆکەخانەی ئیسرائیل دابەزی.

چەند مانگێک دواتر، کاتێ هەواڵی هەڵگەڕانەوەی «جوکلیک» ئاشکرا بوو، ڕاپۆرتنووسە ئەوروپییەکان نووسیان لەوانەیە بۆیە جوکلیک پەیوەندی بە ئیسرائیلییەکانەوە کردبێ، چونکە «هاینز کرەک»ی بەڕێوبەری کۆمپانیای «ئینترا» شوێنزر کرابوو. «جۆکلیک» پەیوەندییەکی دۆستانەی لەگەڵ کرەگدا هەبوو، ئەویش یەکێک بوو لەو ژمارە کەمانەی کە دەیانزانی جوکلیک چ ڕۆڵێکی لە بەرنامەی تایبەتی سەربازیانەی میسرییدا هەیە. کاتێکیش کرەگ ون بوو، جۆکلیک تۆقی. باشە چی دەبێ ئەگەر کرەگ لەلایەن ئیسرائیلییەکانەوە ڕفێندرابێ؟ ئەوکات پەردە لەسەر ئەرکە نهێنییەکە هەڵدەداتەوە. ئەوسا، جۆکلیک دەزانێ کە هەر مردووە مردووە. هەر بۆیە بڕیاریدا هێڵەکە ببەزێنێ و خۆی بداتە دەست ئیسرائیلییەکان؛ بەم شێوەیە وەک هیوای بۆ دەخواست، بەلای کەمی ژیانی سەلامەت دەبێ.

«جوکلیک» چوار ڕۆژ لە ئیسرائیلدا مایەوە. لەوێ لە شوێنێکی دابڕاوی تەواودا داندرا، لەژێر چاودێرییێکی تۆکمەی ئاسایشی مۆساددا بوو. ئیسەر بڕیاریدابوو بۆ دوو ئەرک بیقۆزێتەوە: وەک سەرچاوەیەکی هەواڵگری لەسەر پڕۆژەی میسرییەکان و وەک ئاژانێکی دووسەرە کە بگەڕێتەوە میسر و کار لەگەڵ مۆساددا بکا.

«ئۆتتۆ جوکلیک» بە ئیسرائیلییەکانی ڕاگەیاند، کەوا پیاوێکی ئاڵمانی سەر بە کۆمپانیای فڕۆکەوانی عەرەبی یەکگرتوو بە ژەنەڕاڵ محەمەد خەلیلی ئاشناکردووە، کە نازناوەکەی لەلای زانا ئاڵمانەکان «هێرر دکتۆر مەحمود» بوو. دیدارەکەی ئۆتۆ جوکلیک لەگەڵ ئەو «هێرر دکتۆر»ە دوو پڕۆژەی لێکەوتەوە: «ئیبیس» و «کلیۆپاترا». نهێنی ئەو دوو پڕۆژەیە تەنها بە «پرۆفیسۆر پیلز» و دکتۆر «کرەگ» گووترا بوو.

ئۆپەراسیۆنی «ئیبیس» چەکی تیشکدەرەوەی دایە دەست میسرییەکان بۆ ئەوەی مەترسی تیشکی ناوەکی بڵاوبکاتەوە. جۆکلیکیش لەخۆی گرتبوو کە زۆترین بڕی مادەی سڕکراوی ڕادیۆئەکتیڤ کۆبالت-٦٠ و ئەزموونەکەی بۆ میسر دابین بکا. ئەگەر تاقیکردنەوەکە سەرکەتوو بوو، ئەوا جوکلیک هەوڵدەدا بڕی زیاتری کۆنالت پەیدا بکا، تا بخرێتە سەر کڵاوەی موشەکەکان و کاریگەری تیشکدانەوە کوشندەکە زیاتر بکا.

ئامانجی پڕۆژەی دووەمیش، واتە کلیۆپاترا، بەرهەمهێنانی دوو بۆمبی ناوەکی بوو. جوکلیک ڕێگەیەکی زیرەکانەی بۆ کارخانەی بەرهەمهێنانی بۆمبەکان پێشنیاز کردبوو: کڕینی یۆرانیۆمی پیتێندراو بە ڕێژەی بیست لە سەد لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا یان لە ئەورووپا؛ ئەوسا دیسان بپاڵێورێت و بپیتێندرێت بەڕێژەی ٩٠ لەسەد لە سەنتەرفیگی تایبەتی پێشکەوتوو لە ئاڵمان یان هۆڵەندا لەلای زاناکانی وەک د. ویلیەم گرۆس، دکتۆر جاکۆب کیستەرماکەر و د. گێرنۆت زیپ؛ ئەوسا دروستکردنی بۆمبی ئەتۆم لە پێکهاتەی ئەو یۆرانیۆمە پیتێندراوەدا.

جوکلیک بۆ وڵاتە یەکگروتووەکانی ئەمریکا ڕۆیشت، بەڵکو لەوێ دەستی بە یۆرانیۆمی پیتێنراو ڕابگا؛ لەێ چەندین زانای ئەڵمانی بینین، داوای لێکردن بێنە میسر سەنتەرفیوگ دروست بکەن. لە هەمانکاتدا خۆیشی هەندێ کۆبالت-٦٠ی لە ئەورووپا کڕی و ڕەوانەی گینۆلۆجیکێکی میسری بەناوی خانم د. خەلیل کرد کە خوشکی هێرر دکتۆر خەلیل بوو لە قاهیرە.

کاتێکیش ئیفادە فەرمییەکەی جوکلیک لە ئیسرائیل تەواو بوو، قسەکانی نێردرانە لای چەندین شارەزا بۆ لێوردبوونەوە و هەڵسەنگاندن. لەبەر چەند هۆکارێک، ڕاپۆرتی ئەو شارەزایانە ئاوڕێکی شایستەیان لێنەدرایەوە. سەبارەت بە مشوورخواردنی پڕۆژەکەی کلیۆپاترا، شارەزایان گوتیان پێناچی هیچ دەرفەتێک هەبێ، کە جوکلیک بتوانێ

ڕێژەی ٢٠٪ی یۆرانیۆمی پیتێندراو پەیدابکا. تەنانەت ئەگەر پەیداشی بکا، ئەوا میسر بەلای کەمییەوە پێویستی بە سەد لە باشترین سەنتەرفیوگەکانە بۆ ئەوەی ئەو یۆرانیۆمە پێویستەیان لێ بەرهەم بێنێ کە بۆ بۆمب لەماوەی دوو تا سێ ساڵ بەدەست بخا. خۆ ئەگەر هەر توانیشیان بۆمبەکە دروست بکەن، ئەوا ناکرێ هەروا بە ئاسانی بیتەقێنن، ئەو دارشتەیەی کە جۆکلیک باسی کردووە، دروست نییە. هەروەها شارەزایان پرۆژەکەی ئیبیس و چەکی تیشکدەرەوەشیان بەلاوە نا، چونکە وەک ئەوان گوتیان، ئەویش دروست نەبوو، گەر دروستیشی بکەن زیانێکی زیاتر لە بۆمبێکی ئاسایی ناگەیەنێ.

ئەو ئاهـ پێداهاتنەوەی نێو ڕاپۆرتەکان کوڵی دڵی سەرکردەکانی دەوڵەتەکەیان دانەمرکاندنەوە. ئەوان زیاتر بەو ڕاپۆرتانەوە گڕیان گرت، کە باسیان لەوە دەکرد میسرییەکان خەریکی پەرەپێدانی چەکی کیمیایین. لە ١١ی ینایری ١٩٦٣دا، ترسەکەیان بەرەوا بینرا، ئەمەش دوای ئەوەی میسرییەکان لە شەڕی یەمەندا گازی ژەهراوییان بەکارهێنا. خانم گۆڵدا مایەری وەزیری کاروباری دەرەوەی ئیسرائیل دیدارێکی لەگەڵ سەرۆک جۆن ئێف کەنەدیدا سازکرد و دەربارەی مەترسی میسرییەکان دوا بەوەی خەریکن کڵاوەی چەکی نائاسایی لەسەری ڕۆکێتەکانیان ببەستن. گۆڵدا مایەر داوای لە سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کرد، خۆی لە پرسەکە هەڵبقورتێنێ، بەڵام کەنەدی وای نەکرد.

هەر بەڕاستیش کڵاوەی چەکی نائاسایی زۆر دژوار بوو، بەڵام پێشنۆرەیی درایە هەوڵی لە باریەک هەڵوەشاندنەوەی سیستمی ڕێنوێنی مووشەکە دوورهاوێژەکان.

لە زستانی ١٩٦٣دا، «د. کلاینواختەر»، شارەزای ڕێنوێنی کارخانەی ٣٣٣ چەند هەفتەیەکی لە ئاڵمان بەسەربرد. لە ئەنگۆرەی ٢٠ی فێبرایردا

تاقیگەکەی خۆی لە «لۆراخ» بەجێهێشت، سواری ترومبێلەکەی بوو، بەناو کۆلانێکی باریکدا بەرەو ئاراستەی ماڵەوە لێیخوڕی. کۆلانەکە هەم تاریک و هەم چۆڵیش بوو، بەفرێکی ئەستوریش باریبوو. لەپڕ تایەکانی فش بوونەوە، ترومبێلێکیش لەسەری دووریانەکە پەیدا بوو، ڕێگەی لێگرت. پیاوێک لە ترومبێلەکە دابەزی و بەرەو لای کلاینواختەر چوو. زانایەکەش سێیەمین پیاویشی لەنێو ترومبێلەکدا بینی.

پیاوەکە داوای لێکرد: "ئەرێ د. شێنکەر لەکوێ دەژی؟" بێ ئەوەی چاوەڕێی بەرسڤەکەش بکا، دەستی دایە دەمانچە بێدەنگەکەی بەرپشتی و تەقەی لێکرد. گوللەی بەسەردا بارین، گوللەکان جامەکە و کورسییە خورییەکەی زاناکەی بڕی، بەڵام بکوژەکە غاریدایە لای دووەمین ترومبێل کە هەندێ لە دوورەوە وەستابوو.

پۆلیس، یەکەمین ترومبێلی لە دوری سەد مەترێکەوە لە شوێنی پەلاماردانەکەوە دۆزیەوە. هەر سێ پیاوەکانیش بە ترومبێلێکی دیکەوە هەڵاتبون. ئەوان پاسپۆرتێکیان لەدوای خۆیان بەناوی «عەلی سەمیر»، یەکێک لەسەرە گەورەکانی دەزگەی هەواڵگری میسری، بەجێهێشتبوو. دوایی بەدیارکەوت، کەوا ئەم کارە تەڵە بووە؛ ئاخر لە ڕۆژی پەلاماردانەکەدا عەلی سەمیر لە قاهیرە بووەوە و ڕۆژنامەنووسێکی ئەڵمانیش وێنەکەی گرتبوو.

ئەو کەسانەی هێرشیان کردە سەر کلاینواختەر هەر نەدۆزرانەوە. هێشتاش بیروڕای یەکدەنگی میدیا هەر ئەوەبوو کە ئیسرائیلیەکان لە پشت کردەی کوشتنەکە بوون و کۆتایەکەشی شکستهێنان بوو.

یەک دوو هەفتە دواتر، مۆساد هەوڵێکی دیکەی دایەوە؛ ئەم جارەیان بەدوای «د. پاول گورکە»دا ڕۆیشتن، کە لە ئاڵمانیا لەدایک ببوو، بەڵام لە سویسرا دەژیا.

گورکەش هەروەک کلاینواختەر لە سیستمی ڕێنوێنی تاقیگەی کارخانەی ٣٣٣ی مووشەکە دوورهاوێژەکانی میسردا کاری دەکرد. ئەو پێدەچوو لەلای میسرییەکان هەروەها لای مۆسادیش زۆرگرنگ بووبێ. کیژەکەی ئەو بە ناوی «هایدی» لە فرایبورگ کە شارێکی ئەڵمانی سەر سنوری سویسرا بوو، دەژیا. کەمێک دوای هەوڵی لەناوبردنی کلاینواختەر، دکتۆر جۆکلیک زەنگی بۆ «هایدی» لێدا و پێگوت لەو دواییانەدا باوکی ئەوی لە وڵاتی میسر بینیوە، لەو شوێنەی بۆ تێکوپێکدانی ئیسرائیل کاری لەسەر پەرەپێدانێ چەکێکی سامناکدا دەکرد. جۆکلیک ئاماژەیەکی وای دا کەوا گورکە هێشتا لە چالاکیەکانی خۆی نەوەستاوە، بەم جۆرە بێ، ئەو خۆی تووشی سەرچڵییێکی ترسناک دەکا. لەسەرێکی دیکەشەوە، خۆ ئەگەر لە میسر بێتەدەر، ئەوا دەکرێ سەلامەت لێیدەرچێ.

لە ئاکامدا جوکلیک وای بە کچەکەی گورکە گوت: "ئەگەر باوکی خۆت خۆشدەوێ، ڕۆژی شەممە، ٢ی مارت سەعات چواری دوای نیوەڕۆ وەرە هوتێلی سێ پاشایەکە لە بازل، دەمەوێ بە یەکێ لە برادەرەکانی خۆمت بناسێنم."

هایدی زەندەقی چوو[155]، دەستەجێ پەیوەندی بە «هـ .مان» ئەفسەری پێشووی نازییەوە کرد، «مان» پەیوەست بوو بە ئاسایشپارێزی ئەو زانایانەی لە میسر کاریان دەکرد. ئەویش لە ڕێی خۆیەوە پۆلیسی فرایبورگی ئاگادار کردەوە، پۆلیسیش کاربەدەستە سویسرییەکانی

---

[155] زەندەقی چوو: زراوی ڕژا، زۆر ترسا، تۆقی.

ئاگادارکردەوە. بەم جۆرە، کاتێک جوکلیک و برادەرەکەی پێیان نایە نێو هوتێلی سێ پاشایەکە، چەندین ترومبێلی پۆلیس لە پشت باڵەخانەکە بۆیان وەستابوون، لێکۆڵەرەوەکانیش لە هۆڵی هوتێلەکە بوون، ئامێری تۆمارکردنیش لە نزیک مێزی «هایدی گۆرکە»وە داندرا.

«جوکلیک» و برادەرەکەی – جوسیف بن گالی ئاژانی مۆساد- بەپێی خۆیان کەوتنە نێو داوەکە. تومەز گومانیان لە هیچ شتێک نەکرد و بۆ ماوەی سەعاتێک قسەی خۆیان لەگەڵ هایدی گۆرکەدا کرد، بەڵام وریایانە قسەیان کرد، هیچ گەفێکی ڕاستەوخۆیان لێنەکرد، هەرچەندە مەترسی دژواریان سەبارەت بە باوکی کچەکە و ئەو شوێنەی کە چەکێکی سامناکی پەرەپێدەدا دەربڕی. ئەوان بلیتێکی فڕۆکەیان بۆ هایدی کڕی تا بتوانێ بەدوای باوکیدا بڕواتە قاهیرە و بیگەڕێنێتەوە ئاڵمان، بەم پێیە خۆی و خێزانەکەی سەلامەت دەربچن.

کۆبوونەکە تەواو بوو، هەردوو پیاوەکە لە هوتێلەکە چونەدەر و سواری قیتاری سەعات شەش بوون بەرەو زیوریخ ڕۆیشتن، لەوێش لەیەک جیابوونەوە. بەڵام لەو کاتەی جوکلیک لە سەر شۆستەی وێستگەکەدا چاوەڕێی قیتارێکی دیکە بوو، لەلایەن پۆلیسێکی جل خاکی گیرا، بن گالیش لەنزیک کونسولخانەکەی خۆی گیرا.

ئیسەریش لەبنکەی خۆی لە ئەورووپاوە، پەیوەندییەکانی خۆی خستنەکار و هەوڵی دا بن گال و جوکلیک لە گرتووخانەی سویسرا ئازاد بکا، بەڵام ئەوان لەبەر داوای ڕادەستکردنەوەیان بۆ ئاڵمان، داوای بەردانیان ڕەتکردەوە. ئینجا ئیسەر گەڕایەوە ئیسرائیل و گۆڵدا مایەر، وەزیری کاروباری دەرەوەی بینی. ئاخر لەو دواییانەدا ئەوان زۆر لەیەک نزیک ببونەوە، هەردووکیان هاوڕابوون سەبارەت بە ڕوانینە گوماناوییەکەیان دەرهەق ئاڵمان. گۆڵدا پێشنیازی ئەوەی کرد، ڕوو لە ڕاویژکارەکەی

ئاڵمان ئایناوەر بندرێ داوای لێبکرێ، کەوا ئاڵمانی ڕۆژئاوا داوای ڕادەستکردنەوەی هەردوو پیاوەکە هەڵبوەشێنتەوە.

پاشان دەستبەجێ ئیسەر بەرەو تەبەریا لێیخوڕی، ئەو شوێنەی کە سەروەزیر بنگۆریۆن کاتی پشووی تێدا بەسەر دەبرد. داوای لە بنگۆریۆن کرد نێردراوێکی بنێرێتە بۆن، پایتەختی ئاڵمانی ڕۆژئاوا. نێردەکەش بە بەڵگەی سەلمێندراو چالاکییە خراپەکاریەکانی زانا ئاڵمانەکان لە میسر نیشانبدا و داوای کێشانەوەی حوکمی ڕادەستکردنەوەی هەردوو پیاوەکەش بکرێ.

بنگۆریۆن داواکەی ئیسەری ڕەتکردەوە.

ئیسەر هەروا بە ئاسانی دەستەوەستان نەبوو، بە بنگۆریۆنی گوت: "تۆ دەبێ بڕیاربدەی، ئاخر ئەگەر گیرانەکەی هەردوو پیاوەکە ڕابگەیەندرێ؛ ئەوا سەرلەبەری کاروباری پەیوەندیدار دەتەقێتەوە."

بنگۆریۆنیش لێیپرسی: "مەبەستت چییە لەوەی دەڵێی دەتەقێتەوە؟"

"هەر لەو کاتەی کە گرتنی «بن گال» ئاشکرا بکرێ، ئەوا سەرتابای گۆبەندی زانایانی ئاڵمان لە میسر دەکەوێتە بەرتیشک. ئەوسا لەسەر ئیسرائیل پێویست دەبێ ڕوون بکاتەوە کە بۆچی «بن گال» وای کردووە. ئێمە ئەوسا دەبێ پەردە لەسەر ئەوەش هەڵبدەینەوە کە میسرییەکان کەرەستەیان بۆ ڕۆکێتەکان و بەرنامەی سەربازی دیکە لە ئاڵمان کڕیوە."

بنگۆریۆنیش بۆ خولەکێک بیری لێکردەوە و لەدواییدا گوتی: "باوابێ."

ئەمەش سەرەتای پچڕانی پەیوەندی نێوان ئەو دوو پیاوە بوو.

لە ئەنگۆرەی ڕۆژی سێشەممەی ١٥ی مارتی ١٩٦٣دا، ئینتەرناشیونال یونایتد پرێس گرتنی جوکلیک و بن گالی بەم جۆرە ئاشکرا کرد:

"بەگومانی هەڕەشەکردن لە کیژی زانای ئاڵمانی کە لە میسردا کاردەکا جوکلیک و بن گال گیراون." ئیسەر هارلیش داوای کۆبونەوەیەکی نهێنی لە سەرنووسەری ڕۆژنامەکان کرد؛ لە کۆبوونەوەکەدا پاشخانی بن گالی بۆ وێنا کردن. بە تایبەتیش جەختی خستە سەر بەشەکەی جوکلیک لە گۆبەندەکەدا، باسی جۆری کارەکەی لە پرۆژەکەی میسردا بۆ کردن، هەروەها باسی ڕاستی ئەو لایەنەشی کرد کە کابرا خۆبەخشانە هاتۆتە پێش و ویستوویەتی قەرەبووی زیانەکان بکاتەوە.

لە ماوەی ئەو یەک دوو ڕۆژەی بەدوای ڕووداوەکەدا هاتن، بە نهێنییەوە یاریدەدەرانی ئیسەر هەندێ شتیان بە رۆژنامەنووسانی ئیسرائیلی گوت: بە نافتالی لاڤی لە حائارێتز، شامۆئیل سێگیڤ لە مەعاریف و یەشایاهو بن پۆرات لە یەدیحوت ئەحرانوت. ئەوان هەموو ڕاستییەکان، ناوونیشانی کۆمپانیای ئینترا، پاتوێخ و پەیمانگەی شتوتگارتیان پێدان. ئینجا هەرسێ پیاوەکان بەرەو ئەورووپا بەڕێکەوتن تا داتا لەسەر زانا ئاڵمانەکان کۆبکەنەوە و زانیارییەکان بۆ ڕۆژنامەکانیان لە ئیسرائیل بنێرنەوە. بەگوێرەی لێکدانەوەی ئیسەر، کاتێ هەواڵ سەبارەت بە پرۆژەی زانا ئاڵمانەکان لە ئەورووپاوە بنێردرێتەوە کاریگەرتر دەبوو. پیاوەکانی دیکەی مۆسادیش نێردرانە دەرەوەی وڵات بۆ ئەوەی زانیاری بۆ ڕۆژنامەنووسە نزیکەکانی ئیسرائیلی کۆبکەنەوە.

ئیسەر هارل نەیدەزانی کەوا دۆزی ئاڵمان هەستیارترین بابەتە لە ئیسرائیل. ئەو پەلامارە بێ جڵەوگیرییەی ئاڵمان دەستپێکرا، بووە مایەی هەڵگیرسانی گڕکانێک کە بەریان پێنەگیرا، ئەو بەلێشاو تاوانبارکردنەی زاناکان هەستێکی تۆقاندنی ڕاستەقینەی لە ئیسرائیل وروژاند.

بۆ ١٧ی مارتیش، میدیای ناوەوە و دەرەوەی ئیسرائیلی کەوتبووە بن باری سەرهێڵ و مانشێتە هەستیارەکان: زانا ئاڵمانەکان، کە زۆربەیان

نازیی پێشوو بوون، چەکێکی کوشندە لە میسر بەرهەمدەهێنن. ئەوان خەریکی پەرەپێدانی گازی ژەهراوی، میکرۆبی سامناک، تیشکی کوشندە، کڵاوەی ناوەکیی یاخود خەریکی گۆڕینی جۆرە تیشکێکن کە بکوژ و سامناکە.

ڕۆژنامەکان ئەو کاروکردەوانەیان بەیەکدی بەراورد دەکرد و ڕاپۆرتیان بڵاودەکردەوە کە لە کۆمیدیای فلاش گۆردن دەچوون: تیشکی مەرگهێن، هەر شتێک کە بێتە سەر ڕێگەی دەدرووێتەوە و لە ناوی دەبا... بەلای کەمییەوە هەوای ئیسرائیل بۆ ماوەی نۆهەد ساڵ ژەهراوی دەبێ... بەکتریاکان، تاعونی سامناک و هتد بڵاودەکەنەوە. ئەو هەڵمەتە حکوومەتی کۆماری فیدرالی ئاڵمانیشی تاوانبارکرد، کە خۆی لە کۆتاییهێنان بەو چالاکیە ئەهریمەنانە دەدزێتەوە کە لە میسر دەیانکا، لەڕاستیدا بەم کارەی بە شوێنپێی هیتلەردا دەڕوا. ئەو ڕاپۆرتانەی بۆ ئەورووپا نێردران بەنزینی زیاتریان بە ئاگردا دەکرد بەوەی: "ڕۆژانە وردەکاری نوێ سەبارەت بە پیلانی جەهەننەمیانەی زاناکان دەدۆزرێنەوە."

بن گال و جوکلیک لە بازل دادگایی کران، حوکمێکی سووکیان بۆ بڕایەوە، هەر یەکەیان بە دوو مانگ زیندانیی حوکمدرا کە لە ڕۆژی گرتنیانەوە هەژمار کرا. بەڵام ئەو حوکمە بەرەنجامی دووەمی زۆر قورس بوو.

لەماوەی دادگاییەکەدا، لەپڕ دادوەرەکە تێبینی ئەوەی کرد کە یەکێ لە وانەی وەک گوێگر و میوان لە هۆڵی دادگاکە دانیشتووە، چەکی پێیە.

ئیدی دادوەرەکە بە تووڕەیەوە لێیپرسی: "باشە چۆن زات دەکەی لە دادگادا چەک هەڵبگری؟"

پیاوەکەش وەڵامی دایەوە: "من مۆڵەتی چەکهەڵگرتنی هەموو کاتم پێیە. من ئەفسەری ئاسایشی زانا ئاڵمانەکانم لە میسر."

کابرا خۆی بەناوی «هـ . مان» ناساند، ئەو پیاوەی دوای تەلەفۆنەکەی جوکلیک لەلایەن هایدی گورکەوە تەلەفۆنی بۆ کرا، هەر ئەویش بوو پۆلیسی ئاڵمانی لە دۆزەکە ئاگادارکردبووەوە.

یەکێک لە پیاوە دەمامکدارەکانی مۆساد دەستبەجێ لە هۆڵی دادگاکە هەڵدەستێ و هەواڵی ڕووداوەکە بەسەرچاوەی خۆی دەگەیەنێ. کاتێکیش «ڕافی میدان»، کە ئاژانێکی دێرینی مۆساد بوو بە هەواڵەکە دەزانێ، یەکسەر لە شوێنی خۆی هەڵدەستێ و بەیەکەمین قیتار دەچێتە ڤیەنا و بەپەلەپڕوزێ دەچێتە ماڵی «سیمۆن ویسنتال» کە ڕاوەدوونەرێکی بەناوبانگی نازیەکان بوو. ویسنتالیش دەستبەجێ بە یارمەتیدانی مۆساد قایل دەبێ.

«میدان» لە کابراکە دەپرسێ: "ئایا هیچ شتێک لەبارەی ئەو ئەڵمانەی ناوی«هـ .مان»ـە دەزانی؟"

ویسنتالیش دەچێ و لاپەڕەی ئەرشیفی کارەکانی خۆی هەڵدەداتەوە. دوای یەک دوو سەعات، دەگەڕێتەوە لای میدان و فایلێکیشی لەبن هەنگڵ دایە. پێی دەڵێ: مان لە ماوەی جەنگەکەدا ئەفسەرێکی SS بووە. ئەو وەک کۆماندۆیەک لەژێر فەرماندەیی کۆلۆنێل سکۆرینزدا کاری کردووە."

«میدان»یش ئەو زانیارییانە بۆ ڕافی ئیتان و ئاڤراهام ئاهیتوڤ دێنێتەوە، ئەو ڕافیەی لە هەموو شوێنک ئامادە بوو.

ئاڤراهام ئاهیتوڤ، پیاوێکی سەڕووتاوە و بەڕۆژ هەڵقرچاوی عەینەک لەچاو، لە ئاڵمان لەدایکببوو، دواتر لەگەڵ دایک و باوکە دیندارەکەی لە تەمەنی پێنج ساڵیدا کۆچ دەکاتە ئیسرائیل. لە تەمەنی شازدە ساڵیدا ببووە

ئەندامێکی ڕێکخراوی هاگانا[156] و لە تەمەنی هەژدەساڵیشدا یەکێ بووە لە دامەزرێنەرانی شاباک. ئاهیتوڤ زۆر زیرەک بووە، لەکاتی ماوەی سەربازیەکەی خۆیدا خوێندنیشی تەواوکردووە، خوێندنی لە فێرگەی قانون لە «سوما کوم لاودە»دا دەرچووە. لە ١٩٥٥دا گرنگترین سیخوڕی میسری لە ئیسڕائیل بەناوی رفعت الجمال[157] گرتووە، ئەو کەسەی لەژێر ناسنامەی ئیسڕائیلی «جاک بیتۆن»دا کاریکردبوو. ئاهیتوڤ وای لە سیخوڕە میسریەکە کرد بابداتەوە، بیکاتە یەکێ لە باشترین جاسوسە دووسەرەکان، واتە ئەو کەسەی زانیاری فلتەرکراوی بۆ ماوەی دوازدەساڵان دەدایە میسرییەکان. لە ١٩٦٧دا، لە سەروبەندی شەڕی شەش ڕۆژەدا، ئەلجەمال بەتەمابوو میسریەکان لە هێرشێکی زەمینی بۆ سەر میسر بەر لەناردنی هێزی ئاسمانی ئاگادار بکاتەوە؛ دەرەنجامیش کەموکورتی هێزی ئاسمانی میسریش وا شکایەوە، بەر لەوەی فڕۆکەکانیان هەڵبستن، لەلایەن هێزی ئاسمانی ئیسڕائیلیەوە تێکوپێک شکێنران. پاشان ئاهیتوڤ بووە باشترین بەڕێوەبەری شاباک، بە زۆریش لەسەر ئەوە پەسندرا کە هەوڵەکانی بۆ یەکانگیربوونی عەرەبەکانی ئیسڕائیل لەنێو تەوژمە سەرەکیەکەی کۆمەڵگەی ئیسڕائیلیدا سەرکەوکەوتوو بوو.

[156] Haganah هاگانا بە عیبری واتای بەرگری دەدا؛ ڕێکخراوێکی میلیشیایی جوو بوو لە ١٩٢٠ دامەزراوە و لەگەڵ جاڕی سەربەخۆیی لە ١٩٤٨ بووەتە بونیادی سوپای بەرگری ئیسڕائیلی. هاگانا لە کار و چالاکییەکانی خۆی بە ژێرزەمینی و ئاشکرایی دژی دەسەڵاتی عەرەب و مانداتی بەریتانی لەسەر خاکی فەلەستین تێکۆشاوە. ڕێکخراوێک بووە لەژێر دەسەڵاتی حیزبەکەی بنگۆریۆندا بووە.

[157] Rifat Al Gammal

له ئەنگۆرەیەکی ئایاری ١٩٦٣شدا، ئاهیتوڤ گوێی لە ڕاپۆرتەکەی میدان سەبارەت بە «مان» و «سکۆرزنی» گرت، ئینجا گەڕایەوە لای ڕافی ئیتان: "باشە بۆچی ئێمە هەوڵنەدەین سکۆرزنی بێنینە ڕیزەکانی خۆمان؟"

یەکەم جار بیرۆکەکە ناقۆڵا بوو، بەڵام خۆ لە بنەوەدا لۆژیکی خۆی هەبوو: خۆ ئەگەر سکۆرزنی بگەڕێتەوە لای مان، ئەوا دەرفەتێک دەبێ بۆ وەدەستخستنی کەرەستەیەکی پلە باڵا لە کەسێک کە پێشتر لەبن دەستی ئەودا کاری کردووە. هەنووکەش پرسیارەکە ئەوە بوو، چۆن خۆیان بگەیەننە سکۆرزنی. پشکینێکی خێرا ئەوەی نیشاندا کەوا ژنە خۆدوورگرەکەی سکۆرزنی هێشتاش پەیوەندی توندوتۆڵی هەر پێوەماوە؛ ئیتا خانم کۆمپانیایەک بەڕێوەدەبا کە تایبەتمەندە بە بازرگانی کانزا. ئاژانەکانی مۆساد، شلۆمۆ زابۆلدۆڤیچ، بزنسمانێکی ئسرائیلییان دۆزیەوە، کە لەسەر هەمان هێڵی ژنەکەدا کاریدەکرد و پەیوەندییان پێوەکرد، ئەویش لە وەڵامی پرسیارەکەیاندا گوتبووی، بەڵێ خانم سکۆرزنی دەناسم. بزنسمانەکەش ئاژانەکانی مۆسادی بە خانمەکە ناساندن، ئەوانیش ئەوەی پێویست بوو بە ژنەکەیان گوت.

ئەمەش ئەوە دەردەخا، کە چۆن ڕافی ئیتان و ئاهیتوڤ سەردانی نووسینگەی سکۆرزنیان لە مەدرید کرد. ئەوان ئێستا ئەو پاڵەوانەی ڕایخی سێیەمی نازییەکانیان دەناسی و بووە ئاژانیان و زانیاری سەبارەت بە چالاکییەکانی زانا ئاڵمانەکانی کارکرد و لە میسر دایە مۆساد. وێڕای کەسێکی وەک مان، سکۆرزنی یەک دوو سەرکردەی کۆمەڵگەی ئاڵمانیشی لە میسر دەناسین، زۆر لەوان ئەفسەری پێشووی بن سەرپەرشتی ئەو بوون.

سکۆرزنیش پرسی: "باشە چۆن متمانەتان پێبکەم؟ ئاخر چۆن لەوە دڵنیابم، کە ئێوە دواتر بەدوای منیشدا ناکەون؟" ئاخر ئەو دەترسا نەوەک

تۆڵەستێنانی ئیسرائیل ئەویش بدۆزنەوە وەک چۆن ئەدۆلف ئایخمانیان دۆزییەوە و چارەنووسی ئەویش وەک هی ئەوی لێبێ.

لەوەڵامدا دەستبەجێ ڕافی ئیتان چارەسەری کێشەکەی دۆزییەوە. پێیگوت: "ئێمە ڕێگەمان پێدراوە لە ترسەکە ئازادت بکەین." ئیدی پارچە کاغەزێکی هێنا و نامەیەکی بەناوی دەوڵەتی ئیسرائیلەوە بۆ سکۆرزنی نووسی کە تێیدا مسۆگەری کردبوو، کە ئەو "ئازاد دەبێ لە ترسەکەی" و بەهیچ شێوەیەک ناکەوێتە بەر هیچ جۆرە بەدواداچون و ڕاوەدوونانێک یان توندوتیژییێک.

سکۆرزنیش نامەکەی خوێندەوە، ئینجا بێدەنگ ما. لەسەر کورسیەکەی خۆی هەڵسا، یەک دوو جار هاتوو و چوو، بەگژ هزران ڕاچوو، تێیدا نقووم بوو.

لەکۆتاییدا گەڕایەوە لای ئیسرائیلییەکان پێیگوتن: "من قایلم."

لە مانگەکانی بەدوایدا هاتن، سکۆرزنی زانیاریگەلێک کە لە نرخاندن نەدەهاتن سەبارەت بە چالاکی زانا ئاڵمانەکان لە میسر، ڕادەستی پیاوەکانی مۆسادی کردن. ئەمەش بە یارمەرتی «هـ . مان» و دۆستە کۆنەکانی دیکەوە، ئەو لیستی وردەکاری سەبارەت بە زاناکانی ئاڵمان، ناوونیشانەکانیان، ڕاپۆرت لەسەر ڕادەی پەرەسەندنی پێواژۆی پرۆژەکانیان، پلانەکانیان، نەخشەی دەستنووسی ڕۆکێتە دوورهاوێژەکان، نامە و نامەگۆڕینەوەیان سەبارەت بە شکستی کۆکردنەوەی سیستمی ڕێنوێن بۆ مووشەکە دوورهاوێژەکانی خستەنە سەرمێز.

بەڵام خۆ ئەوکات ئیسەر لەوێ نەمابوو تا ڕاپۆرتەکانی سکۆرزنی بخوێنێتەوە.

لەو نێوەدا میدیای ئیسرائیلی جڵەوی خۆی شلکردبوو. ناوونیشانی تۆقێنەر، دارشتنی، کارتۆن تەنانەت لە هۆنراوەکانیشدا جاڕیان دەدا کەوا ئاڵمانی ١٩٦٣ هەر هەمان ئاڵمانی ١٩٣٣یە؛ ئەو ئاڵمانیایەی کە شەش ملیۆن جوی قەتڵوعام کرد، هەنووکەش یارمەتی میسر دەدا بۆ ئەوەی هۆلۆکۆستێکی نوێ سەرپێ بخا. لەنێو کەنێستیشدا، مێناحێم بێگن، سەرۆکی ئۆپۆزسیۆن بە وتاری دوورودرێژ بەسەر بنگۆریۆندا نەڕاندی: "تۆ ئوزی[158] بە ئاڵمان دەفرۆشی و ئەوانیش میکرۆب بۆ دوژمنەکانمان ڕەوانەدەکەن." لە دووانێکدا گۆڵدا مایەری هاوپەیمانی ئیسەر، ئاڵمانەکانی میسری بە بەرهەمهێنانی چەکێک تاوانبار کرد: "مەبەستی ئەوان ئەوەیە، هەموو زیندەوەرێکی ئێرە زیندەبەچاڵ بکەن."

ئەو تاوانبارکردنانەش زێدەڕەوی تێدابوو. تاڕادەیەک هەموویان لە واقیعی خۆیان داماڵدرابوون. ئامۆس مانۆر، بەرپرسی شاباک و دۆستی نزیکی ئیسەر دواتر بە ئێمەی گوت[159]: "لە ماوەی ئەو ڕۆژگارەدا، کاتێ ئیسەر هەڵمەتی دژی زانا ئاڵمانەکان بەڕێوەدەبرد، ئەو بووە پیاوێکی ناهاوسەنگ. ئەو زیاتر بە ناخدا شۆڕببووەوە لەوەی هەر شتەکی لە کەللەدا بێ. ئاخر نەتدەتوانی دەمەتەقێیەکی ئاسایی سەبارەت بەو باسوخواسە لەگەڵدا بکەی."

شیمۆن پێرێز، جێگری وەزیری بەرگری ئەوکات، لە ٢٤ی ئازار لە گەشتێکی بۆ ئەفریقیا گەڕابووەوە، لەوە بەئاگا هاتەوە کە ئەو مەترسییە کوشندانە چین کە وەک لێکەوتەی شەڕی خاچپەرستانەی ئیسەر هارلدا دەردەکەوێ. هەروەها لەوەش تێگەیشت، کە چیرۆکی چەکەکان گوایە

---

[158] Uzi ئوزی: جۆرە تفەنگێکی ئیسرائیلی بچووکە لە دەمانچە دەچێ.

[159] لێرەدا مەبەست نووسەرانی ئەم کتێبەیە.

"هەموو زیندەوەرێکی ئێرە لەناو دەبا" سووک و ئاسان مایەی پێکەنینە. ئامان، هۆبەی هەواڵگری سوپای بەرگری ئیسرائیلی، مەزندەکردنێکی تەواو جیاوازیان پێشکەشی پێرێز کرد. "ئێمە هەموو ئەو شتانەمان کۆکردەوە کە دەکرێ کۆبکرێنەوە،" مایەر ئامیت، بەڕێوبەری ئامان بەم جۆرە بە پێرێزی گوت: " وێنە لەسەرخۆیەکە دەرکەوت: ئەم چیرۆکە لە هەموو ڕاستییەک لایداوە... کەسانی ئێمە گوتویانە کە ئەمەی دەگوترێ نابێ ڕاست بێ؛ نابێ شتێک بێ بەهەند هەڵبگیرێ."

پیاوەکانی ئامیت هیچ ئاماژەیەکی وایان نەدۆزییەوە، کە زانا ئاڵمانەکان خەریکی پەرەپێدانی چەکی کیمیایی یان بەکتریایی بن؛ چیرۆکەکان سەبارەت بە چەکی شووم لە خەیاڵی زانستییەوە وەرگیراون؛ ئەو بڕ و چەندایەتی کۆبالتە کە هێندراوەتە میسر هەر زۆر کەمە. هەروەها ئەوەش سەلمێندرا، کە «د. ئۆتۆ جۆکلیک»، ئەو کەسەی گەواهیدانەکەی ڕۆڵێکی سەرەکی لەسەرجەم کاروبارە پەیوەندیدارەکاندا گێڕاوە، ئەگەری زۆری هەیە کە هی ئەوە نەبێ متمانەی پێبکرێ.

لە ٢٤ی مارتدا ڕاپۆرتەکەی ئامان گەیشتە سەر مێزەکەی بنگۆریۆن. ئەویش یەکسەر بانگی ئیسەر هارلی کرد و پرسیاری سەبارەت بە سەرچاوەی زانیارییەکانی لێکرد. داوای وەڵامی ورد و دەقاودەقیشی لێکرد. ئیسەر ددانی پێدانا، کە ئەو ڕاپۆرتنووسی ناردوونەتە ئەورووپا، دوای ماوەیەکی کورت لە باس و خواسەکە، ددانیشی بەوەدا نا، کەوا ئەو زانیاری سەبارەت بە گازی ژەهراوی، پرسی تیشکی کوشندە یاخود کۆبالتی بۆمبەکانەوە نییە.

بۆ ڕۆژی دواتر بنگۆریۆن شیمۆن پێرێزی بینی، ئەویش لەگەڵ سوپالاسار هاتبووە لای. بەرپرسی ئامان ڕاپۆرتێکی پڕ وردەکاری پێبوو بەرچاوی بنگۆریۆنی ڕوونکردەوە: زانا ئاڵمانەکان کار لەسەر شتی

ئاسایی دەکەن، ڕۆکێتی کۆنباویان دروستکردوون. بەڵێ هەر بەڕاستیش چالاکییەکانی ئەوان مەترسیدارە، بەلام هی ئەوە نییە کە بازنەکانی حکوومەت وەک ئێستا بتۆقێنێ، بە وەزارەتی بەرگری و سوپای بەرگری ئیسرائیلیشەوە، هەموو ئەوانەی گوتراون، لە دەرەوەی بازنەی ڕاستییەکانن.

دیسان بنگۆریۆن بانگی ئیسەری کردەوە. ئەمجارەیان دەمەتەقێکەیان توند و گرژ بوو، بنگۆریۆن گومانی سەبارەت بە ڕاپۆرتەکان و هەڵسەنگاندنەکانی ئیسەر دەربڕی. تەواوی ئەو متمانەیەی سالانی ڕابردوو لەنێوان ئەو دوو پیاوەدا، بوو بە دەمەتەقێیەکی توندو تووڕە کە جێپەنجەی لەسەر پەیوەندییەکانی ئاڵمان- ئیسرائیلیش دانابوو. ئینجا ئیسەر بە تووڕەیی گەڕایەوە نووسینگەی خۆی و نامەیەکی دەستلەکارکێشانەوەی بۆ بنگۆریۆن ڕەوانە کرد.

بنگۆریۆنیش هەوڵیدا قسەی لەگەڵدا بکا و جارێ باسی ڕۆیشتن نەکا، بەلام ئیسەر کەڕەپ بوو. ئەو گوتی، من دەست لەکار دەکێشمەوە، ئەمەش دوا قسەی بوو.

ئەمەش کۆتایی هاتنی سەردەمێک بوو.

ئەوسا بنگۆریۆن داوای لێکرد لە شوێنی خۆی بمێنێتەوە تا یەکێک دەستنیشان دەکا. ئیسەر ئەمەشی ڕەتکردەوە. بە سکرتێرەکەی سەروەزیری گوت: "بە بنگۆریۆن بڵێ، با ڕاستەوخۆ یەکێک بنێری تا کلیلەکانی ڕادەست بکەم." هەر تەڕدەستانەش بنگۆریۆن ڕامسادێکی ئەفسانەیی لە جێگەی ئیسەر دۆزییەوە. بە سکرتێرەکەی خۆی گوت: "دەی دەستبەجێ بانگی ئامۆس مانۆرم بۆ بکەن." ئەویش بەپەلە بۆ لای تەلەفۆنەکە ڕایکرد.

بەڵام خۆ بەرپرسی شاباک، ئەوێ دەمێ بەردەست نەبوو؛ ئەو بۆ سەردانی خزمان لەڕێی کیبۆتی ماگاندا بوو لە دۆڵی ئوردن، ئەوێ ڕۆژێش هێشتاش تەلەفۆنی دەستی پەیدا نەببوون.

ئینجا بنگۆریۆن بە بێ ئۆقرەیی گوتی دەی "مایەرم بۆ بانگ بکەن."

ژەنەڕاڵ مایەریش لە گەشتێکی پشکنین دابوو لە نەقەب، بەڵام لەڕێی ڕادیۆوە بانگی تەلئەبیب کرا. لە گەیشتنندا زانی، کە وەک بەڕێوبەری مۆساد دەستنیشانکراوە تا ئەو کاتەی سەرۆکێکی نوێ بۆ ڕێکخراوەکە دادەندرێ. یەک دوو هەفتە دواتر دانانی «مایەر ئامیت» بووە بڕیارێکی کۆتایی.

دوابەدوای نامە نهێنییەکەی شیمۆن پێرێز بۆ فرانس جۆزیف شتراوس، ئاڵمان پیاوێکی بە ئەزموونی ڕێزلێگیراوی وەک «پرۆفیسۆر بوهمنی»ان کردە بەرپرسی ئەوەی، ڕێگەیەک بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی زاناکانیان لە میسر بگەڕێننەوە. هەر بەڕاستیش ئاڵمان لەوەدا سەرکەوت، کە مجێزی زۆر لە زاناکانی بۆ ئەوە ڕابکێشێ کە بێنەوە و کار لە پەیمانگەکانی لێکۆڵینەوە لەسەر خاکی ئاڵمان بکەن. ئەوانی دیکەش بەرەبەرە وڵاتی میسریان بەجێهێشت. ئەوان لە دروستکردنی ڕۆکێتەکان نەببوونەوە، سیستمی ڕێنوێی ڕۆکێتەکانیشیان شکستی خوارد، تەنانەت فڕۆکەی مێسەر سخمیدتیش هەرگیز لەشوێنی خۆی هەڵنەستا.

یەکێک لە نووسەرانی ئەم کتێبە گەشتێکی بۆ هەنرسڤیلا، یالاناما کرد و لەوێ کوڕێکی چاوشینی NASAی بینی کە «دکتۆر وێرنەر ڤۆن براون» بوو. ڤۆن براون بە لیستی زاناکانی ئاڵمان لە میسردا چووبووەوە و گەیشتبووە ئەو ئاکامە، کە دەرفەتێکی زۆر کز هەبوو ئەگەر زانا پلە دووەکان هەرگیز بتوانن ڕۆکێتێکی دوورهاوێژی کارانگاز دروست بکەن.

کۆششەکەی هێر دکتۆر مەحموودیش بە تەواوی تووشی نسکۆ بوو.

گۆبەندی زانا ئاڵمانەکان وای لە ئیسەر هارل کرد بڕووخێ و لەجێی ئەودا مایەر ئامیت سەرهەڵبدا. ئیسەر هارل لە ناخەوە ڕقی لە ئامیت بووەوە، لە ماوەی ساڵەکانی وەک ڕامسادا شەڕێکی تاڵاونۆشینی لەگەڵدا کرد. گۆبەندی زاناکانی ئاڵمان بووە مایە لەرزۆککردنی هێز و دەسەڵاتی بنگۆریۆنیش، دوای یەک دوو مانگ لە ڕووداوەکە، ئەویش دەستی لە کار کێشایەوە.

لە قاهیرەشدا، دەزگەی هەواڵگری نهێنی میسر دەمامکیان لەسەر ڕووی «وۆلفگانگ لوتز» هەڵدایەوە، "ئەو جاسوسە بەهەڵمەتە" لە ١٩٦٥دا گیرا. هێشتاش نەیانتوانی ڕووپۆشە ئاڵمانیەکەی لەسەر لابدەن، حوکمی زیندانی بەسەردا دراو و دوای دوو ساڵ و نیویش ئازاد کرا.

کۆتایی گۆبەندەکە بووە کۆتایی کارکردنی مۆسادیش لەگەڵ ئۆتتۆ سکۆرزنی، ئەو ئاژانە کە ڕێی تێنەدەچوو ڕۆژێ لە ڕۆژان سیخوڕیی بۆ دەوڵەتی جوو بکا.

## بەندی نۆ: پیاوەکەمان لە دیمەشق

***ئازیزم نادیا، هاوسەرە خۆشەویستەکەم،***

***من دوا وشەکانی خۆمت بۆ دەنووسم، هیوادارم ئێوە بۆ هەمیشە بە یەکگرتوویی بمێننەوە. من داوام لە ژنەکەم دەکەم لێم ببووریّ، ئاگای لەخۆی بیّ و منداڵەکانیشمان باش پەروەردە بکا ... خۆشەویستەکەم نادیا، دەکریّ شوو بکەیتەوە، بەم جۆرە منداڵەکانمان باوکێکیان دەبیّ. بە شێوەیەکی ڕەهاوە تۆ لەمبارەیەوە سەربەستی. داوات لێدەکەم بە مەلوولی سەر بەسەر ڕابردوودا نەگری، بەڵکو ڕوو بکەرە ئایندە. من دوایین ماچەکانی خۆمت بۆ دەنێرم.***

***تکایە نوێژ بۆ گیانم بکە.***

***دڵسۆزت، ئێلی.***

ئەم نامەیە لە ئایاری ١٩٦٥دا گەیشتە سەر مێزی «مایەر ئامیت»، *ڕامسادە* نوێیەکە. «ئێلی کۆهن» یەکێک لە ئازاترین جاسووسەکان بووە لە مێژوویی سووسەکاریدا، کە بەدەستە لەرزۆکەکەی هەرچەند خولەکێک بەرلەوەی ژیانی لەپڕ لەسەر قەنارەکانی دیمەشق کۆتایی پێبیّ؛ ئەم نامەیەی سەرەوەی نووسیوە.

✡ ✡ ✡

ژیانی نهێنی «ئێلی کۆهن»، بیست ساڵ بوو سەریهەڵدابوو. گەنجێک، جوولەکەیەکی کەشخەی میسری، لە دوای نیوەڕۆیەکی شێداری ناوەڕاستی تەمووزی ١٩٥٤دا بەرەو ماڵ دەبووەوە. تەمەنی ٣٠ ساڵان بوو، باڵایەکی مامناوەند، خاوەن سمێڵێکی ڕەشی قەیتانی وەرزشوانی و خەندەیەکی بێوەییانە بوو. لە شەقامێکی قاهیرەدا توشی برادەرێک، ئەفسەرێکی پۆلیس بوو. " ئێمە ئەمشەو چەند تیرۆرستێکی ئیسرائیلی دەگرین." ئەفسەرەکە بەم جۆرە لە گەڵی دوا: "یەکێک لەوانەش ناوی «شمۆئیل ئازار»ە." «ئێلی» هەم سامگرتی هەم سەرسامیش بوو، بەڵام هەر لە برادەرەکەی جیابووەوە، بەلەز گەڕایەوە ئەو ئەپارتمانەی بەکرێی گرتبوو، ئیدی نارنجۆک، تەقەمەنی و ئەو بەڵگەنامانەی لەوێ دانابوون، لابردن. ئاخر ئێلی بە قووڵی دەستی لە چالاکیە نهێنییەکاندا هەبوو. ئەو نەخشەڕێی هەڵاتنی دانا و بەڵگەنامەی ساختەی بۆ خێزانێکی جوو ئامادەکردبوو کە بە تەمای کۆچکردن بوون بۆ ئیسرائیل. ئەو ئەندام و چالاکوانی ژێرزەمینی جووەکانیش بوو، لە ئۆپەراسیۆنە مجێزبەرزەکە، کە بە گۆبەندی «لاڤۆن» ناسرا، بەرپرسیار بوو.

لە بەرایی ١٩٥٤دا، سەرکردەکانی ئیسرائیل بەوەیان زانی، کەوا حکوومەتی بەریتانی بڕیاریداوە بە تەواوی لە میسر بکشێتەوە. میسریش بەهێزترین وڵاتی عەرەبی و دوژمنی سەرسەختی ئیسرائیل بوو. تا ئەو کاتەی سوپای بەریتانی لە میسر هەژموونی، سەرچاوەی بنکەکانی سوپا و فڕۆکەخانە سەربازییەکان بە درێژایی نۆکەندی سوێسەوە لەبەردەستدا بوایە، ئەوا ئیسرائیل تاڕادەیەک کاریگەری بەسەر دەستە و تاقمە سەربازییەکە، کە وڵاتەکەیان بەڕێوەدەبرد هەبوو. بەڵام بە بڕیاری کشانەوە لە میسر، بە یەک جار ئەو دەستڕۆیشتنەیان لە بەین نەدەما؛ سەرباری ئەمەش بنکە نوێیەکان، فڕۆکەخانەکان، جبەخانەی قەبەقەبەی

پڕ لە کەرەستە و تفاقی جەنگی دەکەوتە بەردەستی سوپای میسرییەوە. ئەوکاتیش، تەمەنی دەوڵەتی ئیسرائیل تەنیا شەش ساڵ بوو، دەبووە ئامانجی پەلامارێکی دڕندانەی سوپایەک لە هی خۆی گەورەتر، پڕ چەک کە خوازیاربوو تۆڵەی شکستە ئابڕووچونەکەی خۆیان، هی ١٩٤٨ی جەنگی سەربەخۆیی ئیسرائیل بکەنەوە.

تۆبڵێی بکرێ بڕیارەکەی بەریتانیا بەتاڵ بکرێتەوە؟ بنگۆریۆن ئەوکات لەسەر تەختی دەسەڵات نەمابوو؛ بە دەست لەکارکێشراوەیی چووبووە «سدێ بۆکر[160]». کەسێکی بیرورا مامناوەند بەڵام لاواز جێگەی گرتبووەوە کە «موشێ شارێت» بوو. «پیناس لاڤۆن»ی وەزیری بەرگریش ڕاشکاوانە دژایەتی دەسەڵاتی سەروەزیری دەکرد. ئیدی بە بێ ئاگاداری شارێت، بەبێ زانیاری مۆسادیش، لاڤۆن و کۆلۆنێل «بنیامین گیبلی»، سەرۆکی هەواڵگری سەربازی (ئامان)، نەخشەیەکی دژوار و گەوجانەیان داڕشت. ئەوان برگەیەکیان لەنێو ڕێککەوتننامەی بەریتانی-میسرییدا دۆزیەوە، کە ڕێگەی بە بەریتانیای مەزن دەدا بگەڕێتەوە بنکەکانی جارانی ئەگەر هاتوو تەنگژەیەکی مەترسیدار سەریهەڵدا، ئەوانیش ساویلکانە گەیشتنە ئەو بەرەنجامە، ئەگەر بێت و بە چەندین بۆمبی تیرۆریستیانە میسرییەکان ڕابماڵن، ئەوا دەکرێ بەریتانیەکان بگەنە ئەو ئاکامە، کە سەرکردە میسرییەکان ناتوانن باری ئاسایش و قانون و سیستمی وڵات بپارێزن. ئەوسا بەریتانیا بە ناچاری بڕیاری کشانەوەی لە وڵاتەکە هەڵدەوەشێنێتەوە. «لاڤۆن» و «گیبلی» بڕیاریان دا چەندین

---

[160] Sdeh Bokr سدێ بۆکر ئەو گوندە کیبۆتیەی بیابانی نەقەب بوو، پێشتر دەستەیەک لە کیبۆتنشینەکان ئاوەدانیان کردبووەوە، بنگۆریۆن کاتێ دەستی لەکارکێشایەوە، چووە ئەوێ. پاشان کە بە یەکجاریش وازی لە حکوومەت هێنا هەر چووە ئەوێ، لەوێ بووە شوان. کە مردیش هەم خۆی و هەم ژنەکەی لەوێ بەخاک سپێردران. (بڕوانە کتێبەکەی داود بنگۆریۆن، دامەزرێنەری دەوڵەتی ئیسرائیل).

بۆمبی تیرۆرستیانە لە قاهیرە و ئەلەکسەندەرییە بتەقێننەوە کە کتێبخانە، بنکە ڕۆشنبیرییەکان، سینەماکان، بنکەی پۆست و گەیاندنەکان و باقی باڵەخانەکانی دیکەی بەریتانی و ئەمریکییەکان بە ئامانج بگرن. ئەوسا ئاژانە نهێنییەکانی «ئامان» لە میسر، چەند گەنجێکی جووی خۆجێی ئەوێیان بەکرێگرتن، باشتریش وابوو ئەو کەسانە لە زایۆنیستەکان بن، ئەوانەی ئامادەبوون گیانیان لەپێناوی ئیسرائیلدا بەخت بکەن. بە ڕاپەڕموون بەو کارە، «ئامان» ڕێسا پیرۆزەکانی کۆمەڵگەی هەواڵگری ئیسرائیلی شکاند: ئاخر هەرگیز نابێ جووە خۆجێییەکان بۆ ئۆپەراسیۆنی دوژمنکارانە بەکاربهێنن، چونکە بەم کارە ژیان و شوێنی نیشتەجێی سەرتاپای کۆمەڵگەی جوو دەکەوێتە بن مەترسییێکی دژوارەوە. وێڕای ئەمەش، ئەو کچ و کوڕە لاوانە هیچ مەشقێکی سەرەتاییان بۆ ئەم جۆرە ئۆپەراسیۆنانە نەبینیووە.

بۆمبەکان بەراییانە بوون، لە شووشە دروستکرابوون کە هەندێ ماددەی کیمیاییان تێدا کردبوون. ماددەی دیکەی تەقەمەنیەکان مادەیەکی لاستیکی سوتێنەر بوو، هەر کاتێک بەر شتێکی دیکە دەکەوت، دەتەقایەوە و ئاگری لێبەرز دەبووەوە، بەم جۆرە زیانێکی زۆری بە دەوروبەری خۆی دەگەیاند. ئەو جۆرە بۆمبە لاستیکییانە وەک قوڕمیشکردن بەکاردەهێندران، بۆ ئەوەی بکەرەکە بتوانێ داینێ و بەر لە تەقینەوەکەی هەڵبێ و دەربازی بێ.

نەخشەکە هەر لەسەرەتاوە شکستی پێوە دیاربوو. لە ٢٣ی تەمموزدا، دوای یەک دوو ئۆپەراسیۆنی لاوەکی، یەکێک لە بۆمبەکان لە بەرکی «فیلیپ ناتانسۆن»، ئەندامی ڕایەڵەی زایۆنستی، لە دەروازەی سینەمای«ڕیۆ» لە ئەلەکسەندەرییەدا تەقییەوە. ئیدی دەستبەجێ کابرا لە

لایەن پۆلیسەوە گیرا و لە ڕۆژەکانی دواتریشدا هەموو ئەندامانی ڕایەڵەکە قۆڵبەست کران.

«ئێلی کۆهن»یش گیرا، کەچی لە پشکنینی ئەپارتمانەکەیدا هیچ بەڵگەیەکیان نەدۆزیەوە؛ بۆیە زوو ئازاد کرا، بەڵام پۆلیسی میسر فایلێکی بۆ کردەوە. فایلەکەی بریتی بوو لە سێ وێنە و تۆمارکردنی ناوەکەی بە «ئێلی شاول جوندی کۆهن»، لەدایکبووی ١٩٢٤ ئەلەکسەندەریە، لە دایک و باوکێک بە ناوی شاول و سۆفی کۆهن، کە لە ١٩٤٩دا بۆ شوێنێکی نادیار لەگەڵ خوشک و پێنج براکانی ئێلی کۆچیان کردبوو. گومانلێکراوەکەش دەرچووی خوێندنگەی فەرەنسی و خوێندکاری زانکۆی فاروق بوو لە قاهیرە.

میسرییەکان نەیاندەزانی، کە ماڵباتی ئێلی کۆچیان کردۆتە ئیسرائیل و لە «بات یام» گەڕەکێکی دەرەوەی تەلئەبیب ئاکنجی بوونە.

سەرباری گرتنەکانیش، هێشتا ئێلی بڕیاریدا بوو لە میسر نەڕوا. لە ترسی چارەنووسی خراپ بۆ برادەرەکانی، ئێلی هەموو زانیارییێکی سەبارەت بە دەستبەسەرداگرتن، لێدان و کوتان و ئەشکەنجەدان لە زیندانەکانی میسردا کۆکردەوە.

لە ئۆکتۆبەریشدا، میسرییەکان بە ئاشکرا گرتنی "سیخوڕە ئیسرائیلییەکان"یان لە ٧ی دیسێمبەردا ڕاگەیاند و دادگاکەشیان لە قاهیرە بۆ کرایەوە. «ماکس بێنێت» یەکێ لە ئاژانە ئیسرائیلییە شاراوەکان کە لەگەڵ گرووپەکەدا گیرابوو، بە بزمارێکی ژەنگاوی کە لە دەرگەی ژوورە زیندانیەکەی خۆی کردبوەوە، دەماری بازندی دەستی خۆی بڕی و خۆی کوشت. لە دادگاکەشدا داواکاری گشتی داوای سزای لە سێدارەدانی بۆ هەندێک لە گیراوەکان کرد. ئینجا داوا و نزای سۆز و بەزەیی و

لێخۆشـبون لەلایەن «پاپـل نەنسـیۆ»   وەزیـری کاروبـاری دەرەوەی فەرەنسا، باڵوێزەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و بەریتانیا، ئەندامانی ئەنجـوومەنی لـۆرداتی بەریتـانی وەک کرۆسـمان و مـاوریس ئاوربـاچ و گەورە ڕابـاینی میسـر، بەسـەر دەسـەڵاتدارە میسـرییەکاندا بـارین... بەڵام هیچیـان دادیـان نەدا. لە ١٧ی یـانیوەری ١٩٥٥دا دادگـای نائاسـایی سـەربازی بڕیارەکـانی خـۆی ڕاگەیانـد: دوو لە گیراوەکـان بێتـاوان دەرچوون؛ دوو کەسیشیان بە حەفت ساڵ زیندان و کاری قوڕس، دووی دیـکەش بە پـازدە و دووانیشـیان بـۆ هەتـا هەتـایە حوکمـدران؛ دوو سەرکردەی ڕایەڵەکەش کە د. «موشێ مەرزوق» و ئەندازیار «شاموئیل ئازار» بوون بە لە سێدارەدان تا مردن حوکمدران. چوار ڕۆژیش دوای ئەوە لە حەوشـەی زینـدانی قـاهیرەدا بڕیارەکەیـان جێبەجێکـرد. لە ئیسرائیلیشـدا گۆبەنـدێکی شـەرمەزاری گەورە تەختـوبەختی حکـومەتی هەژانـد. ئـاخر کـێ بڕیـارێکی گەوجـانە و تاوانبـارانەی ئەو جـۆرە ئۆپەراسـیۆنەی دەرکـردووە؟ چەنـدین دەسـتەی لێکـۆڵینەوە لە سەروسۆراخکردنی وەڵامێکی کورت و گردەبڕدا شکستیان هێنا. «لاڤۆن» و «گیبلی» پەنجەی فەرمانپێکردنی کارەکەیان بۆ یەکدی ڕاهێشت. ئینجا «لاڤـۆن»ی وەزیـری بەرگـری ناچـارکرا دەسـت لەکـار بکێشـێتەوە و بنگۆریـۆن جـێگەی گـرتەوە، کە لە خۆخانەنشـینکردن گەڕایەوە؛ هەرچـی سەبارەت بە کۆلۆنێل «گیبلی»ش بوو، هەرگیز پلەکەی بەرز نەکرایەوە و ئەویش دوای ماوەیەکی کورت ڕیزەکانی سوپای بەجێهێشت.

لە میسریشدا، ئێلی کۆهین هەندێک لە دۆستە هەرە باشەکانی لەدەستدان. هەرچەندە هێشتا لە چاوی دەسەڵاتدارانەوە بە چاوی گومان لێیدەڕواندرا، بەڵام هەر لە قاهیرەدا مایەوە و بەدوای چالاکییە نهێنیەکانی خۆیدا چوو.

بەڵام دواتر لە ١٩٥٧دا، لەدوای جەنگی کەنداوی سوێسدا، بەرەو ئیسرائیل کۆچیکرد.

✡ ✡ ✡

«بات یام» ئەو شەقامە هێورە نسارە بەناوی شەهیدێکی قاهیرەوە کراوە. «ئێلی» ڕۆژانە کاتێ سەری لە ماڵباتەکەی خۆی دەدا، بەسەر ئەو شەقامەدا دەڕۆیشت. هەنگاوە یەکەمەکانی ژیانە نوێیەکەی لە ئیسرائیل ئاسان نەبوون. بۆ یەک دوو هەفتە هەر بەدوای کاردا دەگەڕا. لەچاوی ڕەوانبوون لە زمانان (عەرەبی، فەرەنسی، ئینگلیزی و تەنانەت عیبری)ش پێگەیەکی دۆزیەوە: وەرگێڕانی گۆڤارە هەفتانە و مانگانەکان بوو بۆ دەزگەی «ئامان»[161]. نووسینگەکەی ئەو لە شەقامێکی تەلئەبیب وەک ئاژانسێکی بازرگانی ڕوپۆش کرابوو. مانگانەیەکی مامناوەندی دەدرایە ئێلی: ١٧٠ پاوەندی ئیسرائیلی (٥٩ دۆلاری ئەمریکی) لە مانگێکدا. دوای چەندین مانگ لەسەر کارەکەیان دەرکرد. ئینجا یەکێک لە دۆستەکانی، کە ئەویش میسری بوو، کارێکی نوێی بۆ دۆزییەوە: ژمێریار لە زنجیرە کۆگای «هاماشبیر». هەرچەندە کارەکەش هەراسان بوو، بەڵام داهاتەکەی زیاتر بوو. لەهەمان کاتدا برایەکەی «ئێلی» بە پەرستارێکی جوان و شۆخوشەنگی بە ڕەچەڵەک عێراقی ناساند. هەفتەیەک دوای دیدارەکەیان، ئێلی «نادیا»ی هێنا، نادیاش خوشکی «سامی مێشێل» ڕۆشنبیری تازەهەڵچووبوو. ئەوەبوو دوای ئەوە سپێدەیەکیان، پیاوێک هاتە نووسینگەی ئێلی و پێیگوت:

– "من ناوم «زالمان»ە. ئەفسەرێکی دەزگەی هەواڵگرییم، دەمەوێ کارێکت بۆ بخەمەڕوو."

---

[161] وەک پێشتر ئاماژەی بۆکراوە، ئامان واتە کورتکراوەی دەزگای هەواڵگری سەربازییە.

- "چ جۆرە کارێک؟"

- " لەڕاستیدا کارێکی زۆر سەرنجڕاکێش. بەهۆیەوە زۆر سەفەری ئەوروپا دەکەی. لەوانەشە وەک ئاژانێکی ئێمە بچێتە وڵاتێکی عەرەبیش."

- ئێلی ڕەتیکردوە و گوتی: "من تازە ژنم هێناوە. نامەوێ سەفەری ئەوروپا یان هیچ وڵاتێکی دیکە بکەم."

ئەمەش کۆتایی گفتوگۆکەیان بوو، نەوەک پەیوەندیەکەیان. «نادیا»ی ژنی دووگیان بوو، دەبوایە کارەکەی خۆی جێبێڵێ. کۆگاکانی «هاماشبیر»یش یەک دوو کارمەندی خۆی دەرکردن، «ئێلی»ش یەکێک بوو لەوان. کاری دیکەشی بۆ نەدۆزرایەوە. ئەوسابوو، هەر بە ڕێکەوتیش، کە میوانێکی ناوەخت لە دەرگەی ئەپارتمانە بەکرێگیراوەکەی دا.

دیسان «زالمان» بوو.

- "باشە بۆ کارکردن لەگەڵ ئێمەدا ڕەتدەکەیتەوە؟" وای لە ئێلی پرسی. "ئێمە مانگانە ٣٥٠ پاوەند (١٩٥ دۆلاری ئەمریکی)یت دەدەینێ. شەش مانگیش مەشق دەکەی. ئەوسا ئەگەر حەزت لێبوو بمێنەوە. ئەگەر بەدڵیشت نەبوو، تۆ ئازادی."

ئەم جارەیان بە «زالمان»ی نەگوت نەخێر. ئیدی بووە ئاژانێکی نهێنی.

هەندێک لە ئامانە دێرینەکان چیرۆکەکە بەجۆرێکی دیکە دەگێڕنەوە. ئەوان دەڵێن لەو کاتەی ئێلی دەگاتە ئیسرائیل، کاری لەلای دەزگەی ئامان دەستنەکەوت، چونکە ئەو تاقیکردنەوە دەروونیەی بۆی کرا، نیشانیدا کابرا زیاد لە پێویست باوەڕی بەخۆی هەبوو. ئەو بەهرەمەند، بوێر و خاوەن یادگەیەکی زۆر نایاب بوو، بەڵام مەیلێکی لە ڕادەبەدەری

باوەڕبەخۆبونی هەبوو، لە سەرچڵییە ناپێویستیەکانیشدا بێباک بوو. ئەو خەسڵەتە جیاکەرەوانە، لەهەمان کاتیشدا بە یەکگرێدراوانە وایلێکردبوو بۆ ئامان دەست نەدا.

بەڵام لە سەرەتای شەستەکاندا، شتەکان گۆڕان. یەکەی ١٣١ی ئامان، یەکە ئۆپەراسیۆنە تایبەتییەکەی هەواڵگری سوپای بەرگری ئیسرائیل، بە پەلە و شێلگیرانە بەدوای ئاژانێکی تایبەتمەند دەگەڕان بینێرنە دیمەشقی پایتەختی سووریا. ئاخر لەو ساڵانەی دواییدا، سووریا ببووە دوژمنکارانەترین دەوڵەتی عەرەب و ببووە دوژمنی قەستەسەری ئیسرائیل. هیچ دەرفەتێکی بۆ هێرشکرنە سەر ئیسرائیل لە دەست نەدەدا. سووریا لە بەرزاییەکانی جۆلان و لە کەناراوەکانی دەریاچەی گالیلیادا بە شەڕێکی خوێناوی ڕووبەڕووی ئیسرائیل ببووەوە؛ چەندین دەستە و تاقمی تیرۆرست سنوورەکانی ئیسرائیلیان بەزاندبوو. هەنووکەش، پلانێکی لەترکزە[162]ی ئەندازیاریی دانا بۆ ئەوەی ڕووی ئاوی ڕووباری ئوردن وەربگێڕێ و ئیسرائیل لەو ئاوە بێبەش بکا.

لە کۆتایی پەنجاکاندا، ئیسرائیل پرۆژەیەکی قەبەی لوولەکێشی ئاو و نۆکەندی لەسەر ئاوی ڕوباری ئوردندا هەڵبەستبوو تا زەوییە وشکوبرینگەکانی ناوچەی نەقەبی پێ ئاودێر بکا. ئاوەکەش لە بەشێکی ڕووبارەکەوە دەهات و بەنێو خاکی ئیسرائیلدا دەڕۆیشت. پرۆژەی ئاوەکەش مرخی[163] چەندین کۆنفرانسی لووتکەی عەرەبی بۆ خۆی خۆشکرد. دەوڵەتانی عەرەب بە ڕاپەڕەوە بڕیاریاندا ڕووی ئاوەڕۆی

162 لەوانەیە بکرێ و لەوانەشە نەکرێ، بەڵام لە وشەی ڕەنگە و لەوانەیە بەهێزترە، چونکە ئەگەری ڕوودانەکەی زیاترە.

163 مرخ لێخۆشکردن: حەزلێبوون، بە پەرۆش بوون بۆ، چاوتێبڕین.

ڕووبارەکە بەرەو ئوردن بگۆڕن و پڕۆژەکەی ئیسرائیل لەجێدا بفەوتێنن؛ خودی کارەکەش بە دڵی سووریا بوو.

ئیسرائیلیش بەبێ ئاوی ڕووباری ئوردن هەڵینەدەکرد. نەدەبوایە ڕێگەی سووریا بدا بۆیە نەخشەیەکی کاردانەوەی خۆی بۆ پڕۆژەکە دارشت. ئەم کارەش پێویستی بە ئاژانێک هەبوو لە دیمەشق بێ، کەسێک کە جێی متمانە بێ، باوەڕی بە خۆی بێ و بوێریش بێ. هەر هەمان ئەو خەسڵەتانەی کە کاتی خۆی لە ئێلی کۆهندا هەبوون، کەچی دەزگەی ئامان ڕەتی کردنەوە هەنووکەش زۆر گونجاوە بۆ یەکەی ١٣١. (پازدە ساڵ دواتر، ئاشکرابوو کەوا ئامان هەوڵی لەگەڵ یەکێکی دیکە بۆ هەمان کار دابوو، ئەویش سامی میشێلی خەزووری ئێلی بوو! بەڵام میشێل ڕەتیکردبووەوە و هەر لە ئیسرائیلدا مایەوە و پاشان بووە شاعیرێکی گەورە.)

ڕاهێنانی کۆهن دوورودرێژ و تاقەتپڕوکێن بوو. هەموو بەیانییێک بە جۆرە پاساوێک، دەبووایە ئێلی لەماڵەکەی خۆی دەرچووبایە و بەرەو مەڵبەندی مەشقی ئامان بڕۆیشتبایە. بۆ چەندین هەفتە بەتەنیا یەک ڕاهێنەری هەبوو، پیاوێک بەناوی ئیسحاق. یەکەم جار فێرکرا چۆن شتەکان لەبەر بکا. ئیسحاق بە دەرزەن شتی بۆ لەسەر مێزەکە دادەنا، قەڵەمێک، دەستە کلیلێک، جگەرەیەک، ڕەشکەرەوەیەک، یەک دوو دەمبوس. ئێلیش بۆ چرکەیەک یان دووان سەیرێکی دەکردن. ئینجا دەبووایە چاوەکانی خۆی دابخا و وەسفی ئەو شتانەی بینیبوو بکا، کە بەچی دەچن. هەروەها فێرکرا کە جۆری تانک، فڕۆکە و تۆپەکانیش بزانێ و لەبەریان بکا. ئیسحاق وای پێدەگوت: "دەی با پیاسەیەک بکەین." هەردوو پیاوەکە بە شەقامێکی جەنجاڵی تەلئەبیبدا پیاسەیان دەکرد. ئیسحاقیش لەبن گوێدا چرپاندی: "ئەرێ ئەو ڕۆژنامانەی لەوێ داندراون، دەبینی؟ دەی بڕۆ ئەوێ

و سـەیری ڕۆژنامەکـان بکە ئـاخۆ چییـان تێدایە، بەڵام لەهەمـان کاتیشـدا هەوڵبدە ئەو کەسە بدۆزیەوە کە بەدواتدا دەگەڕێ." کـاتێکیش گەیشـتنەوە بـنکەی مەشـقەکە، ئیسـحاق گـوێی لە ڕاپـۆرتی ئێلـی دەگـرت و ئینجـا دەستەیەک وێنەی فڕێدەدانە سەر مێزەکە. "تۆ سـەبارەت بەم شـتە ڕاست دەکەی، ئەو لە دوای تـۆوە بـوو، بەڵام دەربـارەی ئەوەی دیکەیـان، ئەوەی لای دارەکە بوو چی دەڵێی؟ ئاخر ئەویش وەکو سایە بەدواتدا دەخشا."

سپێدەیەکیان «زالمان» بە ڕاهێنەرێکی دیکەی ناساند، ئەویش یەهودا بوو، کە فێری کرد چۆن نێرەرێکی بچوکی ڕادیۆ بەکاربهێنێ. ئینجا «ئێلی»یـان نـاردە بەر تـاقیکردنەوەیەکی جەسـتەیی و دەروونـی. دوای بەسـەرچوونی تاقیکردنەوەکـان، زالمـانیش ئێلـی بە کوڕەگەنجێـک بە نـاوی «مارسـیل کۆزین» ناساند.

ئەویش پێیگوت: "ئێسـتاش نۆرەی تـاقیکردنەوەی لە خشـتەبردنە. مارسـیل پاسـپۆرتێکی فەرەنسـی بە نـاوی جـوویێکی میسـری دەداتـێ، کە چـووەتە ئەفریقـا و ئێسـتاش وەک گەشـتیارێک هـاتۆتە ئیسـڕائیل. بەو پاسـپۆرتە دەچیتە ئۆرشەلیم و لەوێ دە ڕۆژ دەمێنیەوە. مارسیل وردەکاری تەواوت سـەبارەت بە ڕوودابۆشـینەکە، بە پاشـخانە میسـریەکە، بە خێزانەکەت، بە کـارەکەی لە ئەفریقـات دەداتـێ. لە ئۆرشەلیمیشـدا تـۆ تەنهـا بە زمـانی فەرەنسـی و عەرەبـی قسـە دەکەی. تـۆ دەبـێ خەڵکیش ببینـی، بـرادەر و دۆسـت پەیدا بکەی، پەیوەنـدی نوێ پەیـدابکەی بەبـێ ئەوەی ناسـنامەی ڕاستەقینەکەی خۆت ئاشکرا بکەی. هەروەها پێویستە لەسەرت دڵنیابی کە کەس بە دواتەوە نییە و سووسەت بکا."

«ئێلـی»ش دە ڕۆژ لە ئۆرشـەلیم مـایەوە. لە گەڕانەوەیـدا یەک دوو ڕۆژ مۆڵەتی درایێ. «نادیـا» تـازە کیژێکـی ببـوو، نـاوی «سـۆفیا»ی لێنـا بـوو. دوای «ڕۆش هاشنا» - ساڵی نوێی جووەکان - زالمان، ئێلی دایە دەست

دوو کەسی دیکە، کە ناسنامەی خۆیان بۆ ئاشکرا نەکرد. یەکێکیان بە بزەوە پێیگوت: "ئێلی، تۆ لە تاقیکردنەوەکەی ئۆرشەلیم دەرچووی. ئیدی کاتی ئەوە هاتووە کاروباری ڕاستیترت پێبسپێردرێ."

✡ ✡ ✡

لە ژوورێکی بە تاڵوحەتاڵ لە دەزگەی ئاماندا، ئێلی چاوی بە «موسلیم شێخ» کەوت، کە بە حەوسەڵەوە فێرە قورئان و نوێژەکانی موسڵمانانی کرد. ئێلی هەوڵیدا تیشکۆی هزری گردبکاتەوە، بەڵام هێشتاش هەڵەی دەکردن. ڕاهێنەرەکەش پێیدەگوت: "خەم مەخۆ. ئەگەر کەسێک هەر پرسیاری لێکردی، پێیبڵێ کە تۆ دیندارێکی تەواوعەیار نیت، تەنها هەندێ یادەوەرەی دینی تەمومژاوی سەردەمی قوتابخانەت لەبیرماون."

ئینجا ئێلی بۆ ڕاپەراندنی فرمانەکەی خرایە بەردەم کورتە تاقیکردنەوەیەک: ئاخر زۆری پێناچێ دەنێردرێتە خاکی وڵاتێکی بێلایەن، لەوێش دوای ڕاهێنانێکی سەربار، دەنێردرێتە پایتەختی دەوڵەتێکی عەرەبی.

- ئەویش پرسی: "کامەیان؟"
- "لەکاتی خۆیدا پێتدەگوترێ."
- زالمان درێژەی بە قسەکەی خۆی دا: "تۆ وەک عەرەبێک خۆت هەڵدەخەی، پەیوەندی خۆجێی پەیدا دەکەی و ڕایەڵەیەکی جاسووسی ئیسرائیلیش لەوێ دادەمەزرێنی."

ئێلیش بەبێ سی و دوو قایل بوو. ئاخر ئەو باوەڕی بە خۆی بوو، کە ئەرکەکەی ڕایی دەکا.

- ڕاهێنەرەکە پێیگوت: "پاسپۆرتێکی سووری یا عێراقیت دەدرێتێ."

- "بۆچی؟ ئاخر خۆ هیچ شتێک دەربارەی عێراق نازانم. کاغەز و بەڵگەنامەی میسریم بدەنێ."

- "ئەوە ڕێـی تێناچێ." زالمـان وای پێگـوتەوە؛ "میسـرییەکان سـەرژمێری دانیشتوانەکەی خۆیان کردۆتەوە و بەسـەر هەمـوو پاسـپۆرتە دەرکراوەکانیشـیاندا چـوونەتەوە. ئەوێ زۆر دژوارە. عێراق و سووریا ئەو جۆرە تۆمارەیان نۆژەن نەکردۆتەوە. ئەوان ناتوانن شوێنپێت هەڵبگرن و بتدۆزنەوە."

- "ناوی تۆ «کەمال»ـە. باوکیشت ناوی «ئەمین سابت»ـە، کەواتە ناوی تەواوی تۆ «کەمال ئەمین سابت»ە" دوو ڕۆژ دواتر زالمان و هاوکارەکانی بەم شێوەیەی سەرەوە ناسنامە نوێیەکەی ئێلیان بۆ ئاشکرا کرد.

ئەفسـەرانی دۆزی ئێلی وردەکاری تەواویان بۆ چیرۆکی دەمامکدراوی ئاژانە نوێکەیان ئامادەکرد. "تۆ کوڕی دایک و باوکێکی سووری. دایکت ناوی سـەعیدە ئیبراهیمە. تۆ خوشکێکت هەیە. تۆ لە بەیروت لە لوبنان لەدایکبووی. کاتێک سێ ساڵان بووی، لە لوبنان بارتان کرد و چوونە میسـر و لە ئەسـکەندەرییە نیشـتەجێ بـوون. سـاڵێک دوای ئەوە خوشکەکەت مرد. باوکت بازرگانێکی کوتاڵ بوو. لە ١٩٤٦دا مامت کۆچی کردە ئەرجەنتین. کەمێک دوای ئەوە، نامەی بۆ باوکت نووسی بانگهێشتی ماڵباتەکەی ئێوەی کرد بچنە «بۆینس ئایرس». لە ١٩٤٧دا ئێوە هەموو بەیەکەوە بەرەو ئەرجەنتین ڕۆیشتن. لەوێ باوکت و مامت بە هاوکاری کەسی سێیەم، دووکانێکی کوتاڵفرۆشتنیان کردەوە، بەڵام زۆری نەخایاند قەللۆش[164] بوو. باوکت لە ١٩٥٦دا کۆچی دوایی کرد و دایکیشت هەر

[164] قەللۆش: نابووت، ئیفلاس.

شەش مانگ دوای باوکت ژیا، ئەویش مرد. تۆش لەگەڵ مامت مایتەوە و لە ئاژانسێکی گەشتوگوزاردا کارت کرد. پاشان ڕووت کردە بزنس و خوا دەروییێکی باشی لێکردییەوە و تێیدا سەرکەوتوو بووی."

ئیدی ئێلی پێویستی بەوە هەبوو چیرۆکێک بهۆنێتەوە تا عوزرێک بۆ خێزانەکەی بهێنێتەوە. "من کارم لە لای کۆمپانیایەک دەستکەوت کە سەروکاریان لەگەڵ وەزارەتەکانی بەرگری و کاروباری دەرەکییدا هەیە." ئێلی کاتێک گەڕایەوە ماڵ وای بە نادیای خێزانی گوت. "ئەوان پێویستیان بە کەسێک هەیە سەردانی ئەورووپا بکا و کەرەستە، ئامێر و تفاقی پێویست بۆ پیشەسازی سوپای ئیسرائیلی بکڕێ و هەروەها بازاڕیش بۆ بەرهەمەکانیان بدۆزێتەوە. من زووزوو دەگەڕێمەوە ماڵ بۆ ماوەیەکی درێژیش دەمێنمەوە. من دەزانم کە دوورکەوتنەوە زۆر قورسە – بۆ هەردوو لامان- بەڵام تۆ لێرە تەواوی موچەکەم وەردەگری، ئینجا هەر چەند ساڵێکی کەمی پێدەچێ کەلوپەلی ناوماڵ لە ئەورووپاوە دەکڕین و ئەپارتمانێک ڕێکدەخەین."

لە سەرەتای فێبرایری ١٩٦١دا ترومبێلێک کە هیچ سەرنجێکی نەوروژاند، ئێلی گەیاندە فڕۆکەخانەی لۆد. پیاوێکی گەنج کە خۆی بە «گیدۆن» ناساند، پاسپۆرتێکی ئیسرائیلی ڕادەستی ئێلی کرد بە ناوی ڕاستەقینەی خۆی لەگەڵ بلیتێکی فڕۆکە بۆ زیوریخ و بڕی ٥٠٠ دۆلاری ئەمریکی.

بە گەیشتنی بە زیوریخ، ئێلی پیاوێکی پرچ سپی بینی، کە پاسپۆرتەکەی لێوەرگرت و پاسپۆرتێکی دیکەی بۆ وڵاتانی ئەورووپا بە ناوێکی دیکە دایەدەست. لەو پاسپۆرتەدا ڤیزای چوونە نێو وڵاتی چیلی بە ترانزێتی ئەرجەنتینی لێدرابوو. "لە بۆینس ئایرسدا پیاوەکانمان ڤیزەکەت بۆ درێژ دەکەنەوە." پیاوەکە وای بە ئێلی گوت و بلیتێکی فڕۆکەشی بۆ سانتیاگۆ کە لە بۆینس ئایرسدا دەوەستا، دایەدەست. "بەیانیش تۆ دەگەیتە بۆینس

ئایرس. بۆ ڕۆژی پاشتریش، سەعات یازدەی پێش نیوەڕۆ، دەبێ بچیتە قاوەخانەی «کۆرییێنتس». لەوێ پیاوەکانی ئێمە دەبینی."

ئێلی گەیشتە پایتەختی ئەرجەنتین و لە هوتێلێک دابەزی. بۆ بەیانییەکەی سەعات یازدە لە شوێنی دەستنیشانکراو، پیاوێکی پیر هاتە سەر مێزەکەی لە قاوەخانەی کۆرییێنتس و خۆی بەناوی ئابراهام پێناساند. ڕێنمایی دایە کۆهن کە پێویستە بچێتە ئەپارتمانێکی ڕاخراو[165]، کە پێشتر بۆ ئەو بەکرێگیرابوو. مامۆستای خۆجێی ئەوێ پەیوەندی پێوەدەکا و زمانی ئیسپانی فێردەکا. ئابراهام پێیگوت: "تۆ هیچ خەمێکی دیکەت نەبێ من مشووری باری داراییەکەت بۆ دەخۆم."

دوای سێ مانگان، ئێلی بۆ هەنگاوی داهاتوو ساز و ئامادە بوو. تا ڕادەیەک بە باشی بە ئیسپانی قسەی دەکرد، بۆینس ئایریس باش شارەزا ببوو. جلوبەرگ و ڕەفتاریشی وەک ئەو هەزاران عەرەبە کۆچبەرە بوو کە لە پایتەختی ئەرجەنتین دەژیان. ئینجا ڕاهێنەرێکی دیکە فێری کرد بە زمانی عەرەبی و بە زاراوەی سووری قسە بکا.

دیسان ئابراهام لە هەمان قاوەخانەدا ئێلی بینییەوە، ئەمجارەیان پاسپۆرتێکی سووری بەناوی «کەمال ئەمین سابت» ڕادەستکرد. ئینجا پێیگوت: "تۆ دەبێ لە کۆتایی هەفتەدا ناوونیشانەکەت بگۆڕی. حیسابی بانکێکیش بەو ناوە بکەرەوە. سەردانی چێشتخانە عەرەبییەکانیش بکە، بڕۆ ئەو سینەمایانەی کە فیلمی عەرەبی لێدەدەن، سەرێ لە یانە سیاسی و کلتوورییە عەرەبەکانیش بدە. تۆ پیاوێکی کارامەی، بازرگان و بزنسمانێکی لێهاتووی. تۆ کاروباری هێنان و ناردن دەکەی، لە هەمان کاتیشدا سەرت لە گواستنەوە و سەرمایەگوزاریش دەردەچێ. باربووی

[165] ڕاخراو: مجهز، ئەو خانووانەی بە کەلوپەلی ماڵەوە بۆ بەکرێدان ئامادەن.

بەخشندانەش پێشکەشی فەندە خێرخوازەکانی کۆمەڵگەی عەرەبی بکە. دەی بەختێکی باش!"

✡ ✡ ✡

هەر بە ڕاستیش سیخوڕە ئیسرائیلیەکە بەختێکی زۆری هەبوو. لە ماوەی چەند مانگێکی کەمدا، ئێلی کۆهن سەرکەوتووانە دزەی کردە نێو کۆمەڵگەی سووریە عەرەبەکانی بوێنس ئایرس. ڕووە خۆشەکەی، بڕوابەخۆبوونەکەی، هەستی خۆڕسکی خۆی و سەروەت و سامانی، سەرنجی ژمارەیەکی باشی لە عەرەبەکان بۆ لای خۆی ڕاکێشا، لەنێویشیاندا هەرە گرنگەکانیان لە ئەرجەنتین. بۆیە هەر زوو لەنێو بازنەی عەرەبەکان بووە بیچمێکی ناسراو. خالی وەرچەرخانیشی لەو جۆرە ئاشنابوونانەدا لە یانەیەکی موسڵماناندا بوو، کاتێ شەوێکیان پیاوێکی بە ڕێزی شکۆداری، شیکپۆشی سەر ڕووتاوەی سمێڵ پڕی ناسی. ئەو خۆی وا پێناساند کە «عادل لەتیف حەسەن»ی نووسەر لە گۆڤاری جیهانی عەڕەبی چاپی ئەرجەنتینە. حەسەنیش بە قووڵی کەوتبووە ژێر کارانگازێتی کەسایەتی سووریە کۆچبەرەکان و ئیدی هەر دوو پیاوەکە بوونە دۆستی لەیەک نزیک.

ئەو بۆنانەی بەشەو لەو یانانە دەکران لە کۆچبەرە عەرەبەکان جمەی دەهات و ئینجا بە هاتنەڕیزی دەمڕاستەکانی کۆمەڵگاکەش بەزمەکانیان خۆشتر و گەرموگوڕتر بوون. ئێلی ناوی لە لیستی میوانەکانی باڵوێزخانەی سووریدا نووسرا و لە ئاهەنگێکی نایابیشدا بانگهێشت کرا. لە ئاهەنگە فەرمییەکەی باڵوێزخانەکەدا حەسەن قۆڵی کەمالی دۆستی گرت و بردییە لای کابرایەک، کە دیاربوو ئەفسەربوو، جلێکی ژەنەراڵانەی سووری لەبەرکردبوو. "دەی با سوورییێکی دڵسۆزی نیشتمانپەروەرتان پێبناسێنم." حەسەن وای بە ژەنەڕاڵەکە گوت. ئینجا ڕووی خۆی لە ئێلی

کرد و ئەوەندەشی بۆ زیاد کرد: "دەی، ژەنەڕاڵ ئەمین ئەلحافز، پاشکۆی سەربازی باڵوێزخانە بناسە."

پێدەچوو ئێلی دوایین قۆناغی خۆی بڕیبێ و کەسایەتی ئەفسانەیی خۆی سەلماندبێ. ئیدی کاتی ئەوە هاتبووە هەر ئەرکی سووسکاریی ڕاستەقینەی خۆی ڕاییبکا. ئێلی لە تەمموزی ١٩٦١دا بە کورتی و بە نهێنی ئابراهامی بینییەوە. بۆ ڕۆژی پاشتر ئەو چووە نووسینگەی حەسەن. "من نەخۆشم و لە ژیانی ئەرجەنتینیش هەراسان بووم." بەم جۆرە دەردەدڵی خۆی لای حەسەن کرد. ئاخر ئەو سووریای لە هەموو شوێنێکی دیکە زیاتر خۆشدەویست، دەیویست بۆی بگەڕێتەوە. باشە تۆ بڵێی حەسەن یارمەتی بدا و چەند نامەیەکی ڕاسپاردەیی بۆ بنووسێ؟ نووسەرەکەش دەستبەجێ چوار نامەی بۆ نووسین: یەکێکیان بۆ زاواکەی خۆی لە ئەلێکسەندەریە، دوو نامەش بۆ برادەرەکانی لە بەیروت (یەکێکیان بانکەوانێکی باڵای دەستڕۆیشتوو بوو)، نامەی چوارەمیشی بۆ کوڕەکەی خۆی لە دیمەشق نووسی. ئێلی سەردانی برادەرە عەرەبەکانی دیکەشی کردن، ئیدی جانتاکەی پڕی نامەی پەرۆشی و جۆشوخرۆش و ڕاسپاردە بوون، لەلایەن دەمڕاستەکانی کۆمەڵگەی عەرەبی بۆینس ئایرسەوە نووسرابوون.

✡ ✡ ✡

لە کۆتایی تەمموزی ١٩٦١دا، «کەمال ئەمین سابت» بەرەو زیوریخ فڕی، لەوێش فڕۆکەکەی بۆ میونخ گۆڕی. لە فڕۆکەخانەی پایتەختی باڤاریادا، ئاژانێکی ئیسرائیلی بە پیرییەوە چوو. ئاژانەکەش ناوی «زێلینگەر» بوو. ئەویش پاسپۆرتە ئیسرائیلییەکەی ئێلی دایەوە لەگەڵ بلیتێکی فڕۆکە بۆ گەشتە فڕین بۆ تەلئەبیب. لە سەرەتای ئابدا ئێلی گەڕایەوە ماڵێ. بە «نادیا»ی هاوسەری گوت: "چەند مانگێک لە ماڵ دەمێنمەوە."

مانگەکـانی بەدوایـدا هـاتن کەوتە ژێـر مەشـق و ڕاهێنـانێکی چڕوپـڕ. ڕووپۆشەکەی ئێلی تەواوعەیار بوو، زۆر بە دروستیش چووە نێو بەرگی ناسـنامەی کەسـایەتییە نـوێکەی. ڕاهێـنەرە رادیـۆییەکەی گەڕایەوە، کۆدەکانی ناردنی ڕادیۆیی فێرکرد. دوای یەک دوو هەفتە توانی لە یەک خولەکدا دوازدە تا شازدە وشە بەکۆدە فێرکراوەکەی ڕادیۆ وەربگرێ. ناچاریش کرا کتێب و بەڵگەنامە لەسەر سووریا، سوپاکەی، چەکەکانی و ستراتیژیەکەی بخوێنێتەوە. دوای ڕاگەیاندنە شایستەکان هەر بە خۆیشی بووە شارەزا لەبارەی سیاسەتی ناوەخۆی سووریا.

لە دیسـێمبەری ١٩٦١دا، جـارێکی دیـکە بەرەو زیـوریخ فـڕییەوە، بەڵام ئەمجارەیان دوا ئامانجی گەشتەکەی دیمەشق، لانەی شێر بوو.

لەگەڵ لاوازبوونی ڕژێمی سووریادا، گرژیەکانی سەرسنووری سووریا-ئیسـڕائیل پەرەیـان سـەند. هەر لە ١٩٤٨ەوە، زنجیـرەیەک کودەتـای سەربازی وڵاتەکەی هەژاند. زۆر بە دەگمەن دیکتاتۆری سووری لەسەر پێخەفی خۆی بە مردنی خۆی دەمرد، دەبوایە بە ملی هەڵواسراو بە سێدارەوە بمرێ، یان لە بەرانبەر دەستەیەک چەکدار ڕابگیرێ و گولله باران بکرێ، یاخود بە دەستی پێشخزمەتێکی بکوژ بفەوتێ. ناسەقامگیری وڵاتەکە بەردەوام پشـێوی زۆری بەدواوەبـوو. زۆر جـاران بـۆ ئەوەی سەرنجی خەڵکەکە لەسەر کاروباری شەپڕێوی ناوەخۆ لاببەن، سەرکردە سوورییەکان بە دەستی ئەنقەست چەند ڕووداوێکیان لەسـەر سنوور لەگەڵ ئیسڕائیل دروست دەکرد. لەسێدارەدانیش بە ئاشکرا و لە گۆڕەپانی پڕ حەشاماتی خەڵکی دەکرا. یەک بەدوای یەک تۆمەتبارەکانیان لە قەنارە دەدان، لە داردەرەکەش تابلۆی تاوانبارکردنی بە بەرۆکی قوربانییەکەوە دەکرد بەوەی سیخوڕ، دوژمنی دەوڵەت یاخود لایەنگری ڕژێمی پێشووە. زۆر نەبوو کە ئێلی گەیشتە دیمەشق، دیسان کودەتایەکی دیکە لە ٢٨ی

ئەیلوولی ١٩٦١دا کرابوو، ئەمجارەیان کۆتایی بەو یەکێتییە کەم تەمەنەی نێوان سووریا و میسر هێنا، کە بەناوی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو بانگدەکرا.

بەرلەوەی ئێلی بەرەو ئەنجامدانی ئەرکەکەی بڕوا، چاوی بە زالمان کەوتەوە، ئەو زالمانەی کە لە هەموو شوێنێک حازر بوو، ئەویش ڕێنمایی وردی دایێ: "«زێلینگر»، پیاوەکەی ئێمە لە میونیخ، نێرەرێکی ڕادیۆت دەداتێ. دوای ئەوەی دەگەیتە دیمەشق، کارمەندێکی سەر بە ڕادیۆی سووریا بۆ هاوکاری پەیوەندیت پێوە دەکا. ئەویش وەک تۆ 'کۆچبەرێک'ـە، لە مێژیش نییە لە سوریا جێگیر بووە. ئەو ناسنامەی ڕاستەقینەی تۆ نازانێ. تۆش هەوڵ مەدە ئەو بدۆزیتەوە! ئەو خۆی لەکاتی خۆیدا پەیوەندیت پێوەدەکا."

لە میونیخ «زێلینگر» پاکێجێکی سەرنجڕاکێشی کەلوپەلی سووسەکاری دایێ: دەستەیەک کاغەز، کە لەسەر لاپەڕەکانی بە مەرەکەبی نەبیندراو کۆدەکانی نێرەری ڕادیۆی لەسەر نووسرابوو؛ چەند کتێبێک کە وەک کۆدی نێرەرەکە بەکاریان بهێنێ؛ ئامێرێکی تایبەتی پیتنووسین؛ ترانزیتەرێکی ڕادیۆ کە نێرەریشی تێدابوو؛ مەکینەیەکی کارەبای ڕیشتاشین کە وایەری کارەبایەکەی وەک ئالیێرێکی ترانزیتۆرەکە کاری دەکرد؛ داروکەی دینامیت کە لەنێو سابوونی یاردەلی شاردرابووەوە لەگەڵ جگەرە؛ هەروەها لەگەڵ چەند حەبێکی نوقڵئاسا بۆ باری هەرە ناچار و پێویست بۆ خۆکوشتن...

ئێلیش بە دەست ئەو پرسیارە دۆش داما، چۆن بتوانێ ئەو هەموو شتانە لەگەڵ خۆی بگەیەنێتە سووریا، لەو کاتەی کۆنترۆڵی گومرگ و کۆچبەران زۆر توندوبەندە.

زێلینگەریش بەرسڤی دایەوە: "تۆ شوێنێک لەسەر کەشتی «ئاستۆریا» دەگری کە لە سەرەتای یانیوەریدا، لە گێنوای ئیتالیاوە بەرەو بەیروت دەڕوا. لەوێ لەسەر کەشتییەکە یەکێک پەیوەندیت پێوەدەکا. ئەو یارمەتیت دەدا تا لە کۆنترۆلی سەرسنوری سووریا دەرباز دەبی."

پاشان ئێلیش چووە سەر پشتی کەشتی ئاستۆریا. بەیانیەکیان کاتێ ئەو لەنزیک گرووپێک لە ڕێبوارە میسرییەکان دانیشتبوو، پیاوێکی لێ نزیک بووەوە و شتێکی بەسرتەوە پێگوت: "دەی بەدوام کەوە." ئێلیش لە شوێنی خۆی هەڵسا و لە لای گروپەکە ڕۆیشت. پیاوەکە پێیگوت: "«ناوم مجید شێخ الئارد[166]»ـە. ترومبێلیشم پێیە." ئەمەش ئاماژەیەک بوو بەوەی لەسەر کەنارەکە تا دیمەشق بە ترومبێل دەیگەیەنێ.

ئەلئارد پیاوێکی باڵاکورت و شەرمن، ڕێکخەری کاروباری بزنسمانی نێودەوڵەتی ناسراو بندیواری[167] دیمەشق بوو. کابرا ژنێکی جووی میسری هێنابوو، هێشتاش هەر ئەوەی لێبژارد کە لە ئاڵمانی قۆناغی دوای نازییەکان بژیێ. خەسڵەتە خۆگۆڕی و بە چڵێسیەکەی وایلێکردبوو بە هاوکارێکی ناقۆڵا دیاربوو، ئەمەش سەرنجی دەزگەی هەواڵگری ڕاکێشا، کە هەر زوو بیکەنە ئاژانێک، هەرچەندە ئەو هێشتا پەیشی پێنەبردبوو. ئەو بڕوای وابوو کە کار لەگەڵ باڵی زێدەڕەوی ڕاستڕەوەکان دەکا کە بە دەمامکدراوی خەبات دەکەن. بەڕاستیش بڕوای بە لێهاتوویی ئەفسانەیی «کەمال ئەمین سابت» هەبوو، لە ساڵەکانی بەدوایداهاتن، بووە یارمەتیدەرێکی گەورەی سووسەکاری ئیسرائیلی.

---

[166] Majeed Sheikh Al-Ard

[167] لێرەدا وشەی بندیوارم بۆ کابرایەک بەکارهێناوە کە لە ڕواڵەتدا هەبێ و لە ڕاستیشدا وەها نەبێ. لە سایەی سەری گەندەڵکارانی هەرێم، ئەم وشەیە بەو ناوەڕۆکەوە بۆ فەرهەنگی زمان زیادبووە!

یەکەمین ئەرکیشی ئەوەبوو کەلوپەلەکانی کەمال سابت بە مسۆگەرییەوە لە کۆنترۆلی سووریەکان لە سنووەرەوە بۆ دیمەشق دەرباز بکا.

لە ١٠ی ینایری ١٩٦٢دا ترومبێلەکەی «ئەلئارد» لە بەیروتەوە هات، لەسەر سنوری سووریا وەستا. لە سندووقی ترومبێلەکەشدا تەواوی ترانزیتەر و نێرەری رادیۆ و کەلوپەلەکانی لەنێو جانتاکەی ئێلی کۆهندا بوون. ئێلیش لەسەر کورسی تەنیشت شێخ ئەل ئارد دانیشتبوو.

کاتێک ئەلئارد گەیشتە سەر هێڵی سنوورەکە گوتی: "ئێمە دەچین «ئەبو خەلدون»ی دۆستمان دەبینین. ئەو کەوتۆتە تەنگژەیەکی دارایی. بەدڵنیاییەوە پێنجسەد دۆلار بارە لارەکەی ڕاست دەکاتەوە."

بەم جۆرە ٥٠٠ دۆلار لەبەرکەی ئاژانە ئیسرائیلیەکە بۆ بەرکەی ئەبو خەلدون، پشکنەرەکەی گومرگی سەرسنوری سووریا ڕۆیشت. ئینجا داری بەربەستی زاڵگەکە بەرزکرایەوە، ترومبێلەکەش بەنێو بیابانەکە ملی لێنا. ئیدی ئێلی گەیشتە سوریا.

لە دیمەشقی جەنجاڵدا، کە سیخناخە لە مزگەوت و بازاڕی ڕەنگین بەنگین، شتێکی زەحمەت نەبوو لەنێو گوڕدەمی خەڵکەکەدا بتاوێیتەوە و ون ببی. بەڵام ئێلی تەواو پێچەوانەکەی دەویست. ئەو خوازیاربوو هەرچی زووە سەرنجی لێبدرێ و بەرچاو بکەوێ. بۆیە ڤیلایەکی کەشخەی لە گەڕەکی «ئەبو ڕامن»ی ڕاقی، لە نزیک بارەگای سەرەکی سوپای سوریادا بەکرێگرت. لەسەر قەپەنگی ڤیلاکەشدا، ئێلی دەیتوانی چاودێری دەروازەی میوانلەخۆگری کاربەدەستانی میری بکا. خانووەکە لەنێو باڵوێزخانە بیانییەکان و خانووی بزنسمانە دەوڵەمەندەکاندا بوو. ئینجا دەستبەجێ کەلوپەلە هەمەڕەنگە نهێنییە شاراوەکانی دەرهێنان و لە شوێنە جۆربەجۆرەکانی خانووەکەی شاردنەوە. بۆ دوورخستنەوەی مەترسی

شـۆفار بەسـەر خـۆی و گـوێهەڵخەر لەنێـو مـاڵەکەی خـۆی، بڕیاریـدا لە هێنانی پێشخزمەتان دووربکەوێتەوە و بەتەنیا بژیێ.

ئەو دیسان بەخت یاری بوو. ئەو لە کاتوسـاتی لەباردا گەیشـتە دیمەشـق. کۆمـاری یەکگرتـووی عەرەبی ڕووخـا، سـەرۆک جەمـال عەبدولناسـریش وەک سـووکایەتییێک بە کەسـی خۆی و بۆ میسـری لەقەڵەم دا. سـەرکردە سووریەکان بە سیاسـی و سـەربازییەکانیانەوە مەترسـی ئەوەیان لەسـەر بـوو کە کودەتـایەکی پیلانگێـڕی میسـرییەکانیان لەسـەر بـێ، پرسـی سـیخوڕێتی ئیسـڕائیلیان لە ئەجێنـدادا نەبـوو. لە دیـوێکی دیکەشـەوە، بە توندی حەوجەداری[168] هاوپەیمانی نوێ، پشـتگیری، سـەرچاوەی پاڵپشـتی چ لەنێو سووریەکانی ناوەخۆ یاخود لەنێو ڕیزی کۆچبەرە سـووریەکانی ئەودیـو زێیەکـانەوە بـوون. کەمـال ئەمـین سـابت، ئەو ملیـۆنلێرە نیشـتمانپەروەرەش کە بە کۆمەڵێـک نـامە و ڕاسـپاردەوە چەکـدار بـوو، کاڵابوو بە قەد باڵای ئەوکات.

ئێلی کۆهن خێرا و بەکارایی ڕایەڵەی پەیوەندیەکانی خـۆی ڕاچاند. نـامە ڕاسـپاردەکانی هەر زوو دەروازەکـانی کـۆمەڵگەی پـلە بـاڵا، دەرگەی بانکەکـان و بـازنەی بازرگـانی کە کەوتبـوونە بـن بانـدۆری کوودەتـاکەی ٢٨ی سـێپتێمبەر بـۆ کـردنەوە. بـرادەرە نوێیەکـانی ئێلـی، ئەویـان بە کاربەدەسـتانی حکوومەت، بە ئەفسـەرە پلە باڵاکـان و بە سـەرکردەکانی حیزبی حکومڕان ناساند. دوو لە بزنسمانە دەوڵەمەندەکان حەزیان لێبوو ئەو ملیۆنێرە گەنجە کەشخەیە لێیان نزیک بێتەوە، منێیان دەکرد یەکێ لە کچەکانیان بخوازێ. بۆ نمایشکردنی دەستکراوەیی خۆیشی، کەمال ئەمین سابت بە برە پارەی زۆرەوە باربووی دروستکردنی چێشتخانە و ناندینی

---

[168] حەوجەدار: حەوجە: پێویست، ئەو کەسەی پێویستی بەشتێکی دیکە هەیە.

جەمــاوەری بــۆ هەژارەکــانی دیمەشــق پێشکەشــکرد. ئیــدی ناســرانە پڕجەماوەرییە نوێیەکەی، دەرگەی بازنەکانی حکوومەتی لەسەردا کردەوە؛ کەچــی هێشــتاش ئەو خــۆی بە دووردەگــرت لەوەی دەسەڵاتبەدەســەتە نوێیەکانی سووریا بناسێ، چونکە هەستێکی خۆزایی وای هەبوو کە ئەمە هەر بۆ ماوەیەکی کاتییە. سوریا هێشتا لە پاشخانی لەیەکجیابوونەوەی یەکێتیەکەی لەگەڵ میسردا دەکولا و دەهەژا.

مانگێک دوای گەیشتنی ئێلی بە دیمەشق، «جۆرج سەلیم سەیف» کە بەرپرسی پەخشی ڕادیۆی دیمەشق بوو لە هەندەران سەردانی ئێلی کرد. ســەیفیش ئەو کەســەبوو کە زالمــان لە دوایــن هەواڵــی پێڕاگەیانــدن لە ئیسرائیلدا ناوی هێنا بوو. سەیف ماوەیەک بەر لە کەمال ئەمین سابت گەڕابووەوە سووریا. ئەمەش لەبەر پێگەکەی خۆی بوو، ئاخر دەیتوانی زانیاری سەبارەت بە دۆخی سیاسی و سەربازی بداتە ئێلی. سەیف ڕێنمایی نهێنی وەزارەتی پڕوپاگەندەشی نیشانی ئێلی دا، بەوەی ئاخۆ چ شتێک پەخش بکرێ و چ شتێکیش لە جەماوەر بشاردرێتەوە. کاتێکیش ئاهەنگ و بۆنە لەماڵی سەیف ساز دەدران، ئێلی چەندان کاربەدەستی پلە بالاو سیاسەتوانە بەناوبانگەکانی بینین.

سەیفیش هەروەک ئەلئارد مەتەڵی ناسنامەی ڕاستەقینەی ئێلی کۆهینیان نەدەزانــی. ئەویــش هەر بــڕوای وابــوو، کە کەمــال ئەمــین ســابت نیشتمانپەروەرێکی دڵسۆزە و خاوەن ئەجندایەکی سیاسیانەی خۆیەتی.

ئێلی پەی بەوە برد کە تەنیاترین سیخوڕە لە دنیادا، تەنانەت یەک دۆست و متمانەپێکەریشی نییە؛ ئەو نەشیدەزانی ئاخۆ ڕایەڵەی دیکەی ئیسرائیلی لە دیمەشقدا هەن یان نا. ئەو پێویستی بەوە بوو دەماری پۆڵایینی هەبن بۆ ئەوەی بەرگەی ئەو هەموو دڵەڕاوکێ و دابڕانە سامناکییەی بگرێ و بەگوێرەی میلی کاتژمێریش بۆ بیست و چوار سەعات ڕۆڵە دژوارییەکەی

خۆی ببینێ. ئەو دەیزانی تەنانەت لەو سەردانە دانسقانەی بۆ نیشتمان و بۆماڵەوەش دەیکا، نابێ نهێنییەکە بۆ ژنەکەشی بدرکێنێ، بەڵکو دەبووایە ئەویش لە خشتە ببا.

ئیدی دەستی بە پەیامناردنەکانی خۆی کرد لە سەعاتی هەشتی بەیانی هەندێ جارانیش لە ئەنگۆرەدا وایدەکرد. دەزگەی ناردنی پەیامەکانی لەبن میچی خانووەکەیدا شاردبوویەوە. نێرەرەکەی هەر لەنێو ڤێلاکەی خۆیدا بوو، کە زۆر لە بارەگای سەرەکی سوپاوە نزیک بوو، بە جۆرێک لەو دەوروبەرە بەبێ کۆتایی پەیام دەنێردران. هیچ کەسێکیش جیاوازی لەنێو پەخشی ئێلی و ئەو پەیامانەی لە پەیوەندییەکانی بنکەکانی سوپا لەگەڵ یەکدی و بارەگای سەرەکییدا نەدەکرد.

دوای شەش مانگ لە گەیشتنی بە دیمەشق، کەمال سابت ئەمین بووە بیچمێکی ناسراو لەنێو کۆمەڵگە پلەباڵاکەی دیمەشقدا. ئینجا بڕیاریدا بۆ "کاروباری بزنسەکەی" سەردانی هەندەران بکا. سەرەتا بەرەو ئەرجەنتین فڕی، لەوێ چەندین دۆستی عەرەبی بینین، ئەوسا گەشتی بەرەو ئەورووپا وەرسووڕاندەوە، لەوێ هەم پلان و هەم ناسنامەی خۆیشی گۆڕی، پاشان لە شەوێکی گەرمی هاویندا لە فڕۆکەخانەی لۆدی ئیسرائیلی دابەزی. بە دەستەدیاری "بازرگانێکی گەڕۆک" گەڕایەوە ئەپارتمانە سادەکەی خۆی لە بات یام، کە نادیا و سۆفیا چاوەڕێیان دەکرد.

هەر چۆنێکیش بێ لە کۆتاییدا بەرەو ئەورووپا فڕیەوە. یەک دوو ڕۆژ دواتر، کەمال ئەمین سابت گەیشتەوە دیمەشق. لەماوەی مانەوەی لە ئیسرائیلدا، کاربەدەستانی سەرووی خۆ لە دەزگەی ئامان کامێرایەکی هەرە بچکۆلەیان دایە بەڵکو وێنەی شت و بەڵگەنامەکانی پێبگرێ. ئەویش دەبووایە لە دیمەشق مایکرۆ فیلمەکەی خستبایە سندوقێکی بەنرخی

پارچەکـــانی تـــاوڵە. ســـندووقەکە لە ســـەدەف و دارعـــاجی ڕەنگـــین دروستکرابوون بە جوانیش ڕازابوونەوە. دەکرا ڕازاندنەوە مۆزائیکییەکە هەڵبکۆڵـدرێ و مـایکرۆفیلمەکەی تێـدا حەشـار بـدرێ. کەمـال دەبـوایە سندوقی تاوڵەکەی بۆ برادەرێکی بنێرێتە ئەرجەنتین، ئەویش بە پۆستی دیپلۆماسی ڕەوانەی ئیسرائیلی دەکردەوە.

هەندێک لەو بەڵگەنامە بەراییانەی ئێلی ناردبوونییەوە، ڕاپۆرتگەلێک بوون سەبارەت بە پشێوی نێو سوپا و بەرزبوونەوەی هێز و دەسەڵاتی حیزبی بەعسـی سۆشیالیسـت (یاخیبووەکـان) بـوو. ئێلـی هەسـتی بە گـۆڕانێکی قووڵی میزاجی سووریا کرد، لێشگەڕا هەستی خۆڕسکی خۆی ڕێنوێنی بێ. ئیدی پەیوەندییێکی تۆکمەی لەگەڵ سەرکردە بەعسیەکان گرێدا و بە بڕە پارەیەکی زۆریشەوە باربووی حیزبەکەی کردن.

ئەو لە بنـی کـدووی دابـوو. لە ٨ی مـارتی ١٩٦٣دا، کودەتـایەکی نـوێ دیمەشقی هەژاند. سوپا بەسەر دامەزراوە حکوومییەکانی دادا و حیزبی بەعس دەسەڵاتی گرتە دەست. ژەنەڕال «حـافز»، دۆستە کۆنەکەی، هـی سەردەمی بۆینس ئایرس لە کابینەی «صلاح البیطار»دا کرایە وەزیری بەرگری. لە تەممووزیشدا کودەتایەکی دیکە بەرپا بووەوە، ئەمجارەیان لەنێـو ڕژێـمەکە خۆیـدا بـوو. ئەمجارەیـان «حـافز» بـووە سـەرۆکی ئەنجـوومەنی سـەرکردایەتی شـۆڕش و مەزنـی وڵاتەکە. پـێگەی بـرادەرە هەرە لەپێشـــەکەی کەمـــال ســـابت بـــۆ کـــابینە و قـــووچەکی ســـوپا چارەنووسساز بوو. ئیدی سیخوڕە ئیسرائیلییەکە هەنووکە بووە ئەندامی بازنەی ناوەخۆی دەسەڵات.

✡ ✡ ✡

ئــاهەنگێکی بە شــەوق و زەوق لە دیمەشــق. هەر ترۆمبێلــی کەشــخەی وەزیرەکــان بــوو یەک لە دوای یەکـدا دەگەیشــتنە ڤـێلا پەرشــوبڵاوەکە. ڕیزێکـی درێـژ لە میوانـان بە جلـوبەرگی کەشـخە و جلـی یەکپۆشـی بە بـاقوبریقەوە لە مـاڵەکە هـاتنە ژوور، لە دەروازەکەشـدا خـانەخوێیەکە بە گەرمـی پێشـوازی لێـدەکردن. جـا بڵـێ کـێ لە لیسـتی بانگهێشـتکراواندا نەبــووبێ! چەنــدین وەزیــر، لەنێویانــدا وەزیــری بەرگــری و وەزیــری چاکســازی کشــتوکاڵی؛ ژمــارەیەکی زۆر لە ژەنەڕاڵ و کۆلۆنێلەکــان، سەرکردەکانی حیزبی بەعس، بزنسمان و دەوڵەمەندەکان. زۆریـان لەوان لە دەوروبەری کۆلۆنێل «سالم حاتەم» بوون، ئەو ئەفسـەرەی لە شـەوی کودەتایەکەدا فەرماندەی تانکەکانی کردبوو لە دواییشدا ژەنەڕاڵ حـافزی گەیاندە سەرۆکایەتی. خودی سـەرۆک حـافزیش بە درەنگەوە گەیشت. بە گەرمـــی دەســـتی خـــانەخوێکە کە کەمـــال ئەمـــین ســـابت، بـــرادەرە خۆشەویستەکەی بـوو، گوشـی. سـەرۆک بە یـاوەری خـانمەکەی خـۆی هاتبوو، کە چاکەتێکی گرانبەهـای کەوڵە ڕێوی نەرمونیانی بەسـەر شـاندا دابوو، کە لە لایەن کەمـال ئەمینەوە وەک دیاریەک بە سوپاسگوزارییەوە بە نـاوی کـۆچبەرە سـووریەکان پێشـکەش بە سـەرۆک و خێـزانەکەی کرابـوو. ئـاخر خـۆ هەر خـانمەکەی سـەرۆک بەتەنیـا نەبـوو، ئەو جـۆرە دیاریانەی بۆ هاتبێ. چەندین خانم کە لەوێ ئاڵتونیان لە خۆدابوو، زۆر لە ئەفســەرە پــلە باڵاکــان کە بە ترۆمبێلــی کەشــخە کەشــخەوە هــاتبوونە ئـاهەنگەکە، دیـاری و خەڵاتـی کەمـال ئەمـین سـابت بـوو بۆیـان. دەڵاڵە سیاسـەتوانە گرنگەکـانی وڵات پـارەی کەمـال سـابتیان خسـتبووە ژمـارە حیسابی خۆیان و کاریان پێدەکرد.

لە ژوری دانیشتنیشـدا، دەسـتەیەک لە کاربەدەسـت و ئەفسـەرانی سـوپا، تــاوتوێی دۆخــی ســەربازیان دەکــرد؛ ئەوان دەســتەیەکی دیکەشــیان لە

بەڵێندەر و ئەندازیاران، ئەوانەی لە پرۆژە مجێزە بەرزەفرەکەی گۆڕینی ڕێڕەوی ئاوی ڕووباری ئوردن کاریان دەکرد، چوونەپاڵ. لەو هۆڵە بەربەرینەدا، بەڕێوەبەرانی حکوومەت، سپۆنسەرانی ڕادیۆی دیمەشق و سەرانی وەزارەتی پڕوپاگەندەش بەیەکەوە وەستابوون. کەمالیش ببووە یەکێک لەوان، ئاخر حکوومەت داوای لێکردبوو هەندێک وێستگەی پەخشی ڕادیۆ بۆ کۆچبەرانی هەندەران دابنێ. کەمالیش ڕادیۆیەکی دیکەی هەبوو، پرسە سیاسی و ئابورییەکانی وڵاتی لێدەدایەوە.

ئاهەنگەکە وەک ئاهەنگەکانی دیکە پارەیەکی زۆری تێچوو، بەڵام خۆ ئەو هەر چاویشی لەبەر نەترووکاند. ئاخر ئەو گەیشتبووە لووتکەی سەرکەوتن و پێدەچوو هیچ دەرگەیەک نەبێ بە ڕوویدا نەکرێتەوە. ئەو برادەری باشی لەنێو بارەگای سەرەکی سوپادا هەبوو، بەردەوامیش بەشداری لە کۆبوونەوەی حیزبی بەعسدا دەکرد بۆ دارشتنی سیاسەتەکەیان.

ئێلی بەردەوام بوو لەسەر ناردنی ڕاپۆرتە خەسڵەت سەربازییەکان بۆ ئیسرائیل کە خۆیان لە ناو و کار و پێگەی ئەفسەرە پلە باڵاکان، ناوونیشانی هەرە نهێنی سەربازی و بابەتەکانی دیکە دەگرتەوە. ئەو وێنەی نەخشەی سەربازیشی کرد و ڕەوانەی کردنەوە، زۆربەشیان نەخشەی ڕەشنووسی بەرەی پێشەوە و سەر سنووری ئیسرائیلی بۆ دەزگەی «ئامان» نارد. ئەو ڕاپۆرتی لەسەر چەکی نوێش کە بۆ سوپای سووریا هاتبوو، نارد. هەروەها توانستی لەخۆگرتنی ئەو چەکانەی لە لایەن سوورییەکان و تا چەند لە بەکارهێنانیدا مەعلانن، بۆ ئیسرائیل ناردەوە. چەند مانگێک دواتر، ژەنەڕاڵێکی سووریایی بە تاڵاوییەکەوە دانی پێدانا کە: "هیچ نهێنییێکی سەربازی نەمابووەوە لە ئێلی کۆهن شاردراوە بن."

ئێلی هەموو بەیانیەک شتەکانی خۆی دەنارد و لە گرتنیش نەدەترسا، ئەمەش هەمووی لە سایەی ئەو چەترە پەخشەی ئیزگەی سوپای سووریاوە بوو کە لە بارەگا سەرەکییەکەی نزیک ماڵی ئەوەوە پەخش دەکرا. بەڵام جارێکیان، برادەرێکی بەناوی «زاهرالدین» بەسەردانێکی کتوپڕ بەسەری دادا. ئێلیش توانی نێرەری ڕادیۆکەی بشارێتەوە، بەڵام هەندێ کاغەز بە کۆدی نهێنی وەک مەتەڵێکی هەڵێندراو بە پیتەکانیشیەوە هەر لەسەر مێزەکەی مابوونەوە.

- "ئەرێ ئەوە چییە؟" زاهیر وا لێیپرسی.

- "ئۆو، ئەوانە هیچ نین، مەتەڵی وشەی یەکدیبڕن." ئێلیش وای بەرسڤدایەوە.

لەپاڵ نێرەرەکە و سندووقی تاوڵەکە کە بۆ برادەرە ئەرجەنتینییەکانی بوون، ئێلی ڕێگەی سێیەمی پەیوەندیشی لەگەڵ ئیسڕائیلدا دۆزیبووەوە: ڕادیۆی دیمەشق. ئەو لەگەڵ سەرپەرشتیارەکانی خۆی لە تەلئەبیب کاری لەسەر کۆدی وشە و دەستەواژەکان کردبوو، کە دەیخستنە نێو پەخشی ڕادیۆکەی و لە ئیسڕائیلیشدا لەلایەن دەزگەی ئامانەوە کۆدی مەتەڵەکەیان دەشکاند.

ئەو ئێستا هەنگاوێکی دیکەی بۆ بەدەستهێنانی زانیاری هەرە نهێنی گرتبووەبەر. لەنێو بازنەی میریی لە دیمەشقدا دەنگودۆیەکی وا بڵاوببووەوە، کەوا کەمال سابت لە ڤیلاکەی خۆیدا ئاهەنگی سێکسی ناقانونیش سازدەدا. ئەویش تەنیا دۆست و برادەرە هەرە نزیکەکانی بۆ ئەو جۆرە ئاهەنگانە بانگهێشت دەکا، میوانەکانیش ژمارەیەکی زۆری کیژی شۆخ و شەنگن. هەندێک لەو ژنانەش ژنی سەر شەقامن و هەندێکیشیان کیژی ماڵباتە باشەکانن. ئیدی میوانەکانی کەمال سابت چێژ

لە سێکســە بەڕەڵایەکە دەبیـنن، بەڵام خانەخوێکەیـان تـاکە کەســە کە بە دەمارساردی دەمێنێتەوە و جڵەوی خۆی لەدەست نادا.

هەروەهــا دەگــوترا کەوا کەمــاڵ ســابت بە بەخشــندەییەوە ســکرتێری سێکسباز بۆ برادەرە پلە باڵاکانی دابین دەکا. یەکێک لەو برادەرانەشی کۆلۆنێل سـەلیم حـاتەم بـوو، یـارەکەی هەمـوو سـڕوتڕێکی سـەبارەت بە کۆلۆنێلەکەوە دەگەیاندەوە کەماڵ.

کاتێـک «کەمــاڵ ئەمــین ســابت» باســی ئیســڕائیلی دەکــرد، ئەوا وەک سووریێکی نیشتمانپەروەری بەجۆش خۆی دەنواند، بەم جۆرە دادەبەزینە سـەر ئیسـڕائیل "پیسـترین دوژمنی نەتەوایەتی عەرەب." ئەو پێی لەسـەر ئەوە دادەگـرت کە سـەرکردەکانی سـووریا پڕوپاگەنـدی دژ بە ئیسـرائیل زیاتر بکەن و بە ڕاشکاوی لەپاڵ میسردا بەرەی دووەمی جەنگ بکەنەوە. تەنـانەت ئەو دۆسـت و برادەرەکـانی بەوە تاوانبـار دەکـرد گـوایە بەپێـی پێویست دژایەتی ئیسڕائیل ناکەن. بەو جۆرە خۆنواندنانەی، مەبەستەکەی خۆی پێکا. دۆست و برادەرەکانیش بڕیاریانـدا کە لەو بـارەیەوە شاشـە، و شــتی واشــی نیشــانبدەن کە ئامادەباشــی ئەوان دەگەیەنــێ بەرانــبەر بە دوژمن. لە سێ بۆنەدا ئەوان، کەمـالی برادەریـان بەسـەردان بـردە پێگەی سورییایەکان بە درێژایی سنووریان لە گەڵ ئیسڕائیل. لێیگەڕان بەرەکـانی پێشەوەی شەڕ و سەنگەرەکانیش ببینێ، ئەو چەکانەشیان نیشـاندان کە لە بەرەی پێشـەوە ئامادەبوون، هەروەها نەخشـە و پلانەکانیشیان بـۆ ئاشـکرا کـرد. لێوتنانـت (ملازمـی سـوپا) زاهرالـدین بـردیە سـەربازگەی «الحمی»، لەوێـدا ژمــارەیەکی زۆری چەکــی نــوێ داکرابــوون[169]. لە ســەردانی چـوارەمی بـۆ سـەر سـنووری ئیسـڕائیل، کەمـال سـابت تەنیـا کەسـێکی

[169] داکردن: عەمبارکردن، کۆگاکردن.

مەدەنی بوو لەنێو کۆمەڵە ئەفسەرێکی پلەباڵای سووری و میسریدا. کۆمەڵەکەش لە لایەن ڕێزلێگیراوترین سەرکردەی سەربازی عەرەب، ژەنەڕاڵی میسری عەلی ئەمیر، سەرلقی یەکەی کۆماندۆی عەرەبەکانەوە فەرماندەیی دەکرا، ئەو کەسەی - بەلای کەمی لە سەر کاغەزیش بێ - ڕێکخەری هێزەکانی میسری، سووریایی و عێراقی بوو لە بەرەکانی پێشەوەدا.

یەکسەریش دوای سەردانەکان، سەرکردە بەعسییەکان کەمال سابتیان بە ئەرکێکی چارەنووسسازانە ڕاسپارد: ئاشتکردنەوەی «صلاح البیطار»ی سەرکردەی پێشووی بەعس، کە ژەنەراڵ حافز دووری خستبووەوە، لەو ساتەوە لە «ئەریحا»دا "لەبن باری چارەسەریدا" بوو. بۆیە کەمال چووە ئوردن و لەوێ یەک دوو ڕۆژی لەگەڵ سەروەزیر بەسەر بردن. گەڕایەوە دیمەشق، کەمال یاوەری حافز، سەرۆکە نەخۆشەکەی بۆ فڕۆکەخانە کرد، کە بۆ گەشتێکی چارەسەر ڕووی لە پاریس بوو. کاتێ دوای یەک دوو هەفتە، حافز گەڕایەوە وڵات، «کەمال ئەمین سابت» یەکێ بوو لە پێشوازی بەخێرهاتنەوەی وەستابوو، لەسەر هێڵی بەردەم فڕۆکەکەی وەستابوو، ئەرکەکەشی بە باشی بە ئاکام گەیاندبوو.

✡ ✡ ✡

لە ١٩٦٣دا، گۆڕانکارییێکی گەورە لە ئیسرائیل ڕوویدا. ڕامسادێکی نوێ، کە مایەر ئامیت بوو جێگەی ئیسەری بچووکی گرتەوە. ئامیت یەک دوو مانگ سەرپەرشتی هەر دوو دەزگەی ئامان و مۆسادی دەکرد. ئامیتیش بڕیاریدا یەکەی ١٣١ هەڵبوەشێنێتەوە و هەموو پیاو و ئۆپەراسیۆنەکانی بۆ مۆساد بگوازێتەوە. بەیانییەکیان ئێلی کۆهن بەوەی زانی کە کارمەندییەکەی گۆڕاوە، ئێستا بۆتە ئاژانێکی مۆساد.

هەر هەمان ساڵیش، نادیا کیژی دووەمیشی بەناوی ئیریس بوو. بەڵام لە نۆڤێمبەری ١٩٦٤دا، لە میانەی دووەمین سەردانی بۆ ئیسرائیل و لەهەمان ساڵدا، ئێلی کۆهن بینی خەونە نهێنییەکەی هاتە دی: نادیا سێیەمین منداڵیشی بوو، ئەمجارەیان کوڕێک! ناوی بووە «شاول».

"لە ماوەی ئەو سەردانەدا، بینیمان ئێلی گۆڕاوە." خێزانەکەی دواتر وای تێبینی دا: "ئەو خۆی دوور دەگرت، دەمارگیر و ڕووگرژ بوو. چەندین جاریش حەوسەڵەی خۆی لەدەستدا و هەڵچوو. حەزی نەدەکرد لە ماڵ بێتەدەر، حەزی نەکرد برادەرەکانیشی ببینێ. 'زۆر نابا ئیشەکەم لەدەست دەدەم' هەروای بە ئێمە دەگوت. 'ساڵی دادێ دەگەڕێمەوە ئیسرائیل. ئەوسا نامەوێ هەرگیز لە خێزانەکەم دوور کەومەوە.'"

لە کۆتایی مانگی نۆڤێمبەردا، ئێلی ژن و هەرسێ منداڵەکانی خۆی ماچ کردن و هیوای بەختێکی باشی بۆخواستن و دیسان خواحافیزی لێکردن. نادیاش نەیدەزانی. ئەمە دوایین جارە ماڵئاوایی لێدەکا.

✡ ✡ ✡

١٣ی نۆڤێمبەری ١٩٦٤ ڕۆژی سێشەممە بوو، پێگەی سوورییەکان لە سەر سنووری ئیسرائیل لە «تلدان» تەقەیان لە تراکتۆرەکانی ئیسرائیلی کرد کە لە خاکی بێ چەکدا[170] کاریان دەکرد. کاردانەوەی ئیسرائیلییەکانیش گەورە و کاریگەر بوو. لوولەی تانک و تۆپەکانیان ئاگریان کردەوە، دوای چەند خولەکێکیش فڕۆکەی شەڕکەری میراژ و ڤانتۆم هاتنە مەیدانی شەڕەکە. فڕۆکەکان پێگە و سەنگەرەکانی سوورییەکانیان بە بۆمب دابێژت، ئەوسا ڕووی خۆیان کردە دیوی ئاوەکانی ئوردن ئەو جۆگە و کەناڵە ئاویانەیان تەقاندەنەوە کە لە لایەن

[170] مەبەست ئەو شوێنەی سوپای لێکشاوەتەوە.

سـوورییەکانەوە هەڵکەنـدرابوون. لەوێـدا دەزگە و ئـامێری زل و قـورس، بلـــدۆزەر، تـــراکتەر و شـــۆفەلەکان بە شـــێوەیەکی سیســـتماتیک تێکوپێکشـــکێندران. هێـــزی ئاســـمانی ســـووریش خـــۆی لە ڕەوشـــەکە هەڵنەقورتانـــد، ئـــاخر هێشـــتا بە باشـــی لە فـــڕۆکە مـــیگە شـــەڕکەرە سۆڤییەتییەکان ڕانەهاتبوون.

ڕۆژنـامەگەری جیهـانیش بەڕادەیەکـی وا، کە نزیـک بـوو لەیەک دەنگـی ڕەوایەتیـان بە کـاردانەوەی ئیسـڕائیل دەرهەق کـردەوەی تەقەکردنـی سووریا دا. چەند مانگێک دوای ڕووداوەکە، ئەفسەرانی سووریا ویستیان بڵـێن یەکێـک لە ئەنـدازەدارێژەرانی ئەو پەلامـارەی ئیسـڕائیل ئێلـی کـۆهن بوو، چونکە لەو کاتەدا ئەو لە ئیسڕائیل بوو. لە چاوی کۆهنەوە، ئیسڕائیل بە تەواوی لە ڕەوشی بەربادی هێڵی ئاسمانی سووری و توانستی جەنگی لەو قۆنـــاغەدا ئاگـــاداربوو. هەروەهـــا ئیســـڕائیلیەکان بە وردەکـــارییەوە ڕەوشـــی ســـەنگەر و قـــایمکردنی کـــاری ڕێگـــۆڕینی ئاوەکەیـــان لەلایەن ســـوورییەکانەوە دەزانـــی. ئەوان دەقـــاودەق چەنـــدایەتی چەکەکانیـــان لە سەنگەر و چەپەرەکانی بەرەی پێشەوەی شەڕ دەزانی.

بەڵام خۆ ئێلی کۆهن زۆر لەوە زیاتری دەزانی. ئەو لەوەدا سـەرکەوتوو بـوو  کە خەبەر و بـاس لەبـن بەڵێنـدەرێکی سـعوودییەوە دەربێنـێ کە گرێبەستی بۆ پلانی یەکەمین نۆکەندی پڕۆژەی سوورییەکان بەستبوو. بە هـــۆی چـــاکەی ئەو برادەرایەتییەیـــان، بە چەنـــدین مانـــگ پێشـــوەختە ئیسڕائیلییەکان دەیانزانی کارەکە کتومت لە کوێ و کەی ئەنجام دەدرێ، ئاخر نۆکەندەکە چەند قووڵ و بەرین دەکرێ، چ جۆرە کەرەستەیەکی بۆ لێدان و دروستکردنەکە بەکاردێ، ئەمەو وردەکاری زیاتریش. هەروەها بەڵێندەری گرێبەست واژۆکەرەکە ئەوەشی بۆ برادەرەکەی ئاشکرا کرد، کە توانای نۆکەندەکە چەندە و چەند بەرگەی بۆمبی ئاسمانی دەگرێ و

تەواوی ڕێکار و پێوەرە ئاسایشپارێزییەکانیشی بۆ هەڵرشت. ئیدی لە سایەی ئەو هەموو وردەکارییانەی بە سیخوڕە ئیسرائیلیەکەی گوت، ئیسرائیل چەند جارێک پەلاماری پڕۆژەکەی دا، تا ئەو کاتەی دەوڵەتە عەرەبەکان لە ساڵی ١٩٦٥دا بڕیارياندا بە تەواوی دەستبەرداری پڕۆژەکە بن و وازی لێ بێنن.

لە ناوەڕاستی ینایری ١٩٦٥یشدا، دوای یەک دوو هەفتە دوای ئەوەی ئێلی ئیسرائیلی بەجێهێشت، پۆستکاردێکی زۆر جوان و نەخشین گەیشتە سندووقی پۆستی نادیا کۆهن. ئێلی بە زمانی فەرەنسی تیایدا نووسیبووی: "نادیای خۆشەوستم، تەنها بەو یەک دوو دێڕە ئارەزووی ساڵێکی نوێت بۆدەخوازم، هیوادارم کە خێروخۆشی بۆ خێزانەکەمان لەگەڵ خۆی بێنێ. ماچی زۆرم بۆ فیفی (سۆفی)، ئیریس و شایخ (شاول) و بۆ تۆش لە کانگای دڵەوە. ئێلی."

کاتێکیش نادیا ئەو پۆستکارتەی بەدەستگەیشت، ئێلی لە ژوورێکی بەردینی ڕەقو تەقی زیندانێکی دیمەشق لەبن باری لێدان و ئەشکەنجەداندا کەوتبوو.

✡ ✡ ✡

بۆ چەندین مانگ پێشتر، موخابەراتی سووریا، دەزگەی هەواڵگری نهێنییان لە هۆشدارییێکی پلەباڵدا بوو. هۆشدارییەکەش لەلایەن بەرپرسی تایارا[171]، سەرۆکی هۆبەی فەلەستینی موخابەراتەوە درا. تایارا هەر لە هاوینی ١٩٦٤ەوە تێبینی ئەوەی کرد، کەوا بەنزیکەیی هەر بڕیارێک لە ئەنگۆرە یان تەنانەت لە شەوێشدا لە لایەن حکوومەتی سوریاوە دەرچووبێ، ئەوا بۆ بەیانیەکەی لە ڕادیۆی دەنگی ئیسرائیلدا بەزمانی

171 Tayara

عەرەبـــی، ئەو ڕادیـــۆیەی حکـــوومەتی ئیســـڕائیلی لەپشـــتەوە بـــوو، بڵاودەکرایەوە. لەوەش زیاتر، ئیسڕائیل هەندێ لەو بڕیارە زۆر نهێنییانە و ئەو بڕیـارانەی لەپشـت دەرگە داخراوەکـانی سـووریاوە دەدران، ئاشـکرا کردن. تایارا سەرسام بوو بە نیشانەشکێنی کتومتی بۆمبەکانی ئیسڕائیلی لە ماوەی ڕووداوەکـانی ١٣ی نۆڤێمبەردا. دەرهاوێشـتە لۆژیکەکەی کـابرا ئەوە بوو، کە ئیسڕائیل دەقاودەق ئاگای لە پێشهاتەکانی بەرەی پێشـەوەی سوورییەکانە و دەشزانێ لە کوێ و کەی و چۆن و بە چ کـاریگەرییێکیش دەستی خۆیان بکەنەوە و ئامـانجە سوورییەکان تێکوپێک بشکێنن. ئیدی دڵنیـابوو لەوەی ئیسـڕائیل سـیخوڕێکی لە   ئاسـتێکی هەرە بـاڵا لە نێـو ڕیزەکانی حکوومەتی سووریدا هەیە. زانیارییەکانی ئەو سیخوڕە لە ڕادیۆ دەنگـی ئیســڕائیلدا وەک هەواڵــی ســەعات بڵاودەکـرانەوە. ئەمەش هەر ئەوەی دەگەیانـد کە هەواڵ و زانیارییەکـانی ڕۆژانە بە نێرەرێـک بنێـرێ. بەڵام تۆ بڵێی ئەو نێرەرە ڕادیۆییە لە کوێ بێ؟

لە پـایزی ١٩٦٤دا، تایـارا و هاوکارەکـانی بە ئـامرازی سـۆڤێتی هەوڵێکـی زۆر مەزنیـــان دا تـــا شـــوێنی ئەو نێـــرەرە نهێنـــیە بـــدۆزنەوە، بەڵام سەرنەکەوتن. پاشان لە یانیوەری ١٩٦٥دا بەخت بۆی هێنان.

کەشتییێکی سۆڤییێتی لە بەندەری لاتاکیادا بـاری خـۆی داگـرت، کە چەنـدین کەنتینەی[172] زل و کەتەی پڕ لە کەلوپەلی پەیوەندی بوون. ئەوانە جێگەی کەلـوپەل و ئـامێرە کـۆن و سـواوەکانی سـوپای سـووریایان گـرتەوە. نۆژەنکردنەوەی ئامێرەکـان لە ٧ی ینـایری ١٩٦٥دا بـوو. لەپێنـاوی ئەوەی ئـامێرە تازەکـان لە شـوێنی خۆیـان دابنـدرێن و تـاقی بکـرێنەوە، هەمـوو وێستگەکانی پەیوەندی کردن بۆ ماوەی بیست و چوار سەعات ڕاگیران.

---

[172] کەنتینە: ئەو سندووق یان کەندوە قەبە و گەورانەیە کە بۆ شت گواستنەوە لە بەندەر و سەر کەشتی بەکار دێ.

له کاتێکدا لەسەرتاسەری وڵاتدا بێدەنگی باڵی بەسەر هێڵی پەیوەندییەکانی سوپادا گرتبوو، ئەفسەرێکی ئێشکگر نیشانەی نێرەرێکی لاوازی لە وێستگەی خۆی بەدی کرد. پەخشی سیخوڕەکە بوو. ئیدی یەکسەر ئەفسەرەکە خۆی گەیاندە تەلەفۆن.

دەستەیەکی موخابەرات، کە ئامرازی شوێنپێهەڵگری سۆڤیەتیان پێبوو، بۆی دەرچوون تا شوێنی نێرەرەکە بدۆزنەوە. بۆ بەدبەختی نێرەرە ڕادیۆکە بەرلەوەی ئەوان بیگەنێ وەستا. بەڵام تەکنیکارە پەرۆشەکان ئاماژەیان بۆ یەک ئاراستە کرد: ماڵی کەمال ئەمین سابت.

"هەر دەبێ ئەمە هەڵەیەک بێ." ئەمە قسەی ئەفسەرێکی پلەبالای موخابەرات بوو. ئاخر بە مێشکدا نەدەچوو کەمال سابت، کە سەرکردە بەعسییەکان دەیانەویست لە کابینەی حکوومەتی داهاتوودا بیکەنە وەزیر، سیخوڕ دەرچێ. کەمال سابت لە سەرووی هەموو گومانێکەوە بوو.

کەچی بۆ ئەنگۆرە، نێرەری ڕادیۆیەکە سەری هەڵدایەوە. دیسان موخابەرات ترومبێلەکانی خۆی بە دوادا نارد، دیسان هەمان بەرەنجام.

دەق لە سەعات هەشتی بەیانیدا و لە ڕۆژێکی خۆرەتاوی یانیوەریدا، چوار ئەفسەری موخابەرات خۆیان بە خانووە کەشخەکەی گەڕەکی «ئەبو رامان»دا کرد. ئەوان دەرگەی دەرەوەیان شکاند، شمشێرەی دەرگەکەیان بادا، پاشان چوونە ژوور، وێران بچنە ژووری نووستن، دەمانچەی ڕووتیان بە دەستەوە بوو، بەڵام جاسووسەکە لەوێ نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا کابرا لەنێو پێخەفی خەویشیدا نەبوو. ئەو لە ناوەڕاستی ناردنەکەدا و لە قافدا گیرا. ئەوسا لە شوێنی خۆی بازیدا و هەڵسایە سەر پێی و تووشی ئەفسەرەکان هات؛ ئەو نە هەوڵیدا ڕا بکا و نە بەرگریشی

کــرد. بــۆ جارێــک، نامۆیەکــان دژی وەســتانەوە. ئەفســەری فەرمانــدە بەسەریدا نەڕاند: "کەمال ئەمین سابت، تۆ دەسبەسەرکرای!"

ئینجا هەواڵەکە وەک ئاگرێک لە پوش بەربێ وا بڵاوبووەوە. نایابە، شتێکی پڕوپووچانەیە، نەکردەیە، شتی قۆڕە! ئاخر خۆ وشەگەلێک نەبوون ئەو حاڵەتە هێدمەگرتن و تاساوییەی سەرکردە سوورییەکان دەربڕی کە هەواڵەکەیان پێڕاگەیەندرا. ئەرێ دەکرێ یەکێک لە سەرکردەکانی حیزبی حوکمڕان، کەسێکی وا نزیک لە سەرۆک، ملیۆنلێرێک و سۆشیالیستخوازێک، سیخوڕ دەرچێ؟!

بەڵام خۆ بەڵگەکان هی حاشالێکردن نەبوون. ئەو نێرەرە ڕادیۆیەی کە کەمال ئەمین سابت دەیەویست لە پشت جامی پەنجەرەکەوە بیشارێتەوە، ئەو وەرگرە بچکۆلانەیەی لەنێو مۆمدانێکی گەورەی ژووری لێدانیشتن شاردرابووەوە، مایکرۆفیلمەکان، دینامێتی ناو جگەرە، پاکەتی کۆدەکان.... دەریانخست هەر بەڕاستی پیاوەکە ناپاکە.

بە هێدمەگرتنێکی تەواوەوە، سەرانی ڕژێمەکە فەرمانی لێکۆڵینەوەیەکی بەربڵاویان دا. تۆبڵێی بە دەقاودەقی کەمال سابت چی زانی بێ؟ ئایا دەتوانن بە تاوانباری دابنێن؟ سەرۆک حافز بە خۆی هاتە نێو چاوە زیندانەکەی و لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا کرد. دواتر حافز وا ئیفادەی دا: "لە میانەی لێکۆڵینەوەکەدا، لەو کاتەی سەیری چاوەکانی کەمالم دەکرد، لەپڕێکەوە گومانێکی سامناک پەلاماری بۆ هێنام. داوام لێکرد سورەتی فاتیحا، دەستپێکی یەکەمین بەشی قورئان بڵێتەوە. کەمال بە ئاستەمێک چەند ئایەتێکی گوتنەوە. ئەو تێکۆشا بەرگری لەخۆی بکا بەوەی کە ئەو بە منداڵی سووریای بەجێهشتبوو، ئیدی یادەوەرییەکەی لەو شتانەدا یار نەبوو. بەڵام لەو ساتەدا زانیم: ئەو جوو بوو."

ئەشکەنجەدەرانی دیمەشق باقی ئیشەکەیان کرد. لەو کاتەی هێشتا کەمال لە چاوە زیندانە تاریکەکەیدا بە بێ هۆشی کەوتبوو، دەموچاو و جەستەی برینـــی پـــیس و نـــاقۆڵای پێـــوە بـــوو. نینۆکەکـــانی دەرکێشـــرابوون، دانپێدانانەکەی بە خێرایی گەیشتە ژەنەڕاڵ حافز. پیاوەکە کەمال ئەمین سابت دەرنەچوو، بەڵکو ئەو ئێلی کۆهن، جوویێکی ئیسرائیلی دەرچوو.

لە ٤ی یانیوەری ١٩٦٥دا، دیمەشق بە فەرمی "گرتنی سیخوڕێکی گرنگی ئیسـرائیلی" ڕاگەیانـد. ئەفسـەرێکی پلەبـاڵا، بە تـووڕەیی و لە کۆنفرانسـە ڕۆژنامەنووســـییەکەیدا نەڕانـــدی: "ئیســـرائیل ئەهـــریمەنە و کـــۆهنیش ئاژانەکەیەتی."

سام و تۆقین بەنێو دیمەشقدا بڵاوبووەوە. تۆبڵێی کۆهن تاکە گورگێک بێ یان سەری ئەڵقەی جاسووسییەکە بێ؟ ئیدی یەک لەدوای یەک، شەست و نـۆ کەس گیـران؛ بیسـت و حەوت لە گیراوەکـان ئـافرەت بـوون. لەنێـو گومانلێکراوەکانـدا مەجید شـێخ ئەلئـارد، جـۆرج سـەلیم سـەیف، مـلازم زاهرالـدین، کاربەدەستە پلە باڵاکانی وەزارەتـی پڕوپاگەنـدە، قەحپەکـان و ئافرەتانی دیکە کە ناسنامەکەیان ئاشکرا نەکرا، هەبوون. چوارسـەد کەس ئەوانەی پەیوەندی و هاموشۆیان لەگەڵ ئەودا هەبوو، خرانە بن پرسیار و وەڵام. لێکـۆڵینەوەکە هەنـدێ کێشـەی ڕاسـتەقینەی خسـتەڕوو. زۆر لە سیاسـییەکانی سـووریا، لە سـوپا و گەورە بزنسـمانەکان لە دۆسـت و برادەرە نزیکەکانی ئێلی کۆهن بوون. نەدەکرا لێکۆڵەرەوەکان دەستیان بۆ بەرن. نەدەکـرا ناوەکانیشـیان بێتەسـەر زمـان، ئـاخر هەر ئامـاژەیەک بـۆ ئەوان واتـــــای ئەوەی دەگەیانـــــد، کە ئەوانـــــیش دەســـــتیان لە سـیخوڕایەتیکردنەکەدا هەبـێ. سـوورییەکان ئەوەشـیان بـۆ دەرکەوت، کە کەمـــال ســـابت هەمـــوو هەوڵێکـــی داوە بـــۆ ئەوەی پەیوەنـــدییەکانی بە

سەرچاوە هەمەڕەنگە زانیارییەکانی ئاشکرا ببێ؛ هەر بۆیە زۆر سەخت بوو بازنەی سیخوڕییەکە بە بەرفراوانی دابمەزرێنێ.

دەزگەی چاودێری ئیسرائیلیش دوور و نزیک خۆی بەدوور گرت کە هیچ شتێک سەبارەت بە گرتنی ئێلی کۆهن بدرکێنێ. هێشتا ئیسرائیلییەکان هیوایان بە ڕزگارکردنی ئێلی هەبوو، بۆیە ڕێگەیان گرت هیچ هەواڵیک لەو بارەیەوە بگاتە دەستی میدیای خۆجێی. بەڵام خۆ کەسانێک مافی ئەوەیان هەبوو ڕاستی و دروستی هەواڵەکە بزانن. ئەنگۆرەیەکیان لایدەیەک[173] سەرێکی برایەکانی ئێلی دا و پێیگوتن: "برایەکەتان لە دیمەشق گیراوە و بە سیخوڕیتی بۆ ئیسرائیل تاوانبار کراوە." یەکێک لە براکانی بە هەواڵەکە حەپەسا. برایەکەی دیکەی بەناوی «ماوریس» بە پەلە خۆی گەیاندە ماڵی دایکی لە «بات یام» و پێیگوت: "دایکە دەبێ بەهێز و خۆڕاگر بیت، ئێلی لە سوریا گیراوە."

پیرەژنیش لە تاوا قسەی پێنەکرا، لەکۆتاییدا توانی بڵێ: "لە سوریا؟ چۆن؟ ئایا ئەو بەهەڵە لە سنوور پەڕیوەتەوە؟" کاتێکیش «ماوریس» بۆی ڕوونکردەوە کە بۆچی چووەتە دیمەشق، پیرەژنی بەستەزمان ڕاقەنا[174].

«نادیا»ش بە تاساوی لەنێو منداڵەکانیدا وەستابوو. هەرچەندە دەمێک بوو گومانی ئەوەی کردبوو، مێردەکەی هەموو شتێکی بۆ نادرکێنێ، بەڵام هەرگیز بیری بۆ شتێکی وەها نەدەچوو کە مێردەکەی هەر بە ڕاستی لەسەر ئەو هێڵەدا کاری کردبێ. هاوڕێکانی ئێلی هەوڵیاندا هێوری بکەنەوە. "یەکێک لە برادەرەکانی پێیگوت: "تۆ ڕاستەخۆ بەرەو پاریس بفڕە. ئێمە باشترین پارێزەرمان بۆ گرتووە. هەموو شتێکیش لەپێناو

---

[173] لایدە: نامۆ، غەوارە، غەریبە، بیانی.

[174] ڕاقەنا: کەوت.

سەلامەتبوونی ئەو دەکەین."مایەر ئامیت بەخۆی بەرپرسیاریێتی هەوڵ و تەقەللای ڕزگارکردنی کۆهنی لە ئەستۆ گرت.

لە ٣١ی یانیوەردا، یەکێک لە پارێزەرە هەرە گەورەکانی فەرەنسە بەناوی «جاک مێرسیر» چووە دیمەشق. بە فەرمیش ئەو لە لایەن خێزانەکەی ئێلییەوە بەکرێگیرابوو؛ لە ڕاستیشدا دەوڵەتی ئیسرائیل خەرجی دەستحەقی قەبەی پارێزەرەکەی دەدا. ئەو بە ئەرکێکی نەکردە گەیشتە دیمەشق. ئەو گوتی: "لە یەکەمین ڕۆژم لە دیمەشق، لەوە تێگەیشتم کە چارەنووسی ئێلی کۆهن مۆری لێدراوە. ئەو لە سێدارە دەدرێ. هەنووکە هەموو ئەوەی لە دەستم دێ، بەدەستهێنانی کاتە و کارکردنە بەڵکو ژیانی بپارێزرێ."

یەکەمجار پارێزەرەکە هەوڵیدا دادگایی نەکرێ. ئەو چووە لای سەرانی ڕژێم و داوای لێکردن بەڵکو کۆهن ببینێ و نامەی بریکارنامەی «مێرسیر»ی وەک پارێزەر پێواژۆ بکا.

داواکەی بەشێوەیەکی گردەبڕانە ڕەتکرایەوە.

کەچی بە زوویی پارێزەرەکە هەندێ هاوپەیمانی لە بازنەیەکی دیاریکراوی نێو حکوومەتدا دۆزیەوە کە بەرێزەوە دەیانڕوانییە ڕای گشتی. ئەوان دەیانەویست دادگایەک بێتەکایە کە مافەکانی تۆمەتبارەکە بپارێزرێ. ئەوان - لەبەر هۆکارێکی تەواو جیاواز- لەلایەن هەڵۆکانی ناو سوپا پشتگیریان لێکرا، لەلایەن دوژمنە خوێنخۆرەکانی حافیز، ئەوانەی دەیانەویست ئەوە دەربخەن کە سەرۆک حافز پەیوەندییێکی زۆر دۆستانەی لەگەڵ کەمال ئەمین سابتدا هەبووە و لە دادگەیەکی کراوەدا ئەوە بەدەربکەوێ. ئەم چەشنە دادگایە، بەگوێرەی لێکدانەوەی ئەوان، گەندەڵییەکانی ڕژێمی ئاشکرا دەکرد و پێگەکەشیان لاواز.

بەڵام ئەم نیازکردەیە بۆ دۆزەکە بە توندی لەلایەن گرووپەکەی دیکە ڕەتکرایەوە، ئەوەش ڕای هەموو ئەوانە بوو کە کاتی خۆی لە کەمال ئەمین سابتەوە نزیک بوون. ئاخر دەیانزانی دادگایەکی کراوە، ئەوانیش بەرەو پەتی سێدارە دەنێرێ. ئەو دەستە و تاقمە یەک تاکە مەبەستیان هەبوو: بە هەر نرخێک بێ ڕێگە بە دادگایەکی کراوە نەدرێ و تا بشکرێ بە زوویی ئێلی کۆهن لەناوببرێ.

دوایین دادگایەکە پێش دادگای تایبەتی سەربازی کەوت، ئەویش لەپشت دەرگەی داخراوەوە کرا، لە ژوورێکی بەتاڵوحەتاڵ؛ تەنیا چەند شتێکی بەگوێرەی پێویست لێگرتبوو، بۆئەوەی لە تەلەفزیۆنی دەوڵەت نمایش بکرێ. لەو دادگایەدا نە داواکاری گشتی، نە پارێزەری مافی داوالێکراوەکە نەبوون. کاتێکیش ئێلی کۆهن داوای لە دادگاکە کرد کە پارێزەری داواکراوەکە کوانێ، سەرۆکی دادوەرەکان بە پێکەنینەوە بەڕوویدا تەقیەوە: "تۆ پێویستیت بە پارێزەر نییە. هەموو ڕۆژنامە گەندەڵەکان لایەنگری تۆن و هەموو دوژمنانی شۆڕشیش پارێزەری تۆن." سەرۆکی دادگا کار و فرمانەکانی هەر یەک لە لێکۆڵەرەوە، داواکار و پارێزەری دۆزەکەی بینی. کاری لەوەش پۆلکتر ئەوەبوو کە سەرۆکی دادگاکە سەرهەنگ «صلاح دالی» بوو کە برادەرێکی نزیکی ئێلی بوو. شتێکی دیکە، لەوەش ناخۆشتر، برادەری کەمال ئەمین سابت، ملازم «سالم حاتەم» لە دادوەرەکان بوو. بۆئەوەی هەموو دەنگۆیەکیش لەسەر پەیوەندییە توندوتۆڵەکانی لەگەڵ کۆهندا بسڕێتەوە، لێی پرسی: "ئەرێ سالم حاتەم دەناسی؟" ئیدی تاوانبارەکە، وەک ئەکتەرێک لەسەر هێڵەکانی دەقە نووسراوەکەدا بڕوا، ئاوڕێکی لە ژوورە بەتاڵەکەی دایەوە، ئینجا چاوی لەچاوی حاتەم کرد و وەها وەڵامی دایەوە: "نەخێر، من ئەو لەم ژوورەدا نابینم."

ئەو کۆپلەیان لە تەلەفزیۆن نیشاندا. مێرسیری پارێزەریش گوتی: "هەموو دیمەشقییەکان بەو کۆپلەیە پێکەنین. ئاخر خۆ ئەمە دادگایی نەبوو. بەڵکو ئەمە تراژیدیایەکی کۆمیدی ئامێز، سێرکێک بوو بۆ خۆی."

کامێراکانی تەلەفزیۆن هاوتاوانبارەکانی ئێلی کۆهنی نیشاندا: ئەلئارد، ئالدین، سەیف، یەک دوو قەحپە. بەڵام ئایا ژنەکانی دیکە کێ بوون؟ ژنانی ئەفسەرە پلەباڵاکان؟ سکرتێرەکان؟ برادەرانی کەمال سابت بوون یان هی سەرکردەکانی بەعس؟ ئەرێ ئەو نهێنییانە چی بوون کە ئێلی لەگەڵ ئیسرائیلییەکانی ئەودیو هێڵ بەیەکی گەیاندبوون؟ ئەو بە تۆمەتی سیخوڕیکردن تاوانبارکرابوو، بەڵام خۆ لە ماوەی دادگاییەکەدا یەک وشەش دەبارەی کردەوەکان و ناواخنی ئەو شتانەی بە نێرەرەکە ڕەوانەی کردبوون، نەگوترا. تاکە شتێک کە کامێراکان نەیانتوانی پەردەپۆشی بکەن ئەو تەوژمە دەمارگرژییەی ماسوولکەکانی لاڕومەتی چەپەی کۆهن و لەگەڵ ئەو لاربوونەوە تیژەی سەری بوون. ئەمەش لە ئاکامی ئەشکەنجەدان و لێدانی تەوژمی کارەبایی بوو کە لە جەستە و سەریان دابوو.

ئیسرائیلیش بە بێدەنگی بینەری دادگایەکە بوو. هەموو شەوێک،ماڵباتی ئێلی لە دیار تەلەفزیۆنێک کە مۆساد پێیدابوون، دادەنیشتن. منداڵەکان، نادیا، برایەکان کاتێک ڕووخساری ئێلییان لەسەر شاشەکەدا دەبینی، دەگریان. دایکیشی، لە پەرۆشیان شاشەی تەلەفزیۆنەکەی ماچ دەکرد و ئەو ئەستێرە بچکۆلانەی داودی کە بە ملییەوە کردبوو داگیرساند. سۆفیش بانگی کرد: "ئەوە باوکمە! ئەو پاڵەوانە!" نادیاش بە بێدەنگی دەگریا.

له دیمەشق و له نیوەی شەودا پارێزەر مێرسیر له خەو بێداربووەوە، ئارەقەیەکی ساردی دەردا دیاربوو شەولەبانی لەخەودا بینیبوو[175]. ئەو ڕەفتاره بێمانایانه به قوولّی بێزاری کردبوو. له ۳۱ی مارتدا، دادگا سەربازیەکه حوکمەکەی بڵاوکردەوە: ئێلی کۆهن، مەجید شێخ ئەلئارد و ملازم زاهرالدین بڕیاری مردنیان بەسەردا درا.

«مێرسیر» هەوڵێکی دیکەی دا. له مانگەکانی ئەپریل و ئایاری ۱۹٦٥دا سێ جاران سەری له دیمەشق دا. ئەو به نمایشێکی زۆر گرنگ له ئیسرائیلەوە هاتەوە. یەکەمیان سەودایەک بوو: ئیسرائیل بایی یەک ملیۆن دۆلار داودەرمان و ئامێری قورسی کشتوکاڵی دەداته سووریا تەنیا بۆ ئەوەی ئێلی نەکوژن. سووریەکان داواکەیان ڕەتکردەوە. ئیسرائیل نمایشێکی دیکەی خستنه بەردەم: لەبەرانبەر ئێلیدا، دوازده جاسووسی سووری بگێڕنەوە که له زیندانەکانی ئیسرائیلدا بوون. سووریەکان ئەمەشیان هەر ڕەتکردەوە، بەڵام ئاماژەیەکی واشیان دا، کەوا لێبوردنی سەرۆکایەتیش به دوور ناگیرێ.

له ۱ی ئایاردا حوکمەکەی ئەلئارد له مەرگەوه بۆ زیندانی هەمیشەیی سووک کرا. له ۸ی ئایاریشدا بڕیاری مەرگی ئێلیش به فەرمی بڵاوکرایەوە. مۆساد دەستی به دوایین داوی تەقەلالاوه گرت. له پاریس، نادیا کۆهن داوای بەزەیی و لێخۆشبوونی له باڵوێزخانەی سووریا کرد. داوای تێهەڵچوونەوەش له هەموو لایەکی دنیاوه هات. هەموو ئەو داوایانەش له کەسانی ناسراوەوه واژۆکرابوون وەک پاپا پاولی شەشەم و فەیلەسوفی ئینگلیز برتراند رسل؛ دەوڵەتمەدارانی وەک فرانسس ئێدگار فاوەر و ئەنتۆنی پینی، دایکه شاژنی بەلجیکا ئێلیزابیت سیاسەتوان کامێلا

---

[175] مەبەست خەوێکی زۆر ناخۆشی بینیبوو.

هیوسمانس و جۆن دیفنباکەری کەنەدی؛ کاردینال و کەشیشەکانی ئیتالی، بیست و دوو ئەندامی پەرلەمانی بەریتانی؛ کۆمکاری مافەکانی مرۆڤ؛ خاچی سووری نێودەوڵەتی... خۆ ئەگەر ئێلی ئاگای لەوانە بووبا، ئەوا داوای هاوچەشنی کاتی خۆی یاد دەکەوتەوە، هی یازدە ساڵ بەر لەئێستا بۆ ئەوەی برادەرەکانی خۆی لە قاهیرە ڕزگار بکرێن.

لە ١٨ی ئایار و لە نیوەی شەودا، لەلایەن زیندانەوانان ئێلی لە خەوەکەی بێدار کرایەوە. جلێکی سپی ئاودامان شۆڕیان کردەبەر و بەرەو بازاڕی دیمەشقیان برد. لێیگەڕان نامەیەک بۆ خێزانەکەی خۆی بنووسێ و یەک دوو وشەش لەگەڵ «نەسیم ئاندابۆ»، ڕابیەکەی دیمەشق بگۆڕێتەوە. ئینجا سەربازە سووریەکان پۆستەرێکی گەورەیان لەسەر سینگ قایمکرد کە حوکمەکەی بە خەتێکی عەرەبی درشت لەسەر نووسرابوو، کامێرای تەلەفزیۆن و ڕۆژنامەکانیش تیشکۆی خۆیان خستە سەر ئەو پیاوە تەنیاباڵەی بەنێو دوو ڕیز سەربازی چەکدارەوە بەرەو پەتی سێدارە دەڕوا.

جەلـلادەکەش لەوێ چاوەڕێی دەکرد، ئیدی هەر زوو پەتەکەی لە ملی ئێلیی توند کرد. وای لە حوکمبەسەردا کراوەکە کرد لەسەر کورسییێکی نەویدا بوەستێ.

ڕووی ئێلی لە ئاپۆرای خەڵکی بوو، بێدەنگ، دەستەوەستان بەڵام نەوەک بە ڕووخاوی. حەشاماتی خەڵکەکە هەناسەی خۆیان ڕاگرت. بە هەستی خۆڕسکانە گوێیان لە تەپەی کەوتنی کورسییەکە بوو کە لەبن پێی ئێلی دەرهێندرا؛ ژن و پیاو بە مەرگی سیخوڕە ئیسرائیلییەکە خۆشحاڵ بوون و هاواریان کرد.

سـەیر لەوەدا بـوو بەشـێوەیەکی تەلیسـماوی حەشـاماتێکی زۆر لە دیمەشـقییەکان لەو سـەعاتە هەرە زووەی بەرەبەیـان بە ئاگـابوون، هاتبوونە لای سێدارەکان و بۆ ماوەی شەش سەعاتان سەیری تەرمی نمایشکراویان دەکرد. لە ئیسرائیلیش لەیەک خولەکدا پەردە ئەستوورە بێدەنگییەکە دڕا. لە چەند سەعاتێکی کەمدا، ئێلی کۆهن بووە پاڵەوانێکی نیشـتمانی. سـەدان هەزار بەشـداری مـاتەمی ماڵباتەکەیـان کـرد. قوتابخانەکان، شەقامەکان و پارکەکانیشی بەناو کران. وتار و کتێب دەربارەی نەبەردییەکانی نووسران. «نادیا»ی ژنیشی مێردی نەکردەوە.

تەنانەت ئەمڕۆش، چل و شەش ساڵ[176] دوای مەرگی ئێلی کۆهن، سووریا ڕەتیکردەوە تەرمەکەی بۆ ناشتن ڕادەستی ئیسرائیل بکاتەوە. ئێلی کۆهن بە یەکێک لە پاڵەوانەکانی مۆساد دادەندرێ. بەڵام خۆ زۆر هەن کە پەنجەی تاوان بۆ مۆساد درێژ دەکەن. ماڵباتەکەی خۆی و چەندین نووسـەر لەو بـاوەڕەدان، کە مۆسـاد ئێلیـان بە بێبـاکییکی لەڕادەبەدەر بەهۆی نێرەری ڕادیۆیی ڕۆژانە بەکارهێناوە، تەنانەت هەندێ کات دوو جاران بووە لە ڕۆژێکدا؛ تەنانەت مۆساد بەوەشەوە نەوەستاوە، هاتووە داوای ئەوەیشی لە ئێلی کردووە کە ڕاپۆرت لەسەر دەمەتەقێکانی نێو پەرلەمانەکەشیان بدا، هەرچەندە ئەو جۆرە باسوخواسانە هیچ سوودێکیشیان نەبووە. ئەرکێکی بێ ئامانج وای لە ئێلی کرد سەرچڵییکی ناپێویست بکا.

بەڵێ، کۆهن سیخوڕێکی مەزن بوو؛ کۆتاییەکەشی کۆتایی سیخوڕە مەزنەکـان بـوو. ئەو بڕوابەخۆبوونەیـان لەگەڵ داوا زێـدەڕۆکانی سەرپەرشتیارەکانیان، ئەوانیان گەیاندە لێواری مەرگ.

[176] کتێبەکە خۆی لە ٢٠١٢دا چاپکراوە.

## بەندی دە: "من میگی-۲۱م دەوێ!"

مایەر ئامیت کە جێگەی ئیسەر هارلی گرتەوە، جۆرە پیاوێکی تایبەت بوو. ئەو لێبڕاو، بڕیاردەر، هەندێ جارانیش ڕاشکاو و بە مشتومڕ بوو، بەڵام کەسێکی مەجلیس گەرم، ڕووخۆش، سەرباز و بە دۆست و برادەریش بوو. جارێکیان «موشێ دایان» پێگوتین: "ئەو تاکە برادەرم بوو."

چیرۆکی ژیانی مایەر ئامیت هێمای گۆڕانی سەرکردایەتی مۆساد بوو. ئیسەر هارل لە ڕووسیا لەدایک ببوو، ئەو سەر بە نەوەی مارەکان بوو، هەرچی مایەر ئامیت بوو، سابرا (لەدایکبووی ئیسرائیل) بوو، ئەو یەکەمینی زنجیرەیەکی بەردرێژی ژەنەڕاڵەکان بوو؛ ئەو لەنێو ڕیزەکانی سوپادا جەنگا، دوای ماوەیەکی زۆر کە لە بن جلی خاکی سەربازیدا بوو، ئینجا چووە نێو مۆساد. نەوەی ئیسەر نەوەیەکی بێپێخوست[177] و خۆپارێز بوو، خۆیان لە سێبەری نەناسراوی، پیلانگێڕی و بێ پەرێزی[178] حەشاردابوو. هەرچی مایەر ئامیتیش بوو پیاوی لەشکر بوو، کۆمەڵێ دۆست و هاوڕێی هەبوو، دەیزانی چی دەکا و چی ناکا. ژیانی سایە، ژیانێک نەبوو هی مایەر ئامیت بێ. لەکاتێکدا ئیسەری بچووک کاریزما و تەلیسمێک بوو لەبارەی خۆیەوە، ئامیت و شوێنگرەوەکانی ئاراستەیەکی توندی و دەستڕۆیشتووبوون کە پلەکانیان لە ڕیزەکانی سەربازیەوە پێدرابوو.

---

[177] پێخوست: ئەو ڕێگایەی شوێنپێی ڕێبوارانی زۆر پێوە دیار بێ هەر بۆیەش بۆتە ڕێ. لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە وروژێنەر نەبووە.

[178] پەرێز: واتە شوێنەوار، جێپەنجە، مەبەست لێرەدا نادیاری و پەنهانییە.

ئامیت لە «تیبەریا» لەدایک بوو، لەوێ چووبووە ئۆرشەلیم، لەکۆتاییشدا ئەندامی کیبۆتی «ئالۆنم» بوو، بەشێکی زۆری ژیانیشی لەبن جلی خاکیدا بەسەر بردبوو. لە تەمەنی شازدە ساڵیشەوە چووبووە ڕیزەکانی هاگانا، کاتێکیش سوپای بەرگری ئیسرائیلیش دامەزرا، ئەو فەرماندە بوو، لە جەنگی سەربەخۆیشدا بریندار ببوو، دوای ئەوەش کارنامەیەکی ناوازەی لەنێو سوپادا ڕۆنا. ئەو سەرپەلی یەکەی تایبەتی لێگیراوی کۆماندۆی پەلی[179] جۆلان بوو، لە ماوەی ئۆپەراسیۆنەکانی هەڵمەتی سیناشدا سەرکردەی بەرەی شەڕی باشوور و پاشانیش ناوەڕاست بوو، لە گوینیش بوو بێتە سوپاسالاری هەموو سوپا، بەڵام باری لەنگی تەندروستی دەرفەتی نەدا و بۆ ماوەی یەک ساڵ لەسەر پێخەفی نەخۆشخانەی هێشتەوە. کاتێکیش هەندێ چاکبووەوە، دوای ماوەیەک لە هاتنەوەسەرخۆ و خوێندن لە زانکۆی کۆلۆمبیا، کرایە بەرپرسی دەزگەی «ئامان»[180]. ئیدی ئەوەبوو لەو ئێوارە دراماتیکەی ئەپریلی ١٩٦٣دا بنگۆریۆن پێویستی پێی هەبوو، کە جێگەی ئیسەر هارلی بۆ بگرێتەوە و کرایە ڕامساد (سەرۆکی مۆساد).

یەکەمین هەنگاوی ئامیت لەنێو مۆساددا ئاسان نەبوو. ئاخر زۆر لە هاوڕێیانی ئیسەر هارل، وەک «یاکۆڤ کارۆز» لەگەڵ ئەو شێوازە تیژ و دەستبەجێیەی و بڕوابەخۆبوونەی ئەویان هەڵنەدەکرد. هەندێکیان دەستبەجێ وازیان لە کارەکەیان هێنا، هەندێکیش دەرفەتیان بە کات دا بەڵکو لەگەڵی ڕابێن. لەژێر سەرپەرشتی ئامیتدا، گۆڕانکاری لە پاسەوانییدا

[179] ئەم کتێبە وردەکاری پلەکانی سەربازی شیناکاتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا زۆرجار پلەکانی سەربازی ناویان هاتووە، منیش لە وەرگێڕانی پلەکاندا هەر پەنام بردۆتە هەندێ دەستەواژەی کۆنی کوردی وەک دەستە، پەل، لق... هیوادارم لە پەیامە سەرەکییەکە لانەدابێ.

[180] ئامان: وەک پێشتریش ئاماژەی بۆ کراوە، دەزگای هەواڵگری سەربازی وەزارەتی بەرگری.

هاتەئارا. بەڵام ئەو پشێوییە نێوخۆییەی دژی *ڕامسادە* نوێیەکە بەرپابوو، هیچی وانەبوو کە بە هی کاتی خۆی ئیسەری بچووکدا بەراورد بکرێ.

لە درەنگانێکی بەهاری ١٩٦٣دا، بنگۆریۆن دەستی لەکار کێشایەوە، سەروەزیر و وەزیرێکی نوێ بۆ بەرگری لەلایەن یاریدەدەرێکی نزیکی ئەو جێگەی گرتەوە کە «لیڤی ئەشکۆل» بوو. ئەشکۆل چەندین دەستپێشخەری کردن کە هاوتای پێشخۆی دەهری کرد. یەکێک لەو کارانە، دانانی ئیسەر بوو بە ڕاوێژکاری کاروباری هەواڵگری. ئیسەری بچکۆڵەش دوای ئەوەی لە مۆساد دەرچوبوو تووڕە و دڵڕەنجاو بوو. کاتێکیش هەواڵی ئەوەی بیست، کە مایەر ئامیت چاکەیەکی نائاسایی لەگەڵ مارۆکۆییەکان کردووە، یەکسەر گەیاندیە مریشکەڕەشە.

✡ ✡ ✡

مۆسادەکەی مایەر ئامیت پەیوەندییێکی توندوتۆڵی لەگەڵ شانشینی مۆراکۆیی بەست.

لەیەک نزیکبوونەوە لەگەڵ مۆراکۆیەکاندا لە سەردەمی ئیسەرەوە دەستپێکردبوو. سەرەداوی یەکەمین پەیوەندیش لەسەر دەستی یاکۆڤ کارۆز و ڕافی ئێتانەوە ڕاچێنرا. لە زستانی ١٩٦٣دا، ئیسەر بە متمانەیەکی تەواوەوە بە ئێتانی گوت: "حەسەنی دووەم، پاشای مۆراکۆ لە پیلانگێڕی جەمال عەبدولناسری سەرۆکی میسر دەترسێ لەناوی بەرێ، چونکە سیاسەتەکەی زیاتر بە لای ڕۆژئاوادا دەشکێنێتەوە. حەسەن داوای لە مۆساد کردووە بەڵکو مشووری ئاسایشپارێزی کەسی پاشا بخۆن."

چیرۆکەکە وادیار بوو ڕێی تێنەدەچوو. ئاخر چۆن دەبێ پاشایەکی عەرەب بۆ یارمەتی ڕوو لە دەزگەیەکی نهێنی ئیسرائیل بکا؟ ئیدی ڕافی ئێتان پیاوی کردار و ئاژانێکی دیکە بەناوی «دایڤد شۆمرۆن»،

ڕاستەوڕاست بە پاسپۆرتی ساختەوە بەرەو «ڕیبات»ی پایتەختی مۆراکۆ فڕین؛ لەوێشەوە بە دەروازەیەکی نهێنییەوە گەیەندرانە کۆشکەکەی پاشا. لەوێدا «ئوفقیر[181]»، ژەنەڕاڵە سامناکەکە، وەزیری پاشا بۆ کاروباری ناوخۆیان بینی، ئەو کەسەی بە ناوهێنانی خەڵکەکە دەترسان و منداڵی ناو بێشکەشیان پێ کڕدەکردنەوە. ئەو بە دڵڕەقی ناسرابوو، ئازار و ئەشکەنجەی نەیارانی پاشای دەدا، بەرپرسیاریش بوو لە سەروسۆراخنەمانی زۆر لە بەرهەڵستکارانی ڕژێم، بێئەوەی ئامادەبێ هیچ ڕوونکردنەوەیەکیش لەسەر ئەو بارەبدا. هەرچۆنێک بێ ئەو ڕاوێژکاری هەرە بایەخداری پاشا بوو لەبارەی کاروباری هەواڵگرییەوە، هەر ڕێکەوتنێک لەنێوان ئیسرائیل و مۆراکۆدا پێویستی بە پەسەندنامەی ئەوەوە هەبوو. ئەویش لەگەڵ کۆلۆنێل «دلیمی» جێگرەکەی خۆی، ئیتان و هاوڕێکەی بینی.

بەڵێ هەر لەوێ، ڕافی ئیتان و «ئوفقیر» گەیشتنە ڕێککەوتنێک: مۆساد و دەزگەی هەواڵگری نهێنی مۆراکۆ پەیوەندییێکی مەحکەم لەنێوان خۆیاندا سازبدەن و نووسینگەی هەمیشەیش لە هەردوو وڵاتدا بۆ یەکدی بکرێتەوە؛ مۆساد دەبێ مەشق بە دەزگەی نهێنی هەواڵگری مۆراکۆیی بکا و لەبەرانبەریشدا مۆراکۆ بە تەواوی ئاژانەکانی مۆساد لەسەرتاسەری دنیادا لەبن باڵی خۆیان بگرێ و بیانشارێتەوە؛ دەزگەیەکی تایبەتیش بۆ هەواڵگرییە کۆکراوە هاوبەشەکان دەکرێتەوە؛ هەروەها دەبێ مۆساد ڕاهێنان بە یەکەی تایبەتی ئاسایشپارێزی پاشاش بکا.

[181] ژەنەڕاڵ «محمد افقیر» ١٩٢٠-١٩٧٢ وەزیری بەرگری و کاروباری ناوخۆی شانشینی مۆراکۆیی و دەستەڕاستی شا محەمەدی پێنجەم بوو پاشان هی حەسەنی دووەم بوو لە نێوان ساڵەکانی ١٩٤٠-١٩٧٢. لە ئابی ١٩٧٢دا هەوڵێکی کودەتای بەسەر پاشادا، بەڵام سەرنەکەوت و لە ئەنجامدا لەسێدارەدرا و تۆڵە لە ماڵباتیەکەیشی کرایەوە. وەرگێڕ.

دوای دوو هەفتە «ئوفقیر» گەیشتە ئیسرائیل. ئەو ژەنەڕاڵەی هەر لە هوتێل و کۆشکی کەشخە کەشخەدا دەیبردەسەر، لە ئیسرائیل ئەو ماوە درێژەی مانەوەی لە ئەپارتمانە بچکۆلانە سێ هۆدە و ناوهەیوانێکی ئیتان لە تەلئەبیبدا بەسەربرد. ئیتانیش توانی «فیلیپ»سەردەستەی ئاشپەزەکانی مۆساد بباتە ئەوێ و خواردن بۆ میوانە مۆراکۆییەکە ساز بکا. ئوفقیر دەڕۆیشت و دەهاتەوە؛ ئیدی پەیوەندییەکانی ئەو دەزگە هەواڵگرییە پەرەیسەند. لە ١٩٥٦دا ئوفقیر داوای چاکەیەکی تایبەتی لە مایەر ئامیت کرد.

سەرکردەی سەرەکی ئۆپۆزسیۆنی شانشین و مەترسیدارترین دوژمنی پاشا، مۆراکۆییەک بوو بەناوی «مەهدی بن بەرەکە». دوای ئەوەی بە پیلانگێڕی لە دژی پاشا تۆمەتبار کرا، نەفی کرا، بەڵام هێشتا لە حەشارگەکەی خۆی لەسەر چالاکییە ژێرزەمینییە دژایەتییەکانی هەر بەردەوام بوو. لە غیابیش بڕیاری مەرگی بەسەردا درابوو، دەشیزانی کەوا ژیانی لە مەترسیدایە، بەڵام زۆر بە وریاییەوە چالاکی دەنواند و پیاوەکانی ئوفقیریش لە دۆزینەوەی کابرادا شکستیان هێنابوو. ئینجا پرسیار ئەوەبوو، ئاخۆ دەکرێ لەو بارەیەوە مۆساد یارمەتیان بدا؟

بەڵێ، هەر بەڕاستیش پیاوەکانی ئامیت یارمەتییاندا. لەژێر بەهانەیەکی زیرەکانەوە، ئەوان لە سویسڕاوە پەیوەندییان بە بن بەرەکەوە کرد و قەناعەتیشیان پێهێنا بۆ کۆبوونەوەیەکی گرنگ بێتە پاریس. لە دەرگەی چێشتخانەیەکی بەناوبانگی سەرلێواری ئاو بەناوی «براسەری لیپ» لەلایەن دوو ئەفسەری پۆلیسی فەرەنسییەوە گیرا، کە دواتر دوو کرێگرتەی ئوفقیر دەرچوون. بن بەرەکە درایە دەست ئوفقیر و شوێنبزر کرا، بەڵام شاهیدێک ئەوەی بینیبوو کە ئوفقیر بە چەقۆ لێیدا تا مرد. مایەر ئامیتیش بە خۆی بە «ئەشکۆل»ی سەرۆوەزیری ڕاگەیاند: "پیاوەکە مرد."

لە فەرەنسادا، دیارنەمانی بن بەرەکە هەرا و گۆبەندێکی شەرمەزارییانەی سیاسی بێ پێشینەی لێکەوتەوە. سەرۆک دیگۆل لەگەڵ ئەوەی هەر بە خۆی بە جارێک لە کارەکە دەهری ببوو، بەڵام کاتێ بیستی کەوا ئیسرائیلییەکان دەستیان لە ڕفاندنی کابرادا هەبوو، هیچی تێدا نەهێشتەوە. ئیسەر هالیش تاسا. ئاخر چۆن دەبێ مۆساد بەشداری کەتنێکی وا بکا؟ ئاخر چۆن دەبێ ئامیت ڕۆڵێکی وا تاوانبارانە، ئۆپەراسیۆنێکی بێ ڕەوشتانە ببینێ و هاوپەیمانێتییە دۆستانەکەی لەگەڵ فەرەنسادا زەرەرمەند بکا. ئەشکۆل دوودڵ بوو، پاشان دوو لیژنەی لێکۆڵینەوەی پێکهێنان، کە هیچ بنەمایەکیان نەدۆزییەوە تا ڕێکاری دژ بە «ئامیت» بگرنەبەر. هەرچۆنێ بێ ئامیت بن بەرەکەی فریودا و بۆ پاریسی دەستکێش کرد، بەڵام بەشداری کردەی ڕفاندن و کوشتنەکەی نەکردبوو. ئینجا ئیسەری بچووک دەستی لەکاری ڕاوێژکارییەکەی کێشایەوە و دەمودەستیش داوای دەستلەکارکێشانەوەی هەریەک لە لیڤی ئەشکۆلی سەروەزیر و مایەر ئامیتی ڕامسادی کرد. هەوڵیدا هەڵمەتێکیش لە مەیدانی ڕۆژنامەوانییەوە بکا، بەڵام دەزگەی چاودێری سوپا بە توندی قەدەغەی کرد هیچ شتێک لەبارەی گۆبەندەکەوە بدرکێندرێ. ئیسەر نەسەلمێنانە دژایەتی ئامیتی هەر دەکرد، بەڵام خۆ ڕامسادەکە خەریکی ئۆپەراسیۆنێکی دیکە بوو، کە بۆ باری بەرگری ئیسرائیلی چارەنووسساز بوو: ئەویش هاوپەیمانییێکی نهێنی بوو لەگەڵ کوردی عێراق.

"لە کۆتایی ١٩٦٥دا،" مایەر ئامیت وای لە یاداشتنامەی خۆیدا نووسیبوو: "خەونەکەمان خەریکبوو بە ڕاستی وەربگەڕێ. شتێکی باوەڕپێنەکراو قەوما. نێردەیەکی فەرمی ئیسرائیلی لە بارەگای «مەلا مستەفا بارزانی» (سەرکردەی کوردە هەڵگەڕاوەکانی باکووری عێراق) جێگیربوو."

گەیشتنی ئەفسەرەکانی مۆساد بۆ کوردستان، بە سەرکەوتنێکی مەزنی دەزگەی هەواڵگری ئیسرائیلی دادەندرا. ئەوە بۆ یەکەمین جار بوو پەیوەندی بە یەکێ لە سێ پێکهاتە سەرەکییەکەی دەوڵەتی عێراقەوە بکرێ کە کورد بوون، ئەوانەی بە پێداگیرییەوە شەڕێکی لەبنەهاتوویان دژی حکوومەتی بەغدا بەرپاکرد. (باقی دوو پێکهاتەکەی دیکە شیعە و سوننە موسڵمانەکان بوون.)[182] شۆڕشگێڕەکان کە بارزانی سەرکردایەتی دەکردن، ڕووبەرێکی بەرفراوانیان لەنێو عێراقدا لەبن دەستدا بوو. خۆ ئەگەر مۆساد بتوانێ شۆڕشگێڕە کوردەکان بکاتە هێزێکی سەربازی بەهێز، ئەوا سەرانی عێراق ناچاردەبن تیشکۆی هزر و کاریان بخەنە سەر کێشەی ناوخۆیی و ئەوسا توانستیان بۆ شەڕکردن لەگەڵ ئیسرائیلدا لەبەین نامێنێ. هاوپەیمانێتی لەگەڵ کورددا دەبووە دەستکەوتێکی ڕاستەقینە بۆ ئیسرائیل.

ئەو دوو مۆسادەی یەکەمین جار بۆ ئەوێ ناردران، سێ مانگی ڕەبەق لە کوردستان مانەوە. بارزانی لە بازنەی داخراوی خۆیەوە بەخێری هێنان، بۆ هەر کوێیەک چووبا لەگەڵ خۆی دەبردن و هەموو نهێنییەکانی خۆیشی بۆ درکاندن. ئەو دیدارە یەکەمینەش بووە مایەی هاوکارییێکی پتەو، کە ساڵانێکی زۆر درێژەی کێشا. بارزانی و سەرانی هێزی چەکداری کورد سەردانی ئیسرائیلیان کرد؛ مایەر ئامیت و یاریدەدەرانیشی هاتنە کوردستان؛ ئیسرائیل چەکی دایە کورد و بەرگری لە بەرژەوەندییەکانی خۆی لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیدا کرد.

---

[182] لە ڕاستیدا دەبوایە نووسەرەکان بیانووسیبایە شیعە و سوونە عەرەبەکان، چونکە شتێکی حاشاهەڵنەگرە کە شیعە و سوونە دوو مەزهەبەکەی ئیسلامن!

«بێنی زیڤی»، ئاژانێکی پلەباڵای ئیسرائیلی کە سەردانی کوردستانی کردبوو، لەکاتی سەردانەکەیدا «جەلیله[183]»ی ژنی لە لەندەن بەجێهشتبوو، دووگیان بوو، خانمەکە لە چاوەڕوانی منداڵبووندا بوو. «ناداڤ» کوڕەکەی بێنی زیڤی لە کاتێک لەدایکبوو کە باوکی لە شاخە سەختەکانی کوردستان لەگەڵ بارزانیدا بوو. ئەوێ دەمێ بروسکەیەکی کۆدەدار دەگاتە دەست «بن زیڤی». بروسکەکە لە «ڕیمۆن» وە واژۆ کرابوو. ڕیمۆنیش نازناوی کۆدەداری مایەر ئامیت بوو. بروسکەکە وا دەخوێندرایەوە: "دایک و منداڵەکە لە تەندروستییێکی زۆر باش دان. *مازاڵ تۆڤ* (بەختێکی باش)!"

کاتێکیش بارزانی هەواڵی منداڵبوونەکە دەبیستێ، چوار بەرد دێنێ و زۆریان دەنەخشێنێ. ئینجا بانگی «زیڤی» دەکا و پێیدەڵێ: "ئەمە دیاری منە بۆ کوڕەکەی تۆ. هەر کاتێک گەورە بوو، دەکرێ بێتە وڵاتەکەمان و داوای پارچە زەوی خۆی بکاتەوە."

کاتێکیش پەیوەندی ئامیت لەگەڵ کوردا پەرەیسەند، سەرەداوی پلانێکی ئۆپەراسیۆنێکی مەزنی دیکەی ڕاچاند و کۆدەناوەکەشی «*یاهالۆم* - ئەڵماس» بوو، ئەو ئۆپەراسیۆنە، مایەی شانازییە هەرە مەزنەکەی بوو.

✡ ✡ ✡

لە ماوەی ساڵی بەر لە مردنی ئامیتدا، ئێمە چەندین جار لە ماڵەکەی خۆی لە «ڕامات گان»دا سەردانمان کرد. ئەو وا دەستی بە قسان کرد: "چیرۆکەکە لە دانیشتنێکی من لەگەڵ ژەنەڕاڵ ئایزەر وایزمەندا چەکەرەی کرد، ئەو کات ئەو سەرۆکی هێزی ئاسمانی بوو. ئێمە ڕاهاتبووین قاوەڵتی بەیانیمان هەر دوو یان سێهەفتە جارێک لەگەڵ یەکدا دەخوارد. لە یەکێک

---

[183] Galila

لەو دانیشتنانەدا، پرسیارم لە ئایزەر کرد ئاخۆ من وەک ڕامسادێک، چی دەتوانم بۆی بکەم. ئەویش دەستبەجێ گوتی: 'مایەر، میگی-٢١م دەوێ.'"

"منیش پێمگوتەوە" ئەرێ شێت بووی؟ ئاخر خۆ جۆرە فڕۆکەیەکی وا لە جیهانی ڕۆژئاواشدا نییە." میگی-٢١ ئەوێ دەمێ پێشکەوتوترین فڕۆکەی جەنگی سۆڤێتی بوو؛ ڕووسەکان زۆر لەو جۆرە چەکەیان دابووە دەوڵەتە عەرەبیەکان.

پاشان «ئایزەر» لە شوێنی خۆی هەڵسا: "ئێمە پێویستمان بە میگی-٢١ هەیە، تۆش نابێ هیچ ڕەنجێک بۆ بەدەستهێنانی لەدەست بدەی."

ئامیتیش بڕیاریدا ئۆپەراسیۆنەکە بە «ڕێهاڤیا ڤاردی» ئەو ئەفسەرە دێرینەی ئۆپەراسیۆنەکان بسپێرێ کە هەمیشە پێشتر هەوڵی خۆی داوە میگی-٢١ لە میسر یان لە سووریاوە بە دەست بێنێ. چەندین ساڵ دواتر، «ڤاردی» گوتی: "ئێمە چەندین مانگ لەو ئۆپەراسیۆنەدا کارمان کرد. گرفتە سەرەکییەکەشمان ئەوە بوو، چۆن بیرۆکەکە بخەینە واری جێبەجێکردنی ئۆپەراسیۆنێکی لەو جۆرە."

«ڤاردی» بیرۆکەکەی بەنێو جیهانی عەرەبدا نارد. دوای چەندین هەفتەی دوورودرێژ، ڕاپۆرتێکی لە «یاکۆڤ نیمرودی» پاشکۆی سەربازی ئیسڕائیلی لە ئێرانەوە پێگەیشت. نیمرودی لەبارەی جوویێکی عێڕاقی بە ناوی «یوسف شیمەش[184]» نووسیبوو، گوایە ئەو فڕۆکەوانێک دەناسێ کە دەتوانێ میگی-٢١ بگەیەنێتە ئیسڕائیل. «شیمەش» کەسێکی سەڵت، زیرەک، مێباز، شێتی زەوق و ئاهەنگ بوو، لە برادەر پەیداکردن زۆر مەعلان و بەزووی وای لێدەکردن متمانەیان پێی هەبێ. نیمرودی گوتبووی: "ئەو بە مۆدەیەکی هەرە پیشەمەند فڕۆکەوانەکەی هێناوەتە

[184] Yossef Shemesh

ژێربار.ساڵێکه ئیشی لەسەر دەکا. بەدەر لەو هیچ کەسی دیکه ناتوانێ ئەو کاره بکا." نیمرودی بڕیاریدا کابرایەکه تاقی بکاتەوه. ئەو یەک دوو ئۆپەراسیۆنی لاوەکی پێسپاردبوو. شیمەشیش به مەعلانییێکی باش و هەر به تەقڵەوه له تاقیکردنەوەکان سەرکەوتووانه هاتەدەر. ئینجا نیمرودی تیشکی سەوزی بۆ ئۆپەراسیۆنەکەی بۆ هەڵکرد.

له بەغدا «شیمەش» یارێکی کریستیانی هەبوو. کامیلای خوشکی یارەکەی مێردی به فڕۆکەوانێکی هێزی ئاسمانی عێراقی به ناوی «مونیر ڕوفا[185]» کردبوو، که ئەویش هەر کریستیان بوو. شیمەش دەیزانی که ڕوفا دڵشکاو و نامراده؛ هەرچەنده باشترین فڕۆکەوانی میگی-٢١یەکیشه؛ ئاخر فەرمانی پێکرابوو سواری فڕۆکەیەکی میگی-١٧ی کۆن بێ تا ئەرکه جیاوازەکەی ڕایی بکا، ئەویش بۆمبارانکردنی گوندەکانی کوردان بوو. ئەو، ئەم کارەی به شەرمەزاری و نزم دەزانی. ئەو سکاڵای برده بەر ئەفسەره پلەباڵاکانی سەرووی خۆی و تێگەیەندرا کەوا ئەو لەبەر کریستانبوونەکەی هەرگیز پلەکەی بەرز ناکرێتەوه و نابێته سەردەستەی کۆمەڵه فڕۆکەوانەکان. «ڕوفا» ئەو پیاوه به مجێزه بەرزەفڕه، له ئاکامدا گەیشتبووه ئەو هەسته، چیدی واتای ژیان له عێڕاقدا نەماوه.

بۆ ماوەی نزیکەی ساڵێک، شیمەش لەگەڵ ئەو فڕۆکەوانه گەنجەدا له گفتوگۆ و هاموشۆدا بوو، لەکۆتاییدا توانی قەناعەتی پێبێنێ که کورته سەفەرێک بکاته «ئەسینا». ئەویش هەموو لەبلەبانی و مەعلانێتی خۆی بەکارهێنا تا بۆ کاربەدەسته عێڕاقییەکانی ڕوونبکاتەوه، کەوا ژنەکەی ڕوفا تووشی نەخۆشییێکی پیس بووه، تاکه ڕێگەی ڕزگاکردنیشی ئەوەیه، دکتۆره ڕۆژئاواییەکان پشکنینی بۆ بکەن. شیمەش گوتی، دەبوایه خانمەکه

[185] منير جميل حبيب ڕوفا (١٩٣٤-١٩٩٨)

ڕاستەوخۆ بچێتە یۆنان، ئینجا لەوێ داوای ئەوە بکا مێردەکەشی بیگاتێ، چونکە ئەو تاکەکەس بوو لە ماڵباتەکە کە ئینگلیزی بزانێ.

بەم جۆرە کاربەدەستەکان دەستەوەستان بوون. «مونیر ڕوفا» ڕێگەی پێدرا لەگەڵ ژنەکەی سەفەر بکاتە ئەسینا. لەوێ فڕۆکەوانێکی دیکەیان بەناوی «کۆلۆنێل زیڤ لیرۆن» وەک ئەفسەری هێزی ئاسمانی ئیسڕائیلی بینی. لەلایەن مۆسادەوە داوای لێکرابوو بەڵکو لە دۆزی ڕوفادا یارمەتیان بدا. لیرۆن و ڕوفا دووقۆڵی چەند جارێک لەگەڵ یەک دوان. لیرۆن وای خۆنیشاندا کە فڕۆکەوانێکی پۆلۆنییە و لەگەڵ ڕێکخراوێکی دژەکۆمۆنیستیدا کاردەکا. مونیریش دەربارەی ماڵباتەکەی خۆی، دەربارەی ژنەکەی لە عێراق دوا، ئەو بە قووڵی دڵڕەنجاو بوو لە کاربەدەستەکانی سەرووی خۆی کە دەیاننارد تا گوندەکانی کوردان بۆمباران بکا. خۆی گوتەنی؛ هەموو ئەوەی بە پیاوەکانی کورد دەکرا ئەوە بوو هەڵبێن، ئەوەی لە گوندەکانیش دەمانەوە هەر ژن و منداڵ و پیر و پەککەوتە بوون. ئاخر ئەوانە هی ئەوە بوون بیانکوژی؟ لەبەر ئەمە ئاماژەی دوایین بڕیاری ئەوە بوو: دەیەوێ بۆ هەمیشە عێراق بەجێبێڵێ.

بەگوێرەی ڕێنماییەکانی مۆساد، لیرۆن بانگهێشتی ڕوفای کرد لە گەڵی بڕواتە دوورگەیەکی بچکۆلانەی گریک. مۆساد کۆدەیەکی بەناوی "یاهالۆم -ئەڵماس-" دایە ڕوفا. لە کەشوهەوایەکی خۆشی ڕاستگۆیی سەر دوورگەکەدا، هەردوو پیاوەکە لەسەر وتووێژەکانیان بەردەوام بوون و بوونە دوو دۆستی باش. ئێوارەیەکی درەنگ لیرۆن لە ڕوفای پرسی ئاخۆ چی ڕوو دەدا ئەگەر بە خۆی و فڕۆکەکەی عێڕاق بەجێبێڵێ.

- "ئەوان دەمکوژن،" ڕوفا وای پێگوتەوە؛ "سەرباری ئەوەش، خۆ هیچ وڵاتێک نییە داڵدەم بدا."

- "بەڵێ، وڵاتێک هەیە بە باوەشی کراوەوە پێشوازیت لێدەکا." لیرۆنیش وای پێگوتەوە و ڕاستی خۆی بۆ برادەرە حەپەساوەکە ئاشکرا کرد:

- "ئەز فڕۆکەوانێکی ئیسرائیلیم نەوەک پۆلۆنی."

ساتێکی درێژی بێدەنگی باڵی بەسەردا کێشان.

- "دەی با بەیانی باسی بکەینەوە." لیرۆن بۆ شەوەکە لە ڕوفا جیابووەوە. بۆ بەیانیەکەی، ڕوفا بە ئیرۆنی گوت کە بڕیاری داوە بە داواکەی قایل بێ. ئیدی هەردوو پیاوەکە دۆخی ڕوفای یاخیبوو و ئەو بڕە پارەیەی وەری دەگرێ تاوتوێ کرد.

دواتر لیرۆن گوتی؛ ڕوفا زۆر خاکی بوو. "مایەر پێیڕاگەیاندم کە بڕە پارەیەکی دیاریکراو بخەمەڕوو؛ ئەگەر پێویستیشی کرد دوو هێندەی بکەمەوە. بەڵام ڕوفا هەر یەکسەر بە دەستپێشخەریەکەی من قایل بوو. ئێمە ڕازی بووین کە ماڵباتەکەی ئەو بگەیەنینە ئیسرائیل.

لە دوورگە یۆنانیەکەوە بەرەو ڕۆما فڕین. شیمەش و یارەکەشی لە بەغداوە گەیشتنە ئەوێ. یەک دوو ڕۆژ دواتر، «یەهودا پۆرات»یشیان گەیشتێ، کە ئەفسەرێکی لێکۆڵەرەوەی هێزی ئاسمانی ئیسرائیلی ببوو کە ئیفادەی لە ڕوفا وەرگرت.

«پۆرات» گفتوگۆکەی بەم جۆرە یاد کەوتەوە: "ئەو کەسێکی زۆر بەڕێز بوو، شتەکانی بەهەند هەڵدەگرت و پیاوێکی شەڕەفمەند بوو. کەسێکی ئازاش بوو، بەڵام زۆر بەدەموپل نەبوو[186]؛ ئەو هیچ لەو خووانەی نەبوون کە تۆ لە کەسێک کە لە پێگەی ئەودا بێ، ڕەچاوبکەی."

---

[186] واتە کەمدوو بوو، لە قسەکردن لەبلەبان نەبوو.

له ڕۆمادا، لیرۆن و ڕوفا ڕێگە و شێوازی پەیوەندییەکانیان تاوتوێکرد. لەسەر ئەوە ڕێککەوتن هەر کاتێ ڕوفا گوێی لە ڕادیۆی دەنگی ئیسرائیل بوو گۆرانییە میللییە عەرەبییەکە لێبدا کە "مرحبتین مرحبتین" ئەوە نیشانەی ئەوە بوو، دەبێ دەستبەکار بێ. بەڵام ئەو نەیدەزانی کاتێ لەگەڵ ئەوانەی سەروسەودایان لەگەڵ دەکرد لە قاوەخانەکانی ڕۆمادا دەسووڕایەوە، لەلایەن سەرۆکی مۆسادەوە چاویدێری دەکرا.

مایەر ئامیت بە ئێمەی گوت: "من بڕیارمدا کە بە خۆم بەرلەوەی ئۆپەراسیۆنەکە بگاتە دوایین قۆناغ، فڕۆکەوانەکە بە چاوی خۆم ببینم. بۆیە بەرەو ڕۆما فڕیم و چوومە ئەو قاوەخانەیە کە فڕۆکەوانە عێراقییەکە و پیاوەکانی من قەول وابوو لەوێ بن. من لەسەر مێزێکی نزیکی ئەوان دانیشتم. کوڕەکە مایەی جێسەرنجی باسی من بوو؛ ئینجا ئاماژەیەکم بەو ئەفسەرە دا کە لەگەڵی دانیشتبوو، کەوا هەموو شتێک لە جێی خۆیدایە و باش بەڕێوەدەڕوا، ئەوسا هەڵسام و ئەوێم بەجێهێشت."

لەماوەی چاوپێکەوتنەکەمان لەگەڵ ئامیتدا، ئەو مکوڕبوو لەسەر ئەوەی چەند بڕگەیەک لە کتێبەکەی خۆی "بۆ پێشەوە" بخوێنێتەوە، کە تێیدا وێنای گرووپێک دەکا کە چوونە نێو قاوەخانەکەی ڕۆما: "عاشقە جووەکە (شیمەش) قاپقاپەیەکی لەپێدابوو چونکە پێی جێبرینێکی تێدا بوو؛ یارەکەی، کە خانمێکی قەڵەوی ناشیرین بوو (من لەوە تێنەدەگەیشتم ئاخۆ شیمەش چی لەو ئافرەتەدا دەبینی)؛ لەگەڵ ئەڵماسەکە (ناوی کۆدەداری مونیر)، کە پیاوێکی کورت، تێکسمڕاوی چوارشانەی خودان ڕووخسارێکی ڕاستەقینە بوو. ئەوان نەیاندەزانی کەوا تاقیدەکرێنەوە."

تەنیا ئەو کاتەی مایەر ئامیت قەناعەتی هات و متمانەی بە ئەڵماسەکە پەیدا بوو، ئینجا فەرمانی دیکەی بە «ڕێهاڤیا ڤاردی» کرد لەسەر هەنگاوی داهاتووی ڕێکارەکانی ئۆپەراسیۆنەکە بەردەوام بێ و فڕۆکەوانە

عێراقییەکە ئاراستە بکا و بێتە ئیسرائیل. بەڵام خەریکبوو بەربەستەکەی فڕۆکەخانەی ئەسینا سەرلەبەری ئۆپەراسیۆنەکە بشێوێنێ. بە هەڵە ڕوفا سواری فڕۆکەیەک بوو لەجیاتی ئەوەی بۆ تەلئەبیب بێ، بۆ قاهیرە دەڕۆیشت. تەنیا ئەو کاتەی لیرۆن چووە سەر پشتی فڕۆکەی ئەلئال، پێیزانی کەوا «ڕوفا» ون بووە.

پاشان «لیرۆن» گوتی: "من نامراد بووم. دڵنیابووم هەموو شتێک لەدەست دەرچوو. بەڵام خۆ هەر یەک دوو خولەکی پێچوو، «مونیر»م بینی لەلای من دەرکەوتەوە. تومەز کاتێ تاقمی فڕۆکەی قاهیرە سەرژمێری سەرنشینەکانی خۆیان دەکەن، دەبینن یەکێ زیادی کردووە، ئینجا بلیتەکان دەپشکنن، ئەوسا مونیر دەنێرنەوە گەشتەفڕینی تەلئەبیب."

ڕوفا تەنیا بیست و چوار سەعات لە ئیسرائیلدا مایەوە. ئەو لە ئاراستەکان ئاگادارکرایەوە و مەشقی لەسەر هێڵی دابەزینی ئیسرائیل پێکرا. لە بارەگای مۆساددا، کۆدەیەکی نهێنی پێگوترا؛ ئینجا برادەرەکانی پیاسەیەکی شەقامی «ئێلنبی»یان پێکرد، کە یەکێک بوو لە شەقامە سەرەکییەکانی تەلئەبیب و لە ئەنگۆرەشدا لە چێشتخانەیەکی نایابی یافایان مێوانداری کرد، "ئەمەش بۆ ئەوەی هەست بە نامۆیی نەکا."

پاشان ڕوفا بەرەو ڕۆما فڕییەوە، فڕۆکەکەی خۆی گۆڕی، ئینجا لە بەغدا نیشتەوە، لەوێش ئامادەکاری بۆ دوا قۆناغی کردەوەکە کرد.

بەڵام ... وەک ڕافی ئیتان بەبیری هاتەوە: "لەو ساتەدا خەریکبوو فشاری دڵ لێم بدا. یەک دوو ڕۆژ بەرلەوەی هەڵبگەڕێتەوە، فڕۆکەوانە عێراقییەکە بڕیاریدا کەلوپەلی ناوماڵی خۆی بفرۆشێ. ئیدی ئەوە بێنە پێشچاوی خۆت کە فڕۆکەوانی فڕۆکەیەکی شەڕکەر لەپڕ ماڵوحاڵی بفرۆشێ، ئەمە چەندی بە چەند! من لەوە تۆقیم نەبادا موخابەراتی عێراقی (دەزگەی

ئاسایشیان) بە پرسی سەروسەودای فرۆشتنەکە بزانێ، ئەوسا سەرلەبەری ئۆپەراسیۆنەکە بەسەریەکدا دەڕما. بەڵام سوپاس بۆ یەزدان، موخابەرات بەو پرسەیان نەزانی، فرۆشتنە گەوجانەی کەلوپەلەکانی ئەو قرچۆکە نەبووە مایەی دەستگیرکردنی ..."

ئینجا کێشەیەکی دیکە: باشە چۆن ماڵباتی فڕۆکەوانەکە لە عێراق دەرباز کرابا؟ سەرەتا دەبوایە بگەیەندرابانە بەریتانیا لەوێشەوە بۆ ئەمریکا. ئاخر ئەو زۆر خوشک و زاوای هەبوون، دەبوایە بەر لە فڕینەکەی لە عێراق دەرهێندرابان. دەستبەجێش خانەوانەدەکەی ڕازیبوون بەرەو ئیسڕائیل بفڕن. ژنی ڕوفاش هیچی لەبارەی بابەتەکە نەدەزانی، مێردەکەیشی دەترسا ڕاستییەکەی پێبڵێ. ئەو هەر ئەوەندەی پێگوتبوو کە ئەوان بە تەمان بۆ ماوەیەکی درێژ بچنە ئەورووپا. ئینجا ژنەکە بەخۆی و دوو منداڵەکەی بەرەو ئەمستەردام فڕین. پیاوەکانی مۆساد لەوێ چاوەڕێیان بوون و گواستیانەوە بۆ پاریس، لەوێ لیرۆنیان بینی. هێشتاش نەیدەزانی ئاخۆ ئەو خەڵکە بۆ لەوێن.

لیرۆن وا ڕووداوەکەی بیر خۆی خستەوە: "لەوێ لە ئەپارتمانێکی بچکۆلەی یەک پێخەفی دەبڵ داندران. ئێمە لەسەر ئەو پێخەفە بووین، لە شەوی بەر لەفڕین بەرەو ئیسڕائیل، کە دەبوایە مێردەکەی بۆ ڕۆژی پاشتر لە ئیسڕائیل دابەزیبا. ئەوسا ئێمەش هەموو لەوێ دەبووین."

کاردانەوەی خانمەکە بۆ ئەو پێڕاگەیاندنە دراماتیکی بوو: "ئەو هەموو شەوەکەی گریا و لە هاواری دەدا." لیرۆن بەم جۆرە ڕاپۆرتی بۆ سەرووی خۆی بەرزکردەوە. "خانمەکە گوتی کەوا مێردەکەی ناپاک دەرچوو؛ ئەمەش ناپاکییە دەرحەقی عێراق؛ ئاخر برایەکانی لەسەر ئەو کردەوەیە، مونیر بە دەستی خۆیان دەکوژن هەر کاتێک دەستیان کەوت.

ژنەکە دەیەویست ڕاستەوڕاست بڕواتە باڵوێزخانەی عێراق و پێیان بڵێ کەوا مێردەکەی بە نیازی چییە. ژنەکە لە قیژە و هاتوهاوار نەکەوت و تەواوی شەوەکە هەر دەگریا. منیش هەوڵمدا هێوری بکەمەوە؛ من پێمگوت ئەگەر دەیەوێ مێردەکەی ببینێ، ئەوا دەبێ لەگەڵ من بێتە ئیسرائیل. خانمەکە پەی بەوە برد، کە هیچ دەرەتانێکی دیکەی بۆ نەماوەتەوە. بە چاوی پەنماو و ساوای نەخۆشەوە سواری فڕۆکە بووین و بەرەو ئیسرائیل فڕین."

لە ١٧ی تەممووزی ١٩٦٦دا، یەکێک لە ویستگەکانی مۆساد لە ئەورووپا نامەیەکی کۆدەداری لە مونیرەوە پێگەیشت، ئاگاداری کردبوونەوە کەوا فڕینەکەی نزیک بووەتەوە. لە ١٤ی ئابدا، ئەو بە فڕۆکەکە هەڵسا، بەڵام بەهۆی هەڵەیەکی سیستمی ئەلکترۆنی وایلێکرد بابداتەوە و لە بنکەی ئەلڕەشیدی سەربازی بنیشێتەوە. "پاشان" وەک مایەر ئامیت گوتی: "بۆی دەرکەوت کە کەموکورتیەکە شتێکی ئەوەندە سەخڵەت نەبوو. لەپڕ ژوورۆچکەی فڕۆکەوانەکە پڕ لە دووکەڵ بوو، ئەمەش لەبەر فیوز سووتانەکە بوو؛ خۆ ئەگەر هەر لەسەر ئاراستەکەی خۆی مابایەوە، ئەوا بەبێ کێشە دەگەیشتە شوێنی مەبەست. بەڵام ئەو وای نەکرد، نەیویست سەرچڵی بنوێنێ و گەڕایەوە بنکەکە، منیش لەو ماوەیەدا تاڵە موی سپیی زیاترم لەسەر پەیدابوون..."

دوو ڕۆژ پاشتر، دیسان مونیر بە فڕۆکەکەی هەڵسایەوە. ئەمجارەیان بەگوێرەی نەخشەکە ڕۆیشت، لەسەر ڕاداری ئیسرائیلیش پنتێک بەدەرکەوت، ئاماژەکەشی ئەوە بوو کە فڕۆکەیەکی بێگانە لە بۆشایی ئاسمانی ئیسرائیلی نزیک دەبێتەوە. فەرماندەی نوێی هێزی ئاسمانی، ژەنەڕال مۆردەخای (مۆتتی) هۆد، تەنیا دوو فڕۆکەوانی خستنەگەڕ. ئەوان دەبووایە یاوەری فڕۆکە عێراقییەکەیان بکردبایە تا دەیانگەیاندە بنکەی

خۆیان لە ئیسرائیل. هەموو یەکەکانی دیکەش، فڕۆکەوانەکان، دەستە و تاقمەکە، هەموو بنکەکانی هێزی ئاسمانی لەلایەن هۆدەوە فەرمانیان پێدرا: "ئەمڕۆ ئێوە هیچ ناکەن، بە ڕەهاییەوە هیچ شتێک ناکەن، بەبێ فەرمانی دەنگی من لە شوێنی خۆتان ناجوولێن. خۆشتان دەنگم دەناسنەوە." ئاخر نەیدەویست هەندێ لە فڕۆکەوانە تامەزرۆکان ئەو "فڕۆکەیەی دوژمن" کە هەرێمی ئاسمانی ئیسرائیلی دەبڕێ، ببینن و بخەنە خوارەوە.

ئیدی میگە ٢١ـەکە گەیشتە ئاسمانی ئیسرائیل. «ڕان ڕاکەر» یەکێ لە لێهاتووەکانی هێزی ئاسمانی دەستنیشانکرا تا یاوەری مونیر ڕوفا بکا. ڕانیش ڕاپۆرتی دایە کۆنترۆلی هێزی ئاسمانی: "میوانەکەمان وا خاوی دەکاتەوە. بە پەنجەی ئەسپێ کوژەشی ئاماژەم بۆ دەکا کە دەیەوێ بنیشێتەوە؛ هەروەها باڵەکانیشی بەرزکردنەوە، ئەمەش نیشانەیەکی نێودەوڵەتییە واتای بە ئاشتی نزیکبونەوە دەگەیەنێ." دەق لە سەعات هەشتی بەیانیدا لە بنکەی سەربازی ئاسمانی بەغدا هەڵفڕی و دوای شەست و پێنج خولەک، گەیشتە بنکەی ئاسمانی «هاتزۆر» لە ئیسرائیل.

ساڵێک دوای ئەوەی ئۆپەراسیۆنەکە دەستیپێکرد و دە مانگیش بەر لە شەڕی شەش ڕۆژەی ١٩٦٧دا، هێزی ئاسمانی ئیسرائیل میگی-٢١ی دەستکەوت. دوو فڕۆکەی میراج لەسەر سنوورەوە یاوەری فڕۆکە میوانەکەیان کرد تا هەڵنیشێتەوە. مایەر ئامیت و پیاوەکانی کارێکی نەکردەیان بە ئەنجامی خۆی گەیاند. فڕۆکەی میگی-٢١ لەو کاتەدا بە تاجێکی زێڕینی جبەخانەی سۆڤیەتی دادەندرا و بە دوژمنی هەرە سەرەکی ئیسرائیلی دەزاندرا کەچی هەنووکە کەوتە بەردەستی ئیسرائیلییەکان. دوای نیشتنەوەی فڕۆکەکە، «مونیر ڕوفا» هەر پەشۆکاو و ئەوقماو دیاربوو، لەوێ مونیر بردرایە ماڵی فەرماندەی بنکەکەی هاتزۆر. چەندین

ئەفسەری پلەباڵا ئاهەنگێکیان بۆ سازکرد، کە هەستی پیاوەکانیان پێنەشاردرایەوە.

پاشان مایەر ئامیت وای باسکرد: "مونیر بە ئاهەنگەکە سەرسام بوو، سەرەتا وای هەستکرد کە هاتۆتە سەر زەماوەندی ژنهێنانی پیاوێکی دیکە. ئەو لە قوژبنێک[187] بە ئارامی دانیشت."

دوای کورتە پشوودانێک، دکە لەوە دڵنیابووەوە ژن و منداڵەکانی بەسەر پشتی فڕۆکەی ئەل ئالەوە بە ڕێگەوەن، مونیر ڕوفا بردرایە بەردەم کۆنفرانسێکی ڕۆژنامەوانی. لە لێدوانەکەیدا، ئەو باسی چەوساندنەوەی کریستیانەکانی عێراق، باسی بۆمبارانکردنی کورد و هۆکاری تایبەتی خۆی بۆ یاخیبوون لە ڕژێمی عێراق کرد.

دوای کۆنگرە ڕۆژنامەنووسییەکە، مونیریان گەیاندە «هێرزلیا»، ئەو دیوەی تەلئەبیب کە بەسەر دەریادا دەڕوانێ، تا لەوێ خێزانەکەی ببینێتەوە. مایەر لەو بارەوە نووسی: "ئێمە هەموو هەوڵێکماندا هێوری بکەینەوە، هانماندا، زۆریشمان لەسەر ئۆپەراسیۆنەکەدا پەسن دا. من بەڵێنم پێدا هەرچیم لە تواناداا بێ بۆ یارمەتیدانی خۆی و گەیشتنەوەی بە خێزانەکەی قسوور نەکەم، بەڵام ئەز لە قۆناغی داهاتوو دەترسام، ئاخر دەمانزانی ماڵباتی مونیر سەر بە کێشە بوون.

یەک دوو ڕۆژ دوای ئەوەی مونیر بە خۆی و فڕۆکەی میگ-٢١ لە بنکەی هاتزۆر نیشتەوە، برای ژنەکەی -کە ئەفسەرێکی سوپای عێراقی بوو- گەیشتە ئیسرائیل. ئەویش بە یاوەری شیمەش و کامێلای یارەکەی هاتن. ئەفسەرەکە لە تووڕەییان شێت ببوو. پێیگوترابوو دەبێ بە پەلە خۆی بگەیەنێتە خوشکەکەی، چونکە زۆر نەخۆشە و لە ئەورووپاشە، بەڵام

[187] قوژبنێک: گۆشەیەک، سووچێک.

ئەوە مایەی حەپەسان بوو کە هێنرایە ئیسرائیل. کاتێکیش گەیشتە لای مونیر، بە تەواوی بەسەریدا تەقییەوە و پێیگوت ناپاک، پەلاماریدا لێیبدا. ئەو خوشکەکەیشی، ژنی مونیریشی تاوانبارکرد، بەوەی ماوەیەکی درێژە ئاگاداری نەخشەی مێردەکەیەتی و بە کەسیشی نەگوتووە، ئەمەش تاوانێکی گەورەیە. بەڵام ژنەکە حاشای لە تۆمەتەکە کرد، کەچی بێهوودە بوو. یەک دوو ڕۆژ دواتر کابرا ئیسرائیلی بەجێهێشت.

✡ ✡ ✡

یەکەمین کەسیش کە بە میگی-٢١ هەڵسا، «دانی شاپیرا» بوو، فڕۆکەوانێکی کارامە و لە باشترین فڕۆکەوانەکانی ئیسرائیل بوو. «مۆتی هۆد» بە یەک ڕۆژ دوای هاتن و دابەزینی فڕۆکەکە بانگی کرد و پێیگوت: "تۆ دەبیتە یەکەمین فڕۆکەوانی ڕۆژئاوایی کە بە فڕۆکەی میگی-٢١ بفڕی. بڕۆ لێیبکۆڵەوە، تا پێتدەکرێ بۆی بفڕە و لە خاڵە بەهێز و لاوازەکانیشی شارەزا بە."

شاپیراش مونیری بینی، ئینجا گوتی: "ئێمە لە هێرزلیا و دوای یەک دوو ڕۆژ لە گەیشتنی، یەکدیمان بینی. کاتێکیش ئەویان پێناساندم، خەریکبوو لە بەئاگابوونەوە باز بدا. پاشان ئێمە لە بنکەی هاتزۆر، لەلای فڕۆکەکە یەکدیمان بینیەوە. ئەو سویچەکەی نیشاندام، ئێمە بەیەکەوە چووینە لای تابلۆکە کە بە هەر دوو زمانی ڕووسی و عەرەبی نووسرابوو، ئینجا دوای سەعاتێک پێمگوت کە دەمەوێ بە فڕۆکەکە بفڕم. ئەویش سەرسام بوو. پێیگوتم: بەڵام خۆ هێشتا کۆرسەکەت تەواونەکردووە! منیش بۆم ڕونکردەوە، من فڕۆکەوانێکم بۆ تاقیکردنەوە. ئەو دیاربوو زۆر نیگەران بوو، داوای لێکردم کە لە لای فڕۆکەکە بێ کاتێ دەفڕێ. منیش بەڵێنم پێدا."

ئەو ڕۆژە هەموو ئەفسەرە پلە باڵاکانی هێزی ئاسمانی هاتنە بنکەی هاتزۆر بۆ ئەوەی فڕینی فڕۆکە بووکەکە ببینن. ئایزەر وایزمەن تا ئەو ماوانەی دوایی فەرماندەی هێزی ئاسمانی بوو، ئەویش هات. شاپیرا وای ڕوداوەکە بیرخۆی هێنایەوە: "ئایزەر هاتە لای من. دەستێکی لەسەر شان دانام و گوتی: دانی، هیچ گەمەیەک مەکە، فڕۆکەکە بە سەلامەتی بگەڕێنەوە، باشە؟"

"مونیر ڕوفاش لەوێ بوو. من بە فڕۆکەکە هەڵفڕیم، ئەوەم کرد کە کردم، پاشان گەڕامەوە و هەڵنیشتمەوە، ڕوفا هاتە لام و باوەشێکی پێداکردم. فرمێسکی لە چاودا قەتیس مابوون. گوتی "بە فڕۆکەوانەکانی وەک تۆ، هەرگیز عەرەب لێتان ناباتەوە"".

دوای یەک دوو تاقیکردنەوە بە فڕۆکەکە، شارەزایان لەوە تێگەیشتن کە بۆچی ڕۆژئاوا ئەوەندە فڕۆکەی میگی-٢١ بەرز دەنرخێنێ. ئاخر زۆر بەرز و زۆر خێرا دەفڕێ و کێشیشی بە یەک تۆن لە میراژی ٣ی فەرەنسی و ئیسرائیلی سووکترە.

ئیدی ئۆپەراسیۆنی میگی-٢١بووە سەردێڕی ڕۆژنامەکانی جیهان. ئەمریکا زۆر پێی سەرسام بوو. زۆری پێنەچوو، نێردەیەکی تەکنیکییان نارد و داوایان کرد لە فڕۆکەکە بکۆڵنەوە و پێشی بفڕن. ئیسرائیلیش لێنەگەڕا ئەوان تخوونی فڕۆکەکە بکەون، بەرلەوەی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لەگەڵ فڕینەکەدا فایلی سام ٢ (SAM-2) کە ڕۆکێتێکی سۆڤێتی دژەفڕۆکەکان بوو نەداتە ئیسرائیلیەکان. لەکۆتاییدا ئەمریکیەکان قایلبوون، فڕۆکەوانە ئەمریکیەکان هاتنە ئیسرائیل و فڕۆکەکەیان پشکنی و ئینجا پێشی فڕین.

زانینی نهێنییەکانی فڕۆکەی میگی-٢١ بۆ ئیسرائیلییەکان یارمەتییێکی بێئەندازە گرنگ بوو، بۆ ئەوەی بە باشی خۆیان بۆ ڕووبەڕووبونەوەی جەنگی فڕۆکەکان لە داهاتوودا ئامادە بکەن، هەر دوای چەند مانگێک لە شەڕی شەش ڕۆژەدا بەکەڵکیان هات. پاشان ئامیت بە شانازییەوە گوتی: "ئەو میگە ڕۆڵێکی گرنگی لە سەرکەوتنی هێزی ئاسمانی ئیسرائیلی بەسەر هێزی ئاسمانی عەرەبیدا بینی، بەتایبەتیش لەچەند سەعاتێکی کەمدا، کە هێزی ئاسمانی میسری تێکوپێک شکێندرا."

بەڵێ هەر بەڕاستیش مۆساد و هێزی ئاسمانی ئیسرائیلی دەستکەوتێکی سەرکەوتووانەی مەزنیان بەدەستهێنا، بەڵام مونیر و خێزانەکەی بە قورسی باجەکەیان دا. ئەفسەرێکی پلە باڵا لەوبارەیەوە گوتی: "دوای گەیشتنیان، مونیر ژیانێکی تاڵ و زۆر ناخۆشی بەڕێکرد. بنیادنانی ژیانێکی نوێ بۆ ئاژانێک (لە دەرەوەی وڵاتەکەی خۆی) ئەرکێکی نەکردەیە. منیر هەستی بە بێهودەیی کرد، خێزانەکەشی هەروەها. ئیدی هەمووماڵباتەکە ڕووخا."

بۆ ماوەی سێ ساڵان مونیر هەوڵیدا ئیسرائیل بکاتە ماڵوحاڵی خۆی، تەنانەت بۆ کۆمپانیای نەوتی ئیسرائیل بە فڕۆکەی داکۆتا گەشتی فڕینی بۆ سینا کرد و هاتەوە. خێزانەکەشی لە تەلئەبیب دەژیان، ئەوان پەردەپۆشکرابوون، وەک پەنابەری ئێرانی نمایش دەکران. بەڵام هاوسەرەکەی مونیر، کە ژنە کاسۆلیکێکی دڵسۆزبوو، نەیدەتوانی برادەر بۆ خۆی پەیدا بکا، هەستی بە دابڕان و گۆشەگیری کرد و لەگەڵ ژیانەکەی ئیسرائیل هەڵینەدەکرد. لەکۆتاییشدا ئیسرائیلیان بەجێهێشت و لەژێر ناسنامەیەکی ساختەدا ڕوویان لە وڵاتێکی ڕۆژئاوایی کرد. لەوێش دوور لە نیشتمان و کەسوکار، بە ئاسایشی خۆجێی دەورەدرابوون، هەستیان بە تەنیایی کرد و لە باڵادەستی موخابەراتی عێراقیش دەترسان.

له ئابی ١٩٨٨یشدا، بیست ساڵ بەسەر یاخیبونەکەیان، مونیر ڕوفا لە ماڵەکەی خۆی بە لێدانێکی کتوپڕی دڵ مرد. خێزانەکەشی بە چاوی فرمێسکاوییەوە زەنگی بۆ مایەر ئامیت لێدا (کە دەمێک بوو ئەویش مۆسادی بەجێهێشتبوو) پێیگوت کە ئەم بەیانییە زووە، مێردەکەی لە نهۆمی دووەمی ماڵەکەی هاتۆتە خوارەوە، لەو کاتەی لە تەنیشت کوڕەکانی وەستابوو، لەپڕ ڕادەقەنێ و لە دەروازەی هۆڵەکەدا دەستبەجێ گیان لە دەست دەدا.

مۆسادیش ڕێوڕەسمێکی ماتەمینیانەی بۆ مونیر ڕوفا ڕێکخست. ئەفسەرە دێرینەکان نەیاندەتوانی ڕێگە بە هەڵڕشتنی فرمێسکەکانیان نەدەن. لیرۆن گوتی: "ئاخر ئەوە هەستێکی سەیربوو، کە مۆسادی ئیسڕائیلی ماتەم بۆ فڕۆکەوانێکی عێڕاقی دابنێ ..."

✡ ✡ ✡

دوابەدوای سەرکەوتنی ئۆپەراسیۆنی ئەڵماس و لێکەوتەی سەرکەوتنە سەرسوڕهێنەرەکە لە شەڕی شەش ڕۆژەدا، مایەر ئامیت هاتە سەر کەڵکەڵەی ئەوەی، دەرفەتی دەستپێکی ئۆپەراسیۆنێکی دیکەش لەپێشە. پێیڕاگەیەندرا کە بەرپرسەکانی ئەو داوای بەردانی گیراوەکانی گۆبەندی لاڤۆن وەک بەشێک لە گۆڕینەوەی دیلەکانی جەنگ دەکەن. گەنجێکی زیندانیکراو کە سێزدە ساڵ بوو لە زینداندا ڕزابووەوە، هیچ دەرفەتێکی لێخۆشبونی ئازادکردنیشی لە ئاسۆدا نەبوو. ئامیتیش هەستی کرد کەوا ئیسڕائل ئەو زیندانیکراوەی لەبیرچۆتەوە. هەنووکەش جەنگی شەش ڕۆژە کۆتایی هاتووە، ئیسڕائیل لەگەڵ میسر لە دانوستان دایە. ئیسڕائیل ٤،٣٣٨ سەربازی میسر و ٨٣٠ مەدەنی بە دیل گرتبوون، لەکاتێکدا میسر هەر تەنیا ١١ ئیسڕائیلی بە دیل گرتبوون. کەچی هێشتا میسرییەکان گردەبڕانە

ڕەتیان کردەوە، زیندانیکراوەکانی گۆبەندی لاڤۆن وەبەر گۆڕینەوەی دیلەکان بکەون.

مایەر ئامیتیش لێنەگەڕا دەرفەتەکە لە دەست دەربچێ. مۆشێ دایان، وەزیری بەرگری بە برادەرەکەی گوت: "مایەر، لەبیری کە. میسرییەکان هەرگیز ئەو زیندانیانە ئازاد ناکەن." سەروەزیر ئەشکۆلیش قایل بوو، بەڵام ئامیت ڕەتیکردەوە دەستەوەستان بێ. لە کۆتاییدا پەیامێکی تایبەتی بۆ سەرۆک جەمال عەبدولناسر "وەک سەرباز بۆ سەرباز" نارد و داوای ئازادکردنی زیندانییەکانی لێکرد، کە وۆلفانگ لوتز "سیخوڕی بە هەڵمەت" لە ماوەی گۆبەندی زانا ئەڵمانەکانەوە لە میسر گیرابوو، بەربدا.

ئامیت دانوستانی لەسەر زیندانییەکانی سووریاش کرد. خۆیشی لەو دانوستانەدا ڕۆڵی هەبوو. داوای لە سووریەکان کرد بەڵکو یارمەتی بەردانی «شولا کۆهن» لە زیندانەکانی لوبناندا بدەن. شولا کۆهن (بەکۆدەناوی "گەوهەرەکە") یەکێک لە سیخوڕە ئەفسانەیەکانی مۆساد بوو. کابانێکی سادەی ماڵ بوو، ڕایەڵەی پەیوەندی لەگەڵ سەرکردە پێگە باڵاکان لە لوبنان و سووریا ڕاچاندبوو، بە نهێنی کاروباری کۆچپێکردنی هەزاران جووی سووری و لوبنانی ڕێکخستبوو، سەرکەوتووانەش ئەڵقەیەکی سووسەکاری زۆر کاریگەرانەی بەڕێوەبرد.

بۆ مایەی سەرسامی، داواکەی لە «جەمال عەبدولناسر» خواردی، سوورییەکانیش دوای ئەوە هەمان شتیان کرد. ئیدی مایەر ئامیت بردییەوە. بە پەردەپۆشییەوە، گیراوەکانی گۆبەندی لاڤۆن، هەریەک لە لوتز و شولا کۆهن گەڕانەوە ئیسڕائیل.

هەندێک جار ئەرکی گەڕانەوەی خۆوەڵاتی بۆ نیشتمان واتادارترین شت دەگەیەنێ.

## بەندی یازدە: ئەوانەی هەرگیزاو هەرگیز لەبیر ناچنەوە

سەروبەندی سەرەتای ئەیلوولی ١٩٦٤ بوو، پیاوێکی سەرڕووتاوەی چوارشانەی بەهێز، لە تەمەنی ناوەڕاستی چل ساڵیدا بوو، چاویلکەیەکی دژەڕۆژی لە چاودابوو، بە قیتاری ڕاستەخۆ لە پاریسەوە گەیشتە وێستگەی ڕۆتەردام لە هۆڵەندا. لەژێر ناوی « ئانتۆن کونزل» لە هوتێلی کەشخەی «ڕاین هۆتێل» دابەزی و وەک بزنسمانێکی نەمساوی ناوی خۆی تۆمارکرد. ئینجا ڕووی کردە نووسینگەیەکی پۆست و گەیاندن و سندووقێکی پۆستی بە هەمان ناو بەکرێ گرت. لە نووسینگەی پۆست و گەیاندنەکەوە ئەمجارەیان ڕووی خۆی لە بانکی «ئیبن ئامرۆ» کرد و حیسابێکی کردەوە و ٣٠٠٠ دۆلاری لێدانا. لە دوکانێکی چاپکردنیش، کارتێکی بزنسمانیشی بەناوی « ئانتۆن کونزل» بەڕادان دا، کە لەسەری بنووسرێ بەڕێوبەری کۆمپانیایەکی وەبەرهێنانە لە ڕۆتەردام. لەوێشەوە بە پەلە خۆی گەیاندە کونسڵخانەی بەرازیل و فۆرمی ڤیزایەکی گەشتیاری بۆ بەرازیل پڕکردەوە. لەلای نۆڕینگەی پزیکشیش، پشکنینی خۆی کرد و گەواهینامەی لەشساغییەکەی وەرگرت، ئینجا چووە لای پزیشکی چاو، لەکاتی پشکنینەکەدا فرتوفێڵی کرد و چاویلکەیەکی گەورەکردنی داواکرد، هەرچەندە پێویستیشی بەو جۆرە چاویلکەیە نەبوو.

بۆ سپێدەی پاشتر، کورتە گەشتێکی بۆ زیوریخ کرد و لەوێش حیسابێکی لە بانکی سویسرا کردەوە، لەوێش ٦٠٠٠ دۆلاری خستە سەر حیسابەکە. ئینجا گەڕایەوە پاریس لەوێش لە ئارایشگایەک جووت سمێڵێکی چڕوپڕ بۆ سەر ڕوخسارەکەی سەرنجی ڕاکێشا، ئینجا لەلای وێنەگر بە عەینەکە

نوێیەکەیەوە چەندین وێنەی گرتن. لە گەڕانەوەی بۆ ڕۆتەردام وێنەکانی پاریسی بۆ ڤیزا دانە دەست نووسینگەی ڤیزای بەڕازیلی بۆ ئەوەی لەسەر پاسپۆرتە نەمساویەکەی بدرێن. ئیدی ئێستا دەیتوانی بلیتی گەشتەفڕین بۆ «ڕیۆدۆ جانیرۆ» لەوێشەوە بەرەو «ساو پاولۆ» و «مۆنتیڤیدیۆ»ی «ئوراگوای» بڕوا. بۆ هەرکوێ چووبا ئەو «کونزل»ە زۆربلێیە هەر باسی بزنسە وەبەرهێنانە نەمساویەکەی دەکرد. دەستبڵاوییە بەخشندانەکەی لەکاتی گەشت و گەڕانەکانی، دابەزینی لە هوتێل و چێشتخانە کەشخە و نایابەکان، هەر بۆخۆی گەواهی بوو، کە هەر بەڕاستی «کونزل» بزنسمانێکی دەوڵەمەند و سەرکەوتووە.

پێدەچوو بەو کردە ئاسانانە، ئاژانی مۆساد «ئیسحاق سارید» کە ئەمەش ناوی خۆی نەبوو، ڕووپۆشێکی تەواو سەلمێندراو بۆ خۆی دابین بکا. لە شوێنێک لە شوێنەکان لەو گەڕان و سوڕانەی لەنێوان پاریس، ڕۆتەردام و زیوریخ، «ئیسحاق سارید» ونبوو کەس نەیزانی ئاسمان هەڵیکێشا یان زەوی قووتی دا، لەجیاتی ئەو کەسێکی دیکە شوێنیگرتەوە ئەویش: «ئانتۆن کوزل»، بزنسمانێکی نەمساوی کە ناوونیشانێکی لە ڕۆتەردام، حیسابی بانکی، کارتی بزنس، ڤیزایەک و بلیتی فڕۆکەشی بۆ بەڕازیل لە گیرفاندایە.

هەرچەند ڕۆژێکی کەم بەر لەوە، واتە لە یەکی ئەیلوولدا، بانگی «ئیسحاق سارید» کرا لە کۆبوونەوەیەکی لە پاریس ئامادەبێ. ئاخر «سارید» ئەندامی ئۆپەراسیۆنێکی مۆساد بوو لەژێر کۆدی «کایساری[188]». لە

[188] Caesarea

ماڵێکی پارێزراو[189] له گەڕەکی ڤێرسای چاوی به فەرماندەی ئۆپەراسیۆنی کایساری، «یۆسکه یاریڤ» کەوت که پیاوێکی چوارشانەی ماسوولکەدار بوو، هەمیشەش جێگەی سەرسامی کارمەنده بندەستەکانی خۆی بوو. «یاریڤ» ئەفسەرێکی پێشووی سوپا بوو، جێگەی ڕافی ئیتانی له سەرۆکایەتی تیمی ئۆپەراسیۆنییدا گرتبووەوە. «ئیتان»یش کرابووه سەرۆکی وێستگه ئەورووپییەکانی مۆساد و بنکەکەشی له پاریس بوو.

«یاریڤ» کۆبوونەوەکەی بەوه دەستپێکرد، یەک دوو مانگێک دەبێ، پەرلەمانی ئاڵمانی ڕۆژئاوا ستاتوتێکی لەخۆگرتووە، که کۆتوبەندی خستۆته بەردەم داواکردنەوه و به سزاگەیاندنی تاوانبارانی جەنگ، واته تاوانبارانی نازی – ئەوانەی لەبن ناوێکی دیکەدا دەژین- که دەکرێ جارێکی دیکه ئەوانه سەرهەڵبدەنەوه و ژیانێکی ئاسایی دەستپێبکەنەوە، ئەگەر هاتبێ ئەو کەسانه کردەیەکی سامناکییان نەکردبێ. «یاریڤ» گوتی زۆر له ئەڵمانەکان دەیانەوێ لاپەڕەی نوێ هەڵدەنەوه و مێژووه سامناکەکەیان پەردەپۆش بکەن. تەنانەت نەتەوەکانی دیکەش، ئەوانەی لەبن دەسەڵاتی ئاڵماندا نالاندبوویان، پەرۆش نەبوو که لێکۆڵینەوه و گەڕان و سوڕان بەدوای تاوانباره نازییەکان بەردەوام بێ. لەوەتەی چوار ساڵی ڕابردوو، که ئایخمان گیرابوو، هۆشیاری سەبارەت به تاوانباره نازییەکان نەمابوو، ئەوەش وەک ئەوه وابوو، که دادگاییکردنەکەی ئایخمان و لەسێدارەدانی بەندێکی له بەندەکانی مێژووی جیهان پێوەدابێتەوە. «یاریڤ» گوتی شتێکی زۆر سەرەکییه، لەوه دڵنیابین که

---

[189] ماڵی پارێزراو: ئەو خانوو و ئەپارتمانانه بوون که مۆساد له شارەکانی وڵاتانی دەرەوەدا به ناوێکی خوازراوەوه به کرێی گرتبوون، دووربوون له گومان و کار و چالاکی خۆیانیان تێدا دەکرد.

ئەو ستاتوتەی کۆتوبەندکردنی گەڕان بەدوای تاوانبارانی نازی، نەبێتە قانون. ئاخر جیهان پێویستی بەوە هەیە ئەو دێوەزمانە بەبیر خۆی بێنێتەوە، کە هێشتا ژمارەیەکی زۆریان لێماون.

یاریڤ بە ساریدی گوت: "تۆ دەبێ یەکێ لە گەورەترین تاوانباری نازی بکوژی." ئاژانێکی مۆسادیش لە ئەرکێکی خۆی لە باشووری ئەمریکادا یەکێک لەو گەورە تاوانبارانەی دۆزیبووەوە. "قەسابی «ڕیگا[190]»،" نازییێکی لاتڤی کە تاوانبار بوو بە کوشتارگەیەک، کە ۳۰،۰۰۰ جووی تێدا کوژرا، بەتەواوی ناونیشانەوە ناسراوەتەوە. ئەو ئێستا لە بەرازیل و لەبن ناسنامەی ڕاستەقینەی خۆی «هێربەرتس کوکەرس» دەژیێ. مایەر ئامیتی ڕامسادیش، تیشکی سەوزی بۆ ئۆپەراسیۆنەکە هەڵکردبوو.

ئیدی یاریڤ ڕووی لە «سارید» کرد. ئەوەش وەنەبێ لەبەر ئەوەبێ، کە سارید تۆمارێکی مەعلانی و پڕاوپڕی هەبوو، لە ئۆپەراسیۆنی ئایخمانیشدا بەشداربوو، بەڵکو لەبەر ئەوەش بوو، کە سارید خۆی لە ئاڵمان لەدایکببوو، دایک و باوکی لە هۆلۆکۆست فەوتابوون. سارید هەڵاتبووە فەلەستین، بەڵام سوێندی خواردبوو دژی هیتلەر بجەنگێ و لە بەرایی ئەو فەلەستینییە خۆبەخشانەشدا بوو، کە لەمیانەی جەنگەکەدا چوونە ڕیزی سوپای بەریتانیا. یاریڤ هیچ لەبارەی نیازکردەی «سارید» بەخەم نەبوو.

فەرماندەی «کایساری» بە ساریدی گوتبوو: "من دەمەوێ تۆ خۆت لەژێر ناوی بزنسمانێکی نەمساوی پەردەپۆش بکەی. کارەکەی تۆ فڕینە بەرەو

---

[190] Riga ڕیگا، پایەتەختی وڵاتی لاتڤیا.

بەرازیل، لەوێش «کوکەرس» بدۆزیتەوە و وای لێبکەی متمانەت پێبکا. ئەمەشیان هەنگاوی یەکەمی لەناوبردنییەتی." لە پێڕاگەیاندنە وردەکانی دیکەدا، یاریڤ ناوە نوێیەکی بۆ «سارید» ئاشکراکرد ئەویش: «ئانتۆن کونزل» بوو.

دوای دە ڕۆژ لە کۆبوونەوەکەیان لە پاریس، «ئانتۆن کوزل» سواری فڕۆکەیەک بوو بەرەو «ڕیۆ دۆ جانیرۆ» فڕی. ئەو بە ئەرکەکەی هەم خۆشحاڵ و هەم پەشۆکاش. ئاخر هەرگیز نەکەوتبووە دۆخێکی لەم جۆرە. ئەو دەبوو، هەر بە تاکوتەنیا لە وڵاتێکی بیانییدا دەستبەکار بێ و ئەرکەکەی ڕاپەڕێنێ. لەوەش زیاتر ئەو دەبووایە دۆستایەتی لەگەڵ دێوزمەیەک پەیدابکا، کە دڵنیابوو لەوەی ڕۆژێک دێ یەکێک دەیکوژێ. «کونزل» دەیزانی، یەک هەڵە دەبێتە مایەی لەبارچوونی سەرلەبەری ئۆپەراسیۆنەکە؛ بەڵێ هەر هەنگاوێکی شاش لەوانەیە سەری خۆیشی لەسەردابنێ.

لەماوەی گەشتەفڕینەکەدا، کونزل سەری بەسەر بارستایەکی قەبەی بەڵگەنامەدا گرتبوو، ئیفادەکانی دەخوێندنەوە، هەموو ئەو پارچە ڕۆژنامە هەڵگیراوانەی سەبارەت بە هێربەتس کوکەرس هەڵگێڕ و وەرگێڕ کردن. کابرای نازی لە سییەکانی سەدەی ڕابردوودا فڕۆکەوانێکی بەهرەمەند و ناسراو بوو، ئەو بە فڕۆکەیەکی بچوک کە هەر بەخۆی دروستی کردبوو لە لاتڤیاوە بەرەو «گامبیا» لە ئەفریقیا فڕیبوو. بە شەو و ڕۆژێک ئەو فڕۆکەوانە گەنجە قۆزە بووە پاڵەوانێکی نیشتمانی لاتڤیا. لە بەرانبەردا بە مێدالیای نیشتمانی «سانتۆس دومۆنت» لەسەر شەرەفی فڕۆکەوانی یەکەمینی بەرازیلی پاداشت کرا؛ ڕۆژنامەوانانیش ناوی "هەڵۆی لاتڤیا" و

"ليندبێرگی[191]" لاتڤیایان لێنا. مۆزەی جەنگیی لە «ڕێگا» جمەی دەهات لەو کەسانەی بە پەرۆشەوە سەیری فڕۆکەکەی «کوکەرس»یان دەکرد کە لەوێ نمایش کرابوو.

«کوکەرس» لە لاتڤییە نەتەوەپەرستە ڕاستڕەوەکان بوو، زۆر لە برادەرەکانیشی جوو بوون. تەنانەت سەردانی فەلەستینیشی کردبوو، لە گەڕانەوەشدا زۆر بە دەستکەوتەکانی زایۆنیزم لەوێ کارانگاز بوو. قسە بەجۆش و پەرۆشەکانی بۆ مارە و بەرابیەکانی کۆچکردووان بۆ فەلەستین وایلێکردبوو بە هاوپەیمانی جووەکانی لاتڤیا بناسرێ.

کەچی لەگەڵ هەڵگیرسانی جەنگی دووەمی جیهان، لە هیکەوە شتەکان گۆڕان. هەر زوو سۆڤیەت لاتڤیای داگیرکرد، بە خێراییش ڕقی خەڵکەکەی بردەوە و ئەو کەسانەشی دەچەوساندنەوە کە «کورکەس» خۆشی دەویستن. بەڵام سوپای سوور دوای هێرشی هیتلەر بۆ سەر ڕوسیا، لە لاتڤیا کشایەوە، ئیدی لاتڤیا کەوتە بن دەستی لەشکری ئاڵمان. ئەمجارەیان «کورکەس» بە یەکجاری گۆڕا. ئەو نیشتمانپەروەرە بەجۆشە و سەرکردەی ڕێکخراوی دڕندەترین بکوژی سادیزمی جووەکانی «ڕێگا»، هەر زوو خۆی و سەربازەکانی سێسەد جووی لەنێو کەنیشتەیەک کرد و ئاگریشی تێبەردان، هەرچی تێیدا بوو کوشتی. ئینجا جووەکانی دەگرت، ئازاری دەدان، بە دەمانچەی بەرپشتی وەبەر گوللانی دەدان، بەم جۆرە سەدان کەسی لە جووە ئۆرسەدۆکسەکان کوشتن، لێیدەدان و ڕیسوای دەکردن، سەری کۆرپە و ساواکانی بە دیوارەکانی شاردا دەدا.

[191] چارلس ئاگوستۆس لیندبێرگ (١٩٠٢-١٩٧٤) ئەفسەر و نووسەر و فڕۆکەوانێکی زۆر ناوداری ئەمریکا بوو، بە هەڵۆ بەناووبانگ بوو.

شەوێکیان، لەبەردەم کۆمەڵە جووێکی دیلکراودا جلی لەبەر کچێکیان داماڵی، ئینجا ڕابیێکی پیری ناچارکرد لە کچەکە بدا و برینەکانی بلێسێتەوە، ئەمەش هەمووی لەبەرچاوی حیتەی[192] پێکەنینی پاسەوانەکاندا کرد. لە هاوینیشدا بڕیاری خنکاندنی ١٢٠٠ جووی لەنێو دەریاچەی «کولدیگا»دا دا، هەروەها لە نۆڤێمبەری ١٩٤١یشدا ٣٠،٠٠٠ جووی بۆ کوشتن گەیاندە کێڵگەکانی دارستانی «ڕومبلا»، لەوێ لەلایەن سەربازانی ئاڵمان جلیان لەبەردا داکەندران و بەخوێنی ساردەوە تەقەیان لێکردن و کوشتیانن.

خوێندنەوەی نامەی هەندێ لەو جووانەی ئەوێ دەمێ بە پەڕجوو دەربازیان بوو، «کونزل»ی لە ناخەوە تەزاند. بەڵگەنامەکان وەسفی هەڵاتنی «کورکەس»یان دەکرد، چۆن دوای جەنگ چۆتە فەرەنسا و کاخەز و ناسنامەکانی ساختەکردوون. ئەو خۆی بە جووتیارێک نیشان دابوو، بۆیە توانی بە بەلەمێک خۆی بگەیەنێتە «ڕیو دی جانیرۆ». ئەو لەگەڵ خۆی بەڵگەنامەیەکی متمانەیی سەیری بردبوو، ئەویش کچە جووێک بە ناوی «مریام کایتزنەر»، کە لە دەست جەنگەکە ڕزگاری کردبوو. «مریام» ئێستا وەک یاوەرێکی بوو، لەنێو بەرازیلدا قسەی لەسەر ڕۆڵی جوانمەردانەی ئەو وەک "فریادڕەسێکی «ڕێگا» دەکرد.

لە ڕیۆ دۆ جانیرۆشدا، «کورکەس» پەیوەندییەکی گەرموگوڕی لەگەڵ زۆر لە جووە بەرازیلییەکاندا گرێدا. حەزی لێبوو لەناو جووەکاندا وا وەسفی بکرێ، وەک چۆن لە چیرۆکەکەی مریامدا هاتبوو. ئەو لەسەر ئەوە ڕاهاتبوو کە بڵێ: "نازییەکان کچەکەیان گرت. کیژەکە بەرەو مەرگێکی

---

[192] حیتە: قاقا، قرتە.

سامناک بەڕێوە بوو، بەڵام من ڕزگارم کرد، سەرچڵێشم کرد کە وامکرد." ئاخر خۆ ئەو پاڵەوانە ئازایە و فریادڕەسی جووەکان وەنەبێ هەموو ڕۆژێ ڕێی بکەوێتە ڕیۆ دی جانیرۆ، هەر بۆیە جووەکانی شارەکەش دریغییان نەکرد لەوەی نیشانی ئەو لاتیڤیە ئازایە بدەن کە بۆ ئەو کارە جوامێرییەی نیشانی دابوو، چەند بەنرخە و چاکەیان چەند قات دایەوە.

«کورکەس» لەنێو کۆمەڵگەی جوەکانی شارەکەدا خۆشەویست بوو، تا نیوەشەو ئەو لاتڤیە ئازایە هەر مەی و شەرابی دەنۆشی. ئاخر زۆر خواردنەوەی ئەلکهول هیچ بەربەستێکی لەپێشدا نەهێشت و ئەوەی لەناو دڵیدابوو بە ئاسانی هاتە سەرزمانی، ئینجا بۆ ئامادەبووان چیرۆکێکی جیاوازی گێڕایەوە. هەر بەڕاستیش دەربارەی جووەکان قسەی کرد، بەڵام پێیگوتن کەوا بەراز و خڵتە و خاشاکی نێو کۆمەڵن. ئەو بە تاسەوە باسی ئەو شێوازانەی خۆی و برادەرە نازییەکانی دەکرد کە چۆنیان بۆ سەربڕین و کوشتارگەی جووەکانی ئەورووپا بەکارهێناوە، چۆن جووەکانیان بە زیندویی سووتاندوون، خنکاندوویانن، تەقەیان لێکردوون، گوللەیان پێوەناون تا مردوون... برادەرە جووەکانی کابرای لاتڤی بەو قسانە گۆد بوون، ئینجا دەستیان بە لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون کرد، ئەوەی دۆزیانەوە بەرەنجامێکی زۆر سامناک و هۆڤیانە[193] بوو.

کاتێکیش ناسنامە ڕاستەقینەکەی کابرا سەرئاوکەوت، «کورکەس» ون بوو. ئەو لە ڕیۆ دی جانیرۆدا نەڕۆیی، تەنیا ئەوە بوو چووە گەڕەکێکی دووری قەراغ شار. وازیشی لە مریام کایتزنەر هێنا، چونکە چیدی پێویستی پێنەمابوو. پاشان مریام مێردی بە جوویێکی خۆجێی شارەکە

[193] هۆڤییانە: دڕندانە، ئاژەڵییانە.

کرد و لەنێو کۆمەڵگەی بەرازیلیدا توایەوە. هەرچی دەربارەی «کورکەس»یش بوو، ژنی هێنا و سێ کوڕیشی پەیدابوون.

دە ساڵ بەسەر ئەم ڕەوشەدا تێپەڕین. «کورکەس» بووە خاوەن کۆمپانیای تاکسی هەوایی ڕێزلێگیراو. بەڵام ئەوکات و هەر بەڕێکەوتیش، لەلایەن کۆمەڵگەی جووەکانی ڕیۆ دی جانیرۆدا دۆزرایەوە. ئیدی ئەوانیش جەماوەریان لێئاگادار کردەوە. خوێندکاران بەسەر کۆمپانیاکەیان دادا، دەرگە و پەنجەرەیان شکاندن، کەلوپەل و ئامێرەکانیان تێکدان و فایلەکانیشیان بەتاڵکردن... «کورکەس»یش دەستبەجێ خۆی و خێزان و منداڵەکانی لەوێ باریان کرد و لە سان پاولۆدا نیشتەجێ بوون.

تەنانەت لەگەڵ ئەوەش کە لەوێ کەس هەراسانی نەکرد، بەڵام «کورکەس» هەستی دەکرد، مەترسی هەر لەسەرە. ئەو ترسی خۆی ڕاوی دەنا و گومانی لە هەموو غەوارەیەک هەبوو کە لێی نزیک دەبووەوە. لە حوزەیرانی ١٩٦٠دا، یەک دوو ڕۆژ دوای گرتنی ئەدۆلف ئایخمان، «کورکەس» چووە لای پۆلیسی سان پاولۆ و داوای ئاسایشپارێزی لێکردن. داواکەشی جێبەجێکرا، بەڵام ئەمەشیان لە میدیادا ڕاگەیەندرا، ئیدی قوربانیانی «کورکەس» لە هەموو سوچ و کەناری دنیایێ دەیانزانی کابرا لەکوێ دەژی.

سالانێک وا ڕۆیشت، تا دەهات ترسی کابرا زیاتر دەبوو. ڕۆژێکیان بە ژن و کوڕەکانی گوت کەوا تۆڵەستێنە جووەکان هەر دەیدۆزنەوە و لەهەر کاتێکیشدا بێ دەیکوژن. ئیدی ئەو لەجێی خۆی لیستێکی بۆ دوژمنە هەرە سەرسەختەکانی خۆی دروستکرد، زۆریان لەو لیستە جووە بەرازیلییەکانی شاری ڕیۆ دی جانیرۆ بوون. لە سەرووی لیستەکەش

هەریەکە لە د. ئاهارون ستاینبروک، سیناتۆر د. ئەلفرێدۆ گارتنبێرگ؛ د. مارکوس کۆنستانتینۆ؛ د. ئیسرائیل سکۆلینکۆڤ؛ ڕێزدار کلینکەر و ڕێزدار پایرتزکی بوون.

«کورکەس» هەر بە ناوی ڕاستەقینەی خۆی بوو، بەڵامماڵەکەی وەک قەڵا و سەنگەرێک لێکردبوو، خشپەی مار و مێرووی لە دەوروبەری ماڵەکەی دەگەیاندە پۆلیس و دەزگەی ئاسایش.

ئەو چەندین سەرچڵی بازرگانیانەی کردن، بەڵام لە هەموویان شکستی هێنا. بەگوێرەی فایلەکەی بەردەستی «کونزل»، دوایین ناوونیشانی لەنگەرگایەک بوو لەسەر گۆلێکی دەستکرد لە دەرەوەی سان پاولۆدا. «کورکەس» یەک دوو بەلەمی بەکرێگرتبوون، دیمەنێکی گەشتیاری لە فرۆکە ئاوییەکەی خۆی بەسەر دیمەنی شارەکەوە دەڕوانی.

کونزل دەیزانی ئەگەر بیەوێ ڕاستەوخۆ لە «کورکەس» نزیک ببێتەوە، ئەوا بێ سێ و دوو گومانی لا پەیدا دەکا، بۆیە یەکەم جار ئەو یەک دوو ڕۆژ لە ڕیۆ دی جانیرۆدا مایەوە. لەو شارە بەرازیلییەدا مایەوە کە تەواو پێچەوانەی ئەرکە تاریکەکەی بوو کە دەبوو ڕایپەڕێنێ. ئەو پیاسەیەکی بەسەر کەناراوەکانی «کۆپاکابانا» و «ئیپانێمادا» کرد، سەیری جوانی سروشتی و کیژۆڵەکانی کرد کە هەر بە مایۆ و مەمکدان دەسووڕانەوە، سەیری کۆتەڵە قەبە و سەرنجڕاکێشەکەی عیسای کریستۆسی کرد، کە لەسەر لووتکەی «کۆرکۆڤادۆدا» داندرابوو، سەیری ڕێوڕەسمی ماکومبا (تەلیسمە خورافییەکەی بەرازیلیەکانی) کرد، لەژێر تیشکی گەرما و لەبەر سەمای سامبادا نەشئەی وەرگرت... ئەو نموونەی گەشتیارێک بوو، بەڵام بە چەندین کاربەدەستی پلەباڵا و وەبەرهێنی تایبەت لە جیهانی بزنسدا

ئاشنا بوو، کە لەنێویاندا وەزیری خۆجێی گەشتیاری هەبوو، ئیدی ئەویش وای خۆناساند کە بزنسمانێکی جیهانی گەشتیارییە و حەزی لە وەبەرهێنانە لە شوێنە گەشتیارییە دڵڕفێنەکانی بەرازیل. ئەو یەک دوو نامەشی بۆ چەند بیچمێکی ناوداری جیهانی گەشتیاری بۆ سان پاولۆ پێبوو.

«کونزل» کە گەیشتە سان پاولۆ دەستبەجێ لەنگەرگای «کورکەس»ی دۆزیەوە. لەسەر ڕۆخی بەلەمێک، ئەو بەشە کەشتیە خۆشەی گەشتیاران، فڕۆکەیەکی دەریای بینی، لەتەنیشت فڕۆکەکەشدا پیاوێکی لاوازی کە جلی فڕۆکەوانێکی لەبەردابوو بینی، ئەویش «هێربەتس کورکەس» بوو.

✡ ✡ ✡

کونزل لە کیژە ئاڵمانە جوانەکە نزیک کەوتەوە کە بلیتی کورتە گەشتە گەشتیارەکەی بەلەمەکەی «کورکەس»ی دەفرۆشت و داوای زانیاری گەشتیاری ئەو ناوچەیەی لێکرد. کونزل نەشیدەزانی کە ئافرەتە گەنج و جوانەکە بووکی کورکەسە و ژنی کوڕە گەورەکەیەتی. خاتوونەکەش دانی پێدا نا، کە شتێکی زۆر دەربارەی گەشتیاری نازانێ، بەڵام ئاماژەی بۆ پیاوێک کرد کە لە هەموو شتێک دەزانێ: "پرسیار لەو بکە، ئەو یارمەتیت دەدا."

کونزلیش بەرەو لای فڕۆکەوانەکە ڕۆیشت و خۆی وەک وەبەرهێنەرێکی نەمسایی پێناساند. یەک دوو پرسیاری پیشەمەندانەی لێکردن و کورکەسیش بە بێباکی وەڵامی دانەوە؛ بەڵام کاتێ کونزل داوای لێکرد بەڵکو خۆی و فڕۆکە ئاوییەکەی بەکرێ بگرێ بۆ گەشتێک بەدەوری شارەکەدا، هەڵوێستی گۆڕا. بۆ یەک دوو خولەک دواتر ئەوان لە ئاسمان

بوون. هەردوو پیاوەکە گفتوگۆیەکی دۆستانەی دوورودرێژیان کرد؛ ئاخر «کونزل» دەیزانی چۆن دۆست و برادەر پەیدابکا. لە گەڕانەوەشدا «کورکەس» بانگهێشتی کونزلی بۆ نێو بەلەمەکەی خۆی کرد تا پێکێک براندی بەیەکەوە بنۆشن.

لەکاتێکدا سەرگەرمی خواردنەوە بوون، لەپڕ «کورکەس» بە تووڕەییەوە بە ڕووی ئەوانەی تاوانباری دەکەن، تەقییەوە و جوێنی پیس پیسیشی پێدان. لەجێی خۆی هاواری کرد: "ئەرێ من تاوانباری جەنگ بووم؟ من کچێکی جوولەکەم لە شەڕ ڕزگار کرد." «کونزل»یش گومانی بۆ پەیدابوو لەوەی ئەو خۆنمایشکردنەی «کورکەس» ساختە بێ و هەر بۆ ئەوەی بێ کابرا بیەوێ کاردانەوەی بوروژێنێ.

- کورکەس لێیپرسی: "ئایا تۆ لەجەنگدا خزمەتت کردووە؟"

- "بەڵێ." کونزلیش وا وەڵامی دایەوە؛ "لەبەرەی ڕووسیدا." بەڵام تۆنی دەنگی وەڵامی کابرا دیاربوو ئاماژە بوو بۆ پێچەوانەکەی، تا ئەوە بگەیەنێ کەوا «کونزل» لە شەڕدا خزمەتی کردووە بەڵام بە دڵنیاییەوە نەوەک لە بەرەی ڕووسەکان. ئەو دوگمەی کراسەکەشی کردەوە و جێبرینێکی سەر سینگی نیشانی کوکەرس دا. ئینجا بێ ئەوەی بچێتە نێو وردەکارییەوە گوتی: "هی جەنگە."

«کونزل» خێرا ڕەوشی خانەخوێکەی هەڵسەنگاند. کوکەرس لەبارێکی خراپی داراییدایە؛ لە هەموو لایەک هەر پەشۆکاوە، فرۆکەیەکی شڕی هەیە، بەلەمەکانیشی نیشانەی ئەوەن کە ژیانێکی هەرە نزمی هەیە. کونزل پەی بەوەبرد، کە دەبێ «کورکەس» وا لێبکا، کە بڕوای بەوەبێ لەڕێی

کونزلەوە بەسەر ئاستەنگییە داراییەکانیدا زاڵ بێ، تێیبگەیەنێ ئەو، ئەو پیاوەیە کە بەختی باشی بۆ دەهێنێ و تییدا سوودمەند دەبێ. بۆیە ئەو هەر باسی کۆمپانیاکەی خۆی و هاوکارەکانی دەکرد، هەروەها باسی زەمینەسازی وەبەرهێنانی پرۆژەیەکی قەبەی کرد کە برە پارەیەکی زۆر لە کەرتی گەشتیاری لە ئەمەریکای لاتین وەبەربهێنێ. ئاماژەیەکی واشی نیشاندا بەڵکو کورکەسیش بێتە ڕیزی گرووپەکەیانەوە، چونکە ئەو لە کون و کەلەبەری گەشتیاری بەرازیل شارەزایە.

دیاربوو کورکەس بە قسەکانی میوانەکەی خۆشحاڵ بوو، مەیلیشی لێبوو، بەڵام لەپڕ کونزل هەڵسایە سەر پێیان و گوتی: "زۆر باشە، پێویست ناکا چیدی بێزارت بکەم. تۆش دیارە زۆر سەرقاڵی."

"نەخێر بە هیچ شێوەیەک،" کورکەس وا وەڵامی دایەوە، پێشنیازی بۆ کونزل کرد بەڵکو لەیەکێ لەو ڕۆژانە دوای کار سەردانی بکاتەوە؛ "بەجۆرێک کە بەیەکەوە تاوتوێی بەرژەوەندییە هاوبەشییەکانمان بکەین."

ئیدی تەونی پەیوەندیەکان ڕاچێندرا. داو داندرا. ئێستا دەبێ وا لە کورکەس بکرێ بەدوایدا بچێ و بە داوەکەوە بێ.

هەر هەمان ئەنگۆرە، کونزل بروسکەیەکی کۆدەداری بۆ «یۆسکە یاریڤ» لێدا. بۆ یەکەمین جار ئەو، ئەو کۆدەی بەکارهێنا کە یاریڤ بۆ کورکەسی لێگرتبوو: "مردووەکە."

کورکەسیش لەهەمان شەودا هەندێ شتی نووسی. دەستی دایە لیستی دوژمنە هەرە کوشندەکانی و ناوێکی دیکەی بۆ زیادکرد.

ئانتۆن کونزل.

✡ ✡ ✡

دوای هەفتەیەک، تاکسییێک لەبەردەم خانوییێک لە گەڕەکی ڕیڤیریا لە سان پاولۆ وەستا. خانووەکە خانوییێکی سادە بوو، بەڵام وەک قەڵایەک پارێزراو بوو: بە دیوارێکی بڵند و تێلدڕ دەورە درابوو، دەروازەکەشی دەرگەیەکی کەتەی ئاسنین بوو، لە پاڵیدا گەنجێگ لەگەڵ سەگێکی دڕ وەستابوو. کونزل ڕووی کردە کوڕە گەنجەکە، کە کوڕێکی کورکەس دەرچوو، کە فڕۆکەوانەکە لە هاتنی مێوانەکە ئاگادار بکاتەوە. کورکەسیش بە گەرمی پێشوازی لە کونزل کرد، لەگەڵی بەنێو ماڵەکەدا گەڕا، هاوژینەکەی خۆی (میلدا)ی پێناساند، ئینجا چەکمەجەیەکی کردەوە نزیکەی پازدە میدالیای سەردەمی جەنگی نیشاندان، زۆر لەوان بە خاچێکی نووشتاوە[194] ڕازابوونەوە.

کورکەس دوگمەی چەکمەجێکی دیکەشی کردەوە، ئەمجارەیان یادەوەرەییە تایبەتیەکەی کونزلی پێسەرسام کرد: سێ دەمانچەی قوڕس و تفەنگێکی نیمچە ئۆتۆماتیکی تێدابوو. کورکەس بە شانازییەوە ئەوەی ئاشکراکرد، کە دەزگەی نهێنی بەرازیلی مۆڵەتی هەڵگرتنی ئەو هەموو چەکەی پێداوە. ئەوەشی خستەسەر قسەکانی: "من دەزانم چۆن بەرگری لە خۆم بکەم."

[194] خاچی نوشتاوە: مەبەست ئەو خاچەیە کە نازییەکان وەک دروشمێکی خۆیان بەکاریان دەهێنا. وەرگێڕ.

کونزلیش ئەو قسەیەی کورکەسی وەک گەفێکی لەبن،[195] وەرگرت. قسەی خانەخوێکە وایدەگەیاند، ئەگەر هەوڵبدەی ئازارم پێبگەیەنی، دەبێ ئەوەش بزانی، کە من چەکدارم و خەتەرناکیشم.

ئینجا لەپڕێکەوە بیرۆکەیەکی بۆهات: "ئەرێ بۆچی لەگەڵم نایەیتە گەشتێک بۆ نێو کێڵگەکەم؟ لێرە لە دێهاتە؛ دەکرێ شەوێکی خۆشیش ببەینەسەر."

کونزلیش دەستبەجێ پەسەندی کرد. بەڵام لە ڕێگەی گەڕانەوەی بۆ هوتێلەکەی، لە دووکانێک لایدا و هەر بۆ حاڵەتی پێویست دامبۆکسێکی[196] کڕی.

دوای یەک دوو ڕۆژ، هەردوو پیاوەکە سواری ترۆمبێلێک بون کە کونزل بەکرێی گرتبوو بەرەو شاخەکان کەوتنەڕێ.

گەشتەکە گەشتێکی گرژ و بەترس بوو. تاکە چەکی ئانتۆن کونزل دامبۆکسەکە بوو، لە کورکەسیش دەترسا، هێشتاش هەر سوور بوو لەسەر ئەوەی مجێزی بۆ لای سامانەکەی خۆی ڕابکێشێ و تا دەیگەیەنێتە مەرگی ڕاستەقینەی خۆی.

لە ترۆمبێلەکە، هێربەرتس کورکەس لە تەنیشت کونزل دانیشتبوو، پیاوێکی بەهێز، خەمبار و بەڵام هەژار و گومانی لە برادەرە نوێکەش هەبوو، تفەنگێکی دەستی قوڕسیشی پێبوو بەڵام لەبەرانبەر ئەو دانە و داوەی پێشتر کونزل بۆی دانابوو، ناتوانا بوو.

---

[195] لەبن، شاراوە، ضمني.

[196] جۆرە چەکێکی سپییە وەک دەستەوانە لە پەنجە دەکرێ. دەکرێ هەم وەک بۆکس وەشاندن بەکاربهێندرێ هەم دەکرێ وەک چەقۆیەکی کوشندەش کاربکا.

کونزل بیری کردەوە بەڵکو ئەویش قوربانییێکی گەمەی مشک و پشیلەکەی ئەوبێ، لەوانەیە کورکەس بڕوای بە چیرۆکە نمایشکەرەکەی ئەو نەبووبێ، کێ نالّێ ئەو بۆ ئەوە نەیبردۆتە گەشتی سەرشاخەکان تا لەوێ ساردی بکاتەوە؟

لە ڕێگەی خۆیان لایاندایە کێڵگەیەکی چۆڵ و هۆڵ. هەر لەپڕێکەوە کورکەس دەستی بۆ جانتاکەی بردو تفەنگە نیمچە ئۆتۆماتیکییەکەی ڕاکێشا. کونزلیش لێی ڕاما. ئەرێ باشە بۆچی کورکەس هەم دەمانچە و هەم تفەنگیشی لەگەڵ خۆی هێناوە؟

کورکەس لێیپرسی: "ئەرێ چیدەڵێی کە کێبەرکێیەکی ئامانجشکێن بکەین؟ دەستبەجێ کونزل لێیتێگەیشت: کورکەس دەیەوێ توانستی جەنگاوەرێکی پێشووی بەرەی ڕووسیایی تاقی بکاتەوە ئاخۆ چۆن تەقە دەکا. کابرای لاتڤی نیشانەیەکی گونجاوی لەسەر دارێک دانا، فیشەکی بردنەبەر تفەنگەکە و دە گوللەی سەرکەوتووانە گرتنە نیشانەکە. لێدانەکە دە سانتیمەتری بە دەوری ئامانجەکەدا کرد. کورکەس دەستی بۆ جانتای دووەم برد و تفەنگەکەی پڕ فیشەک کردەوە، ئەمجارەیان دایە دەستی کونزل تا نیشانەکە بشکێنێ. ئیدی ئەو جەنگاوەرە دێرینەی سوپای بەریتانی و ئەندامی سوپای بەرگری ئیسرائیلی، نیشانەشکێنێکی نایاب بوو. ئەویش تفەنگەکەی لێوەرگرت بەبێ هیچ وەخرانێک تەقەی کرد و ئەڵقەیەکی سێ سانتیمەتری بە دەوری نیشانەکەدا کێشا. ئینجا کورکەس سەری ڕەزامەندی بۆ لەقاند و گوتی: "بەڕێز ئانتۆن، زۆر نایابە."

ئەوسا هەردووکیان گەڕانەوە لای ترومبێلەکە و بەرەو کێڵگەی دووەم لێیانخوڕی. ئەمجارەیان کێڵگەکە زۆر گەورەتر بوو، دارستانێکی چروپڕ و

ڕوباریشی لێهەبوو، لەوێدا تیمساح بە تەمبەڵی دەخوشین. کورکەس بەپێش کەوت و ڕێنوێنی ڕێگەکەی کرد، دیسان کونزل ترسی لێنیشتەوە. تۆ بڵێی ئەمە تەڵە بێ؟ ئەرێ کورکەس بۆیە کابرای هێناوەتە ئێرە تا بیکوژێ و هیچ پەرێزیش بەدوای خۆیدا جێنەهێڵێ؟

ئەو لە تەنیشت کورکەسدا دەڕۆیشت. شتەکان بەسەر یەکەوە هاتن، کە لەسەر گابەردێک وەستا؛ دڕکێک لەبن پێڵاوەکەی دەرچوو لە پاشپانی پێی چەقی. ئەوسا بە ئازارەوە کونزل دانەویەوە پێڵاوەکانی داکەندن. خوێنیش لەپاشپانی پێی هاتەخوار.

کورکەسیش خۆی بەسەردا شۆڕکردەوە و تفەنگەکەی ڕاکێشا. کونزلیش ئاشکرا دیاربوو هی ئەوە نەبوو هیچ بەرگرییێک لەخۆی بکا. هەر هیچ نەبێ وەک بیری لێدەکردەوە، ڕەوشەکە وابوو، خەریکبوو لەدوا ساتی ژیانی نزیک دەبووەوە. ئەوسا کابرای لاتقی وەک سەگ دەیداتە بەر گولله. بەڵام کورکەس تفەنگەکەی دایەدەست و پێیگوت "قۆنداخەکەی بەکاربێنە، وەک چەکوک لێیبدە."

کونزلیش تفەنگەکەی لێوەرگرت. ئیدی هەموو شتێک هەر لەپڕ ڕوویدا، ڕۆڵەکان پێچەوانە بوونەوە. ئەوان لە کێڵگەی دامێنی چیاکەدا هەر بەتەنیا بوون. ئاخر خۆ بۆ چەندین مایل کەسێکی زیندووی لێنەبوو. تفەنگەکەش پڕ فیشەک و سوارکرابوو. ئەو دەیتوانی لە هەر ساتێک کورکەس هەر لەسەر هەمان گاشەبەرد فت بکا. هەر ئەوە مابووەوە لوولەی تفەنگەکەی تێبکا و قامک[197] لەسەر پەلاپیتکەکە بگیرسێنێ.

---

[197] قامک: پەنجە، پل، تپل.

کەچی لەبری ئەوە، بەهێزێکەوە لە دڕکەکەی دا و دەریهێنا، ئینجا تفەنگەکەی دایەوە ماخۆکەی.

بۆ شەوەکەی هەردوو پیاوەکە گەیشتنە کۆڵیتە شەق و شڕەکەی کابرا، هەرچۆنێک بوو، ئەو خواردنەی لەگەڵ خۆیان هێنابوو خوارديان. ئینجا کیسە خەوەکانی خۆیان لەسەر دوو چوارپایەی ئاسنین پانکردنەوە. کونزل بینی کەوا کوکەرس تفەنگەکەی لەبن سەرینی خۆی دانا. ئیدی چەند بیرۆکەیەکی شەپڕێوی بۆ هاتن، ئەویش چەقۆکەی دەرهێنا و ئامادەی کرد، بەڵام خەوی لێنەکەوت.

لە نیوەی شەودا، گوێی لە دەنگەدەنگێک بوو لە پێخەفەکەی کورکەسەوە دەهات. کابرا نازییەکە هەڵسا، دەستی دایە تفەنگەکەی، بە هێواشی هەنگاوی نا. کونزلیش کەوتە بیرکردنەوە، باشە بۆچی؟ هەوڵیدا گوێی لەو دەنگە بێ کە لە دەرەوە دەهات، ئینجا لەپڕ بەئاسانی گوێی لە دەنگەکە بوو، ناسیشیەوە. تومەز ئەوە کوکەرس بوو لە دەرەوە وستابوو میزی دەکرد. لەوانەیە لەو دەوروبەرە دڕندە بسووڕێنەوە و بەدوای نێچیردا بگەڕێن.

بۆ بەیانییەکەی بە ساغی و سەلامەتی گەڕانەوە ساو پاولۆ. کاتێکیش کونزل گەڕایەوە لای هوتێلەکە، ئاهێکی پێدا هاتەوە.

لەماوەی ئەو هەفتەیەی بەدوای ڕووداوەکەدا هات، کونزل بانگهێشتی کوکەرسی کردە چێشتخانەیەکی زۆر بەتام، کە یانەیەکی شەوانەی گرانبەها و باڕی خۆیشی هەبوو. لەکاتی نانخواردنەکەدا تێبینی ئەوەی کرد، کە کورکەس زۆر بە مجێز و تاسەوە کەوتۆتە سەر خواردنەکە،

دیاربوو دەمێک بوو لەبەر بێ پارەییان خواردنێکی وا بەتام و خۆشی نەخواردبوو. جووڵەی دواتری کونزل ئەوەبوو، داوا لە کوکەرس بکا بەڵکو لەگەڵی بچێتە چەندین یانەی شەوانی خۆجێی، هەڵبەتە هەمووشی هەر گران بوون و لەسەر گیرفانی کونزلیش بوون. ئەوان بەیەکەوە سەردانی چەند شوێنێکی سەرەکی گەشتیارییان کرد، کوکەرسیش چێژی لە خواردن و مانەوەی ئەوێ دەبینی.

ئێستاش کار هاتەسەر ئەوەی کونزل پێشنیاز بۆ کوکەرس بکا، کە بەیەکەوە بەرەو «مۆنتیڤیدیۆ»، پایتەختی ئۆرۆگوای بفڕن. ئاخر هاوکارەکانی لە بزنس وەک ئەو گوتی داوایان لێکردبوو، لەوێ لە ئەمریکای لاتیندا مەڵبەندێکی گەشتوگوزار دابمەزرێنن، ئیدی ڕایانسپاردبوو بچێ لەبارەی پێگەی شوێنەکە و نووسینگەی باڵەخانەکان و توانستەکانی دیکەی گەشتوگوزاری بکۆڵێتەوە. تەنانەت ئەو پارەی پاسپۆرتێکی نوێشی بۆ کوکەرس دا.

کونزل بەرەو مۆنتیڤیدیۆ فڕی، دوای یەک دوو ڕۆژیش کوکەرسیشی گەیشتێ. بەڵام خۆ هێشتا گومانی کابرای لاتیڤی نەڕەوابووەوە؛ ئەو کامێرای لەگەڵ خۆی هێنابوو. کاتێک لە فڕۆکەخانەی مۆنتیڤیدیۆ لەفڕۆکەکەی دابەزی، کونزلی بینی، چاوەڕێی دەکرد. کوکەرسیش کامێراکەی لەشان کردەوە و چەندین وێنەی کونزلی گرتن، ئەمەش مایەی سەرسامی برادەرەکەی بوو. ئەو برادەر و هاوکار و پاڵپشتییە مادییەی ببووە سەرەکیترین گومانلێکراو لە پیلانی لەناوبردنی خۆیدا.

لەمیانەی ئەو ڕۆژانەدا، کونزل ترومبێلێکی گەورەی ئەمریکی بەکرێگرتبوو. زۆریش لە ڕەنگەکەی کە پەمەیی بوو بێزار بوو، بەڵام خۆ

تەنیا ئەو ترومبێلە بۆ بەکرێدان لە لای ئاژانسەکە هەبوو. هەروەها چەند ژوورێکیشی لە باشترین هوتێلی شارەکە، کۆشکی ڤیکتۆریا بۆ تیمەکەی بەکرێگرت. ئەوانیش یەک دوو ڕۆژیان لە مۆنتیڤیدیۆیان بەسەربرد، گەڕان و سوڕان، سەیری باڵەخانەکانیان کرد ئاخۆ بۆ بنکە و مەڵبەندەکانی کۆمپانیای کونزل دەستدەدەن یان نا. ئەوان شوێنێکیان پێپەیدا نەکرا، بەڵام خۆشییێکی زۆرییان لە پشووەکەیان وەرگرت. دیسان کونزلس کوکەرسی بانگهێشتی باشترین چێشتخانە کرد و لەگەڵ خۆی بردییە یانەی شەوانە، شوێنە ناوادارەکانی شار و گازینۆکان. کوکەرسیش زۆر دڵخۆش بوو. لە کۆتاییشدا لەیەک جیابونەوە، کونزل ئەوێی بەرەو ئەورووپا بەجێهێشت، بەڵێنیشی بە کوکەرس دا، دوای یەک دوو مانگ بگەڕێتەوە و پەرە بە پڕۆژەکەی خۆیان بدەن. کوکەرسیش گەڕایەوە «ساو پاولۆ»، بەڵام بە ژنەکەی خۆی گوت، لە مۆنتیڤیدیۆدا کەسێکی بەدواوە بوو، بۆیە دەبێ لە ئێستاوە وشیار بێ و ئامادەی بەرگری لەخۆکردن بێ.

✡ ✡ ✡

لە پاریسدا کونزل، یاریڤ و هاوڕێکانی بینییەوە و دەستبەجێ ئامادەکاری ئۆپەراسیۆنەکەیان خستەسەرپێ. بڕیاردرا کە کورکەس لە مۆنتیڤیدیۆ لەناوببرێ، ئەمەش لەبەر کۆمەڵێک هۆ: لە بەڕازیل کورکەس لەلایەن پۆلیسی خۆجێیەوە پارێزراوە، هەروەها دەکرێ کێشە و گرفتیش دروست بکا؛ لە بەڕازیل کۆمەڵگە گەورەکەی جوو لە بارێکی ناسکدا دەبێ و دەکرێ نازییە نوێیەکان یاخود ئاڵمانەکان تۆڵەی خۆیان بکەنەوە؛ لەکۆتاییشدا لە بەڕازیل سزای قورس هەیە، خۆ ئەگەر تیمەکە دەستی

خۆی بوەشینی و هەڵێن و بگیرێن یان هەوڵی هەڵاتن بدەن، ئەوا دەکوژرێن.

دەستەی لێدان لە پێنج کەس پێکهاتبوو، «یوسکە یاریڤ» بە خۆی سەردەستەکە بوو. یەکێک لە ئاژانەکانیش زیڤ ئامیت (شارۆن)ی ئامۆزای مایەر ئامیتی ڕامساد بوو، ئەندامەکانی دیکەی دەستەی ئاژانەکە کونزل، «ئاری کۆهن» (کە ناوی ڕاستەقینەی خۆی نەبوو) لەگەڵ «ئێلیازەر سودی (شارۆن)» کە ئەویش پاسپۆرتێکی نەمساوی بە ناوی «ئۆسوالد تاسینگ» هەڵگرتبوو.

ئەندامانی دەستەکە لە فێبرایری ١٩٦٥دا گەیشتنە مۆنتێڤیدیۆ. «ئۆسوالد تاسینگ» ترومبێلێکی ڕەنگ کەسکی ڤۆلکسواگن و هەروەها خانووێکی بچووکیشی لەسەر شەقامی «کارتاگنای» لە گەڕەکی «کاراسکۆ»دا بەکرێگرت. لەدوا ساتیشدا، «یاریڤ» ئەرکێکی بەترس و بیمی پێسپارد: بەوەی پەستێک بکرێ (ئەو جۆرە ترومبێلە لە دار دروستکراوانە لەسەدەی نۆزدەهەمدا هاتوچۆی پێدەکرا). پەستەکەش بۆ ئەوە بوو کە بەشێوەیەک لە شێوەکان بکرێتە دارەبازی کابرای نازی کاتێ ئۆپەراسیۆنەکەیان کۆتایی پێدێ.

کونزلیش کورکەسی بۆ مۆنتیڤیدیۆ بانگهێشت کرد.

لە ١٥ی فێبرایری ١٩٦٥دا، کورکەس چووە لای بنکەی پۆلیسی سەرەکی و «ئالکیدۆ سینترا بیۆنۆ فیلۆی»، ئەفسەری پۆلیسی بینی. کابرای لاتڤی بە ئەفسەرەکەی گوت: "من بازرگانم. بۆ چەندین ساڵە لەژێر سایەی پارێزگاری پۆلیسی بەرازیلیدام، چونکە هۆکارێکی باشم بۆ ترس لە ژیانم

هەیە. هەنووکەش هاوکارێکی بزنسمانی ئەورووپی داوی لێکردووم لە مۆنتیڤیدۆدا بیبینم. باشە ئێوە چی دەڵێن، ئایا دەتوانم بچمە «ئۆراگوای»؟ ئایا چوونەکەم سەرچڵی نییە؟"

ئەفسەرەکەش بە خەندەوە پێیگوت: "مەچۆ! لێرە لەبەرئەوەی دەتپارێزین بە ئاشتی دەژی. بەڵام نابێ ئەوە فەرامۆش بکەی، لەو کاتەی بەرازیل جێدێڵی، تۆ چیدی پارێزراو نی. خۆت تووشی داوی دوژمنەکانت دەکەی. خۆ ئەگەر دوژمنت هەبن، ئەوا گریمانەم هەر ئەوەیە، ئەوان تۆیان فەرامۆش نەکردووە."

کورکەس ماوەیەک بیری لێکردەوە، پێدەچوو دوودڵ بێ، بەڵام لە کۆتاییدا هەڵسا و گوتی: "من هەمیشە پیاوێکی مەرد بوومە. من ناترسم. دەشزانم چۆن بەرگری لە خۆم بکەم. هەمیشە چەکم هەڵگرتووە. بڕوام پێبکە، سەرباری هەموو ئەو ساڵانەی ڕابردن، من هێشتا نیشانەشکێنێکی کارامەم."

✡ ✡ ✡

کونزل لە ٢٣ی فێبرایردا کورکەسی لە مۆنتێڤیدۆدا بینیەوە. داوەکەش داندرابووەوە. کونزل بە ترۆمبێلیکی ڕەشی ڤۆلکسواگنی بەکرێگیراودا کوکەرسی بەرەو «کاسا کوبەرتینی» برد، لەوێوە دەستەکەی لە چاوەڕوانیدا بوون. لە ڕێگەدا بۆ چەندین جار وەستان، بۆ ئەوەی چەندین خانوو "سەیربکەن و بپشکنن" ئاخۆ بۆ مەبەستی نووسینگەی کۆمپانیاکە دەست دەدەن یان نا. لە شوێنێک بینیان هەندێ کەس خەریکی کارن، خەریکی نۆژەنکردنەوەی خانووێکن. ترۆمبێلە کەسکەکەی «تاوسینگ»یش کە هەر ڤۆلکسواگنێک بوو، لەوێ لەلای خانووێکی

نزیکەوە ڕاگیرابوو. کونزلیش ترومبێلەکەی خۆی کوژاندەوە، لە ترومبێلەکە هاتەدەر، بەرەو دەرگەی خانووەکە ڕۆیشت. کوکەرسیش بەدوایدا چوو. کونزل دەرگەکەی کردەوە دیمەنێکی سامناکی بینی: لە خانووە تاریکەکەدا، ئەندامانی دەستەی دەستوەشێن لەلای دیوارەکانەوە وەستابوون، تەنیا جلی بنەوەیان لەبەردابوون. ئاخر ئەوان دەیانزانی ناتوانن بە بێ شەڕێکی خوێناوی بەسەر کورکەسدا زاڵ بن، بۆیەش جلەکانیان لەبەر خۆیان داکەندبوو، تا بە خوێنەوە نەبن. لەوێ دیمەنێکی ترسناکی ئەو دەستەیەی کە تەنیا جلی ژێرەوەیان لەبەردا بوو، دیاربوو کە لە تاریکیدا چاوەڕێی نێچیرەکەی خۆیان دەکرد.

کونزل بەلایەک لایدا و کورکەسیش لە خانووەکە چووە ژوور. هەر ئەو پێی نایە نێو خانووەکە، کونزل دەرگەی لە پشتەوە لەسەر داخست. ئیدی سێ پیاو بۆ کورکەس چوون. «زیڤ ئامیت» هەوڵیدا قورگی بگرێ، بۆ ئەم کارەش لە پاریس ڕاهێنانی کردبوو. دوو کەسەکەی دیکەش لە هەر دوولاوە بازیان دایە سەری.

کابرای لاتڤیش دەستی کردەوە. توانی پەلاماردەرەکانی لەخۆی دووربخاتەوە و ڕووەو دەرگەکە بڕوا. دەسکی دەرگەکەی لەبن دەرهێنا، ئینجا لەو کاتەی تێکۆشا دەمانچەی نێو بەرکەی دەربێنێ بە ئاڵمانی هاواری دەکرد: Lassen Sie Mich sprechen! "دە لێم گەڕێن با قسەیەک بکەم!"

لە میانەی شەڕەکەدا، یاریڤ هەوڵیدا بە دەستی خۆی دەمی «کورکەس» بگرێ، تا دەنگی هاوارکردنەکەی دەرنەچێ. کورکەسیش بە دڕییەوە دەستی توند گەست، خەریکبوو پەنجەیەکی بقرتێنێ. «یاریڤ»یش لەبەر

ئازار هاواری کرد. لەو ساتەدا «ئامیت» دەستی دایە چەکوشێکی گەورەی بیناسازی و بە تەپڵی سەری کورکەسی دادا. خوێن لە برینەکەی فیچقەی کرد. جەستەی پەلاماردەرەکان و قوربانییەکە بەسەر یەکدا کەوتنە سەر زەوی، لەو کاتەشدا کورکەس نامرادانە هەوڵیدەدا دەمانچەکەی ڕابکێشێ. ئیدی هەر ئیشی چەند چرکەیەک بوو، «ئاری» نیشانەی دەمانچەکەی لە سەری کورکەس گرت و دوو جار لەسەر یەک تەققەی لێوە هێنا. دەمانچەکە لەبەر لوولە بێدەنگکەرەکەی، هەر بە تەنیا تەپەی لێوەهات.

ئەوسا تەرمی کورکەس لەو گۆڕە کەوت. خوێنەکەی بەسەر جلوبەرگ و بەسەر ناوکەوەکەدا[198] ڕژا. ئەندامانی دەستە بکوژەکەش لە خوێندا شەلاڵ بوون.

هەر دەستبەجێش «ئۆسوالد تاوسینگ» ڕایکردە لای شێرەی سەرەکییەکەی ئاو و بەریدایەوە. برادەرەکانی خوێنیان لە جەستەی خۆیان شۆری، ئینجا ناوکەوی خانووەکە و دیوارەکەشیان خاوێنکردەوە، کەچی هێشتاش هەر پەڵەی خوێن بە کاشی خانووەکە مابوون.

دواتر یەکێک لە ئەندامانی دەستەکە گوتی مەبەستیان ئەوەبووە، کورکەس بە زیندوویی بگرن، تا بەر لەسێدارەدانی دادگایەکی سەرپێی بۆ ساز بدەن. بەڵام نەخشەکە خەوشی تێکەوت یاخود هێزی جەستەیی کابراکەیان بە هەند هەڵنەگرتبوو، بۆیە ئەرکەکەیان بووە گۆمی خوێن، کە نە نەخشەی بۆ کێشرابوو نە پێویستیش بوو وەها بکەوێتەوە. ئاژانێکی

[198] ناوکەو: ئەرزیەی خانوو.

مۆساد لەدوا ساتدا ترۆمبێلە پەستەکەیان گەیاندە ئەو خانووەی لەسەر شەقامی «کارتاگنا»یان بەکرێ گرتبوو؛ ئینجا لەبری ئەوەی قوربانییەکان ڕابکێشنە نێو پەستەکە، دەبوایە ڕاستەوخۆ تەقەی لێبکەن. بەڵام وەک هەندێک لە دەستەکە پێیان ڕاگەیاندین، ئەرکەکەیان تەواوکرد.

ئاژانەکان تەرمی کوکەرسیان بردە نێو پەستەکە، بۆ ئەوەی بڕوا بە پۆلیس بهێنن کە بە نیازبوونە بیرفێنن و لە ئوراگوای ئاودیوی بکەن. ئینجا نامەیەکی تایپکراویان بە زمانی ئینگلیزی لەسەر تەرمەکەی بەجێهێشت، کە پێشتر ئامادەکرابوو:

"لەبەر قەوارەی ئەو تاوانانەی کە کوکەرس پێیوە تاوانبارکرابوو، بەتایبەتیش بەخۆی بەرپرسیار بوو لە کوشتنی ۳۰،۰۰۰ لە پیاو، ژن و منداڵ و لەبەر ڕەچاوکردنی ئەو دڕندایەتییەی کە هێربەرتس کوکەرس لەکاتی تاوانەکانیدا نواندبووی، ئێمە حوکممان بە مەرگ لەسەر «کوکەرس»دا دا. تاوانبار بەدەستی ئەو کەسانەی کە هەرگیز هی لەبیرچوونەوە نین، لە ۲۳ی فێبرایری ۱۹٦٥دا لەناوبرا."

ئینجا دەستەکە خانووەکەیان بەجێهێشت و بە سواری هەردوو ڤۆلکسواگنەکە لەوێ ڕۆیشتن. لە خانووەکەی دراوسێشدا هێشتا کرێکارەکان هەر خەریکی تەقەی چەکوچ و بزماری کاری بیناسازی خۆیان بوون. ئەوان گوێیان لە هیچ نەببوو. یاریڤیش لەبەر ژانی پەنجەکانی دەیناڵاند. تاوسینگ و کونزل ترۆمبێلەکانیان گەڕاندەوە و هوتێلەکانی خۆشیان بەجێهێشت، سەرلەبەری دەستەکە مۆنتێڤیدیۆیان بەجێهێشت و گەڕانەوە بنکە و بارەگاکانی خۆیان لە ئەورووپا و ئیسرائیل. زیڤ ئامیتیش "بە جەستەی بریندار و ئازاری ڕۆح"ەوە

گەڕایەوە پاریس. بۆ چەندین مانگ هەر شەولەبان و کابوسی لەخەودا دەبینی و نەیدەتوانی بەسەر سەرسامی و ژانەکەیدا زاڵ ببێ.

کاتێکیش هەموو دەستەی دەستوەشێنەکە ئەمریکای لاتینیان بەجێهێشت، ئاژانێکی مۆساد زەنگی بۆ ئاژانسێکی هەواڵ لە ئاڵمانیا لێدا و ڕاپۆرتێکی لەسەر لەناوبردنی تاوانبارێکی نازی لە مۆنتێڤیدیۆ بە دەستی "ئەوانەی هەرگیز لەبیر ناچنەوە" دانە دەست.

ئەو هەواڵنێرانەی ڕاپۆرتەکەیان بە دەست گەیشت، هەواڵەکەیان خستە نێو زبڵدان چونکە بە فشە و ساختەیان زانی. کاتێ ئاژانەکانی مۆساد بینییان کە ڕۆژنامەوانەکان خۆیان لە گوورە نەبرد[199]، وردەکاری زیاتریان ئامادەکرد و پەیامێکیان بۆ ئاژانسە هەواڵییەکە و بۆ پەیامنێرانی ڕۆژنامەی مۆنتۆڤیدیۆ نارد، ئەوانیش پۆلیسیان لێئاگادارکردەوە. لە ٨ی مارتدا و دە ڕۆژ دوای کوژرانی کوکەرس و لە دواییدا پۆلیس گەیشتە «کاسا کوبەرتینی»، ئەو شوێنەی تەرمی کابرای لاتڤی لێبوو.

ئینجا بۆ ڕۆژی پاشتر، ڕۆژنامەکانی جیهان هەواڵەکەیان ڕاگەیاند، بە سەردێڕ نووسیبوویان، تەرمی کوکەرس لە خانوویێکی چۆڵکراوی مۆنتیڤیدیۆ دۆزرایەوە. لە ڕاپۆرتە میدیایەکاندا، دوو ناو وەک گومانلێکراوی کوشتنەکان هاتن: ئانتۆن کوزل و ئۆسوالد تاوسینگ. یەک دوو ڕۆژیش دوای ئەوە، هەفتەنامەی «ڕیۆ دی جانیرۆ» وێنەیەکی ئانتۆن کونزلی بڵاوکردەوە، کە کوکەرس بەخۆی گرتبووی. گۆڤارەکە، کونزلی بە "نەمساویە دەم بە خەندەکە" وەسف کردبوو. وێنەکەش لە

---

[199] واتە هیچیان نەکرد.

لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەی "مەعاریفی" ئیسرائیلی درا. هەندێک لە برادەرانی مۆساد دەستبەجێ ناسنامەی ئانتۆن کونزلیان هەڵێنا.

بۆ یەک دوو ڕۆژیش پاشتر، نامەیەک گەیشتە ماڵی کوکەرس. ئەوەش هەولێکی هەژارانەی ئانتۆن کوزل بوو تا پەرێزەکەی پەردەپۆش بکا.

*خۆشەویستم هێربەرتس،*

*بە یارمەتی یەزدان و هەندێک لە هاوکاران، من بە سەلامەتی گەیشتمەوە چیللی. من ئێستا دوای گەشتێکی ماندوو حەساوەمەتەوە، پێشموایە تۆش هەر وای، زۆر ناخایەنێ دەگەڕێینەوە ماڵ. لەو نێوەشدا، من ئەوەم بەدیکرد، کە ئێمە لەلایەن دوو کەسەوە، پیاوێک و ئافرەتێک سووسەمان دەکرا. ئێمە دەبێ زۆر وریا بین و ئاگامان لە خۆمان بێ. من هەمیشە گوتوومە، تۆ سەرچڵییێکی زۆر دەکەی کە لەژێر ناوی ڕاستەقینەی خۆت دەژیێ و کار دەکەی. ئاخر مایەی کارەساتە ئەگەر ناسنامەی ڕاستەقینەم ئاشکرا بێ.*

*بۆیە هیوادارم ئاڵۆزییەکانی ئوراگوای دەرسێکیان بۆ دوارۆژ پێدادابی، بەوەی ئێستا زیاتر ئاگات لەخۆت بێ. خۆ ئەگەر هەرشتێکی مەترسیدارت لە ناو یان لە دەوروبەری ماڵەکەتدا تێبینی کرد، ئەو ئامۆژگاریەم فەرامۆش مەکە: بڕۆ لەنێو پیاوەکانی «ڤۆن لیدس» (سەرکردەیەکی نازی بوو بە خۆی و گرووپێکی ئاڵمانەکانی تاراوگەنشین بۆ میسر هەڵاتبوون) بۆ ماوەی ساڵێک یان دووان، تا ئەو کاتەی پرسی لێخۆشبوون دێتە ئارا.*

*کاتێکیش ئەو نامەیەت بە دەست دەگا، وەڵامی نامەکەم بەو ناوونیشانەی خۆت دەیزانی لە سانتیاگۆ، چیللی بدەرەوە.*

*دڵسۆزتان*

*ئانتۆن ک.*

هەڵبەتە نامەکە کەسی هەڵنەخەڵەتاند. «میلدا»ی هاوسەری کوکەرس، کەڕەپ بوو، هەر دەیگوت: کونزل بکوژەکە بوو.

زۆر لەوانەی بەشداری کوشتنی کوکەرسیان کرد مردوون. «زیڤ ئامیت» کە نووسەرانی ئەم کتێبە دەیانناسی، لە شەڕی یوم کیپۆری ١٩٧٣دا کوژرا.

ئەرکە پەیامدارەکەی ئەوان کاری خۆی کرد. پەرلەمانتارانی ئاڵمان و نەمسا ستاتوتی سنوردارکردنی تاوانەکانی نازییان ڕەتکردەوە.

ساڵانێک دواتر، ئیسەر هارل، ڕامسادی پێشوو، بانگی یەکێ لە نووسەرانی ئەم کتێبەی کرد و پێیگوت، کە برادەرێکی باشی ئەو دەیەوێ ببینێ. هیچ وردەکاریشی بۆ نەدرکاند، تەنیا ناوونیشانەکەی لە باکووری تەلئەبیب پێیگوت. نووسەرەکەش خانووە بچکۆلە خاوێن و بژوونەکەی کابرای دۆزییەوە. پیاوێکی بەهێزی سەرڕووتاوەی عەینەک لەچاو دەرگەکەی لێکردەوە. نووسەرەکەش دەستبەجێ کابرای ناسییەوە.

ئەویش بە ئەڵمانی بە خانەخوێکەی گوت: Guten Abend, Herr Kuczle (بەڕێز کونزل، ئێوارە باش.)

## بەندی دوازدە: گەڕان بەدوای شازادە سوورەکە

لە ٥ی ئەیلوولی ١٩٧٢دا و لە سەعات چوار و نیوی بەرەبەیاندا، هەشت تیرۆرستی چەکدار بە دەمامکی خلیسکانێی سەر سەهۆڵ، خۆیان کوتایە نێو ئەپارتمانەکەی تیمی ئیسرائیلی لە ئۆلۆمپیادی میونیخدا. لەوێ «مۆشێ واینبێرخ» ڕاهێنەری تیمی زۆرانبازییەکەیان کوشت، کە هەوڵیدابوو ڕێگەیان پێبگرێ، پاشان «جۆ ڕۆمانۆ»شیان کوشت کە پاڵەوانی بەرزکردنەوەی قورسایی بوو. ئەوسا یەک دوو وەرزشوان لەبەر هاتوهاوار و دەنگی تەقە بەخەبەر هاتن، خۆیان لە پەنجەرەکان هەڵدا، نۆ لەوان لەلایەن تیرۆرستەکانەوە بە بارمتە گیران.

پۆلیسی ئاڵمان گەیشتە شوێنی ڕووداوەکە و بەدوایدا هەواڵنێران، وێنەگران و تاقمەکانی تەلەفزیۆن گەیشتنە ئەوێ کە ڕووماڵی درامای گوندە ئۆلۆمپییەکەیان کرد. بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا، جیهان بینەری پەلامارێکی بکوژانەی تیرۆرستی بوو، کە دیمەنەکانی بە زیندوویی لەسەر شاشەکان نیشاندران. بەهەمان شێوەش سەرووەزیر، گۆڵدا مایەر کە لە لایەن یاریدەدەرە سەربازییەکەی لە خەو بێدار کرایەوە، دیمەنەکانی بینین. گۆڵدا هەستی کرد داوی بۆ دانراوەتەوە: ئاخر پەلامارەکە لە وڵاتێکی دۆست بووە و بەرپرسیارێتی ڕزگارکردنی بارمتەکانیش دەکەوتە سەر شانی ئاڵمانەکان. دەسەڵاتدارانی هەرێمی باڤاریا، کە هێرشەکەی تێدا ڕوویدابوو، بە ئەدەبەوە پێشنیازی ئیسرائیلیان بۆ ناردنی «سایەرەت ماتکال» واتە باشترین یەکەی کۆماندۆی ئیسرائیلی ڕەتکردەوە. ئاڵمانەکان بە نوێنەرایەتی ئیسرائیلیان گوت، ئێوە خەم مەخۆن، ئێمە

بارمتەکان ئازاد دەکەین. بەڵام خۆ ئاڵمان لەو بارەیەوە لە ئەزموون، لە بە خۆڕاپەرموون، لە ئازایەتیان کەم بوو بۆ ئەوەی ڕوووبەڕووی ڕێکخراوێکی فێڵبازی تیرۆرستی وەها ببنەوە. دوای دانوستانێکی تاقەتپڕوکێن لەنێوان تیرۆرستەکان و دەسەڵاتدارە ئاڵمانەکاندا، کە ڕۆژێکی ڕەبەقی خایاند، تیرۆرستەکان و بارمتەکان گەیەندرانە فڕۆکەخانەی «فورستنفێلدبروک» لە دەرەوەی میونخ. لەوێ ئاڵمانەکان بەڵێنیان بە تیرۆرستەکان دابوو، کە ئەوان سواری فڕۆکەیەک ببن و ڕووبکەنە ئەو شوێنەی مەبەستیانە. بەڵام لەڕاستیدا پۆلیس لە فڕۆکەخانەکەدا تەڵەیەکی منداڵبازاڕیانە و ناشارەزایانەیان بۆ دانابوونەوە. ئەوان فڕۆکەیەکی لوفتانزای بەتاڵ و بێسەرنشینییان ڕاکێشایە ناوەڕاستی فڕۆکەخانەکە. قەناسبەدەستی ناکارامەش لەسەر بانەکانی فڕۆکەخانەکە جێگەی خۆیان گرت. سەرکردەی تیرۆریستەکانیش هات و فڕۆکەکەی بپشکنێ. ئاخر فڕۆکەکە نە تاقمی فڕینی تێدابوو نە هیچ، هەروەها مەکینەیەکی ساردوسڕیش، چۆن دەتوانێ لە چەند خولەکێکدا لە ئانوساتی فڕیندا بێ؟ تیرۆرستەکان ڕاستەوخۆ تێگەیشتن، کە لە خشتەبراون؛ بۆیە دەستیان بە تەقە کرد و هەندێ نارنجۆکیشیان فڕێدان. لەماوەی ئەو تەقەکردنە لە پۆلیس تەواوی بارمتەکانیان کوشتن. ئەفسەرێکی پۆلیسی ئاڵمانیش کوژرا، لەگەڵ ئەوەشدا پێنج تیرۆرست لە هەشت کەسەکانیان کوژران (سێیەکەی دیکەش گیران، بەڵام زۆری پێنەچوو دوای بە بارمتەگرتنی فڕۆکەیەکی دیکەی لوفتانزا لە لایەن هەمان ڕێکخراوی تیرۆرستییەوە، بەردران.) ژەنەڕاڵی ئیسرائیلی «زڤی زامیر» تازە وەک *ڕامساد* جێگەی «مایەر ئامیت»ی گرتبووەوە، بەدەستەوەستانی لە تاوەری کۆنترۆڵەوە سەیری دراما خوێناوییەکەی دەکرد. ئاخر ئەو

لەلایەن گۆڵدا مایەری سەروەزیر نێردرابووە ئەوێ، بەڵام مافی ئەوەی نەبوو خۆی لە ئۆپەراسیۆنەکەی ئاڵمانەکان هەڵبقورتێنێ. خانەخوێ دڵنیایان کردبووەوە کە نەخشەکەیان نایابە، ئەو هەر لەسەر ئەوەندەی بوو، سەیربکا و ئەنجامەکەی ببینێ. کەچی ئەوەی *ڕامسادە*کە بینی کوشتارگەی وەرزشوانانی ئیسرائیلی بوو. ئەوسا تێگەیشت، ئیسرائیل دوژمنێکی نوێی هەیە: ڕیکخراوێکی تیرۆرستی کە ناوی لە خۆی ناوە "ئەیلوولی ڕەش".

✡ ✡ ✡

*ئەیلوولی ڕەش.* ئەمەش ئەوەیە کە چۆن تیرۆرستە فەلەستینییەکان یادی سێپتێمبەری ١٩٧٠ دەکەنەوە، کە چۆن لەو مانگەدا شا حوسێن، پاشای ئوردن بە هەزاران فەلەستینی لەنێو شانشینی خۆیدا کوشت. لەو ساڵانەی تێپەڕین لە کاتی شەڕەکەی شەش ڕۆژەی ١٩٦٧دا، تیرۆرستەکان وردە وردە جڵەوی خاکێکی زۆریان لە ئوردنییەکان کەوتەبەردەست و زۆر ناوچە و گەڕەکی دیکەشیان لە «عەمان»ی پایتەخت و شار و گوندەکانی سەرسنوور لەگەڵ ئیسرائیلدا کەوتە دەست و بووە بنکە و بارەگای ئەوان و لەسەر جادە و شەقامەکانیشدا بە چەکەکانیان لە جرتوفرتدا بوون. ئەوان دەسەڵاتی شا حوسێنیان ڕەتکردەوە و هەنگاو بە هەنگاو خەریکبوو دەبوونە دەسەڵاتداری ڕاستەقینەی ئوردن. پاشاش ئەوەی دەزانی، بەڵام هیچیشی نەکرد. لە یەکێک لە سەردانەکانی بۆ سەربازگەیەک، بینی مەمکدانێک وەک ئاڵایەک بەسەر ئەنتێنی تانکێکەوەیە. ئەویش بە تووڕەییەوە پرسی: "ئەوە چییە؟".

فەرماندە نێرەکەی تانکەکانیش وەڵامی دایەوە:" "ئەوە واتای ئەوەیە کە ئێمە ژنین. تۆ ڕێگەمان نادەی بجەنگین."

لەکۆتاییدا، نەیدەتوانی بەم جۆرە بەردەوام بێ. ئەو نەیدەتوانی چیدیکە وەک وشترمرخ سەری خۆی لەنێو لمدا بشارێتەوە، لەکاتێکدا شانشینەکەی وردەوردە لەدەست دەردەچێ. لە ١٧ی ئەیلوولی ١٩٧٠دا، پاشا سوپاکەی خۆی لە بنکە و ئۆردوگاکانی تیرۆرستان دەنگدا. ئیدی کوشتارگەیەکی سامناک قەوما. هەر تیرۆریست بوو لەسەر جادە بەر گوللە دەدرا، ڕاودەندرا، دەگیرا، و بەبێ دادگا و لێپێچینەوە دەکوژرا. هەندێک لەوان پەنایان بردە بەر ئۆردوگای ئاوارەکانی فەلەستینی، بەڵام تۆپخانەی ئوردنییەکان بەبێ سڵکردنەوە ئەوێشیان دایە بەر تۆپان، بە هەزاران کەسیان لێکوشتن. ئیدی هەر تیرۆرستی تۆقیو و پەشۆکاو بوو لە ڕووباری ئوردن دەپەڕیەوە و خۆی دەدایە دەستی سوپای ئیسڕائیلی. ئاخر ئەوان پێیان خۆشتر بوو لە زیندانەکانی ئیسڕائیلدا بڕزێنەوە، لەوەی بە گوللەی چەکی دەستی ئوردنییەکان بمرن. لەمیانەی کوشتارگەکەدا، زۆرینەی تیرۆرستە دەربازبووەکان بۆ سووریا و لوبنان هەڵاتن. تا ڕۆژی ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێ ژمارەی تیرۆرستە کوژراوەکانی ئەیلوولی ڕەش هەر بە نەزاندراوی مایەوە، بەڵام مەزندەکان لەنێوان دوو هەزار تا حەفت هەزار کەس بوو.

یاسر عەرەفات، مەزنی ڕێکخراوی «الفتح»، کە سەرەکیترین ڕێکخراوی تیرۆرستی فەلەستینی بوو، لە داخی تۆڵەکردنەوە دەکوڵا. ئەو لەنێو فەتحدا ڕێکخراوێکی نهێنی ناوەخۆی دروستکرد، ڕێکخراوێکی ژێرزەمینی لەنێو ژێرزەمیندا. ئەندامە ئاساییەکانی فەتح و تەنانەت فەرماندەکانیشی بە

بوونی شته نوێکەیان نەدەزانی. ناویشیان لێنا «ئەیلوولی ڕەش». ئەو ڕێکخراوە نەچووە ژێر باری ڕێساکانی ئەو سەرهێڵە "ڕێزلێگیراوانە"ی کە عەرەفات ئەو کات هەوڵی بۆ دەدا بەڵکو گرووپەکە هەست و سۆز و مەیلی نێو دەڵەتی بۆ خۆی ڕابکێشی و دانیشی پێدابندرێ. ئەو دروستکراوە نوێیە دەبوایە توند و دڕ بێ، گروپێکی جڵەونەکراو بۆ ئەوەی بێ بەزەییانە و هەر بۆیان بلوێ پەلاماری "دوژمنەکانی گەلی فەلەستین" بدەن. بە شێوەیەکی فەرمی، ئەیلوولی ڕەش نەبوو بوو، عەرەفاتیش حاشایی لە هەر پەیوەندییێکی بەو ڕێکخراوە دەکرد، بەڵام لەبنەوە خۆی داهێنەر و سەرکردەی بوو. ئەو، «ئەبو سەیف» کە فەرماندەیەکی پلەباڵای فەتح بوو، کردە سەرۆکی ئەیلوولی ڕەش؛ وەک بەرپرسی ئۆپەراسیۆنەکانیش «عەلی حەسەن سەلامە»ی دەستنیشان کرد، کە پیاوێکی گەنجی بیروبۆچوون توندەڕەو بوو، بەڵام لە ئازایەتی و مەعلانیدا کەمتر نەبوو. عەلی کوڕی حەسەن سەلامە بوو، «سەلامە»ش دوا سەرکردەی پلەباڵای هێزەکانی فەلەستینی بوو لە ماوەی جەنگی ١٩٤٨ی عەرەب- ئیسرائیل. حەسەن سەلامە لە جەنگەکەدا کوژرا، ئیدی عەلی کوڕیشی سوێندی خوارد لەسەر خەباتی باوکی بەردەوام بێ.

یەکەمین ئۆپەراسیۆنی ڕێکخراوی ئەیلوولی ڕەشیش زۆر نەبووە مایەی نیگەرانی ئیسرائیل، چونکە زۆرینەی چالاکییەکانیان دژی ئوردن بوون. تیرۆرستەکان نووسینگەکانی هێڵی نیشتمانی ئاسمانی ئوردنیان لە ڕۆما بۆمبڕێژکرد؛ بە کۆکتێلێکی مۆلۆتۆڤ پەلاماری باڵوێزخانەی ئوردنیان لە پاریس دا؛ هێڵی ئاسمانی ئوردنیان بۆ لیبیا ڕفاند؛ باڵوێزخانەی ئوردنیان لە بێرن وێرانکرد؛ لە ئاڵمان و ڕۆتەردامیش دەستبەکار بوون، لە بازاڕێکی «بۆن»یش پێنج ئاژانی نهێنی ئوردنیان کوشت. لە ئۆپەراسیۆنە هەرە

کاریگەرەکەشیان لە هۆڵێکی هوتێلی شیراتۆن لە قاهیرە، «وەسفی ئەلتالیای» سەرووەزیری پێشووی ئوردنیان کوشت. یەکێکیش لە بکوژەکان خۆی هەڵدایەسەر جەستەکە و خوێنی قوربانیەکەی سڕییەوە.

لەگەڵ سەرکەوتنی ئیسرائیل لە شەڕی شەش ڕۆژەی ١٩٦٧دا، تیرۆرستەکان ئەوەیان لەخۆگرت، کە درێژەبدەن بە شەڕی خۆیان لە دژی دەوڵەتی جوو. ئەوان فڕۆکەیان بە بارمتەگرت و فڕاند، سنووری ئیسرائیلیان بەزاند، مەدەنیان کوشتن، بۆمب و تەقینەوەیان لە شارە گەورەکاندا دانانەوە. ئەوسا دەبوایە شاباک و مۆساد لە دژی دوژمنە نوێکەیان دەستیان کردبایەوە، دزە بکەنە نێو ڕێکخراوە تیرۆرستییەکە، پلانەکانیان پووچەڵ بکەنەوە و چالاکوانەکانیان بگرن. هەنووکە فەتح سەرەکیترین ڕێکخراو بوو کە ئیسرائیل بەرەنگاری ببووەوە نەوەک ئەیلوولی ڕەش. بەڵام هەر زوو ئەیلوولی ڕەش سنووری چالاکییەکانی خۆی بەزاند و ڕووی لە وڵاتەکانی ڕۆژئاوا کرد و سەرەتا و لەپێش هەمووشیانەوە دژی ئیسرائیل وەستایەوە.

کوشتارگەی «میونخ» یەکەمین پەلاماری خوێناوییان بوو.

هەر بەم جۆرەش بوو کە «عەلی حەسەن سەلامە» نازناوەکەی خۆی بەسەردا بڕا. ئاخر ئەو عەقڵی پشت ئۆپەراسیۆنەکەی میونخ بوو. بەندوباوی تامەزرۆبوونی ئەو بۆ خوێنڕشتن لەنێو تیرۆرستاندا بڵاوبوو، ئیدی دەستیان پێکرد بە کوڕەکەی حەسەن سەلامەیان دەگوت "شازادە سوورەکە".

✡ ✡ ✡

سەروبەندی ئۆکتۆبەری ١٩٧٢ بوو، دوو ژەنەڕاڵی خانەنشینکراو داوای دیداری گۆڵدا مایەریان کرد، ئەوێ دەمێ گۆڵدا مایەر جێگەی لیڤی ئەشکۆلی گرتبووەوە، چونکە ئەو لەپڕ لە ١٩٦٩دا مرد. دوو کەسەکەش «زڤی زامیر»ی *ڕامسادی* نوێ و ڕاوێژکاری سەروەزیر بۆ دژەتیرۆر، بەرپرسی پێشووی ئامان «ئاهارۆن یاریڤ» بون.

گۆڵدا مایەر کە بیستی وەرزشوانە ئیسرائیلییەکان کوژران، کەوتبووە بن باری تراومای "شەوەکەی میونخ". گۆڵدا گوتبوی: "ئاخر دیسان لەسەر خاکی ئالمان جوو قۆڵبەست کران و کوژران." گۆڵداش ژنێکی بەهێز و توندوبەند بوو؛ شتەکەش ڕوون و ئاشکرابوو، کە خانمەکە لێنەدەگەڕا کوشتارگەی میونخ بەبێ تۆڵەکردنەوە تێبپەڕێ.

کتومت زامیر و یارڤیش هەر ئەوەیان دەویست.

زڤای زامیر پیاوێکی لەڕولاواز، سەرڕووتاوە، پێست جین جین[200] بەنێوچاوێکی تیژ بین و دەموچاو سێگۆشەییێکی وەستاو، جەنگاوەرێکی پێشووی «پالماخ» بوو، بەڵام پێنەدەچوو ژەنەڕاڵێکی تەواوعەیار بێ. باڵاترین پلەی لە ماوەی ڕاژەی سەربازیدا فەرماندەی بەرەی باشوور بوو. دوای ئەوەی وەک پاشکۆیەکی سەربازی نوێنەرایەتی وەزارەتی بەرگری ئیسرائیلی لە بەریتانیای مەزن دەکرد. لە ١٩٦٨یشدا، لەجێی مایەر ئامیت کرایە ڕامسادی مۆساد، کە ماوەکەی ئەوی تەواوکرد. زۆر کەسیش ڕەخنەیان لە بۆچوونی زامیر گرت؛ ئاخر ئەو کەسێکی سەرنجڕاکێش نەبوو، شەرمنیش بوو، وێڕای ئەوەش هیچ ئەزمونێکی لە

[200] جین جین: خاڵدار، خاڵ خاڵ.

ئۆپەراسیۆنی نهێنییدا نەبوو؛ ئەو لەباری کاریزماییدا کورتهێن بوو، ئەو وەک هارل و ئامیت کە پێش ئەو *ڕامساد* بوون، خۆی بە سەرۆکی مۆساد نەدەزانی. ئەو ئەوەی پێباشتر بوو وەک سەرپەرشتیارێک هەڵسوکەوت بکات و دەسەڵاتەکانی بداتە زۆر لە یاریدەدەرە پلە باڵاکانی. ئەو تەنیا لە شەڕی یوم کیپۆردا (بڕوانە بەندی چواردەم) گەیشتە ناوپەیداکردن، بەڵام لە ١٩٧٢دا ئەو هیچ نەبەردییێکی گرنگی نەبوو تا پێ بنازێ. ئیدی هەندێک لە مۆسادە دێرینەکان وەک ڕافی ئیتان حەزیان بە چارەی نەکرد و لەبەر ناڕەزایەتی ڕیزەکانی مۆسادیان بەجێهێشت.

«یاریڤ»یش هەروەک زامیر، زیاتر پیاوی پشتپەردە و پاشخان بوو لەوەی پیاوی سەرسەکۆ و بەر تیشک بێ. لەمیانەی شەڕی شەش ڕۆژەشدا پیاوێکی لێوەشاوە بوو، بەڵام زیاتر خەڵک لەبەر تێگەیشتنەکەی و لێکدانەوە ڕاڤە تیژەکانی سەرسامی ببون. کابرایەکی باریکەڵەی نەرمونیان بوو لە ئاخاوتندا، عەینەک لەچاو و تەوێڵێکی[201] ڕوونیشی هەبوو، شێوازی یاریڤ زیاتر لە مامۆستایەکی مەعلان دەچوو لەوەی لە سووسەکاریدا باڵادەست بێ.

یاریڤ و زامیر شتی هاوبەشیان زۆر بوو. خۆی لەبەر کردەوە بەسەرچووەکانیان وا پێشبینی دەکرا ئەوان ڕکابەری یەک بوونایە، کەچی هێشتا ئەوان بە هاوئاهەنگی و بە بڕوای دوولایەنییەوە کاریان لەگەڵ یەکدا دەکرد. هەردووکیان کەسی کڕ و بێدەنگ، ئۆقرەگر، خۆپارێز و هەروەها شەرمنۆکیش بوون. ئەوان ڕقیان لەوە بوو ببنە چەقی بازنە و بە وریایشەوە شیتەڵکاری و پلانی خۆیان دەخستەڕوو. بەڵام ئەو

[201] تەوێڵ: هەنیە، نێوچاوان.

بیرۆکەیەی لەو دوای نیوەڕۆی مانگی ئۆکتۆبەردا خستیانە بەردەم گۆڵدا مایەر بە شێوەیەکی سەیر ڕووقایمانە بوو: دەزگەی هەواڵگری دەبێ جێگەی سەرکردەکانی ئەیلوولی ڕەش بدۆزێتەوە و بیانناسێتەوە و هەر هەمووشیان لەوێ سارد بکاتەوە. بەڵێ هەر هەموویان بکوژێ.

لەو کاتەی ڕووداوەکەی «میونخ» قەومابوو، یاریڤ و زامیر کەوتبوونە خۆ و لە کار و چالاکی گەرمدا بوون و زانیاری هەواڵگری پلە هەرە باڵایان سەبارەت بە ڕێکخراوی ئەیلوولی ڕەش کۆکردبووەوە. ئەوان بۆ ئامادەکاری هاتبوونە لای گۆڵدا مایەر. وەک ئەوان گوتیان، ئەیلوولی ڕەش بە تەمان[202] شەڕێکی سەرتاپایی دژی ئیسرائیل بەرپا بکەن. ئەوەش ئەو گرووپە بوو کە سوێندیان خواردبوو تا پێیان بکرێ جوو بکوژن، ئەوسا هەرچی دەبێ با ببێ، سەرباز، مەدەنی، ژن و منداڵ بۆ ئەوان جیاواز نییە. تاکە ڕێگەی ڕاگرتنیشیان کوشتنی سەرکردەکانیانە کە یەک لەدوای یەک بکوژرێن. سەری مارەکە پان بکرێتەوە.

گۆڵدا دوودڵ بوو. ئاخر ئاسان نەبوو بڕیارێک بدەی، ڕۆڵە گەنجەکانی خۆت بنێرییە هەڵمەتێکی بکوژانەی سەرچڵئامێز. پێشتر ئیسرائیل هەرگیز ئەم کارەی نەکردبوو. خانمەکە بۆ ماوەیەک بە بێدەنگی مایەوە. ئینجا کەوتەوە قسە، کە دەنگەکەشی بە ئاستەم دەبیسترا، وەک ئەوەی قسە لەگەڵ خۆیدا بکا، ئەو یادەوەری سامناکی هۆلۆکۆست و ئەو تراژیدیایەی لە مێژوودا بەسەر خەڵکی جوودا هاتبوو بیرکەوتەوە، ئاخر هەمیشە هەر چەوسابوونەوە، ڕاودەندران و قەتڵوعام دەکران.

---

[202] تەما: دەکرێ لە تەمەننییەوە هاتبێ، کە واتای نیاز دەگەیەنێ، بە تەمان: بە نیازن.

لەکۆتاییدا سەری بەرزکردەوە و سەیری یاریڤ و زامیری کرد و گوتی: "دەی باشە، کوڕەکان بنێرن."

✡ ✡ ✡

زامیر دەستبەجێ بۆ خۆئامادەکردن بۆ ئۆپەراسیۆنەکە کەوتەخۆ. ناویشی لێنا «تۆڵەی خودا».

بەڵام گۆڵداش قسەی خۆی هەبوو. وەک سەروەزیری دەوڵەتێکی دیموکراتی جوو، هەر بەتەنیا پشتی بە بەڵێنی یاریڤ و زامیر نەبەست بەوەی "کوڕەکان" ئازاری کەس نەدەن، هەر بە تەنیا سەرکردەکان و میلیشیا سەرەکییەکەی ئەیلوولی ڕەش لەناو ببەن. ئاخر هەر بەتەنیا بەڵێن بەس نەبوو. چونکە خانمەکە دەیزانی، ئۆپەراسیۆنێکی لەو جۆرە لە دەرەوەی بازنەی قانوندا دەکرێ، بۆیە مەترسی ڕاستەقینە لەسەر خەڵکی بێتاوان هەیە و لەوانەیە بە هۆیەوە بکوژرێن. هەر بۆیە بڕیاریدا جڵەوی تەواوی ئۆپەراسیۆنی تۆڵەی خودا بکا. گۆڵدا کۆمیتەیەکی نهێنی پێکهێنا کە بەدەر لە خۆی، «مۆشێ دایان»ی وەزیری بەرگری و جێگری وەزیر «ئیگال ئاللۆن» کە ژەنەڕاڵێکی لێهاتوی پێشوو بوو پێکهێنا. ئەو سێ کەسە بوونە دادگایەکی نهێنی کە بەسەر هەر دۆزێکی تایبەتی ئەو ئۆپەراسیۆنەدا دەچوونەوە. ئەوان پێیان گوترا کۆمیتەی X، دەبوایە یاریڤ و زامیر هەر فایلێک و ناوێکیان بۆ ئەو کۆمیتە سێ کەسییە ڕەوانە بکردبا، تەنیا بە پەسەندنامەی ئەوان تیمە دەستوەشێنەکەی دەچووە سەر شانۆی ئۆپەراسیۆنەکە.

هۆبەی ئۆپەراسیۆنەکانی مۆساد، ماسادا (کایسارا) ئامادەی ئۆپەراسیۆنی تۆڵەی خودا بوو. هۆبەکە بە سەرۆکایەتی «مایک هاراری» پرچ ڕەشی،

ڕەق و توندی ئاژانی نهێنیپارێز بوو. نزیکەی هەموو کردەوە زەبروەشێنەکانی ئەورووپا لە ڕێی ئەو هۆبەیەوە دەکران، ئەو شوێنەی کە ئەیلوولی ڕەش پیاوەکانی تێدا کارابون و لەبن ڕووپۆشێکی زۆر ئاڵۆز بلۆزیشدا خۆیان شاردبووەوە.

«هاراری» پیاوەکانی خۆی لەنێو «کیدۆن»، واتە لەنێو تیمی ئۆپەراسیۆنەکانی ماسادا لێگرت. هەر یەکەیەک چەند کەسێکی تاقمی دووەمی خۆی بۆ ئۆپەراسیۆنی دژی ئەیلوولی ڕەش نارد. تاقمێکی شەش کەسی لە پیاو و ژن بەرپرسیارێتیان ئەوەبوو، گومانلێکراوان بدۆزنەوە و شوێنپێیان هەڵبگرن. ئەوان دەبوایە دڵنیا بوونایە لەوەی ئەو کەسەی مەبەستیان بووە، خۆیەتی، ئەوان گورگ بوون لەپێستی مەڕدا. دەبوایە بگەنە ئەو شارەی کەوا تیرۆرستە گومانلێکراوەکانی تێدا دەستبەکار بوون، بەدوایاندا بچن، سایەیان بکەن، بە نهێنیەوە وێنەیان بگرن، خووەکانیان بزانن، شوێنی برادەرەکانیان بزانن، ناوونیشانی دەقاودەقیان بزانن، ناوی ئەو باڕ و چێشتخانانە بزانن کە هاموشۆی دەکەن، کاری ڕۆتینی ڕۆژانەیان بزانن، هەموو ئەوانە سەعات بە سەعات بزانن. یەکەیەکی بچکۆلانەتریش، لە زۆر حاڵەتدا هەر بەتەنیا ژن و پیاوێک بوون، کاری لۆجستییان پێسپێردرابوو، وەک بەکرێگرتنی ئەپارتمان، ژووری هوتێل و ترومبێل. دەستەیەکی بچکۆلەی دیکەش کاری پەیوەندی لەگەڵ بنکەی سەرەکی ئۆپەراسیۆن لە شارە یەک بەدوای یەکەکانی ئەورووپا و بارەگای سەرەکی مۆساد لە ئیسرائیلدا هەبوو.

خودی تاقمی دەستوەشێنەکەش لە چەندین ئاژانی مۆساد پێکهاتبوو، دەبوایە دواجار بگەیشتبانە شوێنی مەبەست و پێیان لەسەر زەوی

چەقاندبا. ئەرکەکەشیان ئەوەبوو لەکاتی دەستنیشاندا بگەیشتبانە ناوونیشانە دەقاودەقەکە و ئەو کەسانەیان بکوشتبا کە وێنەیان گیرابوو و ناسنامەشیان بە باشی ئاشکرا ببوو. لەکاتێکدا لە شاری مەبەست خەریکی ئۆپەراسیۆنەکەی خۆیان دەبوون، ئەوان لەلایەن تیمێکی دیکەوە دەپارێزران، دەستەیەک لە ئاژانی چەکدار و شوفێر کە لە شوێنێکی نزیکی کردەوەکە خۆیان حەشاردابوو، بە خۆیان و ترومبێلە ئامادەکراوەکان و ئاراستە و ڕێی پێداڕۆیشتن ساز ئامادە و لەسەر پێ بوون. ئەرکی ئەوان ئەگەر پێویست بوایە، بە چەکەوە پارێزگاریان لە تیمی دەستوەشێنەکە دەکرد. ڕاستەوخۆش دوای ئۆپەراسیۆنەکە، پێویست بوو هەموو ئەندامانی دەستەی دەستوەشێن و دەستەی پارێزگاری و تەواوی وردەکاری ئاسایشپارێزی وڵاتەکە بەجێبێڵن.

ئەو دەستەیەی بۆ ناسینەوە و بەدواداچونی گومانلێکراوانیش نێردرابوو، بەر لە ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆنی دەستەی دەستوەشێن، شوێنەکەیان بەجێدەهێشت. ئەوانی دیکە یەک دوو ڕۆژی دیکە دەمانەوە بۆ ئەوەی پەردەپۆشی پەرێزەکەیان بکەن، کەلوپەل و ئامێرەکان هەڵگرنەوە و ترومبێلە بەکرێگیراوەکانیش بۆ خاوەنەکانیان بگەڕێننەوە.

یەکەمین شاریش بۆ ئۆپەراسیۆنی تۆڵەی خودا، «ڕۆما» بوو.

لە شارە نەمرەکەدا، تیمی وردەکاری ناسینەوە و بەدواداچون، سایەی پیاوێکیان کرد، کە هەرگیز گومانی تیرۆریزمی لێنەدەکرا: نووسەرێکی پلە دوو لە باڵوێزخانەی لیبیا، پیاوێک لە «نابلس» لەدایک ببوو، فەلەستینییێک تەمەنی سی و هەشت ساڵ بوو، ئەویش «وائیل زعەیتر» بوو. ئەو پیاویکی باریکەڵە، نەرمونیانی قسەنەرم بوو، کوڕی پیاوێکی بەناوبانگی

ئەدەبیات وەرگێڕان بوو بۆ سەر زمانی عەرەبی. «وائیل» بەخۆی بە لێهاتوویی وەرگێڕانی شیعر لە/ بۆ زمانی عەرەبی نایاب بوو. هەروەها ئەو لەخۆشەویستانی هونەریش بوو. ئەو وەک وەرگێڕێک لە باڵویژخانەی لیبییادا بە مانگانەیەکی کەم، بە ١٠٠ دیناری لیبی کاری دەکرد، ژیانێکی زۆر سادەی هەبوو، لە ئەپارتمانێک لە «پیزا ئانیبالیانۆ»دا دەژی. برادەرەکانی بە پیاوێکی خاکیان دەناسی کە هەموو جۆرە توندوتیژییێکی ڕەتدەکردەوە و زۆر جارانیش ناڕەزایەتی و قێزەونایەتی خۆی لە هەمبەر تیرۆررزم و کوشتندا دەردەبڕی.

بەڵام خۆ برادەرە هەر نزیکەکانیشی بە نهێنیەکانی ئەویان نەدەزانی: ئاخر برادەرە هەرە باشەکانی توندڕەوە دڵڕەقەکان بوون، ئەوانەی ئۆپەراسیۆنەکانی ئەیلوولی ڕەشیان لە ڕۆما بەو پەڕی زبری و بێبەزەییەوە ئەنجام دەدان. لەو دوایانەدا ئەو ئۆپەراسیۆنێکی کوشندانەی داهێنا و جێبەجێشی کرد: ئەو دوو ژنە ئینگلیزی گەنجی ناسین کە ڕۆژە یەکەمەکانی پشووی خۆیان لە ڕۆما بەسەربرد بەر لەوەی ڕوو لە ئیسرائیل بکەن. «زعەیتریش» دوو گەنجی کەشخە و ڕووگەشی فەلەستینی ڕاسپاردن کە پەیوەندی بەو کچە ئینگلیزانەوە بکەن و هەڵیان بخەڵەتێنن. هەر بەڕاستیش ئەو گەنجە کازانۆڤایانە[203] خۆیان گەیاندە کچەکان و تەنانەت سەرجێشیان لەگەڵ کردن. کاتێکیش لە عاشقەکەیان جیابوونەوە، یەکێک لە کوڕە فەلەستینیەکان داوای لە کیژەکە کرد بەڵکو ئامێرێکی دەنگ تۆمارکردنی بچکۆڵە لەگەڵ خۆی ببا، وەک دیاری

[203] کازانۆڤا: ئاماژەیە بۆ کازانۆڤا عاشقە ئیتالیەکە. لێرەدا مەبەست گەنجی کەشخە و قۆزی ڕووخسار عاشقانەیە، ئەوەی بە ئاسانی سەرنجی کیژان بۆخۆی ڕادەکێشێ.

بیگەیەنێتە دەستی خانەوادەکەی لە کەرتی ڕۆژئاوادا. کیژە گەلحۆکەش هەر زوو بەڵێ گۆ بوو، ئامێری تۆمارکردنەکەشی بە سادەیی وەک کەلوپەلێک خستە نێو جانتای کیژەکە لەلای کۆمپانیای ئەل ئالی فڕۆکەخانەی ڕۆما وەرگیرا. ئاخر کچەکان نەیاندەزانی کە «زعەیتر» و عاشقە دەم بەخەندەکان ئەوانیان بەرەو مەرگی ڕاستەقینەی خۆیان بەڕێکردن. لەژێر سەرپەرشتی زعەیتەردا، ئاژانەکانی ئەیلوولی ڕەش، ئامێری تۆمارکەرەکەیان پێشتر بردبوو، لەباریەکیان دەرهێنا بوو، ئینجا پڕی مادەی تەقەمەنییان کردبوو، پاشان ڕێکیان خستووەوەو لەنێو پاکەتی نوێی خۆیان دانابووەوە. تۆمارکەرەکەش وا قورمیش کرابوو، هەرکاتێ فڕۆکەکە گەیشتبایە بەرزایی وەرچەرخانی خۆی بتەقابایەوە. ئەوسا هەم فڕۆکەکە و هەم تەواوی سەرنشینەکانی بەرەو چارەنوسێکی شوم دەبرد.

خۆشبەختانە، تیرۆرستەکان نەیاندەزانی ئەو هێڵانەی بۆ ئیسرائیل دەفڕین، ئامێرێکی پارێزبەندی دژە ئامێری هاوشێوەیان تێدایە، بۆ ئەوەی هەموو جانتا و کەلوپەلێکی کۆمپانیای ئەل ئالی کە دەچێتە نێو فڕۆکەکە بچێتە نێو سندوقێکی ئەستووری پۆڵایین، لە حاڵەتێک هەر ئامێریکیشی لەناویدا بتەقێتەوە کار لە ڕەوتی فڕینی فڕۆکەکە نەکا. فڕۆکەوانەکەی ئەل ئال بە ئاماژەی گڵۆپەکە ئاگادار کرایەوە و دەستبەجێ گەڕایەوە فڕۆکەخانەکە. لەوێش کچە ئینگلیزە تاساوەکە کەوتە بەر پرسیار و لێپێچینەوە، ئەویش دانی بە عاشقایەتی لەگەڵ کوڕە فەلەستینییەکەدا نا؛ بەڵام خۆ ئەو دوو گەنجە هەر زوو دوای ئەوەی خواحافیزی مەرگییان لە کچەکان کردبوو، دەستبەجێ وڵاتی ئیتالیایان بەجێهێشتبوو.

یەکەمین تاقمی دەستوەشێن گەیشتە ڕۆما و بۆ چەندین ڕۆژ بەدوای زعەیترەوە بوون. جووتەیەک بە بەردەمی باڵوێزخانەی لیبیدا پیاسەیان دەکرد و ژنەکە کرتەی لەسەر دوگمەی کامێراکەی نێو جانتاکەی کرد، بەم جۆرە هەر جارێک «زعەیتر» چووبایە باڵوێزخانەکە و هاتبایە دەر، وێنەی دەگیرا.

هەندێ لە "گەشتیاران" بە گەشتەفڕینی جیاجیاوە گەیشتنە ڕۆما. یەکێک لەوان، پیاوێکی کەنەدی تەمەن چل و حەفت ساڵان بوو بە ناوی «ئانتۆنی هوتن». ناوبراو ترومبێلێکی ئاڤیسی بەکرێگرت و بە کارمەندە نووسەرەکەی گوت لە هوتێلی ئێسێلسیۆر لە «ڤیا ڤێنتۆ» دادەبەزێ. خۆ ئەگەر نووسەری پرسگەکەش زانیارییەکانی بپشکنیبان. دەیزانی هیچ کەسێک بەو ناوە لە هوتێلە ناوبراوەکدا نییە، ئەمەش کتومت هەروەک "گەشتیارەکانی" دیکە کە ترومبێلیان لە هەمان هەفتەدا بەکرێگرتن و ناوونیشانی ساختەیان دایە کۆمپانیای ترومبێل بەکرێدان.

لە شەوی ١٦ی ئۆکتۆبەردا، «زعەیتر» گەڕایەوە ماڵ، خەریکبوو دە لیرەیەک بخاتە کونی کردنەوەی ئەسانسێرەکە. دەروازەی ماڵەکە تاریک بوو یەکێکیش لە نهۆمی سێیەمەوە پیانۆیەکی خەمبارانەی لێدەدا. لەپڕێکدا دوو پیاو لە سێبەرەکەوە پەیدابوون و بە دەمانچەی بێریتا 0.22 چەند گوللەیەکیان لە جەستەی «زویەتر» خاڵی کردنەوە. کەس گوێی لە تەقەکانیش نەبوو؛ هەر دوو ئاژانەکەش خۆیان هەڵدایە نێو ترومبێلی فیاتی ١٢٥ کە لە «پلازا ئانیبالیانۆ» ڕاگیرابوو. یەک دوو سەعات دوای ئەوە، ئەوان لە وڵاتەکە دەرچووبوون.

هەنووکە، «زعەیتر» کوژراوە، ئیدی پەردەپۆشە قووڵەکەی چیدی پێویست نەبوو. ڕۆژنامەکانی بەیروت ژیاننامەی کابرایان بە واژۆی چەندین ڕێکخراوی تیرۆرستی بڵاوکردەوە کە شینیان بۆ گێڕا و نووسیبویان: "یەکێک لە باشترین شەڕکەرەکانمان لە دەست دا".

✡ ✡ ✡

سەردەستەی ئەو تیمە بچکۆلانەیەی زعەیتەری کوشت، «دایڤد مۆلاد» (کە ناوی ڕاستەقینەی خۆی نەبوو) ئیسرائیلییێکی تەمەنی لە ناوەڕاستی بیستەکاندا بوو. ئەو لە تونس لەدایک ببوو، بە منداڵی کۆچی کردبووە ئیسرائیل. دایک و باوکی مامۆستا و زایۆنیست بوون، ئەو بە باشی زاڵبوونی بەسەر زمانی فەرەنسی بەمیرات بۆ بەجێمابوو، لەکانگای دڵیشیەوە دەوڵەتی ئیسرائیلی خۆشدەویست و هەر وڵاتپاریزی لێدەباری. هەر لە تەمەنی نەوجەوانییەوە، خەونی بە خزمەتی ئیسرائیلەوە دەبینی، تەنانەت ئەگەر ژیانی خۆشی لەپێناو دانابایە، باکی پێنەبوو. لەنێو سوپاشدا خۆبەخشانە چووە ڕیزی یەکەی کۆماندۆی سوپای بەرگری ئیسرائیلی و فەرمەندەکانی بە ئازایەتی و کارایی خۆی سەرسام کرد. دوای لە سوپا دەرچوونیش، پەیوەندی بە مۆسادەوە کرد و بەخێراییش بووە یەکێ لە باشترین ئاژانەکان، بەشداری ئۆپەراسیۆنە ترسناکەکانی کرد. لەبەر ڕەوانی زمانە فەرەنسییەکەی، بە ئاسانی دەیتوانی بچێتە بن کەوڵی کەسێکی فەرەنسی، بەلجیکی، کەنەدی یان سویسڕایی. ئەو زۆر بە گەنجی ژنی هێنا، هەرزوش بووە باوکی ساوایەک، بەڵام ئەم ڕەوشە خێزانییە ساردی نەکردەوە لەوەی لەبەرەکانی پێشەوە وەک جەنگاوەرێکی مۆساد دەستبەکار بێ.

دوای مەرگی «زعەیتر»، «مۆلاد» یەک دوو ڕۆژی لە ئیسرائیلی بردنەسەر، ئینجا بەرەو پاریس فڕی.

یەک دو ڕۆژیش دوای ئەوە، زەنگی تەلەفۆنی ئەپارتمانی ژمارە ١٧٥ی «ڕووی ئێلیسا» لە پاریس لێیدا. دکتۆر «محەمەد هامشاری» تەلەفۆنەکەی وەڵام دایەوە. "ئەرێ د. هەمشاریە؟ نوێنەری ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینییە لە فەرەنسا؟" زەنگلێدەرەکە بە شێوە ئیتالیەکی قورس قسەی دەکرد. ئەو خۆی وەک ڕۆژنامەوانێکی ئیتالی ناساند، کە مەیلی بە لای دۆزی فەلەستینییدا دەشکێنێتەوە و داوای چاوپێکەوتنێکی لە «هامشاری» کرد. ئیدی ڕێککەوتن کە لە قاوەخانەیەک یەکدی ببینن، کە زۆریش لە ماڵەکەی «هامشاری»ەوە دوور بوو. «هامشاری»یش بە خۆی مێژوونووسێکی ڕێزلێگیراو بوو، لەگەڵ ژنە فەرەنسییەکەی بەناوی «ماری کلاودی» و کیژە بچکۆلەکەیان لە پاریس دەژیان و لەو دوایانەشدا زۆر لەخۆیان وشیار بوون. کاتێ بەسەر شەقامدا دەڕۆیشتن، هەمیشە سەیری دەوروبەری خۆی دەکرد، نەبادا کەسێک هەبێ و سایەیان بکا؛ ئەو قاوەخانە و چێشتخانەی بە جێ دەدان بێئەوەی خواردنە بەراداندانەکەیشی بۆ بێ؛ زۆرجارانیش لە دراوسێکانی دەپرسی ئاخۆ هیچ لایدەیەک هەواڵی نەپرسیوە.

لەبەرانبەر ئەوەشدا، ئەو هیچی نەبوو خەمی لێبخوا. ئاخر ئەو پیاوێکی ئەکادیمی و سادە بوو، ئەو لەنێو بازنەی ڕۆشنبیرانی پاریسیدا توابووەوە. «ئاننی فرانکۆس» لە هەفتەنامەی «جێنو ئەفریکا»دا[204]

[204] Jenue Afrique

نووسیبووی: "ئەو پێویستی بە هیچ خۆپارێزیەک نەبوو، چونکە ئەو دژوار نەبوو. ئیسرائیلیەکانیش ئەوەیان باش دەزانی."

بەڵام خۆ دەزگەی هەواڵگری نهێنی ئیسرائیلی یەک دوو شتی زیاتریشی دەزانی: بەشداربوونی هەمشاری لە هەوڵە نەزۆکەکەی کوشتنی داود بنگۆریۆن لە ١٩٦٩ و لە دانیمارکدا، دەستەبوونی لە تەقینەوەی هێڵی ئاسمانی «سویسار» لە ١٩٧٠دا کە بووە مایەی کوشتنی چل و حەفت کەس؛ پەیوەندی تەلیسماوی لەگەڵ گەنجە عەرەبەکان؛ ئەوانەی بە شەو بە خۆیان و جانتای قورسەوە دەهاتنە ئەپارتمانەکەی.

هەروەها دەزگەی نهێنی ئیسرائیلی ئەوەشیان دەزانی، کە هامشاری ئێستا بووەتە کەسی دووەمی فەرماندەیی ئەیلوولی ڕەش لە ئەورووپا.

بەم جۆرە، ئەو ڕۆژەی هامشاری بەرەو دیدارەکەی لەگەڵ هەواڵنێرە ئیتالیەکەدا ڕۆیشت، جووتە پیاوێک دزەیان کردە نێو ئەپارتمانەکەی و دوای پازدە خولەک لێی هاتنەدەر.

بۆ ڕۆژی پاشتر، لایەکان چاوەڕێیان کرد تا ژن و کیژەکەی ئەپارتمانەکە جێدێڵن و هەر بەخۆی تێدا دەمینێتەوە. دیسان زەنگی تەلەفۆنەکەی لێدرایەوە و ئەویش دەستی دایە دەسکی تەلەفۆنەکە.

- "د. هامشاری؟" دیسان ڕۆژنامەوانە ئیتالیەکە وای لێپرسی.

- "بەڵێ ئەو قسە دەکا."

لەو ساتەدا، هامشاری گوێی لە کرتەیەک بوو، ئینجا دەنگی تەقینەوەیەکی بروسکەئاسا. تەقینەوەکە لەبن مێزەکەیدا تەقیەوە و هامشاریش کەوت، بە

سەختی بریندار بوو. یەک دوو ڕۆژ دواتر لە نەخۆشخانە بە سەرکۆنەکردنی مۆسادەوە، لەبەر سەختی برینەکانی گیانی لەدەستدا.

✡ ✡ ✡

یەک دوو هەفتە دوای مردنی هامشاری، «مایک هاراری» و پیاوێکی دیکە بەناوی «جۆناتان ئینگبلی» گەیشتنە دوورگەی قوبرس. ئەوان خۆیان لە هوتێلی ئۆلۆمپیا لە نیقۆسیادا ناونووس کرد. لەو دواییانەدا لەبەرئەوەی قوبرس لە ئیسرائیل، سووریا، لوبنان و میسرەوە نزیک بوو، بۆیە ببووە مەیدانی جەنگی ئاژانەکانی ئیسرائیل و عەرەب. ئەم جارەیان، دوو ئاژانە ئیسرائیلییەکە سایەی کابرایەکی فەلەستینیان بە ناوی «حوسێن عبدالهر» کرد. ئاخر بە ماوەی چەند مانگێکی کەمی پێشتر، «عبدالهر» وەک ئاکنجییێکی ئەیلوولی ڕەش لە قوبرس دەستنیشانکرابوو؛ ئەو بەرپرسیش بوو لە پەیوەندییەکانی یەکێتی سۆڤیەت و بلۆکی ڕۆژهەڵاتی، کە وڵاتەکانیان ببوونە بەهەشتێکی ئارام بۆ تیرۆرستەکان. لە ڕووسیا، چیکۆسلۆڤاکیا، هەنگاریا و بولگاریادا تیرۆرستە فەلەستینییەکان لەلای دامەزراوە لەشکرییەکان و یەکە تایبەتییەکانی سوپا مەشق دەدران. ئەو دەوڵەتانە کەشتی پڕ چەک و تفاقیان بۆ ڕێکخراوە تیرۆرستییەکان دەنارد؛ ئاخر ژمارەیەکی باش لە سەرکردە فەلەستینییەکان بە تامەزرۆوە بڕوایان بە ئایدیۆلۆژی سۆڤیەتییەوە هەبوو، لە زانکۆی «پاتریک لومومبا»ش لە مۆسکۆ خوێندبوویان.

«عبدالهر» بەرپرس بوو لە دزەپێکردنی تیرۆرستان بۆ نێو ئیسرائیل و ئەو سیخوڕە عەرەبانەشی لەناودەبردن کە دەهاتنە قوبرس بۆ ئەوەی

هاموشۆکەرە ئیسرائیلیەکان ببینن. ئیدی کۆمیتەی X بڕیاری مەرگی کابرای دا.

ئەو شەوە «عبدالهر» گەڕایەوە ژووری هوتێلەکەی خۆی. گڵۆپەکانی هەڵکرد و چووە سەر پێخەفەکەی. «جۆناتان ئینگبلی» لەوە دڵنیا بووەوە کە کابرا نوستووە، ئینجا پەنجەی کۆنترۆلی شاشەی چاودێرییەکەی داگرت. دەنگی تەقینەوەیەک لە هوتێلەکە هات. لە ژوورێکی سێهەمین نهۆمی هوتێلەکە، ژن و مێردێکی ئیسرائیلی کە بۆ بەسەربردنی مانگی هەنگوینی لەوێبوون، لەترسی تەقینەوەکە چوونە بن چوارپایەکەیان. کارمەندی پرسگەکەش بە هەڵەداوان بۆ ژووری عبدالهر ڕۆیشت. کاتێکیش دووکەڵی ژوورەکە ڕەویەوە، دیمەنێکی سامناکی بینی و لە تاوان بێهۆش کەوت: ئاخر سەرە خوێناویەکەی عبدالهری بینی لەنێو حەوزی ئاودەستەکە گیر ببوو.

✡ ✡ ✡

تۆڵەکردنەوەی ڕێکخراوی ئەیلوولی ڕەشیش تەڕدەستانە بوو.

لە ٢٦ی ینایری ١٩٧٣دا، کابرایەکی ئیسرائیلی بەناوی «موشێ حەنان ئیشای» برادەرێکی فەلەستینی لەسەر باڕی «موریسۆن» لەسەر شەقامی «جۆس ئەنتۆنیۆ» لە مەدریدا بینی. دوای ئەوەی باڕەکەیان جێهێشت، دوو پیاویان لێوەدەرکەوتن و ڕێیان لێگرتن. لەکاتێکدا کە هەردوو پیاوەکە هەڵیان کێشایە دەمانچەکەیان، فەلەستینییەکە هەڵات، ئیدی «ئیشی» بەگوللە دابێژرا و کۆتاییهات.

هەر یەک دوو ڕۆژ دواتر، ئەوە سەلمێندرا کە ناوە ڕاستەقینەکەی کوژراوەکە «باروخ کۆهن»ی کۆنە ئاژانی مۆساد بوو، کە ڕایەڵەیەکی خوێندکارە فەلەستینییەکانی لە مەدرید ڕاچاندبوو. ئەو گەنجەش کە لە بارەکەدا بینی، یەکێک بوو لەوانەی هەواڵی بۆ دەهێنان یەکێک لە شۆڤارەکانی بوو، هەواڵی بۆ دەهێنان و لەڕاستیشدا کەسێک بوو لەنێو ڕێکخراوی ئەیلوولی ڕەشدا چاندبووی. هاوڕێکانی کوڕە فەلەستینییەکە لە تۆڵەی «عبد الهر»دا «باروخ کۆهن»یان کوشت.

هەروەها پەنجەی گومان بۆ ئەیلوولی ڕەش لە تەقەلێکردن و بریندارکردنی ئاژانێکی دیکەی ئیسرائیلی بە ناوی «زادۆک ئۆپهیر» لە قاوەخانەیەکی برۆکسلدا ڕاهێشترا، هەروەها لەگەڵ لەناوبردنی «د. ئامی شیخۆری» پاشکۆی باڵوێزخانەی ئیسرائیلی لە لەندەن، کە بە نامەیەکی بۆمبی سەری نایەوە.

هەر دوو هەفتە دوای مەرگی عبدالهر، ئەیلولی ڕەش ئاژانێکی دیکەیان لە قوبرس لە جێی ناوبراو دانا. ئەویش هێشتا بیست و چوار سەعات بەسەر گەیشتنە نیقۆسیادا تێپەڕیبوو، کە کابرای فەلەستینی لە دیداری هاوتایەکەی «کەی گی بی»دا گەڕایەوە هوتێلەکەی، ئینجا لەگەڵ هەڵکردنی گڵۆپی ژوورەکەی بە هەمان مەرەدی کابرای پێش خۆی چوو فەوتا.

هەر بۆیە، عەرەفات و عەلی حەسەن سەلامە بڕیاریاندا، تۆڵەیەکی گەورە بکەنەوە. نەخشەیان بۆ ڕفاندنی فڕۆکەیەک داڕشت، کە پڕ لە تەقەمەنی بێ و بەرەو ئیسرائیل بفڕێ و لەلایەن کۆماندۆیەکی خۆکوژیشەوە بتەقێندرێتەوە. بە جۆرێک کە فڕۆکەکە لە ناوەڕاستی تەلئەبیبدا خۆی بە

شتێک دابدا و بە سەدان کەس بکوژێ. ئەوەش جۆرە پەلامارێکی بەراییانە بوو لەشێوەی ئەوەی لە ١١ی سێپتێمبەر لە جووت تاوەرەکەی نیویۆرک ڕوویدا.

هەواڵدزەکانی مۆساد دەنگۆی خۆئامادەکارییەکانی ئۆپەراسیۆنەکەیان بەرگوێ کەوت، بۆیە چەندین ئاژانی سووسەی گرووپێکی فەلەستینییان لە پاریس کرد، کە پێدەچوو بە ئەنجامدانی نەخشەکە هەڵبستن. شەوێکیان، ئاژانەکان تێبینیان کرد، کە پیرەمێردێک هاتۆتە ڕیزی گرووپەکە. ئەوانیش وێنەی پیرەپیاوەکەیان گرت و ڕەوانەی بنکەی سەرەکی مۆسادیان کردەوە، وێنەکە ناسرایەوە کە هی «باسل الكبيسي»، سەرکردەیەکی بالای ئەیلوولی ڕەش بوو. «کوبەیسی» قانونزانێکی ناودار بوو، مامۆستایەکی قانون بوو لە زانکۆی ئەمریکی لە بەیروت و توێژەرێکی ڕێزداریش بوو. بەڵام، ئەویش وەک «زعەیتر» و «هامشاری» و چەندانی دیکە لەبنەوە کەسانی دژوار بوون. لە ١٩٥٦دا، کوبەیسی تێکۆشابوو کە مەلیک فەیسەل پاشای عێراق لەڕێی ترومبێلێکی بۆمبڕێژکراو لەسەر ڕێی کاروانی ترومبێلەکانی پاشایەتیدا لەناوبەرێ؛ بەڵام بۆمبەکە پێش وادەی خۆی تەقییەوە و «کوبەسی»ش لەوێ دەرباز بوو، بۆ لەندەن هەڵات پاشان خۆی گەیاندە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. یەک دوو ساڵ دواتر، هەوڵیدا گۆڵدا مایەریش بکوژێ، کە سەردانی وڵاتە یەکگرتووەکانی کردبوو. کاتێکیش هەوڵەکەی سەرنەکەوت، هەوڵیدا ئەمجارەیان گۆڵدا مایەر لە کۆنگرەی سۆسیال ئەنتەرناسیۆنال لە پاریس بکوژێ. لەوێش هەر شکستی هێنا، بەڵام ئەلکوبەیسی کۆڵی نەدا؛ خۆی گەیاندە بەرەی میللی ڕزگاریخوازی فەلەستین و بووە جێگری «جۆرج حەبەش»ی سەرکردەی گرووپەکە. ئەو بەشداری نەخشەداڕشتنی کوشتارگەی ٣٠ی

ئایاری ۱۹۷۲ی کرد، کە لەلایەن تیرۆرستە عەرەب و یابانییەکانەوە پەلاماری ڕێبوارە بێخەتاکانی فڕۆکەخانەی «لۆد» درا. لە ئەنجامی هێرشەکەدا بیست و شەش کەس کوژران، زۆرینەشیان خەڵکی «پۆرتۆریکۆ»[205] بوون و بۆ حەج ڕوویان لە وڵاتی پیرۆز کردبوو. پاشان ئەلکوبەیسی چووە ڕیزی ئەیلوولی ڕەشەوە، هەنووکەش لە پاریسە، پێدەچی ئۆپەراسیۆنی نەخشەی خۆکوشتنەکە بەڕێوە ببا. ئەو لە هوتێلێکی بچکۆلانە لە «دێلا مادلیننە»دا ناوی خۆی تۆمارکرد.

لە ٦ی ئەپریلدا، دوای ئەوەی نانی شێوانی لە قاوەخانەی «دی لێ پاکس»دا خوارد، ئیدی بەرەو هوتێلەکەی خۆی ملی ڕێگەی گرتەبەر. لەلای دێلا مادلینەدا، دەستەی زەبروەشێنی مۆساد بۆی دانیشتبوون. دوو کەس لەسەر شەقامەکە بوون، دووی دیکەش لەنێو ترومبێلێک. یەکێکیان بارۆکەیەکی کەژەی لەسەر کردبوو. ئەلکوبەیسیش لێیان نزیک کەوتەوە، دوو ئاژانەکەش بۆی چوون، میلی دەمانچەکانیان ڕاکێشا. بەڵام شتێکی چاوەڕواننەکراو ڕوویدا. ترومبێلێکی بە باقوبریق لە نزیک ئەلکوبەیسی ڕایگرت، ئافرەتێکی گەنج سەری لە جامی تڕوومبێلەکە دەرهێنا. یەک دوو قسەیان لەگەڵ یەک کرد و ئەلکوبەیسیش سواری ترومبێلەکە بوو، دەستبەجێ لەوێ ڕۆیشتن. ئاژانە نامرادەکانیش پێیانوابوو ژنەکە لەشفرۆش بوو، پیاوی خۆیان دۆزیەوە.

خەریکبوو سەرلەبەری ئۆپەراسیۆنەکە بەهۆی قەحپەیەک شکست بێنێ!

---

[205] Puerto Rica لە دوورگەکانی کاریبییە.

بەڵام سەردەستەی تیمەکە، کە بەخۆی لەوێ ئامادەبوو، نیگەرانییە نامرادییەکەی ئەوانی ڕەواندەوە. ئەو بە ئاگاییەوە پێیگوتن؛ چاوەڕێ بکە و بیبینە، زۆر نابا ژنەکە کابرا دەهێنێتەوە ئێرە. ئەوانیش پێیان نەگوت، ئاخۆ چۆن دەزانێ، بەڵام خۆ پیاوەکە ڕاست بوو. هێشتا بە تەواوی بیست خولەک ڕەت نەببوو، ترۆمبێلەکە گەڕایەوە. ئەلکوبەیسی لە لەشفرۆشەکە جیابووەوە و بە پێ بەرەو هوتێلەکەی ڕۆیشت. ئەو هەر یەک دوو هەنگاوی هەڵێنابوون کاتێک دوو پیاوەکە لە سێبەرەوە بۆی دەرکەوتن و ڕێگەیان پێگرت. یەکێکیش لەوان «دایڤد مۆلاد» بوو.

دەمودەست ئەلکوبەیسی تێگەیشت. بە فەرەنسی هاواری کرد "نا! نەخێر! وا مەکەن!"

بەڵام خۆ کارلەکار ترازا، نۆ فیشەک جەستەی کابرای سمی و لەلای کڵێسای «مادلین» کەوتە گۆڕێ. ئاژانەکانی مۆسادیش سواری ترۆمبێلە ڕاگیراوەکەیان بوونەوە و گۆڕەپانەکەیان بەجێهێشت.

بۆ ڕۆژی پاشتر، هەروەک دۆزی «زعەیتر»، وتەبێژی بەرەی میللی ڕزگاریخوازی فەلەستینی پەردەی لەسەر ڕۆڵی راستەقینەی پرۆفیسۆرەکەی قانون هەڵدایەوە.

ئینجا لەو مانگانەی بەدوای ڕووداوەکەدا هاتن، «مۆلاد» و ئەندامانی کیدۆن چەندین نێردەی ئەیلوولی ڕەشیان کوشتن کە هاتبوونە یۆنان بۆ ئەوەی بەلەم بکرن و پڕ لە ماددەی تەقینەوەی بکەن و بەرەو بەندەرەکانی ئیسرائیلی ڕەوانە بکەن.

بەڵام خۆ یەک پرسیار بێ بەرسڤ مابووەوە: باشە ئەو عەقڵەی لەپشت ڕووداوەکەی میونیخ بوو لە کوێ بوو؟ عەلی حەسەن سەلامە لە کوێ بوو؟

✡ ✡ ✡

سەلامە لەبارەگای سەرەکی خۆی بوو لە بەیروت، لەوێوە نەخشەی جووڵەی داهاتووی دادەڕشت. یەکەمینیشیان دەستبەسەرداگرتنی باڵوێزخانەی ئیسرائیلی بوو لە تایلاند لەلایەن ئەیلوولی ڕەشەوە. بەڵام ئۆپەراسیۆنەکە شکستی هێنا. لەبن هەڕەشە و گەفی ژەنەڕاڵە تایلەندییە توندوبەندەکان و گوشاری باڵوێزخانەی میسری لە بانکۆک، تیرۆرستەکان، بارمتەکانیان ئازادکردن و تایلەندیشیان بە سەرشۆڕی بەجێهێشت.

ئۆپەراسیۆنی دواتری سەلامە بێباکانەتر بوو: پیاوەکانی ئەو کە تا سەر ئێسقان چەکدار بوون، بەسەر باڵوێزخانەی عەرەبستانی سعوودییان لە خەرتوومدا دا، لەو کاتەی لە ئاهەنگی ماڵئاوایی نێردەیەکی ئەورووپیدا بوون و نزیکەی تەواوی دەستە دیپلۆماتییەکانی نێو باڵوێزخانەی سعوودییەیان لە پایتەختی سوداندا دەستبەسەرداگرت. بە فەرمانی عەرەفات، زۆرینەی بارمتەکانیان ئازاد کردن ئەمانەی خوارەوە نەبێ: «کلیۆ ئا نول» باڵوێزی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا؛ «جۆرج سی مۆر» جێگری نێردەی ئەمریکا و «گای ئاید»ی کارهەڵسوڕێنەری باڵوێزخانەی بەلجیکا، بەگوێرەی ڕێنماییەکانی سەلامە، ئەوان هەموو ناوبراوەکانیان بە دڵڕەقانە لە خوێنی خۆیاندا گەوزاندن، سەرەتا تەقەیان لە پێ و قاچی

قوربانییەکان کردن، ئینجا بەرەبەرە لوولەی کلاشینکۆفەکانیان بەرزکردنەوە تا گەیشتە سنگیان.

تیرۆرستەکان دوای کوشتارگەکە گیران، بەڵام دوای یەک دوو هەفتە لەلایەن حکوومەتی سوودانییەوە ئازاد کران.

جیهانیش بە توڕەیی و قێزلێبوونەوە کاردانەوەی لەهەمبەر کردەی کوشتنە دڕندانەییەکە نواند. ئیسرائیلیش هەستی کرد کە کاتی ئەوە هاتووە زەبرێکی گورچکبڕ لە ئەیلوولی ڕەش بدا.

لە ئۆرشەلیمدا، گۆڵدا مایەر ڕێی بە لەسەر ڕۆیشتنی ئۆپەراسیۆنی تەکانی لاوەکان دا، ئەمەش قۆناخێکی نوێی ئۆپەراسیۆنی نەبڕاوەی تۆڵەی خودا بوو.

✡ ✡ ✡

لە ١ی ئەپریلدا، گەشتیارێکی تەمەن سی و پێنج ساڵە بە ناوی «گیلبرێت ڕیمباود» لە هوتێلی ساندس لە بەیروت دادەبەزێ. هەر لەهەمان ڕۆژدا، گەشتیارێکی دیکە بەناوی «دیتەر ئالتوندەر»یش دێتە هەمان هوتێل. دیاربوو هەردوو پیاوەکە یەکدیان نەدەناسی؛ هەردووکیان ژوورێکی وایان وەرگرت کە ڕووی لەسەر دەریاوە بێ.

لە ٦ی ئەپریلیشدا، سێ گەشتیاری دیکەش گەیشتنە ئەوێ. «ئەندریۆ ویلچێلاو» پیاوێکی ئازاو سەرنجڕاکێشی ئینگلیز؛ «دایڤد مۆلاد» کە دوو سەعات پێشتر لە ڕۆماوە هاتبوو، بە پاسپۆرتێکی بەلجیکی و بەناوی «چارلس باوسارد» ناوی خۆی دایە هوتێلەکە؛ «جۆرج ئێلدەر» کە ئەویش لە ئەنگۆرەوە گەیشتبوو، ئینگلیز بوو، بەڵام تەواو پێچەوانەی

هاودێهاتییەکانی خۆی بوو. گەشتیارێکی دیکەی بەریتانی «چارلس ماسی» لە هوتێلی ئەتلەنتیک لەسەر کەناراوی ئەلبادیەدا دابەزی، ئەویش هەروەک ئینگلیزێکی ڕاستەقینە ڕۆژانە دوو جاران پرسیاری ئاووهەوای ڕۆژەکەی دەکرد.

هەریەک لەو شەش گەشتیارەی گەیشتبوونە بەیروت، بەجیا بەسەر شەقامەکاندا دەڕۆیشتن و بە جادە و باڕ و ترافیکەکانی شارەکە ئاشنا بوون. لە ئاژانسەکانی ئاڤیس و لینکاردا سێ تڕومبێلی بیوک سکیلارک، تڕومبێلێکی ستێشنی پلیمۆس، ڤالیڤانتێک و ڕینۆیەککی ١٦یان بە کرێ گرتن.

لە ٩ی ئەپریلدا، کەشتیگەلێکی بچووک کە پێکهاتبوو لە نۆ بەلەمی ڕۆکێتهاوێژ و بەلەمی چاودێری بە قووڵایی دەریادا ڕۆیشتن و گەیشتنە هێڵی ئاوی نێودەوڵەتی. گەمی «میتاڤ» یەکەیەکی پەڕەشووتوانەکانی بە سەرپەلی کۆلۆنێل «ئامۆن لیپکین» هەڵگرتبوو، کە ئەرکیان هێرشکردنە سەر بارەگای سەرەکی بەرەی میللی ڕزگاریخوازی فەلەستینی بوو. دوو یەکەی دیکەش لەسەر پشتی «ئێم بێ گاش» بوون: ئەوانیش دەستەیەکی دیکەی پەڕەشووتوان و «سەیارەت ماتکال» بوون، لەژێر فەرماندەیی کۆلۆنێل «ئێهود باراک»دا بوون. ئەوانیش ئەرکێکی دیکەیان پێڕاسپێردرابوو. بەر لە دەستپێکی دەرچوونی ئەوان، هەر یەکەیان وێنەی چوار کەسیان پێگەیشتبوو. سێ وێنەیان هی «ئەبو یوسف»ی فەرماندەی باڵای ئەیلوولی ڕەش؛ «کەمال عدوان» فەرماندەی ئۆپەراسیۆنەکانی «الفتح» بوو کە ئەویش لە ئۆپەراسیۆنەکانی ئەیلوولی ڕەش لەنێو خاکی ئیسڕائیلدا بەرپرسیار بوو، لەگەڵ وێنەی «کمال ناسر»ی وتەبێژی

سەرەکی ڕێکخراوی الفتح. بە سەربازەکان گوترا، هەرسێ کەسە ناوبراوەکە لەهەمان ئەپارتمانی باڵەخانەی «ڕیو ڤێردن»دا دەژیان.

چوارەمین وێنەش هی خودی عەلی حەسەن سەلامە بوو. کەسیش نەیدەزانی ئاخۆ ئەو لە کوێیە.

کۆماندۆیەکان جلی مەدەنیانەیان لەبەردابوون. لە سەعات نۆو نیوی شەودا بەلەمەکان لە بەیروت نزیکبوونەوە، ئەوان بارۆکەیان لەسەرنا و جلی هیپییان (سەیروسەمەرەی ڕابواردن) لەبەر کرد. «ئێهود باراک» جلی ژنانەی پۆشی، ئەو لەبن مەمکدانە هەستیارە دڵڕفێنە سێکسییەکەیدا چەندین مادەی تەقاندنەوەی شاردبوونەوە.

ئیدی لەو تاریکییەکەدا چەندین بەلەمی چووپ لەسەر کەناراوە چۆڵەکەی بەیروت بەدەرکەوتن، پەڕەشووتوانەکانیان لە بەلەمی دایکەوە دەگواستنەوە. لەسەر کەنارەکە و لەبەردەمیاندا شەش ترۆمبێل ئامادەکرابوون، کە هەر گەشتیارێک لەپشت سووکانەکەی دانیشتبوو. هەر سەربازێکیش دەیزانی سواری کامە ترۆمبێل ببێ. ئیدی هەر پرسی یەک دوو خولەک بوو، کە ترۆومبێلەکان بە ئاراستەی جیاجیاوە هاژۆتران. ترۆمبێلەکانی دیکەش، کە یەکێکیان «مۆلاد» لێیدەخوڕی، بەرەو باڵەخانەی ئەو ئەپارتمانە ڕۆیشت کە سەرکردەکانی ئەیلوولی ڕەشی لێبوون.

یەکەی کۆماندۆی سەربازی کە بەرەو بارەگای سەرەکی بەرەی میللی ڕزگاریخوازی ڕۆیشت، پێشتر مەشقی لەسەر هێرشکردنەکە کردبوو، بۆ ڕاهێنانەکەیان باڵەخانەی تەواونەکراویان لە گەڕەکێکی لاپەڕگەی تەلئەبیب

بەکارهێنابوو. شەوێکیشیان، کاتێک سوپاسالار «دایڤد (دادۆ) ئێلیازەر» هاتبوو سەیری مەشقەکەیان بکا، گەنجێکی کەشخە، ملازم «ئاڤیدا شۆر»ی لێنزیکبووەوە و پێیگوت: "ئێمە خەریکین سەدوبیست کیلۆ تەقەمەنی بەکاربێنین تا باڵەخانەکەی بەیروتی پێ بڕوخێنین. بەڵام خۆ ئەم کارە پێویست ناکا و لەهەمان کاتیشدا دژوارە. ئاخر تەقینەوەکە زیان بە باڵەخانەکانی دەوروپشتی دەگەیەنێ، ئەوانیش ژمارەیەکی زۆری لە مەدەنی تێدان." ئەویش دەفتەرێکی لە بەرکە دەرهێنا و سەرنجەکانی نووسین. "منیش هەندێ حیسابم لێکدایەوە. ئێمە دەبێ هەر بەتەنیا هەشتا کیلۆگرام لە مادەی تەقەمەنی بەکاربێنین. ئاخر بەم بڕە دەکرێ باڵەخانەکە بەبێ ئەوەی زیان بە خانووی مەدەنییەکانی دەوروبەر بگەیەندرێ، بڕوخێندرێ." ئێلیازەریش لێکدانەوەی خۆی کرد و پێشنیازەکەی ملازم ئاڤیدای پەسەند کرد. ئینجا فەرمانی بە فەرماندەی ئۆپەراسیۆنەکە کرد لە هەشتا کیلۆگرام زیاتر تەقەمەنی بەکارنەهێنێ.

ئیدی یەکەی پەڕەشووتوانەکان گەیشتە بارەگای سەرەکی بەرەی میللی. دوای تەقەیەکی کەم، کە بە هۆیەوە دوو کۆماندۆی ئیسرائیلی گیانیان لەدەستدا، پەڕەشووتوانەکان دەستیان بەسەر دەروازە و هۆڵی باڵەخانەکەدا گرت و بەهەر هەشتا کیلۆ تەقەمەنیەکە شوێنەکەیان بۆمبڕێژ کرد. ئینجا تەقینەوەکە باڵەخانەکەی کردە خاشاکی بەسەر یەک کەڵەکەبوو، ژمارەیەکی زۆر لە تیرۆرستانی کوشت هیچ زیانیشی بە خانووە دراوسێکانی نەگەیاند.

یەکێک لەو کۆماندۆیانەی لە هێرشەکەشدا کوژرا، «ئاڤیدا شۆر»، خۆی بوو.

✡ ✡ ✡

هەر لەهەمان کاتدا پەڕەشووتوانەکانی دیکە و کۆماندۆکانی هێزی دەریایی پەلاماری چەندین بنکەی تیرۆرستانیان لە باشووری بەیروت دا، ئەمەش بۆ ئەوە بوو لە شوێنی جیاجیاوە سەرنجی کاردانەوەی تیرۆرست و سوپای لوبنانی بۆ خۆی ڕابکێشی. بەڵام خۆ ئەو جۆرە کاردانەوەش لەئارادا نەبوو.

لەو کەین و بەینەشدا کۆماندۆکانی «سەیارەت ماتکال» گەیشتنە باڵەخانەکە لە شەقامی «ڕو ڤێردن». ئەوان خەریک بوون لە باڵەخانەکە دەچوونە ژوور، کاتێ دوو ئەفسەری پۆلیسی لوبنانی بەوێدا تێپەڕین. بەڵام پۆلیس هەموو ئەوانەی بینیان دوو جووتەی دڵدار بوون و بە لاڕێدا دەڕۆیشتن. ڕۆمیۆیەکە کەسێکی دیکە نەبوو لە «موکی بێتزەر» زیاتر، ئەویش لە باشترین جەنگاوەرانی «سەیارەت ماتکال» بوو، هەرچی ئەو ژنەی خۆی وەک جۆلیەتە شۆخوشەنگەکە نمایش کردبوو، لە ئێهود باراک زیاتر کەسێکی دیکە نەبوو. هەر کاتێکیش هەردوو پۆلیسەکە گەیشتنە سەری قوژبنەکە، ئیسرائیلییەکان ڕژانە نێو باڵەخانەکە. بەیەکەوە و تەڕدەستانە بەسەر ئەپارتمانەکەی «کەمال عدوان» لە دووەمین نهۆم و «کەمال ناسر» لە سێهەمین و «ئەبو یوسفی»یش لە شەشەمین نهۆمیان دادا.

هەرچۆنێک بێ سەرکردەی تیرۆرستەکان هیچ دەرەتانێکیان بۆ نەمابووەوە. کاتێکیش پەڕەشووتوانەکان بەسەر ئەپارتمانەکانیاندا دان، دەستیان گەیشتە چەکەکانیان، بەڵام سەربازەکان خێراتر بوون. لە ماوەی یەک دوو خولەکدا، هەر سێ تیرۆرستەکە کوژران. ژنەکەی «ئەبو

یوسف» هەوڵیدا جەستەی خۆی بکاتە قەڵغانی مێردەکەی و ئەویش پێکرا. قوربانییێکی دیکە پیرەژنێکی ئیتالی بوو کە لە نهۆمی زەمینی خوار «کەمال عدوان»دا دەژیا. کاتێ گوێی لە دەنگی تەقەکان دەبێ، دێتە دەرێ، ئیدی تەقەی لێدەکرێ و لەجێدا دەکوژرێ.

لەماوەی ئۆپەراسیۆنەکەدا، کۆماندۆکان بەڵگەنامەکانی ئەیلوولی ڕەش کە لەسەر مێز و لەنێو چەکمەجەی دۆلابی سەرکردەکانیان بوون، کەوتنە بەردەستیان. ئینجا بریندار و کوژراوەکانی خۆیان هەڵگرتنەوە و لە ترومبێلەکانیان بارکردن و بە خێرا خۆیان گەیاندەوە لای کەناراوەکە، ئەو شوێنەی کە بەلەمە چووپەکان چاوەڕێیان دەکردن.

لەسەر کەناراوەکە، هەر شەش "گەشتیارە" مۆسادەکان بەڕێکوپێکی و بەڕیز ترومبێلەکانیان ڕاگرت و سویجیشیان لەسەر بەجێهێشتن. دوای یەک دوو ڕۆژ، کۆمپانیای بەکرێدانی ترومبێلەکان لەڕێی بانکی ئەمریکان ئێکسپرێسەوە کرێیەکەی خۆیانیان پێگەیشت.

هێزە ڕاسپێردراوەکە لەسەر پشتی کەشتییە داکانەکە[206] یەکیان گرتەوە و ئینجا بەرەو ئیسرائیل بوونەوە. ئۆپەراسیۆنەکە بە تەواوی سەرکەوتوو بوو. بارەگای سەرەکی بەرەی میللی ڕزگاریخوازی فەلەستینی چیدی وەک خۆی نەمایەوە، سەرکردەکانی ئەیلوولی ڕەشیش کوژران؛ لەنێویشیاندا «ئەبو یوسف النجار»ی فەرماندە بوو.

بەڵام خۆ کۆماندۆکان نەیاندەزانی، هەر پەنجا گەز لەو لاوەی خانووەکەی سەر شەقامی ڕیو ڤێردندا، عەلی حەسەن سەلامە لە ئەپارتمانێکی

---

[206] داکانە: ئەوەی دایکە، شتە سەرەکییەکەیە، لێرەدا مەبەست کەشتییە سەرەکییەکەیە.

ناپێشچاودا لە شیرین خەودا بوو. ئەو هەر مێشیشی لێ میوان نەبوو. بۆ ڕۆژی پاشتر کاتێ مردنی ئەبو یوسف ڕاگەیەنرا، ئەو لەجێگەی کوژراوەکە بووە فەرماندەی ئەیلوولی ڕەش.

بەهاری گەنجان مژدەی کۆتایی ئەیلوولی ڕەشی دا. دوای کوژرانی ئەو هەموو سەرکردانە، ڕێکخراوەکە هەرگیز وەک خۆی لێنەهاتەوە. هەمووی ڕۆیشت تەنیا یەک کەسیان مابووەوە.

✡ ✡ ✡

لە تەلئەبیبدا ئەو بەڵگەنامانەی لەلایەن بەهاری گەنجانەوە لە ئۆپەراسیۆنەکەدا کەوتنە دەست، یارمەتی مۆسادیان دا ئەو تەلیسمەی دوو ساڵی پێشووتری ڕێکخراوی ئەیلوولی ڕەش هەڵبێنی. ئەوەش گۆبەندی جەژنی فیتر بوو.

لە ئەپریلی ١٩٧١دا، دوو گەنج، دوو ژنی جوانی فەرەنسی لە فڕۆکەخانەی لۆدی ئیسرائیلی دابەزین و هەوڵیاندا بە پاسپۆرتی ساختەی فەرەنسی بەنێو پۆلیسی کۆچبەرانی فڕۆکەخانەکەدا ڕەت بن. ئاسایشی فڕۆکەخانەش پێشتر هۆشدارینامەی سەبارەت بە گەیشتنی ئەوان پێدرابوو. ئیدی کیژەکان بردرانە ژوورێکی لابەلا و لەلایەن پۆلیسێکی ژن و ئەفسەرەژنێکی شاباک پشکێندران. پشکنینەکە شتێکی سەیری ئاشکرا کرد: جلی ژنانەی ئەوان و تەنانەت جلی ژێرەوەشیان، دوو جاران لە کێشی جلێکی ئاسایی قورستر بوو. ژنە پۆلیسەکە بۆی دەرکەوت، جلەکانی ئافرەتە فەڕەنسییەکان بە جۆرە بۆیەکی سپی ڕەنگکراون. پێدەچوو جلەکان لەنێو گیراوەیەکی تیر هەڵێندرابن و پۆدرەی سپییان پێوەبێ. کاتێکیش جلەکانیان هەڵوەشێندران و لەیەک خشێندران، بەشێکی

زۆری پۆدرە سپییەکەییان لێهەڵوەرین. زۆر لەو پۆدرە سپییەش لە پاشپانی پێڵاوەکانیان دۆزرایەوە. بە هەر دوو کیژەکە نزیکەی دوازدە کیلۆگرام لە پۆدرە سپییەکەیان هەڵگرتبوو، کە دەرچوو ماددە پلاستیکێکی تەقینەوەی بەهێزە. لە سندووقێکی پارچە پەڕۆی لۆکەیی (لە چەشنی داییبیدا) کە لەنێو جانتای یەکێک لە کیژەکاندا بوو، پۆلیسەکە فتیلەی گڕدانی تەقینەوەی تێدا دۆزیەوە.

ئیدی کیژەکان بۆ لێکۆڵینەوە بردران و دانیان پێدا نا، کە خوشکن و کیژی بزنسمانێکی دەوڵەمەندی مۆراکۆیین؛ ناوەکانیشیان «نادیا» و «مادلین بەردەلی»یە. ئەوان لەلایەن پیاوێک لە پاریسەوە پەیوەندییان پێوەکراوە، هەر بەڕەوشتی سەرچڵیانەی خۆشیان قایلبوون کە ئەو جۆرە پۆدرە بەقاچاغ بگەیەننە ئیسرائیل.

پۆلیسی لێکۆڵینەوەکەش لێیپرسین: "باشە کێی دیکەش لەگەڵ ئێوەدایە؟"

ئەو دوای نیوەڕۆیە، چەندین ئەفسەری پۆلیس بەسەر هوتێلی «کۆمۆدۆر» یان دادا لە تەلئەبیب و جووتەیەکی فەرەنسییان بەناوەکانی «پیرێ» و «ئێدیت براولتەر» گرتن. کاتێکیش نێرەرەکەی ڕادیۆی هەردوو کەسەکەیان لە بار یەک هەڵوەشاند، زمانەی ڕاگری فتیلەی تەقینەوەیان تێدا دۆزیەوە. ئیدی «پێرێ براولتەر» دایە پرمەی گریان.

بۆ ڕۆژی پاشتر، فەرماندەیەکی گومانلێنەکراوی ئۆپەراسیۆنەکە گەیشتە ئیسرائیل: ژنێکی شۆخی فەرەنسی تەمەن بیست و شەش ساڵە بوو، کە پاسپۆرتێکی بەناوی «فرانسینە ئادەلاین ماریا» هەڵگرتبوو. ناوە ڕاستەقینەکەشی «ئێڤلین بارگس» کە پێشتر لەلای مۆساد وەک

تیرۆرستێکی پیشەمەند ناسراوبوو، مارکسیستێکی پەڕگیر و پێشتر لە چەندین پەلاماری تیرۆرستانە لە ئەورووپادا دەستی هەبووە.

کاتێکیش لەلایەن پۆلیسەوە لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا کرا، ئەندامانی ئەوەی پێیان دەگوترا تیمی فیتەرئاسا، دانیان بەوەدانا، کە بەنیاز بوون لە هەڕەتی وەرزی گەشتیاریدا نۆ هوتێلی سەرەکی بتەقێننەوە و تا بکرێ هەموو ئیسرائیلی و گەشتیارەکانیش تێدا بکوژن و بەمەش زەبرێکی کوشندە لە ئیسڕائیل بدەن.

دەسکە گوڵە جوانەکەش بردرانە زیندان، بەڵام ئەو پیاوەی قورمیشی کردەوەکە بوو هێشتا دەستگیر نەکرابوو. ئەویش «محەمەد بودیا» بوو، پیاوێکی ڕووخۆشی جەزائیری کە بەڕێوبەری شانۆیەک بوو لە فەرەنسا و هەر خۆشی تێدا ئەکتەر بوو. دیسان «د. جیکل» و بەڕێز «هاید» پیاوی کلتور، ڕۆشنبیر و هونەرمەند کە ژیانی لە سەنگی مەحەکدابوو بۆ ڕووپۆشکردنی چالاکییە تاوانبارییەکانی. ئەو دڵدارەکەی «ئیلینە بارگەر» بوو، دەستی لەگەڵ چەندین گۆبەندی دڵدارییەوە تێکەڵ بوو کە ئاژانەکانی مۆساد ناوی «بلوبیرد- ڕیش شینە»ـەکەیان لێنابوو.

لە بنەڕەتیشەوە «بودیا» لەبن فەرمانی جۆرج حەبەشی بەرەی میللی ڕزگاریخوازی فەلەستیندا بوو. ساڵێک دوای گرتنی تیمەکەی جەژنی فیتردا، ئەو خۆی گەیاندبووە ئەیلوولی ڕەش و کرایە سەرۆکی ڕێکخراوەکە لە پاریس. ئەو دەستی هەبوو لە کوشتنی «قادر کانو» کە هەواڵنێرێکی سووری بوو لە پاریس و گومانی ئەوەی لێکرا زانیاری بۆ مۆساد ببا. هەروەها «بودیا» بەرپرسیش بوو لە ئۆپەراسیۆنەکانی ئەیلوولی ڕەش لە ئەورووپا و نەخشەی بۆ پەلاماردانی سەر ئۆردوگای

گواستنەوەی کۆچبەرە جووەکانی ڕووسیاش دانابوو و جێبەجێشی کرد. دوای لەناوبردنی «هامشاری»، بودیا زۆر باش وریا بوو، سایەکردنیشی ببووە کارێکی زۆر سەخت.

لە ئایاری ١٩٧٣دا، دەستەی زەبروەشێنی مۆساد گەیشتنە پاریس و هەوڵیاندا «بودیا» بدۆزنەوە. ئەوان ناو و ناوونیشانی یارە نوێکەی بودیایان لە لابوو. ئاژانەکان بە ئۆقرەوە لەلای سووچەکەی ئەو باڵەخانەیەی یارەکەی لێدەژیا، چاوەڕوان بوون. لەکۆتاییدا کەس نەیزانی «بودیا» لە کوێ پەیدا بوو خۆی بە باڵەخانەکەدا کرد. بەڵام بۆ ڕۆژی پاشتر، کاتێک زۆرینەی ئاکنجییەکانی باڵەخانەکە بۆ چوونەسەر کاروباری خۆیان ئەپارتمانەکانیان جێهێشت، ئەو یەکێک نەبوو لەوانەی شوێنەکە بەجێبێڵن! تەنها دوای مانگێکی نامراد، لەو کاتەی ئاژانەکان سەرنج و تێبینیەکانیان بەیەک بەراورد کرد، شتێکی سەیریان بۆ دەرکەوت: هەموو بەیانییێک، دوای ئەوەی بودیا شەوێکی گەرمونەرمی لەگەڵ یارەکەی بەسەردەبرد، ژنێکی درێژی گەورە لەنێو ئەو کەسانەدایە کە باڵەخانەکە بە بەیانیان جێیدێڵن. لەکاتێکدا کە ژنەکە کەژە، هەندێک جارانیش ئەسمەرە... لەکۆتاییدا ئاژانەکان مەتەڵەکەیان هەڵهێنا: کابرا بەهرە ئەکتەرییەکەی بەکاردەهێنێ، دیاربوو بەرلەوەی باڵەخانەکە چۆڵ بکا، خۆی وەک ژنێک هەڵدێخێ.

بەڵام ئێستا، لەبەر چەند هۆیەکەوە ئەو لەسەردانکردنی یارەکەی وەستابوو، مۆسادیش شوێنپێیەکەی لێ ونبوو. تاکە سۆراخ ئەوەبوو، کە هەموو بەیانییێک بە میترۆی ژێرەمینییەوە دەچێتە شوێنی کۆبوونەوەکانی خۆی و لە وێستگەی «ئێتۆلیدا» لەژێر کۆتەڵی «تریۆمپفرا» سواری قیتار

دەبێ. وێستەگەی میترۆریەکەش مەڵبەندی ئەو قیتارانەیە کە بۆ زۆر شوێن دەڕۆن، ئاخر بە ملیۆن لە خەڵکی بە قیتاری ژێرزەمینیدا هاتووچۆ دەکەن و هێڵەکانی قیتاری خۆیان و ئاراستەکانیان دەگۆڕن. باشە لەو شوێنە گوڕدەم و سیخناخەدا چۆن "پیاوێکی بە هەزار دەموچاوی وەک بودیا" دەدۆزرێتەوە؟"

بەڵام خۆ چارەی دیکەیان نەبوو. ئاژانەکانی مۆساد لەسەرتاسەری ئەورووپادا ئاگادار کرانەوە. سەرچاوەکانی ئیسرائیل وێنەکانی بودیایان بۆ هات و لە دالان، ڕاڕەو، هۆڵی دەروازە و شۆستەکان وێستگە زل و زەبەلاحەکەی «ئیتۆلی» گیرابوو. ڕۆژێک، دووان و سیان بەسەر ئەو کارەدا تێپەڕی و هیچ پەیدانەبوو. بەڵام لە ڕۆژی چوارەمدا، یەکێک لە ئاژانەکان «بودیا»یان بە دەمامکدراوی بەدیکرد، هەندێک شکڵی گۆڕا بوو بەڵام هێشتاش هەر لە پیاوەکە خۆی دەکرد. ئەمجارەیان ئاژانەکە هەروەک سایە بە دوایدا خشا تا گەیاندییە نێو ترومبێلەکەی خۆی، کە لە نزیک ستاسیۆنی میترۆی ڕاگرتبوو. ئەویش بەدوای ترومبێلەکەیدا ڕۆیشت، بەو شەوە «بودیا» لە ماڵێک لە «ڕوو دەس فۆسس سێینت بێرنارد»دا مایەوە، پێدەچوو ماڵی یارە نوێکەی بێ. بۆ بەیانییەکەی، ڕۆژی ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٧٣دا، بودیا لە ترومبێلەکەی خۆی نزیک کەوتەوە، جارێ لە دەرەوە چاوێکی لێکرد و پشکنی، سەیری بن بۆدیەکەشی کرد، ئینجا دوگمەکەی کردەوە و لە پشت سووکانەکە دانیشت. هەر ئەوەندە بوو تەقینەوەیەک ترومبێلەکەی پارچەپارچە کرد و «بودیا»شی کوشت. بەگوێرەی ڕاپۆرتی ئەرووپییەکان، زڤی زامیر ڕامسادی مۆساد لە سووچێکی شەقامەکە سەیری تەقینەوەکەی دەکرد.

بەڵام خۆ لەو کاتەدا سەرانی مۆساد کاتی ئەوەیان نەبوو بە بۆنەی سەرکەوتنەکەیان ئاهەنگ بگێڕن. ئاخر پەیامێکی بەلەزییان لە بارەگای سەرەکییەوە بۆهات: پەیکێکی تایبەتی ئەیلوولی ڕەش، «بن ئامنا»ی جەزائیری نێردرابوو کە عەلی حەسەن سەلامە ببینێ؛ «بن ئامنا» بە ڕێگەیەکی نامۆی گەشتیاریدا لە ئەورووپا پەڕیەوەو بەرەو «لیلیهامەر»، شارێکی پشوودانی گەشتیاری نەرویجی چووبوو.

✡ ✡ ✡

یەک دوو ڕۆژ دواتر، دەستەی زەبروەشێنی کیدۆن لەژێر فەرماندەیی «مایک هاراری» شوێنی خۆیان لە «لیلەهامەر»دا گرت. کەسیش هیچی نەدەزانی ئاخۆ «عەلی سەلامە» لەو شارە شاخاوییە ئارامەدا چی دەکا. یەکەمین تاقمیش کە بەدوای «بن ئامانادا» چوونە مەلەوانگەی شارەکە و بینیان کابرا پەیوەندی بە پیاوێکی بە ڕوخسار ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە دەکا. سێ ئەندامی تاقمەکە سەیری ئەو وێنەی هەڵیانگرتبوو کرد و بۆیان دەرکەوت کە ئەو پیاوەی بەردەمیان بەبێ سێ و دوو «سەلامە» خۆیەتی. ئەوان گوێیان لە هاوڕێی چوارەمیان نەگرت، چونکە گوێی لێبوو کە پیاوەکە لەگەڵ خەڵکی دیکە قسەی دەکرد، پێیگوتن شتێکی نەکردەیە ئەو پیاوە سەلامە بێ، ئاخر خۆ سەلامە زمانی نەرویجی نازانێ.

هەرچی ئاژانەکانی دیکە بوون، بە تەواوی لە ناسنامەی کابرا دڵنیا بوون؛ ئیدی شوێنپێی سەلامەیان لە شەقامەکانی لیلەهماردا هەڵگرت و بینیشیان لەگەڵ ژنێکی گەنجی زگپڕ دایە.

ئۆپەراسیۆنەکە گەیشتە دوا قۆناغی خۆی. لە ئیسرائیلەوە ئاژانی زیاتر گەیشتنە ئەوێ: زاڤی زامیریشیان لەگەڵدا بوو. خۆی لەناوبردنی عەلی

سەلامە دوایین هەنگاوی تێکشکاندنی ئەیلوولی ڕەش بوو، بۆیە «زڤی زامیر» ویستی لەو دوایین قۆناغەدا بەخۆی ئامادەبێ. دەستە بکوژەکەش کەسە بەخۆڕاپەرموەکانی وەک «جۆناتان ئینگلبی»، لەگەڵ «ڕۆلف باهر» و «جیرارد لافۆند» بوون. «دایڤد مۆلاد»یش بەشداری ئۆپەراسیۆنەکە نەببوو. دەستەی پشتگیریش تڕومبێل و ژووری هوتێلیان بەکرێگرتبوو. هەندێک گوتیان کەوا دەستبەجێ ئاکنجیانی شارەکە هەستیان بە جموجۆڵێکی نائاسایی کرد؛ ئاخر زۆر لەو "گەشتیار"انەی لە شاری لیلەهمار ئامادەبوون، تڕومبێلەکانیان خێرا بە هەموو ئاراستەکان دەرپەڕین، ئەمەش دیمەنێکی ئاسایی نەبوو لە هاوینی شارەکەدا.

لە ٢١ی تەممووزی ١٩٧٣دا، سەلامە و دۆستە دووگیانەکە لە سینەما دوای بینینی فیلمی "لەو شوێنەی هەڵۆکان نەبەردن" لە سینەمای «کلییێنت ئیستوود»دا بینی، هاتنەدەر. جووتەکە سواری پاسێک بوون لە شەقامێکی ئارام دابەزین، ئینجا بە پێ کەوتنە ڕێ. بەڵام لە پڕێکەوە تڕومبێلێکیان لە تەنیشت پەیدا بوو؛ جووتەکە خۆیان بە لاڕێدا دا، بەڵام چەک بەدەستەکە بواری نەدا و چاردە گوللەی لێخاڵی کرد.

شازادە سوورەکە مرد.

ئۆپەراسیۆنەکە کۆتاییهات، «مایک هاراری» فەرمانی بە پیاوەکانی کرد دەستبەجێ نەرویج بەجێبێڵن. بەپێی ڕێساکە بە تەواوی لەسەر شانۆی کردەوەکەدا کشانەوە: سەرەتا بکوژەکان تڕومبێلە سپییەکەیان لە ناوجەرگەی لیلەهامەر بەجێهێشت، بەیەکەمین گەشتە فڕینی ئۆسلۆی پایتەختەوە دەرچوون. زۆرینەی ئاژانەکان و مایک هارایش دوای ئەوان دەرچوون، تاقمێکیان لەدوای خۆیان بەجێهێشت تا پەرێزیان خاوێن

بکەنەوە و شتەکان بۆ ماڵە پارێزراوەکان بگوێزنەوە و تڕوومبێلە بەکرێگیراوەکانیش بگەڕێننەوە. بەڵام ڕێکەوتێکی چاوەڕواننەکراو هەموو شتێکی هەڵگێڕایەوە. ژنێک کە لە نزیک تەقەلێکردنەکە دەژیا، سەرنجی ڕەنگی سپی تڕومبێلەکە و جۆرەکەی کە پیژۆ بوو، دا بەوەی تڕومبێلی بکوژەکە بێ؛ پۆلیسیش بەربەستیان لەسەر ڕێگەی نێوان لیلەهامەر و ئۆسلۆدا دانا، لەوێوە ئەفسەرێکی پۆلیس تڕومبێلێکی پیژۆی ڕەنگ سپی بینی کە کەسێک لێیدەخوڕێ لە ژنان دەچێ و سەرنجی ژمارەی تڕومبێلەکەی دا. بۆ ڕۆژی پاشتر کاتێک تڕومبێلەکە گەیەندراوە شوێنی لێخواستنی تڕومبێلەکە لە فڕۆکەخانەکەدا، پۆلیس سەرنشینانی تڕومبێلەکەی گرتن، کە «دان ئارابێل» و «ماریانا گلادنیکۆف» بوون. لێکۆڵینەوەکە سەرەنجام بەوە گەیشت هێشتا دوو ئاژانی دیکەش دەستگیر بکەن، ئەوانیش «سلڤیا رافائیل» و «ئاڤراهام گێمەر» بوون. دوو ئاژانی دیکەش لە هەمان ڕۆژدا گیران. ئاربێل و گلاندیکۆف کەوتنە بن باری لێکۆڵینەوەیەکی چڕوپڕ. ئەوانیش زانیارییە هەرە نهێنییەکەی ئۆپەراسیۆنەکە، ناوونیشانی ماڵە پارێزراوەکان لە نەرویج و لە ئەورووپا، ڕێسا پەردەپۆشکراوەکان، ژمارەی تەلەفۆنەکان، شێوەی کاری مۆسادیان ئاشکرا کرد. پۆلیسیش بەسەر ئەپارتمانێکیان لە ئۆسلۆ دادا لەوێ کۆمەڵێک بەڵگەنامەیان دۆزییەوە؛ هەروەها بۆیان دەرکەوت کە «ئیگال یال» ئەفسەری ئاسایشپارێزی باڵوێزخانەی ئیسرائیلیش پەیوەندی بە مۆسادەوە هەیە. کارەسات ئەمما کارەسات.

بۆ رۆژی پاشتر، میدیا هەواڵی گرتنی ئاژانەکانی ئیسرائیلی بڵاوکردەوە. ئەمەش زەبرێکی کوشندە بوو لە ناوبانگ و شایستەیی مۆساددا درا.

بەڵام میدیا هەواڵێکی دیکەشی بڵاوکردەوە، کە لەوەی سەروو جەرگبڕتر بوو: ئەو پیاوەی مۆساد کوشتبووی، هەڵە بوو.

✡ ✡ ✡

ئەو پیاوەی لە لیلەهامەردا کوژرا، عەلی حەسەن سەلامە نەبوو. بەڵکو کابرایەکی مۆراکۆیی بوو کە بۆ کار هاتبووە نەرویج و ناویشی «ئەحمەد بوشکینی» بوو. ئەو ژنێکی نەرویجیشی هەبوو، «تۆریلە» کەژەکەی هاوسەری حەفت مانگ بوو دووگیان بوو.

ئیدی سەرهێڵی وروژێنەر لە هەموو ئەورووپا هەر باسی گۆبەندەکە بوو. ئاژانە گیراوەکان دادگایی دەکرێن و هەندێکیشیان بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ زیندانی دەکرێن. یەکێکیش لەوان سیلڤیا ڕافائیل بوو کە سەرنجی نەرویجییەکان بە شانازی و ڕوخسارە خانەدانییەکەی ڕاکێشابوو. دادگاییکردنی خانمەکە بووە مایەی شتێکی چاوەڕواننەکراو: ئەو کەوتە داوی خۆشەویستی پارێزەرە نەرویجییەکەی، دوای ئازادکردنیشی مارەی کرد و بە یەکەوە ژیانێکی خۆشیان بەسەربرد تا ئەو کاتەی لە دیسێمبەری ٢٠٠٥دا بە نەخۆشی تیراوە[207] مرد.

دوای کەتنە گەورەکەی لیلیهامەر، دەبوایە مۆسادماڵی خۆی پاک بکاتەوە، ڕێسای پیلانگێڕی بگۆڕێ، لەماڵە پارێزراوەکان دوور بکەوێتەوە و ڕایەڵەیەکی نوێی پەیوەندی ڕابچێنێ... دەبوایە بەرپرسیارێتی مەرگی «ئەحمەد بوشیک»یش لە ئەستۆ بگرن و بڕی 400.000 دۆلار بدەنە

[207] تیراوە: شێرپەنجە، سندان، سەرەتان.

ماڵباتەکەی. بەڵام لە هەمووی پۆلکتر، ناوی ئەفسانەیی و نەمریی و زاڵبوویی مۆساد شێوا.

گۆڵدا مایەریش فەرمانی بە «زڤی زامیر» کرد دەستبەجێ دەستبەرداری ئۆپەراسیۆنی تۆڵەی خودا بێ. بەڵام خۆ هەر زوو شکستەکە لەچەند ڕوویەکەوە هەر درامای زیاتری لێدەکەوتەوە. لە ٦ی ئۆکتۆبەردا، لەشکرەکانی میسر و سوریا هێرشێکی سەرسامانەیان کردە سەر ئیسڕائیل. شەڕی یوم کیپور هەڵگیرسا. (بڕوانە بەندی چواردەمین.)

✡ ✡ ✡

دوو ساڵ تێپەڕین.

لە ئێوارە درەنگێکی خۆشی بەهاری ١٩٧٥دا، خانەوادەیەکی بەیروتی میوانداری جوانترین جوانەژنی ئەم سەر زەمینەیان کرد. بە دڵنیاییەوە «جورجینا ڕزق» شایستەی ئەو نازناوەی بوو، هەروەک چۆن چوار ساڵ پێشتر لە کێبەرکێیەکی جوان و قەشەنگی سەر کەناراوی «میامی» بە شاجوانی جیهان هەڵبژێردرا. ئەو جوانە ناوازەیەی لوبنان ناسراو بوو، پاداشتیش کرا، گەڕا و سوڕا سەرکردەکانی دنیای بینین.

با بگەڕێینەوە لوبنان، لەوێ کارنامەیەکی بێهاوتای وەک سوپەرمۆدێل و خاوەنی بۆتیکی ڕێکپۆشی ڕۆنا.

ئەو ئێوارە درەنگەی ئەوێ ڕۆژێ، لە ماڵی برادەرەکانی خۆی، پیاوێکی گەنجی قۆز و کەشخەی ڕووگەشی بینی. زۆری پێنەچوو کەوتە داوی خۆشەویستی کوڕە قۆزەکەوە. دوو ساڵ دواتر و لە ٨ی حوزەیرانی

١٩٧٧دا شووی پێکرد. زاوا بەختەوەرەکەش خودی «عەلی حەسەن سەلامە» بوو.

کارنامەی «عەلی»ش لەو یەک دوو ساڵانەی دواییدا باش بەرزبووەوە. لە کۆتایی ١٩٧٣دا، ئەیلوولی ڕەش وەک بلّێی لە بوون وەستا. بەڵام سەرباری ڕووخانی ڕێکخراوەکە، سەلامە بووە دەستەڕاستی یاسر عەرەفات و "کوڕە بەتەبەنییەکەی"؛ بەندوباوی ئەوەش لەگۆڕێدا بوو کە عەلی سەلامە بە جێگرەوەی عەرەفات دادەندرێ لە ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستیندا.

دوای کەوتنی ڕێکخراوی ئەیلولی ڕەش، بووە سەرۆکی هێزی حەڤدە، کە بەرپرسیاربوو لە ئاسایشپارێزی سەرانی الفتح و هەموو کودەتا نائاساییەکان. سەلامە لە سەفەری نیویۆرکدا یاوەری عەرەفات بوو. عەرەفاتیش چووە نێو کۆبوونەوەی کۆمەڵەی گشتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان کە بەدەستێکی چڵە زەیتوونێکی هەڵگرتبوو و دەمانچەشی لەبەر پشتدا بوو. سەلامەش لە تەنیشت عەرەفات دەڕۆیشت، کاتێک ئەو دواتر چووە مۆسکۆ لەوێ سەرکردە هەرە دەسەڵاتدارەکانی جیهانی بینین. بۆ مایەی سەرسامی ئیسرائیل، لەلایەن «سی ئای ئەی»شەوە پشی پشی بۆ دەکرا.

لە سایەی چاودێرییێکی گەورەتریشەوە، ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی[208] بڕیاریدابوو چاوپۆشی لە پاشخانی "شازادە سوورەکە" بکا لەو ڕۆڵەی لە

---

[208] مەبەست دەزگای سی ئای ئەیە، چونکە پیتەکانی دەزگاکە کورتکراوەی ناوەکەیەتی، واتە Central Intelligence Agency ( CIA).

کوشتارگەی میونخ، لە لەناوبردنە دڕندانەکەی دیپلۆماتە ئەمریکییەکان لە مەدرید کە خۆی داڕێژەری سەرەکی بووە، ئەو ڕاستییە سادەیەی، کە عەلی سەلامە یەکێک لە تیرۆرستە دژوارەکانی جیهان وەها لێبکەن بیخەنە ڕیزی هەواڵدزەکانی خۆیان. سی ئای ئەی هیوای لەسەر ئەوە هەڵچنی بوو، بەڵکو سەلامە ببێتە خزمەتکارێکی دڵسۆزی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا. لەسەرێکی دیکەشەوە، دەزگەکە قایلبوو بەوەی «سەلامە» کاتە پشوویێکی دوورودرێژ لەگەڵ جۆرجینا لە هاوای بەسەر ببا و هەموو خەرجییەکانیش لەسەر گیرفانی سی ئای ئەی بێ.

شێوەی ژیانی سەلامە گۆڕابوو، برادەرەکانیشی خەریکبوو باوەڕ بەوە بکەن، کە چیدی ژیانی ئەو دژوار نییە. بەڵام ئەو بەخۆی وای هەست دەکرد، ڕۆژەکانی ژیانی ئەو لەتەواوبوون دان. ئەو لە باسی مردنی خۆی نەدەبڕیەوە. "ئەز دەزانم،" وای بە هەواڵنێران دەگوت: "کەی چارەنووسم مۆری لێدەدرێ و کەی کۆتاییم پێ دێ. کەسیش ناتوانێ قوتارم بکا."

ئیسرائیلیش بڕیاری دابوو، مۆرێک لە چارەنووسی سەلامە بدا.

✡ ✡ ✡

هەر لەو کاتەی ئەیلوولی ڕەش داڕما، گۆڕانکاری زۆر لە ئیسرائیلدا هاتنەکایە. گۆڵدا مایەر ڕۆیشت؛ «ئیسحاق ڕابین»ی جێگرەوەشی دەستی لەکار کیشایەوە؛ سەروەزیرێکی نوێ، «مێناحیم بێگن» هاتە سەر تەختی دەسەڵات. «زڤی زامیر» لە پۆستەکەی خۆی نەما و ژەنەڕاڵ «ئیسحاق (هاکا) هۆفی»، فەرماندەی پێشووی هەرێمی باکوور لەجێی ئەو بووە *ڕامساد*. تیرۆری فەلەستینی دژی ئیسرائیلی بەشێوەیەکی پچڕپچڕ بەردەوام بوو. لە ١٩٧٦دا، فڕاندنی فڕۆکەیەک بۆ «ئەنتەبە» لە ئۆگەندا و

به ئەنجامگەیاندنی ئۆپەراسیۆنێکی بوێری ڕزگارکردنی بارمتەکان لە لایەن هێزێکی پەڕەشووتوانان و «سەیارەت ماتکال». لە ١٩٧٨یشدا، تیرۆرستەکانی فەتح، لە ئیسرائیل دابەزین و پاسێکی مەدەنیان ڕفاند و بەرەو تەلئەبیب لێیانخوڕی. لەسەر ڕێگە، لە دەرەوەی شار لە ڕێی بەربەستێکەوە وەستێندران، لە کۆتاییشدا بەسەر ڕفێنەرەکاندا زاڵ بوون، بەڵام دوای ئەوەی ڕفێنەرەکان سی و پێنج سەرنشینی مەدەنییان کوشتن، ژن و پیاو و منداڵە مەدەنییەکان بە شێوەیەکی دڕندانە بە پەلامارێکی دڕندانەی تیررۆستانە لەنێو خاکی ئیسرائیلدا کوژران.

مێناحیم بێگنیش هەستی وابوو کە نابێ هیچ تیرۆرستێک کەدەستی بە خوێن سوور بێ، بە ئاشتی بژیێ. لە کۆتایی حەفتاکاندا دیسان ناوی سەلامە کەوتەوە سەرتۆپی لیستی تۆڵەستێنەکان.

مۆسادێک بە دەمامکێکەوە نێردرایە بەیروت، توانی خۆی بگەیەنێتە ئەو یانە وەرزشییەی کە سەلامە لەوێدا ڕاهێنانەکانی خۆی دەکرد. ڕۆژێکیان، کاتێ ئاژانە نهێنییەکە بەرەو ساونا دەڕۆیشت لووتی دە لووتی سەلامەی ڕووتوقووت چەقی.

ئەم دۆزینەوە وروژێنەرە بووە مایەی مشتومڕێکی گەرم لە بنکەی سەرەکی مۆساددا. سەلامەیەکی ڕووتوقوت لە یانەیەکی تەندروستی وەرزشی، نێچیرێکی ئاسانە. لەسەرێکی دیکەشەوە، هەر هەوڵێک بۆ کوشتنی ئەو لەوێ، دەبێتە مایەی کوشتنی مەدەنییەکانیش، بۆیە نەخشەکە هەڵوەشێندرایەوە.

***هاتنی ئێریکا ماری چامبەرس.***

ئێریکا خانمە ئینگلیزێکی سەڵت بوو، ژنێکی سەیر و بەهێز بوو، ئەم چوار ساڵەی دوایی لە ئاڵمان ژیابوو. ئەو هاتە بەیروت و ئەپارتمانێکی لە نهۆمی هەشتەمی باڵەخانەیەکی سەر سووچی «ڕیو ڤێردون» و «ڕیو مەدام کۆری» بەکرێگرت. دراوسێکانی نازناوی «فینەلۆپە»یان لێنابوو. خاتوونەکە بە دراوسێکانی گوتبوو، کە خۆبەخشانە کار بۆ ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی دەکا کە مشووری منداڵە هەژارەکان دەخوا. هەر بەڕاستیش، خانمەکە لە نەخۆشخانە و ئاژانەکانی مشووری لەشساخیدا بیندرا؛ هەندێک هەبوون دەیانگوت تەنانەت عەلی حەسەن سەلامەشی بینیوە. پێدەچوو ژنەکە تەواو تاکو تەنیا بێ. بەردەوام پەرشوبڵاو، جل پەڕپووت بوو، زۆر جارانیش لەسەر شەقامەکان دەردەکەوت و خواردنی دەدایە پشیلە بێ خاوەنەکان؛ دەگوترا ئەپارتمانەکەی پڕ بوو لە پشیلەی بێ خاوەن. هەروەها ئەو خولیای نیگارکێشانیشی هەبوو، بەڵام ئەوانەی تابلۆی خانمەکەیان دەبینی، خێرا تێدەگەیشتن کە بەهرەمەندی ژنەکە بێ سنوور بوو.

بەڵام لەپاڵ نیگارکێشانی دیمەنی سروشتی لوبنانی، ئەوەی هەر بەڕاستی سەرنجی «ئێریکا ماری چامبەرس»ی ڕادەکێشا، ڕێگەی هاتن و چوونە جەنجاڵەکەی شەقامی خوارووی خۆی بوو، زۆر وردتریش، ڕێڕەوی ڕۆژانەی ئەو دوو ترومبێلەی ژێر پەنجەرەی ئەپارتمانەکەی بوو: شێفرۆلێت ستێشنێکی بۆرە کە هەمیشە جیێپێکی لاندرۆڤەری بەدواوە بوو. بە بەکارهێنانی کۆدەوە، هەمیشە ئێریکا کات و ئاراستەی جووڵەی ترومبێلەکانی تۆماردەکرد. هەموو سپێدەیەک ئەوان لە گەڕەکی «سنۆبرا»وە دەهاتن، بە «ڤێردون» و شەقامی «مەدام کوری»دا شۆڕدەبوونەوە، بەرەو باشوور تا بنکەی سەرەکی الفتح؛ بۆ خواردنی

نیوەڕۆش دەهاتنەوە، سەرەتای ئێوارەش دەردەکەوتنەوە و دیسان بەرەو بنکەی سەرەکی فەتح دەچوونەوە.

سەیرکردنی تڕومبێلەکان بە دووربین، ئێریکا عەلی حەسەن سەلامەی ناسییەوە کە لەسەر کورسی پشتەوەی شیڤرۆلێتەکە لەنێوان دوو کوڕی چەکداردا دانیشتبوو؛ چەندین تیرۆرستی چەکداری دیکەش بەسواری لاندرۆڤەرەکە بەدوایەوە بوون.

دەکرێ پاسەوانەکان، سەلامە بپارێزن، بەڵام خۆ ئەوان نەیاندەتوانی لەدەست بەدترین دوژمنی ئاژانێکی نهێنی دەربازی بکەن، کە ڕۆتین بوو. لەو کاتەی جۆرجینا جوانەکەی هێنابوو، ژیانی سەلامە ڕەوتێکی جێگیری وەرگرتبوو: ئەو بەخۆی و هاوسەرەکەی لە گەڕەکی «سنوبرا»دا جێگیر ببوو، وەک هەر کارمەندێکیش دەیەویست بچێتە سەر ئیش، هەموو بەیانییێکیش لەهەمان کاتدا دەڕۆیشت، بۆ نانی نیوەڕۆ و هەندێک پشوو دەگەڕایەوە ماڵ، دوای چاوگەرمکردنێکیش دیسان دەگەڕایەوە سەرکار. ئەو بنەما سادەکانی چالاکی نهێنییانەی پشتگوێ خستبوو: *بەوەی هەگیز پەرە بە خووی ئاسایی نەدەی، هەرگیز بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لەهەمان ناوونیشاندا نەمێنیتەوە، هەرگیز هەمان ناسنامە دووجار بەکارنەهێنیتەوە، هەرگیز لەهەمان کاتی ڕۆژدا گەشت نەکەی.*

لە ١٨ی ینایری ١٩٧٩دا، «پیتەر سکراڤەر»، گەشتیارێکی بەریتانی گەیشتە بەیروت و لە هوتێلی «میدیتەرێین» دابەزی و تڕومبێلێکی شینی گۆلف ڤۆلکسواگنی لەلای ئاژانسی «لینەکار» بەکرێگرت. لە هەمان ڕۆژیشدا «ڕۆنالد کۆلبێرگ»، گەشتیاری کەنەدی بینی، کە لە هوتێلی «ڕۆیال گاردن» دابەزی بوو، ئەویش تڕومبێلێکی سیمکا کرایسلەری لە هەمان

ئاژانسی بەکرێدانی ترومبێلدا، بەکرێگرتبوو. «کۆلبێرگ»یش کەسێک نەبوو لە خودی «داڤید مۆلاد» زیاتر. کڕیاری سێهەمی ئەو ئاژانسە بەهەڕمێنەی بەکرێدانی ترومبێل لە ڕۆژی دواتردا چووە نووسینگەی ئاژانسەکە، ئەویش «ئێریکا چامبەرس» بوو، ئەویش داوای ترومبێلێکی کرد بۆ "گەشتێک بۆ ناو چیاکان". خانمەکە ترومبێلێکی داتسونی بەکرێ گرت و هێنای لە نزیک ماڵەکەی خۆی ڕاگرت.

ئەو شەوە، سێ بەلەمی موشەکهاوێژی ئیسرائیلی لە کەناراوە چۆڵەکەی بەیروت، لە بەندەری «جونەیح» نزیکبوونەوە و لەسەر لمە تەڕەکە بڕێکی زۆری تەقەمەنییان جێهێشت. کۆلبێرگ و سکرایڤەر لەوێ بوون، ئەوانیش ماددە تەقینەوەکانیان لە ڤۆلکسواگنەکە بارکرد.

لە ٢١ی ینایردا، پیتەر سکرایڤەر لە هوتێلەکەی خۆی نەما و ڤۆلکسواگنەکەی بەرەو ریو ڤێردن لێخوڕی و لەبەرانبەر پەنجەرەی ئێریکا چەمبەرسی ڕاگرت. ئینجا تاکسییێکی گرت و بەرەو فڕۆکەخانە ڕۆیشت لەوێشەوە بۆ قوبرس. ڕۆنالد کۆلبێرگیش حیساب و کتابی لەگەڵ هوتێلەکەی خۆی کرد و بەرەو هوتێلی مۆنتمارتری لە جونەیح ڕۆیشت.

لە سەعات چوار و پێنج دەقەی دوای نیوەڕۆدا، وەک هەموو جارێک، عەلی حەسەن سەلامە سواری شۆڤرێلۆتەکەی خۆی بووەوە. پاسەوانەکانیشی سواری لاندرۆڤەرەکە بوون ئیدی بەو کاروانە بچکۆلانەیە بەرەو بارەگای سەرەکی الفتح لێیانخوڕی. ترومبێلەکان بە جادەی «ڕیو مەدام کوری»دا دا شۆڕبوونەوە لە «ڕیو ڤێردن»یشدا بایاندایەوە.

له نهۆمی هەژدەهەمەوە لە گۆشەیەکی باڵەخانەکەدا، «ئێریکا جامبەرس» چاوەڕێی نزیکبوونەوەی ئەوانی دەکرد. «مۆلاد»یش لەتەنیشتی وەستابوو، کۆنترۆلی ئامێرێکی لەدەست بوو.

شۆڤرێلۆتەکە بە سووکی لە ڤۆلکسواگنە شینەکە تێپەڕی. لەو ساتەدا مۆلاد دوگمەی کۆنترۆلە دەستییەکەی داگرت. ڤۆلکسواگنەکە تەقییەوە، بووە یەک تۆپە ئاگر. شۆڤرێلۆتەکەشی بە گڕی مەشخەڵەکەی خۆی هەڵلوشی، ئاگری تێبەردا. پارچە ئاسن و شووشە لە ترومبێلەکە بەتوندی دەردەپەڕین. پەنجەرەی ماڵەکانی دراوسێ شکان و پارچە شووشە بەسەر لاڕێیەکەدا دابارین. بە شێوەکی سامناک پارچەی لەشی ڕێبوارێک کە بەوێدا تێپەڕی وەک خاشاک بەو نێوەدا داباری.

ئیدی ترومبێلی پۆلیس و ئەمبیولانس بە پەلەپروزێ خۆیان گەیاندە ئەوێ و کارمەندانی تەندروستیش لەنێو پارچە ترومبێلە تێکشکاوەکەدا تەرمی شوفێر، تەرمی دوو پاسەوانەکە و هی عەلی حەسەن سەلامەیان دەرهێنا.

لە دیمەشقیش، تەتەرێک بروسکەیەکی بەپەلەی گەیاندە یاسر عەرەفات، کە لەوێ لە هوتێلی مێریدیاندا سەرۆکایەتی کۆبوونەوەیەکی دەکرد. بە تاساوییەوە عەرەفات چاوی بە برووسکەکەدا خشاند و یەکسەر لە پرمەی گریانی دا.

هەر هەمان شەو، بەلەمێکی چووپ کە لە بەلەمێکی موشەکهەڵگری ئیسرائیلیەوە دەرچووبوو، لە کەناراوی جونەیح لەنگەری گرت. ڕۆنالد و ئێریکا چەمبەرس و خۆیان فرێدایە نێوی، لەوێوە بەرەو بەلەمە داکانەکە ڕۆیشتن. یەک دوو سەعات دواتر گەیشتنەوە ئیسرائیل. پۆلیسی لوبنانیش

ترومبێله بەکرێگیراوەکانی ئەوانیان بەڕاگیراوی لەسەر کەناراوەکە دۆزینەوە، کە سویچیان هەر لەسەر بوو.

ئێریکا ماری چامبەرس ناوی ڕاستەقینەی ئاژانێکی مۆساد بوو، ژنە جوییێکی بەریتانی، بەر لەوەی کۆچبکاتە ئیسرائیل لە ئینگلستان و ئوسترالیادا دەژیا، ئیدی لەماوەی خوێندنی لە زانکۆی عیبریدا هێندرایە ڕیزی مۆسادەوە. ئەو گەڕایەوە ئیسرائیل و دواتر کەس گوێی لە ناوی نەبووەوە.

✡ ✡ ✡

ئەمەش کۆتایی داخوازییەکە بوو، کۆتایی ئۆپەراسیۆنی تۆڵەی خوداش بوو.

ئەیلوولی ڕەش لەنێوبرا.

چەندین ساڵ دوای ئەوە، هەندێ لە وردەکاری ئۆپەراسیۆنەکە کەوتە بەرتیشک. ژەنەڕال «ئاهارۆن یاریڤ» لە چاوپێکەوتنێکی تەلەفزیۆنیدا پێی لەوەنا کە ئەو ئامۆژگاری گۆڵدا مایەری سەروەزیری کردبوو: "تا بکرێ ژمارەیەکی زۆر لە سەرانی ڕێکخراوی ئەیلوولی ڕەش بکوژێ." ئەو دانی بەوەشدا نا، بەو ڕاستییە سەرسام بوو کە "ئۆپەراسیۆنێکی سەربازی لەلایەن هێزەکانمان لە بەیروت و یەک دوو کوشتن لە ئەورووپا بەس بوو بۆ ئەوەی سەرکردەکانی فەتح، تیرۆرزمی هەندەرانیان بوەستێنن. بەڵگەکانیش سەلماندیان کە ئێمە ڕاستین لەبەکارهێنانی ئەو شێوازە لە کاتێکی دیاریکراودا."

بەڵام ئەو گۆبەندە ڕەشە دوابەشی سەرسوڕهێنەر و بەڵێندەری لەگەڵ خۆی هێنا. لە ١٩٩٦دا، ڕۆژنامەنووسی ئیسرائیلی «دانییێل بن سیمۆب» بانگهێشتی برادەرێکی بوو بە بۆنەی ئاهەنگێکی خۆش لە ئۆرشەلیم. ئەو لەوێ گەنجێکی فەلەستینی دڵخۆشی بینی، کە جلێکی ڕێکوپێکی لەبەردابوو، بە ئینگلیزییێکی ڕەوانیش قسەی دەکرد. ئەو خۆی وا ناساند کە «عەلی حەسەن سەلامە»یە.

«بن سیمۆن» گوتی: "ئەوە ناوی ئەو پیاوەیە کە عەقڵی داڕێژەری نەخشەی کوشتارگەی وەرزشوانانی ئیسرائیلی بوو لە میونخ."

"بەڵێ، ئەو باوکم بوو،" گەنجەکە وا هاتە وەڵام؛ "ئەو بە دەستی مۆساد کوژرا." ئەو بە «بن سیمۆن»ی ئەوقماوی گوت، بۆ چەندین ساڵ لەگەڵ دایکی لە ئەورووپا دەژیا، لە کۆتاییدا وەک میوانێکی یاسر عەرەفات هاتە ئۆرشەلیم. ئەوەشی بۆ زیاد کرد: "من هەرگیز بڕوام نەدەکرد، کە ڕۆژێک بێ کە لەگەڵ گەنجێکی ئیسرائیلی لە ئاهەنگێک لە ئۆرشەلیمدا سەما بکەم." ئەو وەسفی گەشتەکەی بەنێو ئیسرائیلدا کرد، کە بەگەرمی پێشوازی لێکراوە و ئەوەشی دەربڕی کە ئارەزوویەتی یارمەتی ئاشتبوونەوەی ئیسرائیلی و فەلەستینییەکان بدا.

"من سەد لە سەد پیاوی ئاشتییم،" سەلامەی گەنج وا قسەی کرد؛ "باوکم لە ڕۆژگاری شەڕدا ژیا و بە گیانی خۆیشی نرخەکەی دا. هەنووکە سەردەمێکی نوێ هاتووە. هیوادارم ئاشتی نێوان ئیسرائیل و فەلەستینییەکان ببێتە گرنگترین ڕووداو لە ژیانی هەر دوو گەلەکەدا."

## بەندی سێزدە: پاکیزە سوورییەکان

لە شەوێکی گێژەڵووکەی نۆڤێمبەری ١٩٧١دا، بەلەمێکی مووشەکهاوێژی ئیسرائیلی لەبەر ئاستەنگی شەپۆلەکانی دەریای سپی ناوەڕاستدا، هەر بەم لا و بەو لادا دەهات؛ ئەوەش لەو کاتەدا بوو، دەیەویست بەرەو کەناراوەکانی سووریا تەکان بدا. لە ئێوارەوە بەلەمەکە، کەشتیگەلی خۆی لە بنکەی حەیفاوە جێهێشتبوو، بە دەم کەناراوەکانی لوبناندا ڕۆیشتبوو، گەیشتبووە هەرێمە ئاوییەکەی سووریا. بەلەمە ڕەشە تاریکەکە لە بەندەرە چراخانەکەی «لاتاکیا»دا تێپەڕی، لەسەر ئاراستەی خۆی بەرەو لای ژوور بەردەوام بوو. لەکۆتایدا لە کەناراوێکی کراوەی چۆڵ و لە نزیک سنووری تورکیاوە لەنگەری گرت. کۆماندۆی دەریای فلۆتیلای ١٣ لەسەر پشتی بەلەمەکە دەرکەوتن و یەک دوو بەلەمی چووپیان فڕێدانە نێو ئاوەکە.

لەو کاتەی ئامادەی دەرچوون بوون، دەرگەی داخراوی کابینەکە کرایەوە، سێ پیاو بە جلی مەدەنییەوە لێیهاتنەدەر. ڕووخساریان بە جەمەدانییێک داپۆشرابوو، لەنێو جانتا دژەئاوییەکانیان هەڵیانگرتبوون، نێرەری ڕادیۆ، پاسپۆرتی ساختەکراو، کەلوپەلی کەسیی و دەمانچەی سوارکراویان پێبوو. بێئەوەی هیچ وشەیەکیش گۆ بکەن، خۆیان فڕێدایە نێو بەلەمە چووپەکە و بەرەو کەنار لێیانخوڕی. کۆماندۆکان باسی ناسنامەکانیان نەکرد، یان باسی ئەو هۆیەشیان لێنەکردن کە بۆچی گەیشتونەتە سووریا. کاتێکیش لە کەنارەکە نزیکبوونەوە، بەر لەوەی ڕۆژ دابێ، هەرسێ مەدەنییەکە خۆیان فڕێدایە نێو ئاوە تەزیوەکە و بە بەلەمەکە بەرەو کەنارەکە ڕۆیشتن. ئەوان هێشتا نەگەیشتبوونە لێوارەکە، لەسەر بەردێک خۆیان گرمۆڵە کرد تا لەسەر لمەکە بینیان کەسێک چاوەڕێیان دەکا، ئینجا

ئەو کەمە مەترەش مەلەیان کرد و خۆیان گەیاندە پیاوەکەی سەر لم. کابرای ڕاوەستاوی ئەوێ «جۆناتان»ی سەردەستەیان بوو، کۆدەکەشی «پرۆسپەر» بوو. ئەو جلی وشکی بۆ برادەرە لەسەرما لەرزیوەکان لەگەڵ خۆی هێنابوو و هەر لەوێ خۆیان گۆڕی. ئینجا بردنیە لای ترومبێلێک، لەوێ لە شوێنێک حەشاری دابوو. کابرایەکی نامۆش کە پێدەچوو مۆسادیکی خۆجێی ئەوێ بێ، لەپشتی سوکانەکە بوو، ئیدی سلفی لە ترومبێلەکە دا و بەرەو شارێی سوریا لێیخوڕی. یەک دوو سەعات دواتر گەیشتنە دیمەشق.

لە دیمەشقیش لایان دایە هوتێلێک. دوای خەوێکی دوورودرێژ، هەڵسان و بەیەکەوە چوونە نێو پایتەخت تا شارەزای شارەکە ببن. ئەوان هەر هەموویان کۆماندۆی پێشوی گەمی جەنگی فلۆتیلای ١٣بوون، هەنووکەش ئاژانی مۆساد، لە ڕێگەی ئەوەشدا بوون نائاسایترین ئەرکیان لە ژیاندا ڕایی بکەن. «داڤید مۆلاد»یشیان لەنێودا بوو.

هەر یەک دوو هەفتە پێشتر لە بنکەی سەرەکی مۆساددا نەخشەی ئۆپەراسیۆنەکەیان داڕێژرابوو. «زڤی زامیر»ی ڕامساد؛ «مایک هاراری» بەرپرسی «کاساری» و یەک دوو بەرپرسی هۆبەکانی دیکە، چوار کەسی گەنجیان بینین کە تەمەنیان لەنێوان بیست و سێ و بیست و حەوتساڵیدا بوون. هەر چوار کەسەکەش برادەری نزیکی یەکدی بوون، لە چەندین ئۆپەراسیۆندا بەشدارییان کردبوو، لێهاتووی کۆماندۆی دەریاوانی لەگەڵ مەشقی مۆساددا تێکەڵ بەیەک کردبوو. هەر هەمووشیان لە باکووری ئەفریقیا لەدایک ببوون، فەرەنسی و عەرەبییکی بێ گرێوگۆڵیان دەزانی. ئەوان هەروەک مافیای سیسیلیا بە خۆیانیان دەگوت «کۆسا نۆسترا». زامیریش پوختەی شتەکەی بۆ باسکردن.

دوو ساڵ پێشتر، پەیامێک لە سووریاوە هات. پەیامەکە لە سەرکردەکانی ئەو کۆمەڵگا جووە خۆجێییەی ئەوێوە هاتبوو، کە تا دەهات کەم دەبوونەوە. ڕژێمی ئاوتۆکراسی سەرۆک «حافز ئەلئەسەد» کە لە ١٩٧٠وە دەسەڵاتی گرتبووە دەست، جووە خۆوەڵاتیەکانی ڕاودەنا و دەیچەوساندەوە. زۆریان خۆیان گەیاندە هەندەران، ئەوەی مابووەوە لەنێو کۆمەڵگەیەکی بچکۆلەی کۆندا مایەوە. گەنجەکان و پیاوە تواناداراەکان توانیان لە سووریا ڕابکەن، کیژەکانیان لەدوای خۆیان جێدەهێڵا، کە هیچ هیوایەکیان لە دۆزینەوەی هاوسەردا بۆ نەمابووەوە. باشترین دەرەتانیشیان هەڵاتن بوو بۆ ئیسرائیل.

وەک زامیر بە دەستەی «کۆسا نۆسترا»ی گوت، هەندێ لە کچەکان هەوڵیاندا لە ڕێگەی لوبنان و بەهۆی بەرتیلدان بە قاچاخچیان، لەوێ هەڵبێن. هەندێکیان گیران، لێیان درا، ئەشکەنجەدران تەنانەت بەر گوللەش دران. کەمێکیشیان توانیان خۆیان بگەیەننە بەیروت. هەمووشیان ناوونیشانی ماڵی پارێزراویان لە پایتەختەکەی لوبناندا هەیە. مۆسادە خۆجێییەکانی ئەوێ چاویان لێدەبن، تا دەرفەتیان دەبێ و دەیانگەیەننە ئیسرائیل.

شەوێکیان لە زستانی ١٩٧٠دا، بەلەمێکی موشەکهاوێژی ئیسرائیلی لە بەندەری «جونەیح»ی باکوری بەیروت نزیک دەبێتەوە، ئاخر ماسیگرێکی خۆجێی دوازدە کچی جووی هەڵاتووی سووریایی هێنابوون.

کاپتنی بەلەمە ئیسرائیلیەکە گورگێکی دێرینەی دەریابوو، سەر بە هێزی غەواسەش بوو بەناوی کۆلۆنێل ئاڤراهام (زابو) بن زییڤ. بەر لە ئۆپەراسیۆنەکە، خۆی و پیاوەکانی مەشقێکی چڕوپڕیان لەسەر دابەزین لەسەر هەر بنکەیەکی دەریایی کردبوو. مەشقەکەیان نایابانە بوو، گواستنەوەی کیژەکانیش بە ئاسانی و کارایی بەڕێوە چوو. «زابو» بە

پیاوەکانی پەتۆی بۆ کچە تۆقیو و هەڵلەرزیوەکان هەڵدا و سەندەویچ و قاوەی پێدان ئینجا بەرەو حەیفا لێیخوڕی. ئەو لە سەعات چواری بەیانییەوە گەیشتەوە جێ، کەچی بۆ مایەی سەرسامی ئەو، لەسەر شۆستەی لەنگەرگایەکە بیچمی شیرین و ناسراوی گۆڵدا مایەری سەروەزیری بینی، کە لەگەڵ سوپاسالاری هێزی بەرگری ئیسرائیل ژەنەڕال حایم بارلیف و جێگرەکەی ژەنەڕال دادۆ ئێلیازەر لە چاوەڕوانیدا بوون. گۆڵدا مایەر ئاهەنگێکی خنجیلانەی بۆ کچە سووریەکان ڕێکخست و کەوتبووە بن باندۆری چیرۆکەکانیان. لە ماوەی ساڵی دواتریش، «بن زییڤ» و جێگرەوەکەی «ئامنۆن گرون» یەک دوو ئۆپەراسیۆنی دیکەی هاوچەشنیان ئەنجام دابوون و کیژە جوولەکەی زیاتریان لە لوبنانەوە گەیاندبوونە ئیسرائیل. بەڵام بڕینی سنوری سووریا- لوبنان کارێکی زۆر مەترسیدار بوو، قاچاخچی و ماسیگرە عەرەبەکانیش جێگەی بەقایێ نەبوون[209]. ئەوسا گۆڵدا مایەر بڕیاریدا، دەبێ هەموو کیژە بەجێماوەکانی سووریا بهێندرێنەوە ئیسرائیل.

✡ ✡ ✡

لە کۆبونەوەکەی زامیر لەگەڵ «کۆسا نۆسترا»دا، ڕووی قسەی کردە هەر چوارییان و پێیگوتن: "ئێوە دەبێ ئەو کیژانە ڕزگار بکەن. ئەوەش ئەرکەکەتانە."

لە ژووری کۆنفرانسەکاندا دەمەتەقێیەکی گەرم بەرپابوو. ئاخر یەکێ لە پیاوەکان پرسی، باشە تۆ بڵێی ئەمە کاری مۆساد بێ؟ ئەم کارە دەبێ بخرێتە ئەستۆی ئاژانسی جووەکان. یەکێکی دیکەش بە تووڕەییەوە

---

[209] جێگەی بەقا نەبوون: جێگەی بڕوا نەبوون.

ئەوەی بۆ زیادکرد، خۆ مۆساد ئاژانسێک نییە لە جۆری پلکە پێناویٚ[210]، ئاخر نابیٚ ژیانی ئەفسەرەکانی خۆی بخانە مەترسی لە دڕندەترین و دلّڕەقترین ولاّتی عەرەبیدا، ئەمەش هەر لەپێناوی ئەوەی لەوە دلّنیا ببنەوە، چەند کیژە پاکیزەیەکی جوو، بێمراد نەبن و زاوایان بۆ بدۆزرێتەوە.

ڕامسادەکە خۆی تێک نەدا. ئەو هەر لەسەر ئەوە بوو، ڕزگارکردنی کۆمەڵگە جووەکان لە ولاّتە دوژمنەکاندا، هەر لەسەرەتاوە ئەرکی مۆساد بووە.

ئۆپەراسیۆنەکەش کۆدەناوی «سمیچا»ی لێندرا کە بە زمانی عیبری واتای لێفە دەدا.

✡ ✡ ✡

ڕۆژێک دوای ئەوەی دەستەی «کۆسا نۆسترا» لەسەر خاکی سوریا دابەزین، بڕوابەخۆبوونیان سەلمێندرا. ئەوان بەنێو شەقامەکانی دیمەشقدا دەڕۆیشتن و بە زمانی فەرەنسی دەدوان. دەوروبەری خۆیان دەپشکنی و دڵنیابوونەوە لەوەی لەلایەن موخابەرات، دەزگە هەواڵگرییە ترسناکەکەی سووریاوە سووسە ناکرێن. پاشان بۆ ئێوارەی هەمان ڕۆژ بەنێو بازاڕە ڕازاوەکەی دیمەشقدا پیاسەیان کرد و لەویٚ خۆیان بە دووکانی زێڕنگەرییێکدا کرد. «پرۆسپەر» و «کلاودی (ئیمانۆئێل ئاللۆن)» زێڕەکەیان هەڵگێڕ و وەرگێر دەکرد، بە فەرەنسی قسەیان دەکرد، لەو

---

[210] مەبەست ئەو ئاژانسانەن کە کوڕ و کچ بەمەبەستی هاوسەرایەتی دەگەیەننە یەک. لە حەیرانی کوردەواریدا زۆر باسی پلکەپێناو دەکریٚ، کە هەمان کاردەکا، منیش لێرە پێناو، یان پلکە پێناوم پڕ بە پێست زانی.

کاتەدا دوکاندارەکە بەرەو ڕوویان هات و بە چرپەیەکەوە پێیگوتن: "ئێوە خزمانی «بانی ئامینون» (بە عیبری واتە خەڵکی خۆمانن)، وایە؟"

ئاژانەکانیش تاسان. ئاخر ئەگەر وا ئاسان بناسرێنەوە، ئەوا لە مەترسییێکی دژواردان. ئیدی خۆیان لە سەرنجەکەی دووکاندارەکە نەبان کرد[211] و خێرا چوونەدەر و لەنێو حەشاماتی خەڵکیدا ون بوون.

هەواڵی دەرفەتی هەڵاتن لە سوریا و گەیشتنە ئیسرائیل لەنێو کچەکانی کۆمەڵگەی جوودا بڵاوبووەوە. «سارا غەفانی» یەکێ لە کچەکان دواتر بەم جۆرە دوا: "ڕەوشەکەمان لە سووریا زۆر خراپ بوو. ئێمە لەبن فشاردا بووین تا شوو بکەین، بەڵام بەکێ؟ ئاخر خۆ کەس نەمابووەوە. ئێمە زۆر چیرۆک و بەندوباومان دەبیست، بیرۆکەکەش مێشکی ئێمەی داگرتبوو: دەی بگەرە ئیسرائیل، دە برۆ وڵاتی جووەکان."

پەیامێک بە نهێنی گەیشتە «پرۆسپەر»: بەیانی بۆ ئێوارە درەنگ، کچەکان لە کۆڵانە تەنگەکە کە زۆر لە هوتێلەکەتان دوور نیە، چاوەڕوانتانن.

کە وادەکە هات، هەر بەڕاستیش وابوو، کۆسا نۆسترا ترومبێلێکی بارهەڵگری بچووکیان لەسەر جادە تاریکەکەدا دۆزیەوە، پشتی پیکابەکە هەنوانێکی بە چادر بۆ دروستکرابوو. ئاژانەکانیش پێشتر لە هوتێلەکانیان دەرچووبوون و هەگبەکانی خۆشیان هێنابوو. دوو لە «کۆسا نۆسترا»کان لە پێشەوەی ترومبێلەکە دانیشتن، دووەکانی دیکەش لە پشتەوە؛ لەژێر بنمیچە چادرەکەشدا حەفت کچ هەبوون، تەمەنیان لەنێوان پازدە تا بیستساڵی دابوو لەگەڵ کوڕێکی مێردمنداڵ. کۆسا نۆستراش هەوری[212] سوورییان لەسەر بوو، سەری خۆیان داپۆشیبوو هەر بە تەنیا

[211] خۆ نەبانکردن: خۆ لەگێلیدان، پشتگوێخستن، گرنگی پێنەدان، خۆنەناسکردن.

[212] هەوری: لێرە مەبەست سەرپۆش، چارۆکەکەبەسەر سەر دادەدرێ.

کونی چاویان دیاربوو. ئەوان دەیانزانی کە لەسەر شارێیەکانی سووریادا، زۆر جاران پۆلیس و سوپا بەربەست و بازگە دادەنێن. بڕیاریاندا ئەگەر هاتوو لەلایەن پۆلیسەوە ڕاگیران، پێیان بڵێن کەوا بە ترومبێلەکەیان کچەکان دەگەیەننە گەشتێکی مەیدانی قوتابخانەی باڵا بۆ ناو کێڵگەکان.

دەستی یارمەتییە خۆجێیەکە، کە ترومبێلەکەی بۆ دابینکردبوون، وەک لێخوڕ لەگەڵیاندا بوو. ئەو جووتە کچێکی دیکەشی لە شوێنێک کە پێشتر ئامادەکاری بۆ کرابوو، هەڵگرت و ئینجا بەرەو باکوور بەرەو «تەڕتووس» لێیخوڕی. ئەوان گەیشتنە کەناراوە چۆڵەکە؛ گەنجە جووەکان و ئاژانەکان خۆیان لەنێو کۆڵێتێکدا حەشاردا. لە دووری کەنارەکەش بەلەمێکی مووشەکهاوێژی هێزی بەرگری ئیسرائیلی چاوەڕێی دەکرد. «پرۆسپەر» بە لایتی دەستی ئاماژەیەکی بۆ بەلەمەکە کرد و بە ڕادیۆش بانگی کردن. بەلەمی چووپ کە لە لایەن کۆماندۆکانی فۆلتیلاوە لێدەخوڕا، ڕێگەی خۆی بەرەو کەنارەکە تەی کرد.

ئەمما لە هیکەوە، لە نزیک «پۆسپەر» و برادەرەکانی دەنگی تەقە هات. ئەوانیش خۆیان پەنا دا، بەڵام هەرزوو دەرکەوت کە نیشانەی تەقەکان لەوان نەگیرابوو. باشە تۆ بڵێی کێ بێ تەقە بکا؟ تۆ بڵێی سوورییەکان هەستیان بە بەلەمە چووپەکە کردبێ؟ «گادی کرۆل» سەردەستەی کۆماندۆی دەریایی برووسکەی بۆ ئیسرائیل لێدا: "لەسەر کەنارەکە ئاژاوە هەیە." بەڵام خۆ ئەو دەستەوەستان نەوەستا. ئەویش بە ڕادیۆ بانگی بەلەمە چووپەکانی کرد کە بەرەو باکوور لێبخوڕن، بۆ ئەوەی لە کەنارێکی دیکەدا کە پێشتر وەک جێگرەوە دەستنیشان کرابوو. «پرۆسپەر» و پیاوەکانی کیژەکانیان گەڕاندنەوە نێو ترومبێلەکە و بەرەو باکوور لێیانخوڕی، جارێکی دیکە پەیوەندیان بە بەلەمەکەی دەریاوانی کردەوە. ئەم جارەیان کەنارەکە ئارام بوو. کیژەکان و پیاوەکانی کۆسا

نۆسترا دیتیان دەسماڵیان لە دەموچاوی خۆیان دا، ڕوخساری خۆیان دەمامک دا و چوونە نێو ئاوەکە تا سەرچۆکانیان هات، لەوێشەوە خۆیان فڕێدایە نێو بەلەمە چوپەکان و بەرەو دەریای کراوە بردیان؛ دوای گەشتێکی دوورودرێژ و بە تاسە لەو ئاوە بەگێژەنەدا، لەکۆتاییدا گەیشتنە سەر بەلەمە موشەکهاوێژەکە و ئینجا گەیشتنەوە سەر خاکی ئیسرائیل. ئاژانەکان لەنێو بەلەمەکەدا چوونە کابینەیەک و کیژەکانیش کابینەکەی دیکە و فەرمانیشیان پێکرا هەرگیز قسەیەکی وا نەدرکێنن کەوا ئەوان لە سووریاوە هەڵاتوون. ئاخر ئەوان کەسوکاریان لە دیمەشق بەجێهێشتبوو، خۆ ئەگەر هەڵاتنەکەیان بۆ ئیسرائیل بزانرێ، لەوانەیە دایک و باوکیان بە گیانی خۆیان نرخەکەی بدەن.

دەستی یارمەتییە خۆجێیەکەش ترومبێلەکەی گەیاندەوە دیمەشق، بۆ ئەوەی خۆی بۆ ئۆپەراسیۆنێکی دیکە ئامادە بکا.

بەلەمە مووشەکهاوێژەکەش بەبێ هیچ ڕووداوێک گەیشتەوە حەیفا. بەڵام بەرلەوەی کوڕەکان بۆ ئەرکی داهاتوویان بەرێ بکا، مۆساد هەوڵیدا بزانێ ئاخۆ شەوی پێشتر کێ بوو لەسەر کەنارەکە تەقەی کرد. هۆبەی هەواڵگری بەسەر ڕاپۆرتەکاندا چووەوە، شانە نووستووەکانی لە سووریا بە ئاگا هێنان، پەیوەندی بەسەرچاوەی سوپاوە کرد، بەڵام بێهودە بوو. مەزندەکان وا کەوتنەوە کە ڕووداوەکە نەخشەیەکی بۆسەدانانەوەیەکی خراپ بووبێ لەلایەن سەربازە سوورییەکان لە جوڵەیەکی گومانلێکراویان لەنێو ئاوەکەدا بەدی کردبێ.

✡ ✡ ✡

بۆ جاری دیکە، «کۆسا نۆسترا» لە ڕێی ئاسمانەوە گەیشتنەوە دیمەشق. ئەوان لەپاریسەوە هاتن، بۆ دەمامکیش خۆیان کردبووە خوێندکاری

ئارکیۆلۆژی، هاتبوون شوێنەوارە کۆنەکانی سووریا ببینن. ئەوان کاغەز و بەڵگەنامەی ساختەیان پێبوو، بەرکیشیان پڕی بلیتی میترۆ (قیتاری ژێرزەمینی پاریسی)، پارەوپوول، ڕەچەتەی قاوەخانە و چێشتخانەکان و هەندێ شتی دیکە کە ناسنامە خوازراوەیەکەیان نیشان دەدا. بەڵگەنامەکانیشان بێ کێشەبوو، کەچی هێشتاش هەر پەشۆکاو و گرژ دیاربوون؛ ئاخر کێ نالێ موخابەرات پەردەیان لەسەر هەڵنەداتەوە؟ ئەوان لە فڕۆکەخانەدا بەبێ گرفت بەنێو پۆلیسی کۆچبەراندا ڕۆیشتن، کەچی هەر ئارامیان نەدەگرت. ئەوان لە ئاپۆراکەش تێپەڕین و گەیشتنەهۆڵی فڕۆکەخانە و بە لای دەستەچەپدا بایاندایەوە کە چەندین تاکسی لێڕاوەستابوو. «کۆسا نۆسترا» لە چەندین هوتێلی جیاجیادا دابەزین. کلاودی لە هیلتۆن دیمەشق ناوی خۆی تۆمار کرد.

ئەم جارەیان، یەکەمین شەو کە لە دیمەشق بەسەریان برد، گرژ و وروژێنەر بوو. ئاخر دەیانزانی، ئەگەر بگیرێن، ئەوا بەختیان مۆری لێدەدرێ: ئازار و ئەشکەنجە و مەرگێکی سامناک چاوەڕێیان دەکا. ئەوان داوایان لە دەستی یارمەتییە خۆجێییەکەکرد، بیانباتە ئەو گۆڕەپانەی کە یەک دوو ساڵ پێشتر سیخوڕە مەزنەکەی ئیسرائیل «ئێلی کۆهن»یان لەسێدارە دا. لەو شوێنە ڕاوەستان کە تەرمی کۆهن بە قەنارەوە کرابوو، لەکاتێکدا ئاپۆرای خەڵکەکە دروشمیان دەکێشا و مشتەکۆڵەیان بەرزکردبووەوە، ئەمەش بۆ ئەوان شتێکی زۆربوو. «کلاودی»، هاوڕێکانی خۆی بەجێهێشت و گەڕایەوە هوتێلەکەی؛ ئەو بە باشی ئەزموونەکە هەژاندبووی.

تارماییە شوومەکەی وێنەی ساڵی گۆرینێی گۆڕەپانەکە ڕاوی نابوو، چووە سەر پێخەفەکەی بەڵام خەوی لێنەکەوت. لەهیکەوە و لە نیوەی شەودا، گوێی لە دەنگەدەنگێک بوو لەپشت دەرگە، ئیدی دەمودەست زانی

چ باسە: کلیلەکە لە کونی کیلۆنی دەرگەکەوە بادرا. وەک بیری بۆ چووبوو، کار تەواوبوو. من دەبێ کەسی داهاتووی هەڵواسراوی سەر پەتی سێدارەی گۆڕەپانەکە بم. ئەو خێرا غاریدایە لای دەرگە و لە کونی کلیلی دەرگەکەوە سەیری دەرێی کرد. بینی پیرەژنە گەشتیارێکی ئەمریکی بوو بێهودە هەوڵی دەدا دەرگەکە بکاتەوە. دوای چەندین هەوڵی نەزۆک، لەوێ ڕۆیی. تومەز پیرەژنەکە زووتر لە ئەسانسێرەکە دابەزیوە و نهۆمەکەی هەڵە کردووە. «کلاودی» هەستی کرد جارێکی دیکە لە دایک بۆتەوە.

لەکاتێکدا چاوەڕێبوو، گرووپی دادێی کیژەکان ئامادەبن، ئەوان بەنێو شەقامەکانی دیمەشقدا پیاسەیان کرد و چوونە قاوەخانە و چێشتخانەکان. گارسۆنەکان پێیان سەیربوو لە گەڕەکی فەڕەنساویدا و لەکاتی ژەم هێناندا هەر پێدەکەنین. تومەز ئەمە هەڵەی کلاودی بوو: چەند جارێک لەسەر یەک برادەرەکانی خۆی گرژ کردن، زۆریش گرژ و تووڕە بەوەی ڕەوانبێژانە بە فەرەنسی دەدوا، هەندێ وشە و نوکتەشی بە زمانێکی عیبری بازاڕی دەگوت.

ئۆپەراسیۆنەکە زۆر بەڕێکوپێکی بەڕێوەچوو، تا ئەو ڕۆژەی «پرۆسپەر» و برادەرەکانی بینیان کەوا قەڵەباڵغییێکی زۆری هێزی چەکدار لەسەر کەنارەکە هەیە. ئەوان نەوێران سەرچڵی لەسەر کەنارەکە بکەن چونکە چاودێرییێکی زۆری بەسەرەوە هەبوو، ئینجا «پرۆسپەر» بڕیاری دا شوێنەکە بگۆڕێ.

"برۆ بۆ بەیروت!" وای بە یارمەتیدەرەکەی گوت و بەرەو پایتەختی لوبنان لێیانخوڕی، کە سەد کیلۆمەتر دوور بوو. دوای ئەوەی لە سنوور پەڕینەوە و گەیشتنە لوبنان، پرۆسپەر بەرەو ئاراستەی «جونەیح»، بەندەرەکەی باکووری بەیروت ڕۆیشت کە زۆرینەی دانیشتوانەکانی لە

کریستیانەکانن. بێ ئەوەی کات بە فیڕۆ بدا، بەلەمێکی بەکرێگرت، یەختێکی مام ناوەندی، بۆ ماخۆیەکەشی ڕوونکردەوە، کە بەنیازە نزیکەی پازدە میوان گەشتێکی خۆشی دەریایی وەک گەشتێکی لەپڕ و سەرسامهێنیان پێبکا، چونکە یەکێک لە برادەرەکانی ساڵڕۆژی لەدایکبوونیەتی. کاتێ کە بەلەمەکە ڕێککخرا و ئامادەبوو، بە کۆدەکەی بروسکەی بۆ بەرپرسەکانی لە پاریس لێدا کەوا نەخشەکەیان گۆڕاوە. زۆری نەبرد بە هەمان ڕێگەوە زانیارییەکەی وەرگرتەوە.

ئەو شەوە تڕومبێلە بارهەڵگرە بچوکەکە لە دیمەشقەوەڕا هات، هەروەک جاران ژنە گەنجە جووەکانی هەڵگرتبوو. «کلاودی» تڕومبێلەکەی لێدەخوڕی. تڕومبێلەکە یەک دوو کیلۆمەتر لە سنووری لوبنانەوە وەستا، بارە مرۆییەکەی داگرت. کچەکان بە جانتای قورسیانەوە کە ئاژانەکانی مۆساد یاوەریان دەکردن بەو تاریکییە بۆ چەندین سەعات بە پێ ڕۆیشتن، بەسەر بەرداندا هەڵنگوتن تا لەسنوری بازگەکە دەرباز بوون. دوای ڕێڕۆیشتنە کەنەفتەکە، ئەوان گەیشتنە سەر ڕێگەی ئەودیوی سنوورەکە و لەگەڵ کلاودی یەکیان گرتەوە، ئینجا سواربوون و بەرەو بەندەری جونەیح لێیخوڕی. لەوێشەوە یەک لەدوای یەک سواری یەختەکە بوون، لەکۆتاییدا یەختەکە بۆ ساڵیادی لەدایکبوونەکە کەوتەگەڕ و چووە نێو دەریای کراوە، لەوێشەوە گواستیانەوە سەر پشتی بەلەمێکی هێزی دەریاوانی ئیسرائیلی.

کۆسا نۆسترا ڕۆژی پاشتریان لە بەیروت بردەسەر، پیاسە و بازاڕیان کرد. بۆ شەوەکەش بە هەمان ڕێگەی خۆیان گەڕانەوە دیمەشق؛ یەک دوو کیلۆمەتر بەرلەوەی بگەنەسەر سنوور، سێ لە ئاژانەکان دابەزین و لەنێو کێڵگە تاریکەکاندا بە دەوری بازگەکەدا سوڕانەوە. کلاودی بە شێوەیەکی

قانونی لەگەڵ ترومبێلەکەی و بەهەڵگرتنی برادەرەکانی لەسەر ڕێگە، گەڕایەوە دیمەشق.

بۆ ڕۆژی پاشتر، ئەوان بەرەو پاریس، لەوێشەوە بۆ تەلئەبیب فڕین.

ئۆپەراسیۆنەکە لە ئەپریلی ١٩٧٣دا کۆتایی هات. ئەمەش دوای ئەوەی گۆلدا مایەر هاتە بنکەی دەریاوانی حەیفا تا بە خۆی سوپاسی پرۆسپەر، کلاودی و برادەرەکانی دیکەی بکا لەسەر ئەوەی کە کردیان. لەنێوان ئەیلوولی ١٩٧٠ و ١٩٧٣دا، مۆساد و هێزی دەریاوانی نزیکەی بیست ئۆپەراسیۆنیان بۆ هێنانی کچ و کوڕە گەنجە جووەکان لە سووریاوە لە ڕێی کەناراوی تەڕتوس و لوبنانەوە بە ئەنجام گەیاند. سەرجەم ئۆپەراسیۆنەکانیش سەرکەوتوو بوون، هەمووی بەسەر یەکەوە ١٢٠ گەنجییان گەیاندەوە سەر خاکی ئیسرائیل. ئۆپەراسیۆنەکانیش بۆ ماوەی زیاتر لە (٣٠) ساڵ بە نهێنی هێڵدرانەوە.

ئەمەش کۆتایی «کۆسا نۆسترا» بوو. ئینجا ئەندامەکانی زیاتر تێکەڵ بە چالاکی ئاشتییانە وەک بزنس، گەشتیاری و خزمەتی مەدەنی بوون، مەگەر هاتبا جارێکی دیکە مۆساد بۆ ئۆپەراسیۆنێکی دیکەی قورس بانگی بکردبانایەوە.

ڕۆژگار هات و تێپەڕی؛ ئێمانۆئیل ئاللۆن «کلاودی» بانگهێشتی زەماوەندی خزمێکی کرا. خزمەکەیشی بووکەکەی پێناساند، ئەویش دەمودەست ناسییەوە: کچەکە یەکێک لەو پاکیزانە بوو کە بە یارمەتی ئەو گەیەندرابووەوە وڵات. «کلاودی» لە بوکەکەی پرسی: "خەڵکی کوێی؟"

کیژەکەش ڕەنگی بزڕکا. هەستیکرد هێشتا هەر لە بن سوێندی بە نهێنی هێشتنەوەی ڕابردووەکەی دایە. ئینجا «ئاللۆن» بە خەندەوە پێیگوت: "ئەرێ تۆ لە سووریاوە نەهاتی؟ لە ڕێی دەریاوە نەبوو هاتییە ئێرە؟"

ژنەی بەستەزمان خەریکبوو لە هۆش خۆی بچێ، ئینجا لەپڕێکەوە پیلی[213] گرت، باوەشی تێوەرێنا و بە جۆشەوە ماچی کرد. منگەیەکی لێوەهات: "ئەوە تۆ بووی. تۆ منت لەوێ دەرهێنا!"

ئاللۆنیش دواتر گوتی: لەو ساتەدا، کارەکەمان شایستەی هەموو سەرچڵییێک بوو، کە گرتبوومانەبەر."

---

[213] پیل: شان.

## بەندی چاردە: "دەکرێ ئەمڕۆ تووشی شەڕ بین!"

لە ٥ی ئۆکتۆبەری ١٩٧٣دا و لە سەعات یەکی نیوەشەوەدا، ئاژانێکی مۆساد کە نازناوەکەی «دوبی» بوو، تەلەفۆنێکی لە قاهیرەوە بۆ هات. «دوبی» ئەفسەرێکی پلەباڵای دۆزەکان بوو، لە ماڵێکی پارێزراو لە لەندەن دەستبەکار بوو. تەلەفۆنەکە بێئەندازە مایەی هێدمەگرتن بوو. ئاخر لەو دیو هێڵەکە هەم گرنگترین و هەم نهێنیترین ئاژانی مۆساد بوو، چونکە بوونی ئەو تەنیا بۆ چەند کەسانێکی بە ژمارە زۆر کەم زانراو بوو. ئەو بە "فریشتە" (لە هەندێ ڕاپۆرتیشدا بە نازناوی "ڕەشاش" یان "هۆتێل") ناسرابوو. ئیدی فریشتەکە لە سەر هێڵی تەلەفۆنەکەدا تەنیا یەک دوو وشەی گۆکردن، بەڵام ئەو یەک دوو واژانە «دوبی» ڕاچڵەکاند. وشەکەش "کیمیاویی" بوو. ئینجا «دوبی» دەستبەجێ زەنگی بۆ ناوەندی مۆساد لە ئیسرائیل لێدا و وشە کۆدەدارەکەی گەیاند. هەر بەزوویش لەگەڵ گەیشتنی پەیامە کۆدەدارەکە بە گوێی «زڤی زامیر»ی *ڕامساد*، یەکسەر بە بەرپرسی ستافەکەی خۆی «فرێدی ئینی» گوت: "من دەچمە لەندەن."

ئاخر ئەو دەیزانی هیچ کاتی وای نییە بەفیرۆی بدا. وشە کۆدەدارەکە "کیمیاوی" لەنێو خۆیدا پەیامێکی شوومی هەڵگرتبوو: "ڕەچاوی هێرشێکی دەستبەجێ بۆ سەر ئیسرائیل بکەن."

ئیسرائیل هەر لە جەنگی شەش ڕۆژەی ١٩٦٧ەوە چاوەڕێی پەلامارێکی دراوسێ عەرەبەکانی دەکرد، چونکە ڕووبەرێکی زۆر لە خاکەکەیان لەدەستدا بوو. نیمچە دوورگەی سینا و کەرتی غەززە لە میسر، بەرزاییەکانی جۆلان لە سووریا، بەری ڕۆژئاوا و ئۆرشەلیم لە ئوردن.

ئێستاش هێزی بەرگری ئیسرائیلی لە بەرزاییەکانی جۆلان، لە کەناراوی ڕۆژهەڵاتی نۆکەندی سوێس و هەروەها بە درێژایی ڕووباری ئوردن لێیداکوتا[214]. دەوڵەتە عەرەبییەکانیش هەر شمشێریان ڕادەوەشاند، بەڵێنی تۆڵەکردنەوەیان دەدا، بەڵام لە شەڕی داشۆراندا[215] کە دوابەدوای جەنگی شەش ڕۆژە هات، ئیسرائیل دەستێکی باڵای هەبوو. هەموو ئەو هەوڵانەی داوای گۆڕینەوەی خاکی داگیرکراوە نوێیەکەیان بە ئاشتی دەکرد، بە تووڕەییەوە لە لایەن دەوڵەتە عەرەبییەکان ڕەتکرایەوە. لەو نێوەندەشدا سەرۆکە توند و وتار ئاگرینەکەی میسر، جەمال عەبدولناسر مردبوو، «ئەنوەر سادات» جێگەی گرتبووەوە، ئەویش پیاوێک بوو لە کاریزمایی کەم بوو، بەگوێرەی ڕاپۆرتی شارەزا ئیسرائیلییەکان پیاوێکی لاواز بوو، لێبڕاو نەبوو، ناتوانا بوو لەوەی سەرکردایەتی گەلەکەی بۆ جەنگێکی نوێ بکا. دوای مردنی سەروەزیری «لیڤی ئەشکۆل»، سەرکردایەتی ئیسرائیل کەوتە بن دەستی گۆڵدا مایەر، دەوڵەتمەدارێکی ژنی بەهێز و بڕوابەخۆ بوو، کە وەزیرێکی بەرگری ناوداریشی وەک «مۆشێ دایان»ی پاڵپشت بوو. وەک دەبیندرا و هەستیشی پێدەکرا ئاسایشی ئیسرائیل لە دەستێکی باشدا بوو.

یەک دوو هەفتە بەر لە زەنگی تەلەفۆنەکە و لەبن بارێکی تەواو نهێنیدا، شا حوسێنی ئوردن هاتە ئیسرائیل و گۆڵدا مایەری لە نەخشەی پلانێکی پەلاماری میسری و سوورییەکان بۆ سەر ئیسرائیل ئاگادار کردبووەوە. ئاخر حوسێن ببووە هاوپەیمانێکی نهێنی ئیسرائیل و کەوتبووە دانوستانێکی چڕوپڕ لەگەڵ نێردەی گۆڵدا دا. خانمی سەروەزیریش زیاتر

---

[214] لێیداکوتا: تێدا جێگیربوو.

[215] مەبەست حرب الاستنزافە.

به هەڵبژاردنی ئاینده مەیلدار بوو، هەڵمەتی حیزبەکەی گۆڵدا مایەریش لەژێر ئەو دروشمەدا بوو: "هەموو شتێک لە نۆکەندی سوێسدا ئارامە."

کەچی هەر هەژدە سەعات بەر لە «یوم کیپور»، پێدەچوو هیچ شتێک لەسەر نۆکەندی سوێس ئارام نەبێ. «زڤی زامیر»یش هۆشداریی فریشتەکەی زۆر بەهەند هەڵگرت. بەگوێرەی ڕێکاری پێشوەختە، بە دنەدانی وشە کۆدەدارێک، دەبوایە هەر کاتێ ئاماژەیەکی وای بۆ بهاتبا، تا بۆی بلوابا بە زووترین کات بگاتە لەندەن و خودی ئاژانەکە ببینێ.

زامیر لەسەر یەکەمین گەشتەفڕین بەرەو لەندەن، کورسی خۆی گرت. لە ئەپارتمانی نهۆمی شەشەمی باڵەخانەکەی پایتەختی بەریتانیا، کە زۆر لە هوتێلی «درۆشتەر»ەوە دوور نەبوو، مۆسادماڵێکی پارێزراوی لێدانابوو. ئەو ماڵەش تەنیا بۆ یەک مەبەست و داخواز ئامادەکرابوو: کۆبوونەوە لەگەڵ فریشتەکە. هەر کاتێکیش زڤی زامیر گەیشتە ئەوێ، دە ئاژانی مۆساد لە دەوروبەری باڵەخانەکە بۆ چاودێری بڵاوەیان پێکرا، تا سەرۆکەکەیان لە ئەگەری هەر ئاماژەیەک کە لە قاهیرەوەڕا بێ و نەوەک پیلانێکی گرتن یان ئازاردان لەگۆڕێدا بێ، بپارێزن. سەردەستەی یەکەی پاراستنیش «زڤی مالکین»ی جەنگاوەری دێرین بوو، ئەو ئاژانە ئەفسانەیەی لە گرتنی «ئایخمان» لە ئەرجەنتین یارمەتیدەر بوو.

زامیر بە گرژی و وروژاویەوە، هەموو ڕۆژەکە هەر چاوەڕێی فریشتەکەی دەکرد. دیاربوو ئەو ئاژانەی لە ئیتالیاوە دەهات، چونکە لە قاهیرەوەڕا هاتبوو، لە ڕۆما لایدابوو، هێڵەکەشی گۆڕیبوو، ئینجا بە ئێوارە درەنگانێکەوە گەیشتە لەندەن. ئەوسا هەردوو پیاوەکە لە سەعات یازدەی شەوەوە لە ماڵە پارێزراوەکەدا لەگەڵ یەکدی دانیشتن.

لەو نێوەشدا، یوم کیپور، - واتە ڕۆژە پیرۆزەکەی نوێژ و دوعا، هی بەڕۆژوبوون و هی لێخۆشبوون- باڵی بەسەر ئیسرائیلدا کێشابوو. هەموو کاروبارێک ڕاگیرابوو، تەلەفزیۆن و ڕادیۆ لە پەخشی خۆیان وەستابوون، هیچ ترۆمبێلێک لەسەر ڕێگەوبان نەبوون. یەکەیەکی ژمارە کەم لەسەر سنوورەکانی دەوڵەتی ئیسرائیل بوون.

کۆبوونەوەی نێوان زامیر و فریشتەکە دوو سەعاتی خایاند. «دوبی»یش هەموو وشەیەکی یاداشت کرد. نزیکەی سەعات یەکی نیوەی شەو بوو، کۆبوونەوەکە کۆتاییپێهات. ئینجا «دوبی» فریشتەکەی بانگهێشتی ژوورێکی دیکە کرد، لەوێ بڕی ١٠٠،٠٠٠ پارەی خۆجێی دایێ. زامیریش بە خەم و ترسەوە بروسکەیەکی بەپەلەی ناردە ئیسرائیل. بەڵام خۆ ئاژانەکەی مۆساد لە باڵوێزخانەکەدا کەسی نەبینیەوە تا بروسکەکەی پێ بنێرێ. لە دواییدا «زامیر» حەوسەڵەی لەدەستدا زەنگێکی بۆ ماڵی «فرێدی ئێنی» لێدا. تەلەفۆنی ماڵەکە هەڵنەگیرا، کابرای سەر هێڵەکەش پێیگوت: "گەورەم، هیچ وەڵامێک نییە. پێموایە ئەمڕۆ گرنگترین پشووە لە ئیسرائیل."

"زەنگەلە لێدەوە!" زامیر بە گرژییێکەوە وای پێگوتەوە. لەکۆتاییدا تەلەفۆنەکە هەڵگیراو سەرۆکی ستافەکە هەڵیگرت. دەنگەکەی بەنیوە خەواڵوو دەچوو. زامیریش پێیگوت: "دەی جارێ بڕۆ تەشتێک ئاو بەسەر دەموچاوت داکە." کاتێکیش فرێدی بە گوێی زامیری کرد و گەڕایەوە لای تەلەفۆنەکە، زامیر ئەو ڕستەیەی بۆ خوێندەوە تا بینووسێ: "***کۆمپانیاکە لە کۆتایی ئەمڕۆدا گرێبەستەکە واژۆ دەکا.***"

ئینجا زامیر ئەوەشی بۆ زیاد کرد: "هەر ئێستا خۆت بگۆڕە، بڕۆ بنکەی سەرەکی و هەموان بێدار بکەوە."

«فریدی»ش بەگوێرەی ڕێنماییەکانی زامیر هەڵسوڕا. زەنگی بۆ سەرکردە سیاسی و سەربازییەکانی ئیسرائیل لێد. پەیامەکەشی بۆ ئەوان بەم وشانە پوخت دەکرایەوە: "دەکرێ هەر ئەمڕۆ جەنگ هەڵگیرسێ."

✡ ✡ ✡

کەمێک دوای ئەوە، ئەو بروسکەیەی «زامیر» نووسیبووی لەکۆتایدا گەیشتە تەلئەبیب: "بەگوێرەی پلانەکە، میسری و سوورییەکان سەر لە ئەنگۆرە هێرش دەکەن. ئەوان دەزانن کە ئەمڕۆ ڕۆژی پشووە، باوەڕیشیان وایە، کە دەتوانن بەر لە تاریکداهاتن، لە دیوەکەی ئێمە لەسەر نۆکەندی سوێس دابەزن. ئەو (فریشتەکە) لەو باوەڕەدایە، کە سادات ناتوانێ پەلامارەکەی دوابخا چونکە بەڵێنی بە سەرانی عەرەب و دەوڵەتەکان داوە، ئەویش دەیەوێ سۆزەکەی تا دوا خاڵ بباتەسەر. سەرچاوەکان مەزندەی ئەوە دەکەن، سەرباری دوودڵی ساداتیش، دەرفەتی هێرشکردنەکە ٩٩,٩ لە سەدە. ئەوان لەو بڕوایەدان، سەردەکەون، هەر بۆیە دەترسن کە زووتر ئاشکرای بکەن، نەبادا دەستوەردانی دەرەکی بێتە کایە؛ ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی هەندێ لە هاوکارەکانیان لابدەن کە فشارەکان بەهەند هەڵدەگرن. ڕووسەکانیش بەشداری ئەو ئۆپەراسیۆنە ناکەن."

ڕاپۆرتە دراماتیکیەکەی *ڕامساد*ەکە لەلایەن هەمووان بە شتێکی بەنرخ وەرنەگیرا. ژەنەڕاڵ «ئیلی زایرا» ئەو پیاوە کۆک و بڕوابەخۆبووەی بەرپرسی «ئامان»، بڕوای بەوە هاتبوو کە هیچ مەترسییێکی جەنگ لەئارادا نییە، هەرچەندە هەندێ ڕاپۆرتی نیگەرانیش لە سەرچاوە هەواڵگریەکانەوە هاتبوون. ئەو بڕوای وابوو، ئەو هێز کۆکردنەوە جەنجاڵییەی دیوی ئەفریکای نۆکەندەکەی سوێس، هیچ نییە تەنیا بەشێکە لە مانۆرێکی گەورەی سەربازی. هەروەها «زایرا» دانی بەوەدا نا، کە لەو

دەمەتەقێیەی لەگەڵ زامیردا کردی، ئەو "هیچ ڕوونکردنەوەی" بۆ ئەو ڕاپۆرتەی یەکەی ٨٠٨ نەبوو (دواتر ئەو یەکە ناوی گۆڕا و بوو بە یەکەی ٨٢٠٠ کە یەکەیەکی گوێهەڵخەر و چاودێریکاری دامەزراوی هێزی بەرگری ئیسرائیلی بوو) بەوەی ئاخۆ بۆچی خێزانی ڕاوێژکارە سەربازییە ڕووسییەکان بەپەلە سووریا و میسر جێدەهێڵن، بێگومان دوکەڵەکە بێ ئاگر نەبوو.

بەرپرسی ئامان و زۆر لە سەرکردەکانی هێزی بەرگری بە توندی بڕوایان بەو چەمکە تیۆرییە هەبوو، کە میسر لەژێر دوو دۆخدا هێرش دەکاتە سەر ئیسرائیل: یەکەمیان، ئەگەر لە یەکێتی سۆڤیەتەوە فڕۆکە شەڕکەرەکانی بۆ بێ تا ڕووبەڕووی فڕۆکەکانی ئیسرائیل ببێتەوە، هەروەها ڕۆکێتی واشی پێبگا کە بگاتە نێوجەرگەی ئیسرائیل؛ مەرجی دووەمیش ئەوەبوو، دڵنیابێ لەوەی دەوڵەتەکانی دیکەی عەرەبیش بەشداری لە جەنگە خوێناویەکەدا بکەن. خۆ تا ئەو کاتەی ئەو دوو مەرجە نەیەنە دی، بەگوێرەی بۆچوونەکە، ئەوا هیچ دەرفەتێک بۆ هێرشی میسرییەکان لە ئارادا نییە. بەڵێ دەکرێ میسر گەف و هەڕەشە بکا، هەولبدا دۆخەکە بوروژێنێ، مانۆری گەورەو گەورە بکا، بەلام شەڕ هەڵناگیرسێنێ.

بەلام خۆ خودی تیۆرییەکە پێشتریش لە ١٩٦٧دا شکستی هێنا. ئەو ساڵە بەشێکی زۆری سوپای میسر لە یەمەن بوو، لەوێ لە شەڕێکی درێژخایەن دژی شانشینەکەی ئەوێ تێوەگلابوو. ئیسرائیلیش قەناعەتی هاتبوو، کە میسر زات ناکا دەستپێشخەری هیچ شەڕپێفرۆشتنێک یان کردەیەکی دوژمنکاری بکا، تا ئەو کاتەی سوپاکەی لە زۆنگاوەکەی یەمەنیەکاندا چەقیبێ. بەلام ئەوە بوو لە ١٥ی ئایاری ١٩٦٧دا، یەکە دەستەبژێرەکانی سوپای میسری لەپڕ لە سینا پەڕینەوە و گەیشتنە سەر

سنووری ئیسرائیل، لەکاتێکدا سەرۆک ناسر چاودێرە نێودەوڵەتییەکانی دەرکرد و گەرووەکانی دەریای سووری بەڕووی کەشتیەکانی ئیسرائیلدا داخست. خۆی دەبوایە شارەزا ئیسرائیلییەکان، لەوە تێگەیشتبان کە لۆژیکەکەیان شکستی هێناوە، بەڵام دواتر ئەوە بوو، کە شەڕی شەش ڕۆژە سەرکەوت و شکستی لێکدانەوەکەی پێشووتری لەبیر بردەوە.

"چەمکە" تیۆرییەکە لە کۆبوونەوە نائاساییەکەی کابینەی حکوومەت لە سەعاتە بەراییەکانی ڕۆژی ٦ی ئۆکتۆبەری ١٩٧٣دا باڵکێش بوو. نەوەک هەر «زایرا»، بەڵکو چەندین وەزیری کابینەکەش لەو ڕاپۆرتانەی سەبارەت بە ئەگەری پەلامارێکی نزیکی میسری و سوورییەکان بەرزکرابوونەوە، بە گومان بوون. لە ڕابردودا دوو جاران، لە نۆڤێمبەری ١٩٧٢و لە ئایاری ١٩٧٣شدا فریشتەکە گڵۆپی سووری هەڵکردبوو بەوەی گوایە هێرشێکی وا لەپێشە. ڕاستیش بوو لەدوا ساتدا قسەکەی خۆی کێشایەوە، بەڵام لە ئایاری ١٩٧٣دا، ژمارەیەکی زۆر لە سەربازە یەدەگەکان بە خێرایی داواکرانەوە و ئۆپەراسیۆنەکەش بە خەرجییێکی ٣٤،٥ ملیۆن دۆلار لەسەر ئیسرائیل کەوت.

ئیدی لەو بەیانییەی کۆبوونەوەی کابینەی حکوومەتدا، هەمووان سەبارەت بە ڕەوشە وروژاوەکە وریا بوون. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوان هەر بەتەنیا بڕیاری ئەوەیان دا کە بەشێک لە یەدەگی سەربازی داوا بکەنەوە. هەروەها وەزیرەکان بڕیاریان نەدا زەبرێکی پێشوەختە لەو هێزە کۆکراوەی میسرییەکان بە درێژایی نۆکەندەکە بسرەوێنن.

زامیر گەڕایەوە ئیسرائیل و دەستی دایە چەکەکانی: جەنگ لەپێشە! ئەو هۆشداری فریشتەکەی دەگوتەوە کەوا کەمێک بەر لە ڕۆژهەڵهاتن، هێرشی چڕوپڕی میسری و سوورییەکان دەست پێدەکا.

له سەعات دووی دوای نیوەی شەودا، «زایرا» هەواڵنێرە جەنگییەکانی بانگی نووسینگەی خۆی کرد لێدوانێکی وەهای دا، کە ئەگەرێکی زۆر کز بۆ بەرپابوونی جەنگ هەیە. ئەو هێشتا هەر لە قسەکانی دابوو، کاتێ یاریدەدەرێکی هاتە نووسینگەکە و تێبینییێکی لەسەر پارچەکاغەزێک پێ نیشان دا. «زایرا»ش تێبینیەکەی خوێندەوە، ئینجا بێ ئەوەی هیچ قسەیەک بکا، بێرییەکەی هەڵگرت و بەلەز لە ژوورەکەی چووەدەر.

هەر یەک دوو خولەک دوای ئەوە، زەنگی ئاگادارکردنەوە، بێدەنگییەکەی یوم کیپوری شکاند. ئیدی جەنگەکە هەڵگیرسا[216].

✡ ✡ ✡

دوای جەنگەکە، ئەفسەرە پلە باڵاکانی ئامان بە تورەییەوە فریشتەیان بەوە تاوانبارکرد گوایە زامیری لەخشتە بردووە بەوەی لە ئاگادارینامەکەیدا ناوی سەرەتای ڕۆژەکەی هێناوە وەک سەعاتی سفری هێرشکردنەکە، کەچی لەڕاستیدا پەلامارەکە لە نێوەڕاستی ڕۆژەکەدا بووە. هەر دواتر سەلمێندرا کە لە دواین ساتدا، سەعاتی سفر هەموارکراوەتەوە، ئەمەش لەمیانی تەلەفۆنێکی نێوان سەرۆکەکانی میسر و سووریادا بووە. ئاخر ئەوکات فریشتەکە لە ئاسمان بووە، لە گەشتەفڕینی خۆیدا بەرەو لەندەن.

سەیر بوو کە سەرانی ئامان بە سەرچیخچوونی فریشتە سەخڵەت بوون یان بە هۆشدارییە هەڵەکانی پێشتری. دیاربوو سەرانی ئامان وایان لە فریشتە نەدەڕوانی کە سەرچاوەیەکی هەواڵگرییە بەڵکو نوێنەرێکی مۆسادە لە نووسینگەی سەرۆکی میسردا، کە وەها دەخواسترا ڕاپۆرتەکانی بە وردەکارییەوە بدا و هەموو شتێکی تێدا بەیان بکا. ئاخر

[216] ئەو شەڕەی هەڵگیرسا، سوورییەکان پێیان دەگوت حرب تشرين التحريرية، میسرییەکانیش حرب اكتوبر بە عیبریش شەڕی یوم کیپور چونکە لە ڕۆژی جەژنی لێبووردندا هەڵگیرسا.

ئەوان ئەو ڕاستیەیان پشتگوێخستبوو، وێڕای پێگە و پلە باڵایەکەی خۆی، فریشتە تاکە سووسەکار بوو؛ ئەو ڕاپۆرتێکی نایابی دابوو، بەڵام خۆ هەمیشە هەموو شتێکیشی هەر نەدەزانی، وەک حاڵەتی سووسەکارانی دیکە.

لەماوەی جەنگی یوم کیپوردا کە ئەویٚ ڕۆژیٚ هەڵگیرسا، بەردوام فریشتە هەواڵی دەستی یەکەمی دەدایە ئیسرائیل. کاتێکیش میسرییەکان دوو مووشەکی سکۆدیان گرتنە هێزی کۆکراوەی بەرگری ئیسرائیلی، ڕاپۆرتێکی دڵنیایی لە ئینگلستانەوە، ئیسرائیلی هێمن کردەوە. ئاخر وەک فریشتە گوتبووی؛ سوپای میسری بەنیاز نەبووە مووشەکی زیاتر لە ماوەی جەنگەکەدا بەکاربێنیٚ و میسریش نەیدەویست ئاستی شەڕەکە لەگەڵ ئیسرائیلدا بگەیەنێتە مریشکە ڕەشە.

شەڕی یوم کیپور لە ٢٣ی ئۆکتۆبەردا کۆتاییپێهات. لە بەرزایەکانی جۆلانەوە، لەشکری سووری شپرزە بوو، تۆپخانەی ئیسرائیل لە دوری بیست مایل لە دیمەشقەوە دامەزرا، لە باشووریش، میسرییەکان، هێڵێکی پانی پێنج کیلۆمەتریان لە دیوەکەی ئیسرائیلی سەر کەنداوی سوێس گرتەوە، بەڵام لەشکری سێیەمیان بە تەواوی لە لایەن ئیسرائیلییەکانەوە گەمارۆدرا، کە سەری ڕم بوون بۆ سەر خاکی میسر، ئیدی ئەو هێڵە شکێندرا و دیسان خۆیان کۆکردەوە ئەمجارەیان هەر لە دووری شەست و سیٚ مایل لە قاهیرەوە دوور بوون.

هێشتاش ئیسرائیل بەو سەرکەوتنەی دڵخۆش نەبوو. ئاخر شەڕەکە بە کوژرانی ٢،٦٥٦ کەس و بریندابوونی ٧،٢٥١ کەس تەواو بوو، ئەفسانەی هێزی باڵادەستیش تێکشکا.

لەگەڵ ئەوەشدا دانوستان لەنێوان ئیسرائیلی و میسرییەکان کرا و ڕێککەوتننامەش واژۆ کرا، یەکەم بۆ کۆتاییهێنان بە دوژمنکاری، ئینجا بۆ سەقامگیرکردنی ئاشتییێکی بەردرێژ لەنێوان هەردوو دەوڵەتەکەدا. سووریاش ڕەتیکردەوە بچێتە ڕیزی پێواژۆی ڕێککەوتنەکانەوە.

زڤی زامیریش گەشتی ئەرکەکەی خۆی تەواوکرد و ژەنەڕاڵ «ئیسحاق (کاها) هۆفی» جێگەی گرتەوە.

«زڤی زامیر» وەک ژەنەڕاڵێک بە دەسکەوتەکانەوە خانەنشین کرا. ئەو بانگی ئەوەی دا کە تاکەکەس بووە لەنێو بازنەی هەواڵگرییدا، هۆشداری دابێتە خۆئامادەکارییەکانی سووری و میسریەکان بۆ جەنگ و ڕاپۆرتێکی چارەنووسسازیشی سەبارەت بە ئەگەری زۆر لەپێشی پەلاماردانەکە بەرزکردبێتەوە. خۆ ئەگەر سەرکردە ئیسرائیلیەکان زیاتر سەبارەت بە ئاگادارکردنەوەکە وریا بووبان و دەستبەجێ فەرمانیان بە زەبری پێشوەختە بکردبا، ئەوا ئەگەری زۆر هەبوو ئەنجامی شەڕەکە باشتر لە بەرژەوەندی ئیسرائیل بشکابایەوە. وەزیرەکانی کابینەی دیاریکراویش بۆیە خۆیان لە زەبروەشاندنێکی پێشوەختە بەدوور گرت، نەبادا بە هەڵگیرساندنی جەنگ تۆمەتبار بکرێن. ئەمەش نەوەک هەر پێدەچوو کردەیەکی نابەجێ بێ، بەڵکو بڕیارێکی کورتبین بوو. بۆ لەوەش گرنگتر ئەوەیە؛ ئایا وا باشترە ئیسرائیل بە دنەدانی شەڕ تۆمەتبار نەکرێ یاخود بە هەموو شێوازەکان بەرگری لە خۆی بکا؟

تائێستاش مێژوونووسی ئیسرائیلی «د. ئوری بار یوسف» پێیوایە کەوا ئاگادارینامەکەی فریشتە بەرزاییەکانی جۆلانی ڕزگار کرد. لەسپێدەی ٦ی ئۆکتۆبەردا ئەو نووسی، تاقمی تانکەکان بە خێرایی جۆشدران و لەسەر هۆشدارینامەکەی فریشتەکە ڕۆیشتن. ئەو تاقمانە بۆ دوای نیوەڕۆکەی

گەیشتنە جۆلان و پێشڕەوییەکانی سوپای سووریایان لە کەرتی «نەفەح» وەستاند.

لە کۆتایی جەنگ و لەژێر فشاری بێپێشینەی خەڵک، حکومەتی ئیسرائیلی کۆمیتەیەکی بەرفراوانی بۆ لێکۆڵینەوە بەسەرپەرشتی «شیمۆن ئاگرانات»ی دادوەری دادگای باڵای وڵات پێکهێنا، بۆ ئەوەی لە پێواژۆی داڕشتنی بڕیاردان لە ماوەی جەنگی یوم کیپوردا بکۆڵێتەوە. کۆمیتەکە دەستبەجێ بڕیاری لابردنی ژەنەڕاڵ «ئێلی زایرا» (و چەندین ئەفسەری دیکە لەنێویاندا داڤید ئێلیار سوپاسالاریش بوو) دا.

بەڵام ئاخۆ فریشتەکە کێ بوو؟ ئاخر چەندان چیرۆک، ڕاپۆرت، زنجیرە کتێبی نەبڕاوەی ناڕاستی لەبارەی ناسنامەکەی لەو ساڵانەی دواییدا نووسران و بڵاوکرانەوە. دیاربوو فریشتەکە کەسێک بوو زۆر لە بازنەی حکوومەت و فەرماندە هەرە باڵاکانی سوپای میسرییەوە نزیک بوو، بەڵام هیچ کەس قەڵغانە نهێنی پارێزراوەکەی ناسنامەی ڕاستەقینەی ئەوی پێ هەڵنەدرایەوە. ڕۆژنامەنووس و ڕاڤەکاران بە چەندین نازناوەوە بانگیان کردووە و بیچمێکی وایان بۆ داتاشیوە کە بە چەندین بەهرە ئەفسانەیی بووە. ئەو بووە پاڵەوانی زۆر لە چیرۆکەکانی سووسەکاری و تەنانەت هەندێ ڕۆمانی بە هەڕمێنیش.

✡ ✡ ✡

دوای لەسەرکارلادرانی، ژەنەڕاڵ «زایرا» ئەو نامرادبوونەی بە قووڵی لە ناخی دڵییەوە هەڵگرت. ئەو بڕیاریدابوو بێخەتایی خۆی بسەلمێنێ و ڕوانینی خۆی بۆ ڕووداوەکانی ١٩٧٣ بۆ جیهان بخاتەڕوو.

لەدواییدا بڕیاریدا کتێبێک بنووسێ و وەڵامی خۆی سەبارەت بەو پرسیارە بداتەوە: بۆچی ئەو، ڕاپۆرتەکەی فریشتەی ڕەتکردەوە؟

ژەنەراڵ نووسیبووی کەوا فریشتە لە ئاژانێکی دووسەرە زیاتر هیچ نەبوو، کە مۆساد لە لای میسرییە فێڵبازەکانی چاندبوو، بۆ ئەوەی ئیسرائیلییەکان لە خشتە ببا.

هەندێک لە هەواڵنێران چیرۆکەکەی «زایرا»یان کڕی و نووسیشیان کە هەر بەڕاستی فریشتە بە پلەی نایاب ئاژانێکی دووسەرە بووە. ڕۆڵی فریشتە وەک ئەوان ڕوونیان کردەوە، بە درێژایی کاتەکە ئەوەبوو، کەوا هەواڵ و زانیاری متمانەدار و دەقاودەق بداتە ئیسرائیل تا بڕوای پێبکەن ئەوسا کاتێکیش مۆساد بەکردەوە نانی لەسەر کاسەی ئەو دەخوا، بە درۆی قەبە قەبەی چەکدار بکا تا تێکی بشکێنێ.

بەخۆیشی چیرۆکێکی گەورە بوو. خۆی نزیکەی هەموو شتێکی ڕوون دەکردەوە... چونکە هەردوو لایان «زایرا» و شوێنهەڵگرانی یەک تاکە ڕاستییان بەهەند هەڵنەگرت، ئەویش ئەوە بوو: هەموو ڕاپۆرتەکانی فریشتە، هەرە لە بەراییەوە تا کۆتاییەکەی، بەبێ چەندوچوون ورد و دروست بوون. کەواتە ئەدی درۆیەکە لە کوێ دابوو؟

کاتێکیش کە فریشتە بیتوانیبا ئیسرائیل لە خشتە ببا و خەبەری پێبدا کەوا هێزێکی زۆر لەسەر لێواری نۆکەندی سوێسدا تەنیا بۆ مانۆر کۆدەکرێتەوە، ئیدی مەترسی جەنگ لەئارادا نییە - کەچی ئاژانە دووسەرەکە دۆخێکی پێچەوانەی هەڵبژارد: ئەو بانگی یاریدەدەری «زامیر»ی لە ئینگلستان کرد و هۆشدارینامەی کیمیایی نارد- ئەوسا بەرەو لەندەن دەفڕێ و زامیر ئاگادار دەکاتەوە کەوا هێرشێکی لەناکاو زۆر نزیکە بکرێتە سەر ئیسرائیل.

بەڵام خۆ نەدەکرا دەمی «زایرا» تۆپە قوڕی لێبدرێ! لە ٢٠٠٤دا، کاتێک چاپێکی نوێی کتێبەکەی بڵاوکرایەوە، هەنگاوێکی دیکەشی هاوێشت و

ناسنامەی فریشتەکەی بۆ خەڵک ئاشکرا کرد. لە زنجیرەیەک چاوپێکەوتندا، کە لووتکەکەی نمایشێکی تەلەفزیۆنی هەواڵی بوو لەگەڵ ڕۆژنامەنووسی دێرین «دان مارگالیت»دا، «زایرا» ناوی ڕاستەقینەی فریشتەی هێنا.

**ئەشرەف مەروان.**

ئەو ناوەش هەموو بازنە سیاسییە میسرییە پەیوەندیدارەکانی تەزاند. ئاخر ئەوان باوەڕیان نەدەکرد، «مەروان» سیخوڕێکی ئیسرائیلی بووبێ.

بەڵام ئاخۆ ئەو سیخوڕە وەستاکارە کێ بووبێ؟ ئەرێ بەڕاست «ئەشرەف مەروان» کێ بوو؟

✡ ✡ ✡

لە ١٩٦٥دا، کیژێکی شیرین و شەرمنی میسری، کوڕێکی کۆک و ڕووخۆشی لە یاریگەی تێنسی «هایلیپۆلیس» دەبینێ. کیژەکە، کە «مونا»ی ناودەبێ، سێیەمین کچی خێزانەکەی دەبێ بەڵام زیرەکترینیان نابێ. «هودا»ی خوشکی وەک خوێندکارێکی قوتابخانەی باڵای غەززە زۆر لەو بەهرەمەندتر دەبێ. بەڵام «مونا»، ناسک، دەمبەخەندە و کیژە خۆشەویستەکەی باوکی دەبێ. ئەو کوڕە گەنجەشی کە بینی لە خێزانێکی حاڵخۆشی ڕێزدار دەبێ؛ کە تازە بەکالۆریۆسی لە کیمیا وەرگرتبوو و چووبووە ڕیزی سوپا. «مونا»ش دڵی بۆ لێدابوو، تەواو گیرۆدەی ببوو.

کەمێک دوای ئەوە، کیژەکە کوڕە دۆستەکەی بە خێزانەکەی خۆی ناساند. ئیدی بەم جۆرە کوڕەکە باوکی «مونا» کە خودی سەرۆک جەمال عەبدولناسر بوو، ناسی.

ناسریش دڵنیانەبوو ئاخۆ کیژەکەی کوڕە نموونەیەکەی دۆزیوەتەوە یان نا، بەڵام کچەکە هیچ دەرفەتی بە باوکی نەدا. لەکۆتاییدا، ناسر بانگی باوکی کوڕە گەنجەکەی کردە نووسینگەکەی خۆی، ئەویش ئەفسەرێکی پلە باڵای پاسەوانی سەرۆکایەتی بوو، ئینجا هەردوو پیاوەکە ڕازیبوون کە منداڵەکانیان دەبێ بۆ یەک بن. ساڵێک دواتر، لە تەمموزی ١٩٦٦دا، جووتەکە زەماوەندیان کرد.. پاشان زۆری پێنەچوو، مێردە گەنجەکەی «مونا»، لە هۆبەی کیمیایی پاسەوانێتی کۆماریدا دامەزرا و لە کۆتایی ١٩٦٨یشدا گوازرایەوە هۆبەی زانستی سەرۆکایەتی.

ناوی زاواکەی سەرۆکیش «ئەشرەف مەروان» بوو.

دیاربوو پیاوە گەنجەکە، کارە نوێکەی خۆی بەدڵ نەبووبێ. بۆیە داوای لە «ناسر» کرد بەڵکو ڕێگەی پێبدا لە لەندەن درێژە بە خوێندنەکەی بدا. ناسریش قایلبوو، ئیدی «ئەشرەف مەروان» بەتەنیا لە پایتەختی ئینگلستانێ لەژێر سەرپەرشتی توندوبەندی باڵوێزخانەی میسردا مایەوە.

بەڵام دیاربوو سەرپەرشتی کردنی لەلایەن باڵوێزخانەکە زۆر توندوبەند نەبووبێ. ئەشرەف مەروان حەزی لە ژیانی خۆش بوو، حەزی لە ئاهەنگ، لە سەرچڵی بوو – لەندەنی شەستەکانیش بە بەخشندەیی ئەو هەموو شتانەی مسۆگەر دەکرد. زۆریشی نەخایاند تا گەنجە میسرییەکە هەموو پارە ڕێگەپێدراوەکەی خەرج کرد. ئەو پێویستی بە سەرچاوەی دارایی دیکە بوو تا حەز و ئارەزووە شەوە سوورەکانی تێر بکا- زۆریشی پێنەچوو ئەمەشی دۆزیەوە.

ناوی ژنەکە «سوعاد» بوو، مێردی بە شێخ عەبدوڵڵا موبارەک ئەلسەباحی کوەیتی کردبوو. ئەشرەف تەلیسمی لە ئافرەتە ڕۆمانتیکەکە کردبوو، ئەویش جوزدانی بۆ کردبووەوە. بەڵام ئەو جۆرە کارڕێکخستنە

تەمەنی زۆر نەبوو. گۆڵمەزەکە ئاشکرابوو، ناسری توورەش کوڕە خراپەکەی بە لادراوی ناردەوەماڵی خۆیان. ناسر داواشی کرد، کە «مونا» ئەو زیناکارە تەڵاق بدا، ژنەکە ڕاشکاوانە ڕەتی کردەوە. لەدواییدا ناسر بڕیاریدا کە مەروان هەر لە میسردا بمێنێتەوە و هەر ئەوەندە ڕێگەی پێدرا کە بۆ پێشکەشکردنی باسەکەی بۆ پرۆفیسۆرەکانی بچێتەوە لەندەن؛ دەبووایە مەروان هەموو ئەو پارانەی لە سوعاد الصباحیشی وەرگرتبوو، بگێڕێتەوە. ئیدی کارێکی لە نووسینگەی ناسر دەستکەوت، ئینجا جار بەجار بەرپرس بوو لە ئەرکی لابەلا یان لە ئۆپەراسیۆنەکان.

لە ١٩٦٩دا، دیسان «ئەشرەف مەروان» هاتەوە لەندەن، تا باسەکەی پێشکەشی زانکۆکەی بکا. بەڵام لەو بۆنەیەدا، یەکەمین هەنگاوی ناپاکیکردنی لە خەزوورەکەی هەڵهێنا. ئەو سووکایەتیپێکردنەی سەرۆکی میسر، وای لێکرد تالاو بنۆشێ و نامراد بێ. ئەو لەوەدا دوودڵ نەبوو: تەلەفۆنی بۆ باڵوێزخانەی ئیسرائیل کرد و داوای کرد قسە لەگەڵ پاشکۆی سەربازییاندا بکا. کاتێکیش ئەفسەرێک وەڵامی دایەوە، مەروان ئەشرەف بە ناسنامەی ڕاستەقینەی خۆی ناساند و ڕووقایمانەش گوتی کە دەیەوێ کار بۆ ئیسرائیل بکا. داوای کرد ئەو داوا خستنەڕووەی بدرێتە ئەو کەسانەی کە مشووری ئەو جۆرە چالاکییانە دەخۆن. ئەو ئەفسەرەی تەلەفۆنی لەگەڵ کرد، قسەکانی بەهەند هەڵنەگرت و ڕاپۆرتیشی لەسەر تەلەفۆنکردنەکە بۆ سەرووی خۆی بەرز نەکردەوە؛ تەلەفۆنکردنەوەی دووەم جاری مەروانیش هەر بێ وەڵام مایەوە. بەڵام ئەمجارەیان چیرۆکەکە بەرگوێی هەندێ کاربەدەستی مۆساد کەوت. سەرۆکی هۆبەی ئەورووپی مۆساد، «شموئیل گرون» زەنگێکی لە مەروانەوە بۆ هات. «گرون»یش دەیزانی مەروان کێیە، لەبارەی پێگە گرنگەکەیشی دەزانی و داوای لە مەروان کرد چیدی زەنگ بۆ

باڵویزخانەکە لێنەدا؛ ئەو ژمارەیەکی تۆمارنەکراوی پێدا و دەستبەجێش هەندێ لە هاوڕێکانی لێ ئاگادارکردەوە.

ڕاپۆرتی هەرە نهێنی «گرون» درایە دەستی «زڤی زامیر» و «ڕێهاڤیا ڤاردی»، سەرۆکی «تزۆمت» واتە هۆبەی هێنانەڕیزی ئاژانەکان بۆ نێو مۆساد. هەردوو پیاوەکە تیمێکی تایبەتیان بۆ پشکنینێکی قووڵی ئەو داوایەی مەروان خستبوویە ڕوو، پێکهێنا. لە سەرێکەوە، جووڵەکەی مەروان هەموو خەسڵەتەکانی پێوەدانی ئۆپەراسیۆنی کلاسیکی تێدابوو: ئاخر کەسێکی باڵا لە دامودەزگەیەکی مێمڵ[217]، خۆبەخشانە وەک ئاژانێک بێتەپێش و هیچ کۆششێکی واشی نەوێ بۆ هێنانەڕیز. ئەمەش خۆی لەخۆیدا مایەی گومان بوو. دەکرێ پیاوەکە سیخوڕێکی دووسەرە بێ، لە لایەن دەزگەی هەواڵگری میسرییەوە داو داندرابێتەوە.

بەڵام لەسەرێکی دیکەشەوە، هەر هەمان هاوکێشە دەکرێ واتایەکی پێچەوانە بگەیەنێ. یەکێکی وا باڵا لەنێو ڕیزی دامودەزگەیەکی نەیاردا خۆبەخشانە ببێتە ئاژان. بەدڵنیاییەوە ئەو دەستی بە ماددەی هەرە نهێنی ڕادەگا، کە کەس ناتوانێ هەر لێشی نزیک بێتەوە. لەوانەشە دوای هەموو شتێک، ئەو ئاژانێکی نموونەیی بێ، ئەو، ئەو تاکە بێ کە هەموو دەزگەیەکی نهێنی خەونی پێوە ببینێ. وێڕای ئەمەش، پیاوەکانی «ڤاردی» زانیان «مەروان» کێیە؛ گەنجێکی مجێزبەرز و حەزباز، هەربۆیەشە کەسێکە حەزی لە پارەو پووڵە. ئیدی مۆساد بۆ ئەوەی کابرا بهێنێتە ڕیزی خۆی، لیکاوی لە دەم هاتەخوار[218].

---

[217] مێمڵ: نەیار، دوژمن.

[218] لیکاو : لیک. ئەم ئیدیۆمە واتای ئەوە دەگەیەنە کە زۆری پێخۆشە، لەخۆشیان لیکی لە دەم دەڕژێ.

«گرون» گەڕایەوە لەندەن و داوای بینینی مەروانی کرد. مەروانیش قایلبوو و بە جلێکی کەشخەوە گەیشتە ئەوێ، کوڕێک هەر قۆزی لێدەباری[219]. ئەو بەکراوەیی بە «گرون»ی گوت، کەوا بە قووڵی لە شکستەکەی شەڕی شەش ڕۆژەی ١٩٦٧دا نامرادە، ئیدی بڕیاری داوە ڕەگەڵ لایەنی سەرکەوتوو بکەوێ. بەڵام لەپاڵ ئەو هاندانە "ئایدیۆلۆژییە"دا، مەروان داوای بڕە پارەیەکی زۆری کرد. 100.000 دۆلار بۆ هەر دانیشتنێک کە تیایدا ڕاپۆرتێک بداتە دەست سەوداکارەکەی.

«گرون» سەرباری خەرجییە زۆرەکە، مەیلی لێبوو داواکەی پەسەند بکا. ئەم بڕە پارەیەش هەرگیز پێشتر نەدرابوو. بەڵام یەکەمجار خۆ «گرون» پێویستی بەوە بوو، کە مەروان خاوەن قسەی خۆی بێ و بیسەلمێنێ بۆی. داوای نمونەیەکی لەو بەڵگەنامانە لێکرد کە دەتوانێ ڕادەستیان بکا. هەر ئەو ڕادەستکردنی بەڵگەنامەیەش پەیوەندی نێوان مەروان و مۆسادی بەیەکەوە توند گرێدا. ئەوەش خۆسەلماندنێک بوو، کە مەروان هەر بەڕاستی بۆتە ئاژانێکی ئیسرائیل. هەڵبەتە لە گۆشەنیگای میسرییەکانیشەوە دەیکاتە ناپاک و ئاژانێکی دوژمن.

مەروانیش لێنەگەڕا «گرون» ئەوەندە چاوەڕێ بێ، تەواوی ئەو خولەکە تۆمارکراوانەی دەقی ئەو گفتوگۆیەی سەرۆک جەمال عەبدولناسر لەگەڵ سەرکردەکانی یەکێتی سۆڤیەت کە لە ٢٢ی ینایری ١٩٧٠دا کردبووی بۆ هێنان. لەو سەردانەیدا، ناسر داوای لە سۆڤیەتەکان کردبوو، چەکی نوێ، فڕۆکەی جەنگی مووشەکهاوێژی دوورمەودای بدەنێ، کە بتوانێ قووڵایی ئیسرائیلی پێ بۆمبباران بکا.

---

[219] هەر قۆزی لێدەباری: ئیدۆم/ پۆشتەوپەرداخ، کەشخە و جوان.

بەڵگەنامەکەش بووە مایەی سەرسامی هەموو ئەوانەی خوێندیانەوە. ئاخر ئەوان هەرگیز شتی وایان لەسەر کاغەز نەبینیبوو؛ ماکی و ڕاستگۆیی بەڵگەنامەکەش لە هەموو گومانێک بە دوور بوو. ئیدی سەرانی دەزگەی مۆساد پەییان بەوە برد، گەنجینەیەکی لە نرخ نەهاتوویان کەوتۆتە بندەست. ئەوانیش «دوبی»یان وەک سەوداکار و هێڵی پەیوەندی لەگەڵ مەروان ناردە لەندەن. هەروەها دەستبەجێ کاروبارەکەشیان ڕێکخست: ئەپارتمانێکیان لە لەندەن بۆ کۆبوونەوەکان لەگەڵ فریشتە بەکرێگرت، تیایدا ئامێری گوێهەڵخەر و تۆمارکەریان لێدانا، لەڕووی ئاسایشیشەوە پاراستیان، فەندێکیشیان جێگیرکرد بۆ ئەوەی پاڵپشتی ئەو ئاژانە ئەستێرەیە بکا. ئیدی یاریەکە دەستپێکرد.

کۆبوونەوەکانیش هەر کاتێک کە ڕاپۆرتی خۆی هەبووایە، بە دەستپێشخەری مەروان خۆی بوون. ئەوەش بەگوێرەی ڕێسای جێگیرکراو لەگەڵ «دوبی»دا، مەروان تەلەفۆنێک لەگەڵ نێوەندکارێک دەکا (هەندێ لە سەرچاوەکان دەڵێن کە واڕاهاتبوو زەنگ بۆ ژنە جووەکانی لەندەن لێبدا)، ئینجا مۆسادیش ئاگادار دەکرێتەوە. مەروان هەواڵی زۆر دەداتە سەوداکارەکەی خۆی کە هەموویان بەڵگەی هەرە نهێنی سیاسی و سەربازیین. کۆلۆنێل «مایەر مایەر» ی سەرۆکی هۆبەی ٦ (سوپای میسری) لەنێو «ئامان»دا، بەشداری چەندین لەو کۆبوونەوانەی کردبوو. مایەر دەبوایە لەژێر ناوێکی خوازراوە بەرەو لەندەن بفڕێ؛ دەبوایە هەموو نیشانە و مارکی سەر جلەکانیشی لێبکرێنەوە. ئەو دەبووایە بۆ چەندین سەعات بە پێ، بە تاکسی و بە پاس لە دەوری لەندەن بسووڕێتەوە، بۆ ئەوەی تەواو دڵنیا بێ، کە کەس سووسەی ناکا، ئینجا لەکۆتاییدا خۆی بگەنێتە باڵەخانەکە و لێ وەسەر نهۆمی شەشەمین بکەوێ، کە ئەپارتمانە مەنزڵگایەکەی لێبوو. کاتێکیش بۆ یەکەمین جار

چووه نێو ئەپارتمانەکە، لەوێ پیاوێکی قۆزی بینی بەڵام خۆشمەجلیس نەبوو، ئەو کەسەی ڕاشکاوانە ڕقی لێدەبووەوە و خۆیشی بە بەرزتر دادەنا. مەروان هەر ئەوکاتە نەرمونیان دەبووەوە، کە لێ تێگەیشتبا «مایەر» ئەو کەسەیە زانیاری زۆر لەلایە و خاوەن ئەزموونە. جارێکیان مایەر لە لایەن برادەرێکی مۆسادەوە داوای لێکرا بەڵکو سندووقەکەی مەروانی بداتەدەست. کاتێک لێی پرسی ئاخۆ چی لەنێو سندوقەکە دایە، برادەرەکەی چاوێکی لێداگرت و گوتی: "ئەپارتمانێک لە سەرووی گۆڕەپانی حامدینا" (گرانترین گەڕەکی تەلئەبیب)، ئاماژە بوو بۆ ئەوەی کە بڕێکی قەبەی لە پارە تێدایە. بەگوێرەی خەملاندنەکانی مۆساد، ڕاپۆرتەکانی مۆساد لە ماوەی ڕاژە نهێنییەکەی بۆ ئیسرائیل لەسەر دەوڵەتی جوو بە زیاتر لە ٣ ملیۆن دۆلار کەوت.

ناسر لە ٢٨ی ئەیلوولی ١٩٧٠دا مرد، ئەنوەر ساداتیش جێگەی گرتەوە. پرۆفیسۆر «شیمۆن شامێر» یەکێک لە مامۆستایانی پێشووی ئیسرائیل، کاراکتەری سادات بۆ مۆساد شیدەکاتەوە. «شامێر» گوتی، کەسێکی لاواز، تەمومژاوی؛ ئەو پێی لەسەر ئەوە داگرتبوو کە سادات زۆر لە دەسەڵات نامێنێتەوە یان جەنگ هەڵدەگیرسێنێ. زۆر لە سەرکردە میسرییەکانیش هەمان بۆچوونیان هەبوو، بەڵام «مەروان» بڕیاریدا بەبێ مەرج پشتی سادات بگرێ. ئەو کلیلی قاسەی تایبەتی ناسری لە ژنەکەی وەرگرت و زۆرینەی فایل و بەڵگەنامەکانی کۆکردنەوە و بۆ سەرۆکە نوێکەی بردن.

هەروەها لە ١٩٧١یشدا لە پشتیەوە وەستا، ئەویش لەو کاتەی هەندێ لە سەرکردە میسرییەکان پیلانێکی کودەتای لایەنگریانەی سۆڤیەتیان لە دژ دانا. هەندێ لە ناودارترین ناوی میسری پیلانگێڕییەکەدا بوون، وەک: وەک «عەلی سەبری»، جێگری پێشووی سەرۆک، «محەمەد فەوزی»

وەزیری پێشوی جەنگ؛ «شعراوی جومعە»ی وەزیری نێوەخۆ؛ لەگەڵ وەزیر و ئەندام پەرلەمانی دیکە. پلانەکەش ئەوە بوو کە سادات لەمیانەی سەردانەکەی بۆ زانکۆی ئەلەسکەندەرییەدا بکوژرێ. بەڵام سادات دەستی خۆی وەپێشخست و هەموو پیلانگێڕانی گرتن. مەروانیش لەگەڵ سادات بوو، پاڵپشتی سادات بوو لە سەرکوتکردنی پیلانگێڕیەکەدا.

زۆری پێنەچوو بەرهەمی پاڵپشتکردنەکەش گەیشت. پلەو پایەی مەروان بە فراوانی لەنێو قوچەکی دەسەڵاتی میسرییدا چەسپا. ئەو وەک سکرتێری سەرۆکایەتی بۆ زانیاری و ڕاوێژکاری تایبەتی سەرۆک دەستنیشان کرا. ئەو یاوەری سەرۆکی کرد لەو گەشتانەی بە دنیای عەرەبیدا کردی و بەشداری گفتوگۆ هەرە باڵا سیاسیەکانیشی کرد.

کاتێکیش پێگەی مەروان سەلمێندرا، ڕاپۆرتەکانیشی بەهەمان شێوە هی حاشالێکردن نەبوو. لە ١٩٧١دا، سادات چەندین جار سەردانی مۆسکۆی کرد، لیستێکی بەو چەکانەی کە بۆ هێرشکردنە سەر ئیسرائیل پێویست بوون، پێشکەشی «لیوندید برێجینێڤ» کرد. لەنێو لیستەکەدا لەپاڵ چەک و تفاقی دیکەدا، فڕۆکەی میگی-٢٥یشی تێدابوو. مەروانیش دەقی لیستەکەی دایە دەستی سەوداکارە مۆسادەکەی؛ کاتێکیش داوای لێکرا دەقی گفتوگۆی سادات-برێجینێڤیان بۆبێنێ، ئەویشی بۆ هێنان. زڤی زامیریش بە باشی بە ڕاپۆرتەکانی مەروان کارانگاز بوو، بۆیە خۆیشی بۆ دیتنی چوو. ئەو شتانەی کە مەروان دەیدانێ، هەر لەنێو چەند کەسانێکی کەم لە ئەفسەرەکانی مۆساد و ئامان، سوپاسالاری هێزی بەرگری ئیسرائیلی و جێگرەکەی، گۆڵدا مایەری سەروەزیر، مۆشێ دایانی وەزیری بەرگری و وەزیرە جێتمانەکەی گۆڵدا، وەزیری بێ هەگبە «ئیسرائیل گالیلی» دەستاودەست دەکرا.

پێدەچوو هەندێ لەو شتانەی مەروان دەیدانە مۆساد، دەگەیەندرایە سەر مێزی هەندێک لە دەزگە هەواڵگرییە نهێنییەکانی دیکە. ئەو خۆی لە دەزگەی نهێنی ئیتالیاش نزیککردەوە و داوای کارکردنی لەگەڵداکردن؛ بەگوێرەی هەندێ سەرچاوەی زانیاری، ئەو پەیوەندیشی لەگەڵ MI6دا بەست. ئەمەش ئەوە ڕون دەکاتەوە، کە بۆچی لە ٥ی ئۆکتۆبەری چارەنووسسازدا، لەو کاتەی ئەو لە ڕێگەدا بوو کە زڤی زامیر لە لەندەن ببینێ، لە ڕۆما وەستا و هێڵی گەشتەفڕینەکەی گۆڕی: ئاخر ئەو ئیتالییەکانیشی لەو جەنگەی کە ڕوییدا، ئاگادارکردەوە.

یەکێک لە ڕاپۆرتەکانی دیکەی کە پێشتر دەست ئیتالییەکان کەوتبوو، بەڵام ئەمجارەیان لەلایەن خودی مۆسادەوە بوو. مانگێک بەر لە جەنگی یوم کیپوردا، لیبیا داوای کۆمەکی لە میسر کردبوو. تیرۆرستە فەلەستینییەکان، ئەوانەی لە ڕاژەی کۆلۆنێل موعمەر قەزافیدا بوون، بەنیازبوون فڕۆکەیەکی ئەل ئالی ئیسرائیلی لەکاتی هەڵفڕین لە فڕۆکەخانەی ڕۆماوەوە، بخەنە خوارەوە.

ئەمەش واتای کردەوەیەکی تۆڵەستێنانەبوو دژی ئیسرائیل لە بەرانبەر ئەو بە هەڵە خستنەخوارەوەی فڕۆکەیەکی مەدەنی لیبیایی کە لە فێبرایری ١٩٧٣دا بەسەر ئاسمانی سیناوە دەفڕی. مۆساد بەڵگەیان لەسەر نەخشەی تیرۆرستەکان کۆکردەوە، کە فڕۆکەیەکی ئەل ئال بڕفێنن و بە تەقەمەنی بۆمبڕێژی بکەن، ئینجا لە شارێکی گەورەی ئیسرائیلیدا بیتەقیننەوە (بڕوانە بەندی دوازدە).

کاتێکیش فڕۆکەیەک بە ئاڵای لیبیاوە بەسەر ئاسمانی سیناوە بەدەرکەوت، ڕەتی کردەوە خۆی بناسێنێ و لە بواری ئاسمانی ئیسرائیلی دەرچوو، هێزی ئاسمانی ئیسرائیلیش وایان خوێندەوە، کە ئەوە فڕۆکەیەکی خۆکوژی بۆمبڕێژکراوە. بۆیە دوو فڕۆکەی جەنگیان بۆ بەرزکردنەوە و

فڕۆکەکەیان خستەخوارەوە. دواتر دەرکەوت کە هێڵە ئاسمانییەکە لەبەر گەردەلوول لە هێڵەکەی خۆی دەرچووەوە گەیوەتە ئاسمانی سینا. دامودەزگەی تەندروستی ئیسرائیلی ١٠٨ تەرمی لەگەڵ بۆدیە تێکشکاوەکەی فڕۆکەکە دۆزینەوە.

قەزافیش سوێندی خوارد تۆڵەی خۆی بکاتەوە. ئەو دەستەیەش کە قەول بوو ئۆپەراسیۆنەکەی لیبی ئەنجام بدەن، لە پێنج تیرۆرستی فەتح پێکهاتبوون، سەردەستەکەشیان «ئەمین ئەلهندی» بوو. سەرۆک ساداتیش بڕیاریدا یارمەتی لیبییەکان بدا و مەروانی ڕاسپارد دوو موشەکی ڕووسی جۆری ستریێلا بگەیەنێتە دەستی تیرۆرستەکان. مەروانیش بە پۆستی دیپلۆماسی و بە ڕێگەی ئاسمانی ڕۆماوە مووشەکەکانی ناردن. لە ڕۆماش، مەروان مووشەکەکانی لە ترۆمبێلەکەی خۆی بارکردن؛ لەوێ لە دوکانێکی جیهانی ڤیا ڤێنتۆی ناوداردا، «الهندی» بینی؛ ئینجا لەگەڵ ئەلهیندی چوونە نێو دووکانێکی مافوورفرۆش و دوو مافوری گەورەیان کڕین. بەیەکەوەش هەردوو موشەکەکانیان لەنێو مافوورەکان لوولدان ئینجا بەڕێگەی ژێرزەمینیەوە شتەکانیان گەیاندنەماڵێکی پارێزراوی فەلەستینییەکان... تیرۆرستەکان خەریکی خۆسازدان بوون، کە مووشەکەکە بتەقێنن، بەڵام خۆ ئاگایان لێنەبوو کە مەروان پێشتر و لە پشتەوە مۆسادی ئاگادار کردبووەوە، مۆسادیش دەسەڵاتی ئیتالیا. ئیدی ئەوە بوو لە ٦ی ئۆکتۆبەردا، تاقمی دژە تیرۆری پۆلیسی ئیتالیا بەسەر ئەپارتمانەکەی «ئۆستیا» دادا کە لە فڕۆکەخانەکەوە نزیک بوو. ئیتالییەکان هەندێ ئەندامانی دەستەی تیرۆرستیەکەیان گرتن و دەستیشیان بەسەر مووشەکەکاندا گرت. ئەندامەکانی دیکەی تیمەکەش لە نزیک هوتێلی ڕۆمادا گیران. ڕۆژنامەگەری ئیتالیا ناوی مۆسادی وەک سەرچاوەیەک ڕاگەیاند کە دەزگەی هەواڵگری ئیتالیای ئاگادار کردۆتەوە؛

هەندێکیش گوتیان، لەمیانەی ئۆپەراسیۆنەکەدا، زڤی زامیر بەخۆی لە ڕۆما ئامادە بوو.

یەک مانگیش دوای ئەوە، جەنگی یوم کیپور هەڵگیرسا.

✡ ✡ ✡

دوای جەنگەکە. مەروان ئەرکە هەرە نهێنیەکانی بۆ سادات ڕادەپەڕاندن. ئەو وەک نوێنەری سادات دەنێردرایە پایتەختە عەرەبییەکان و لە جیاکردنەوەی نێوان هێزەکانی سووریا و میسر- لەگەڵ ئیسرائیلدا کارا بوو. هەروەها لەو گفتوگۆیەی لەنێوان هینری کیسنجەری وەزیری کاروباری دەرەوەی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا و شا حوسێنیی شای ئوردن لە عەمماندا ئامادە بوو. لەیەکجیاکردنەوەی هێزەکان، دەرفەتێکی دایە مەروان کە پەیوەندی بە دەزگەیەکی دیکەی هەواڵگرییەوە بکا، ئەویش سی ئای ئەی ئەمریکا بوو، ئەوانیش بە دوای هەواڵگری گرنگدا دەگەڕان سەبارەت بە سیاسەتی میسر دوای ئەو ڕێککەوتنامە کاتییەی لەگەڵ ئیسرائیلدا مۆری کردبوو. بەگوێرەی سەرچاوەی هەواڵی ئەمریکی، پەیوەندی نهێنی نێوان مەروان و سی ئای ئەی نزیکەی بیست و پێنج ساڵ درێژەی کێشا. ئەو چەندین جار سەردانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای بۆ چارەسەری نەخۆشی کرد و لەوێش بە گەرمی پێشوازی لێکرا و چێژی لە مێوانداریيە بەخشندەیی و گەرموگوڕییەکەی سی ئای ئەی بینی.

بەڵام خۆ ئەو پێگە باڵایە و چالاکیە نهێنییەکانی ڕەونەقی خۆی نەما، ئینجا ڕووی لەکارنامەی دووەمی کرد کە بیزنس بوو. ئەو ئەپارتمانێکی نایابی لە لەندەن، لە شەقامی ٢٤ کارلتن هاوس تێراسدا کڕی و پارەشی لە چەندین پڕۆژەی وەبەرهێنان خستەگەڕ. لە ١٩٧٥دا، ئەشرەف مەروان

کرایە سەرۆکی یەکێتی پیشەسازانی عەرەب، ئەو ڕێکخراوەی میسر، عەرەبستانی سعوودی و ئیمارات پاڵپشتی بوو، بۆ ئەوەی چەکە تەقلیدییەکان بە شێوازی ئەورووپی بەرهەم بهێنێ. پرۆژەکەش سەری نەگرت، بەڵام یارمەتی مەروانی دا، پەیوەندیەکانی لە جیهانی بیزنسدا بەرفراوان بکا. دوای ماوەیەکی کەمیش، ئەو لە پێگەکەی لادرا و لە ١٩٧٩دا باریکردە پاریس. دوو ساڵیش دوای لەناوبردنی سەرۆک سادات لەلایەن تیرۆرستە توندڕەوەکانەوە، مەروان هاتەوە لەندەن و کارنامەیەکی بزنسمانانەی نایابی بۆ خۆی پێکەوەنا، وای لێکرد ببێتە پیاوێکی زۆر دەوڵەمەند. ئەو میوانداری سەوداکەرەکەی مۆساد «دوبی» لە هوتێلێک کرد لە «مایۆرکا» لە دورگەی «بالەریک» کە هی خۆی بوو. لەوێوە پێیگوت، کەوا دەستی لە کاروباری جیهانی سیخوڕێتییەوە هەڵگرتووە. هەندێک دەیانگوت لە کۆتایی حەفتاکاندا مەروان هەستی بەوە کرد، خاکی میسر لەژێر پێیدا دەکوڵێ و ئەویش گومانی لەو پەیوەندییە توندتۆڵەی لەگەڵ ئیسرائیل کرد، بۆیە بڕیاریدا بۆ هەتاهەتایە هەم میسر و هەم مۆسادیش بەجێبێڵێ.

لە ساڵانی دواتردا، مەروان زنجیرەیەک کاری بزنسانەی ئەفساناوی کردن. ئەو پارەکەی خۆی وا وەبەرهێنا، کە هەر زوو بەشێکی لە یانەی دوو گۆلی «چێڵسی» کڕی، لەو کاتەی کێبەرکێی «محەمەد الفاید» باوکی «دۆدی فاید» دۆستەکەی «شازادە دایانا»ی دەکرد لە کڕینی بازاڕە هەرە بەنرخەکەی «هارۆدس» لە لەندەن. ئەو توند بە ژیانی چێژ و ڕابواردنی خۆیەوە گیرسا بوو، بەردەوام پۆشتە و ڕێکپۆش دەردەکەوت و گۆبەندە عەشقبازیەکانی لە لووتکەدا بوون. جارێکیان هەندێ لە ئاژانەکانی سی ئای ئەی لە هوتێلەکەی خۆی لە نیویۆرکدا ویستیان

ببینن، بەڵام دەبوایە لە دەرەوە چاوەڕێی بکەن تا یارەکەی جلی دەکاتەوەبەر و لاباڵی هوتێلەکەش پاک دەکرێتەوە.

لە هەشتاکانیشدا، ناوی مەروان پەیوەست بوو بە چەند کردەی کڕینی چەکوتفاق بۆ ڕژێمەکەی قەززافی لە لیبیا و تیرۆرستەکان لە لوبنان. ڕۆژنامەنووسێکی ئەمریکی لە ڕاپۆرتێکدا نووسیبووی، کەوا مەروان ئاژانێکی سی ئای ئەی بانگهێشتی ماڵەکەی کردبوو، لەگەڵی چووبووە بەر حەوشە و ئاماژەی بە ترومبێلێکی ڕۆزڕایسی بریقەدار بۆ کرد، کە لەوێ ڕاگیرابوو، ئینجا پێیگوت: "ئەمەیان دیاری قەزافییە."

چیرۆکی پەیوەندی تیرۆرستانەی مەروان تەواو هەڵبەستراوە. مەروان نەیدەویست دەستی لەگەڵ تیرۆرستاندا تێکەڵ بکا و نەیدەویست ڕووبەڕوی مۆساد بێتەوە نەبادا ڕابردووەکەی وەک ئاژانێکی ئیسڕائیلی هەڵبدەنەوە و حوکمی مەرگی بەسەردا بدەن. خۆ ئەگەر مەروان لە سێبەریشدا دەستێکی لەگەڵ قەزافی یان تیرۆرستاندا هەبووایە، ئەوا بە هاوکاری تەواوی مۆسادەوە دەبوو.

بەڵام ساڵان هاتن و تێپەڕین، لە ٢٠٠٢دا، کتێبێک بە ناونیشانی (مێژووی ئیسڕائیل) لە لەندەن چاپ بوو. کتێبەکە لەلایەن لێکۆڵەرەوەی ئیسڕائیلی «ئاهرون بێرگمان» نووسرابوو، ئاماژەی بەو سووسەکارە کردبوو کە پێشوەخت ئیسڕائیلی لە قەومانی شەڕی یوم کیپور ئاگادار کردبووەوە. «بێرگمان» سیخوڕەکەی بە «زاوا» یەکە ناوبردبوو. ئەمەش نیشانەیەکی نزیک بوو بۆ کەسایەتییە گرنگەکەی؛ ئاخر فریشتەکە زاوای ناسر بوو. «نێرگمان» نووسیبووی کە پیاوەکە ئاژانێکی دووسەرە بووە، زانیاری ساختەی داوەتە ئیسڕائیل.

کتێبەکە ناوی مەروانی نەهێنابوو، بەڵام بووە مایەی تووڕەیی. ئەویش لە چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەی «ئەلئەهرام»ی میسری وەڵامی دایەوە و گاڵتەی بە لێکۆڵینەوەکەی «بێرگمان» کرد و بە "چیرۆکێکی بەدواداچوونی گەمژانەی" لەقەڵەم دا.

«بێرگمان»یش سووکایەتی پێکرا، بڕیاریدا لەسەر شەرەفەکەی خۆی بەدەنگ بێ، ئینجا ئەویش لە چاوپێکەوتنێکی «ئەلئەهرام»دا ڕایگەیاند کە "زاوایەکە" هەر بەڕاستی ئەشرەف مەروان بوو. ئەمەش تۆمەتبارکردنێکی قورس و ڕووشکێنانە بوو، بەڵام لە بەڵگەهێنانەوەدا کورتهێن بوو. تاوانبارکردنەکە هیچ کاریگەرییێکی نەبوو، تا ئەو ڕۆژەی «ئێلی زایرا» ڕایگەیاند کەوا سیخوڕە دوو سەرەکە، کە ئیسرائیلی "گەوجاندبوو" هەر بەڕاستی «ئەشرەف مەروان» بوو.

شتی وا هەرگیز لە ئیسرائیلدا ڕووی نەدابوو. لە زۆر بواردا تەنانەت دوای مردنیشیان ناسنامەی هەواڵدزی پێشوو ئاشکرا نەدەکرا. ئاخر خۆ هێشتا ئەشرەف مەروان لە ژیاندا ماوە، بارێکی ناسکی هەیە، نێچیرێکی ئاسانە بۆ بکوژانی موخابەراتی میسری. زڤی زامیر لە خانەنشینییە ٣٠ ساڵیەکەی گەڕایەوە و تێکۆشا پەیوەندی بە مەروانەوە بکاتەوە، بەڵام فریشتەکە ڕەتی کردەوە قسەی لەگەڵدا بکا. زامیر مەلوولانە گوتی: " ئەو نایەوێت قسەم لەگەڵدا کا، چونکە هەست دەکا نەم پاراستووە. من هەموو شتێکم کرد تا بیپارێزم، بەڵام تێیدا سەرنەکەوتم."

دوابەدوای ئاشکراکردنەکەی «زایرا»، زامیر بێدەنگیەکەی خۆی شکاند و بەتوندی هێرشی کردە سەر بەرپرسی پێشوی ئامان. بە ئاشکراکردنی نهێنیەکانی دەوڵەتی تاوانبار کرد. «زایرا»ش بەرسڤی دایەوە، گوتی کەوا *ڕامسادی* پێشوو پیاوێک دەپارێزێ کە هیچ نەبووە بەدەر لەوەی ئاژانێکی دووسەرە نەبێ.

«رۆنێن بێرگمان» ڕۆژنامەنووسی ئیسرائیلیش، کە سەیری بۆنەنامەیەکی فەرمی میسری بە زیندوویی دەکرد، بینی سەرۆک «حوسنی موبارەک» بە گەرمی دەستی مەروان دەگوشێ، کە لە دانانی چەپکە گوڵێک لەسەر گۆڕی عەبدولناسردا یاوەری کردبوو. دوای پەخشە تەلەفزیۆنەکە، «بێرگمان» نووسی، مەروان ئاژانێکی دووسەرە بووە. سەرۆک موبارەکیش بە هانای مەروان هات و بەتوندی ڕەتیکردەوە کە مەروان سیخوڕێکی ئیسرائیلی بووبێ.

ئیسرائیل لەنێو شەپۆلی تاوانبارکردن و دژەتاوانبارکردن دەهەژا. مۆساد و ئامان دوو لیژنەیان بۆ لێکۆڵینەوە دانان کە گەیشتنە هەمان ئەنجام: «مەروان» ئاژانێکی دووسەرە نەبووەو هیچ زیانێکیشی بە ئیسرائیل نەگەیاندووە. «زایرا»ش هەر وازی نەهێنا و زامیری ڕاکێشایە دادگا. دادوەری پێشوو «تیۆدۆر ئۆر» کە لە لایەن دادگاوە وەک ناوبژیکارێک داندرا، بە پێداگرییەوە سووربوو لەسەر ئەوەی کەوا ڕوانینی زامیر لەو بارەیەوە، ڕاستییەکەیە.

دیاربوو «زایرا» و پاڵپشتەکانی خۆیان لەو ڕاستییە نەبان کرد، کە مەروان یەکێک بووە لە بیچمە لەپێشەکانی حکوومەتی میسری، هەروەها بەوەی زاوای ناسر و لە ساداتیش نزیک بووە. سەرکردەکانی میسر نەیاندەویست پێ لەوە بنێن کە یەکێک لە خۆیان ناپاک و سیخوڕێکی زایۆنیستی بوو. ئاخر دانپێدانانێکی وا ڕای گشتی میسری دەهەژاند و بڕوا و متمانەی میسرییەکانیشی بە سەرکردەکانی لەقدەکرد. بۆیە ئەوان بەڕێگەی دیکەوە بۆی چوون: بە دەنگی بەرز بو لەنێو خەڵکدا پەسنی مەروانیان دا، بەڵام بەنهێنیش مۆریان لە بەختی دا.

لە سەرەتای حوزەیرانی ٢٠٠٧دا، دادوەر «ئۆر» دۆزینەوەکانی خۆی چاپ کرد. لە ١٢ی حوزەیرانیشدا، دادگایەکی ئیسرائیلی بە فەرمی

داخویانەکانی[220] زامیری لەسەر ڕۆڵی مەروان لەنێو دەزگەی مۆساددا پەسەند کرد. دوو هەفتەش دوای ئەوەو لە ٢٧ی حوزەیراندا، تەرمی مەروان لەسەر لاڕێیەکی چیمەنەکەی ماڵی ئەودا دۆزرایەوە.

چاودێرە ئیسرائیلییەکان دەزگەی نهێنی میسریان بە کوشتنەکە تاوانبار کرد. زۆریش هەبوو «زایرا»یان تاوانبارکرد، گوتیان ڕەفتارە کەمتەرخەمییانەکەی ئەو بووە مایەی کوشتنی کابرا. بە دیوێکی دیکەشدا لە لێدوانێکی تەواو سەرسامانەدا، بێوەژنەکەی مەروان مۆسادی بە کوشتنی مێردەکەی تاوانبار کرد. هەموو شاهیدەکانیش گوتیان کەوا بەر لە مردنی بە چەند خولەکێک چەند پیاوێکی بیچم ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیان لەنێو چیمەنەکە لەگەڵ ئەودا بینیوە.

پۆلیسی سکۆتلەندییش دۆزەکەی داخست و ڕاپۆرتی خۆی دا و بەتوندی پێداگیربوو لەسەر ئەوەی کە ناتواندرێ بکەرەکان بدۆزرێنەوە. هێشتاش بکوژەکانی فریشتەکە هەر بە ئازادی دەسوڕێنەوە.

---

[220] داخوویانی: لێدوان.

## بەندی پازدە: تەڵەیەکی هەنگوینی بۆ سیخوڕێکی ناوەکی

بەدەر لەوەی نیشانەیەک هەڵبگرێ و لێینووسرابێ *ئەز سیخوڕم*، دیاربوو «مۆردەخای ڤانونو» هەموو شتێکی کردبێ، تا ژیانە نهێنییەکەی خۆی نمایش بکا.

ئەو تەکنیککارێکی کوورەی ناوەکی «دیمۆنا» بوو، ئەو دامەزراوەیەی لە هەموو شوێنەکانی دیکەی ئیسرائیل ئاسایش پارێزراوترە. ڕۆژنامە بیانییەکان، هەروەک زۆر لە حکوومەتەکان، قەناعەتیان هاتبوو، کە ئیسرائیل چەکی ناوەکی لەژێر توانستێکی هەرە نهێنییدا بنیاد دەنێ. هەر هاووڵاتییێک داوای کارێکی لە دیمۆنا کردبا، ئەوا بە پێواژۆیەکی دوورودرێژی تێدەپەڕی، فۆڕم و فۆڕمکاری، لێکۆڵینەوە و چاوپێکەوتن و پرسیار و وەڵام، «شاباک»یش پاشخانی ئەو کەسەی هەڵدەدایەوە کە داوای کارەکەی دەکرد، تا لە دواییدا کۆتایی بە ڕێکارە کەنەفتەکە دەهات و ئەوان ڕێگەیان دەدا بچێتە نێو ئەو کۆمەڵگە نهێنییە. چاودێرییە چڕوپڕ و ئاسایشپارێزیی توندوبەندی شوێنەکە لەدوای دامەزراندنی کارمەندەکەش هەر کۆتایی نەدەهات.

«ڤانونو»ش دوای ئەوەی لە ڕۆژنامەیەکدا، ڕاگەیاندنێکی هەلی خستنەڕووی کاری بینی، داوای کارێکی لە کۆمەڵگەی دیمۆنا کرد. فۆرمی "لێکۆڵینەوەی توانستی ناوەکی" لە نووسینگەیەکی نزیک «بیرسەبعە» پڕکردەوە، ئینجا کەوتە بن باری پشکنین و لێکۆلێنەوەی ڕۆتینی ئاسایشپارێزی، ئینجا بەبێ هیچ گرفتێک لە شوێنەکە وەرگیرا.

ئەرێ ئەم کارە چۆن ڕێی تێچوو؟ ئاخر ئەو ڕادیکاڵێکی چەپگەرا بوو، برادەرەکانیشی عەرەبی کۆمۆنیستی بوون سەر بە پارتی «ڕاکاهـ»ی دژە زایۆنستی بوو؛ ئەویش بەشداری نارەزایەتییەکانی ئەوان بوو، وێنەشی لە هەرا و خۆپیشاندانی توندڕەوانی لایەنگری فەلەستینییەکان گیرابوو، دروشم و تابلۆی لە نارەزایەتییەکە هەڵگرتبوو. وتاری دابوو و لە میدیاشدا چاوپێکەوتنی کردبوو.

هەروەها ئەو میلیشیاکانی «ڕاکاهـ»ی لە ئەپارتمانە بچکۆلەکەی خۆی لە «بیرسەبعە»دا میوانی کردبوون، داوای کردبوو بچێتە نێو ڕیزی شانەکانی زانکۆکەیان، ڕاشکاوانەش لەگەڵ عەرەبە ڕادیکاڵەکان خۆی نمایش دەکرد، بە کراوەیەش نەیارێتی دژی دەوڵەتی ئیسرائیل دەردەبڕی. لە زانکۆی بنگۆریۆنیشدا، لەو شوێنەی کە ناوی خۆی وەک خوێندکار تۆمارکردبوو، بە ڕوانینە توندڕەوەکانی ناسرا بوو.

ئەو پیاوێکی زۆر بەهرەمەندبوو، بەڵام لەسەر ئاگردانی خۆی بنگرتی[221] نەدەبوو. بەر لەوە ببێتە لایەنگری «ڕاکاهـ»، ئەو سەر بە لاباڵێکی ڕاستڕەوی پێ لێهەڵبڕ بوو، بە پشتگیری باڵی ڕاستڕەوی هاتچییای (ڕێڤیڤاڵ)ی کرد، دەنگی دایە «لیکود» و لەدوایشدا بۆ ئەوسەری چەپ پەڕیەوە. ئەو دەیگوت، کەوا شەڕە بەمشتومڕەکەی ١٩٨٢ی لوبنان وای لێکردوە بیروبۆچوونی سیاسییانەی خۆی بگۆڕێ. ئەو کەسێکی تەنها و دوورەپەرێز بوو، تا ڕاددەیەک هیچ برادەریشی نەبوون، ئەو شێلگیرانە بڕوای وابوو لە ئیسرائیل لەبەرئەوەی لە بنەڕەتەوە مەراکشییە، بۆیە بە چاوێکی نەرێیانەی جیاواز سەیر دەکرێ. ئەو خۆبەتاوانبارزانینەی

---

[221] بنگرتی نەبوو: جێگیر نەبوو.

لەوکاتەوە سەریهەڵدا، کە لە تاقیکردنەوەی ئەکادیمیای هێزی ئاسمانی دەرنەچووبوو، ئینجا گواسترایەوە بۆ هۆبەی ئەندازیاری. دوای دەرکرانیشی لە هێزی بەرگری ئیسرائیلیەوە، بەشی ئەندازیاری لە تەلئەبیب خوێند، پاشان ڕای خۆی گۆڕی و چووە بیرسەبعە، لەوێ خەریکی خوێندنی ئابووری بوو، پاشان وازی لەوەش هێنا و بایدایەوە سەر فەلسەفە. ئەو بووە کەسێکی ڕوەکخۆر و پاشانیش وای لێهات هیچ بەروبوومێکی ئاژەڵ هەر نەخوا.

هاوپۆلەکانی بەوە سەرسام بوون کە ئەو شێتی پارەوپوولە. ئاخر ئەو فشەی بەوەوە دەکرد کە پێویست ناکا کار بکا، چونکە بە زیرەکی پارەکەی لە مارکێتێکی دراوگۆڕینەوەدا وەبەربهێنێ. لە ڕۆژژمێرەکەیدا ئەو پێشنۆرەیی داوەتە مارکێتە دراوگۆڕینەوەکە بەر لە فەلسەفە و ئینگلیزی. ئەو سواری ئاودییێکی سوور دەبوو، هەندێ پارەشی لە مۆدەی خۆڕووتکردنەوە بەدەستهێنا و لە جەژنی خوێندکارانیشدا نانی دەخوارد و بۆ خەڵات و پاداشت خۆی ڕووت دەکردەوە.

شێوەی ژیانی ئەو کاروبارێکی تایبەت بەخۆی بوو، بەڵام دەبوایە چالاکی سیاسیانەی وەک لایەنگرێکی «ڕاکاهـ» و پشتیوانی فەلەستینییەکان وایکردبا زەنگی ئاگادارکردنەوە لە دەروروبەری لێبدا. کەچی لەبری ئەوە، لە لایەن کاربەدەستەکانی «شاباک»ەوە بانگ کرا، کە چالاکییەکانی بوەستێنێ و داواشیان لێکرد بەڵگەنامەیەکی ئاگادارکردنەوە واژۆ بکا. کەچی ئەو نە بەڵگەنامەکەی واژۆ کرد و نە لەچالاکییەکانیشی وەستا.

«شاباک»یش جموجۆڵەکانی لە ڕاپۆرتێکی ڕۆتینی خۆیدا بۆ بەڕێوبەری ئاسایشی وەزارەتی بەرگری نووسی. بەڕێوبەرەکەش شتەکەی ڕادەستی

بەڕێوبەری ئاسایشی کوورەی «دیمۆنا» کرد، ئەویش فایلەکەی خستە نێو فایلەکانی خۆی، ئیدی هەر ئەوەندە بوو. هیچ کردەوەیەکی دیکەی دەرحەق نەکرا. هەموو ئەو زنجیرە ئاسایشپارێزییە، هەر کاربەدەستانی شاباکی خۆجێی تا ئاستی نیشتمانی و بەڕێوەبەرانی وەزارەتی بەرگری و دیمۆناش، لە ڕاییکردنی ئەرکەکانیان سەبارەت بەو پرسە، کەمتەرخەم بوون.

«ڤانونو»ش لەسەر چالاکییە سیاسییەکانی بەردەوام بوو، جارێکی دی هیچ کەس هەراسانی نەکردەوە.

ئەو کەسێکی "ڕاپەڕ" بوو لە دەزگەی ٢، ئەو هۆبە هەرە نهێنییەی لە کۆمەڵگەی دیمۆنادا کاری کرد. لە ژمارەی ٢٧٠٠ کارمەنددا، تەنها ١٥٠ کارمەند بۆیان هەبوو بچنە نێو دەزگەی ٢. ڤانونونش دوو کارتی هەبوون: ژمارە ٩٥٦٨-٨ کە بە هۆیەوە دەچووە نێو دەزگەی دیمۆنا بەگشتی، لەگەڵ کارتی ژمارە ٣٢٠ کە تایبەت بوو بە چوونەناو دەزگەی ٢.

لە دیوی دەرەوە، دامودەزگەی دیمۆنا وادیاربوو هەروەک ئەوەی باڵەخانەیەکی دوو نهۆمی بێ، کە کۆگاکانی هەندێ شتی سەرەکی و لاوەکی یەدەگی بەکارهێنانی دەزگەکەی تێدا داکرا بێ. بەڵام خەڵکانێک کە مێشکێکی ڕاڤەکارانەیان هەبووایە، تێبینی ئەوەیان دەکرد، کە کابینەیەکی ئەسانسێر لەسەر بانە تەختەکەی باڵەخانەکەدا هەیە و سەرسام دەبوون ئاخۆ باڵەخانەیەکی دوو نهۆمی چ پێویستی بە ئەسانسێر هەیە. کلیلی ئەم تەلیسمەش، لەڕاستییە شاراوەکەی دەزگەی ٢ دا بوو: ئاخر خۆ ئەسانسێرەکە پێویست نەبوو بۆ سەروو هەڵکشێ، بەڵکو دادەبەزییە

نهۆمەکانی خوارەوە، کە شاردرابوونەوە. ڤانونوش لە دەستەی کارمەندەکانی شوێنەکە بوو و بەباشیش بە باڵەخانەکە بەڵەد بوو. یەکەمین نهۆم دابەشبووە سەر چەندین نووسینگە و کافتریا. چەند دەرگەیەک لە نهۆمی سەر زەوی بۆ گواستنەوەی یۆرانیۆمی بەکارهێن بۆ کوورەکان هەبوون؛ هەر لە هەمان نهۆمیشدا، هەندێ نووسینگە و نیشانە هەبوون. لە یەکەمین نهۆمی ژێر زەمینەوە لوولەک و ئامێری هەواگۆڕکێ هەبوون. لە دووەمین نهۆمیش ژووری کۆنترۆڵی مەڵبەندی و جۆرە قەپەنگێک هەبوو؛ پێیدەگوترا "قەپەنگی گۆڵدا". میوانە گرنگەکان ئەوانەی بە تەواوی ڕێپێدراوبوون، لەوێوە سەیری هۆڵەکەی خوارەوەیان دەکرد. لە نهۆمی سێیەمی ژێر زەمینیەوە، تەکنیککارەکان کاریان لەسەر یۆرانیۆمی ڕەق و خاو دەکرد کە لەسەرەوە دەهاتە خوار. لە نهۆمی چوارەمیشدا بۆشاییەکی گەورە هەبوو کە بۆ بەرزی سێ نهۆم هەڵدەکشا و تێیدا پلۆتۆنیۆمی لێبەرهەم دەهێندرا و لە یۆرانیۆمە ڕەقەکە جیادەکرایەوە. نهۆمی پێنجەم هۆبە و تاقیگەی ئاسنین بۆ دروستکردنی بۆمب؛ لە نهۆمی شەشەمینی ژێرزەمینیدا پاشماوەی کیمیایی دەخرایە نێو کەندووی[222] تایبەت.

ڤانونو دەیزانی لە میانەی کاری ئاسایی ئەو کوورە ناوەکییەدا، چەندین زنجیرەی کاردانەوە پلۆتنیۆم پێکدەهێندرێ کە لە یۆرانیۆمی خاو و ڕەقەوە پەیدا دەبوو. دوای ئەوەی یۆرانیۆمەکە لە ڕەقایەتی خۆی

[222] ڕاستە کەندوو کاتی خۆی وەک سندووقێکی زۆر گەورە بۆ دانەوێڵە و شتی وا بەکاردەهات، بەڵام لێرە من بۆ کۆنتێنەرم، بەکارهێناوە، هیوادارم گونجاو بێ.

دادەتاشرێ، لە ئاستی چوار و پێنجەمدا کۆدەکرێتەوە و چەکی ناوەکی ئیسرائیلی لێدروست دەکرێ.

ڕۆژێکیان بێ هیچ هۆیەکی تایبەت، «ڤانونو» کامێرایەکی لەگەڵ خۆی بردە دەزگەی ٢. کامێراکەی خستە نێو هەگبەکەی، خستیە نێو ئەو کتێبانەی کە دواتر لەگەڵ خۆی دەیبردنە کلاسەکەی لە زانکۆی بنگۆریۆندا. خۆ ئەگەر لەسەر شاشەی ئاسایشپارێزیدا دەرکەوتبا و لێیان پرسیبا ئاخۆ بۆچی کامێرای لەگەڵ خۆی هێناوەتە نێو دامەزراوەی دیمۆنا؟ نیازی وابوو بڵێ، کە کامێراکەی لەنێو جانتاکەی لەبیرکردوە. بەڵام خۆ کەس جانتاکەی نەپشکنی، کەس پرسیاری لێنەکرد، ئیدی بە ئاسانی کامێراکەی خستە نێو لۆکەرەکەی. لەماوەی نانی نیوەڕۆ و پشووی ئێوارەدا، لەو کاتەی کەس لەنێو باڵەخانەکەدا نامێنێ، ڤانونو بە خۆی و کامێراکەی بە نهۆمی ژێرزەمینیدا دەگەڕێ و وێنەی تاقیگەکە، ئامێر و کەرەستەکان و هۆڵەکان و نەخشەی وردەکاری سەر دیوارەکان و دەروازەی نووسینگەکان و بەڵگەنامەکانی دۆلاب و خەزێنە کراوەکان دەگرێ. کەسیش نەیبینی و کەسیش گومانی لێنەکرد. دیاربوو پاسەوانە ئاسایشپارێزەکان ئەوکات ببوونە هەڵم. کاربەدەستانی سەرووی ڤانونو هیچ بیرۆکەیەکیان سەبارەت بە ئارەزووە دژوارەکەی ڤانونو نەبوو، بەڵکو ئەویان بە تەکنیککارێکی هێمن و جدی و جێگیر دانابوو.

✡ ✡ ✡

لە کۆتایی ١٩٨٥دا دوای نۆ ساڵ کارکرن لە دیمۆنادا، ڤانونو لەسەر کار دەرکرا. لادانەکەشی وەنەبێ لەسەر چالاکیە سیاسییەکانی بووبێ، بەڵکو بەشێک لە کورتهێنانی بودجەی خودی دامەزراوەکە بوو. ئەویش وەک

زۆر لە کارمەندەکانی دیکە لادرا. بەڵام لەبەرانبەردا بە ڕێژەی ١٥٠ی لە خزمەت و هەشت مانگ کرێ و مزی تەواوی دوای ئەوە وەک شتێکی دەستەبەر پێدرا. دیسان ئەو نامراد و تووڕە بووەوە. بڕیاریدا بە گەشتێکی دووردرێژ بچێتە هەندەران، لەوانەش بوو ئەگەر جێگە و ڕێگەیەکی باشی بدۆزیبایەوە هەر نەگەڕابایەوە و هەروەک ئەو ١٢ ملیۆن جووەکەی دیکە لە دەرەوەی ئیسرائیل بژیبایە. ئەپارتمان و ترومبێلەکەی خۆی فرۆشت و پارەوپوولی نێو بانکەکەشی ڕامالّی، ئینجا هەندەران خۆ بگرە هاتم.

«ڤانونو»ی تەمەن ٣١ ساڵە جانتای کردە شان و ڕێگەی گەشتێکی درێژی گرتەبەر. ئەو پێشتر جارێکیان گەشتێکی دووردرێژی بە ئەورووپا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا کردبوو. ئەمجارەیان ڕووی کردە ڕۆژهەڵاتی دوور. لەنێو هەگبەکەشیدا ئەو فیلمەی تێدا بوو، کە کاتی خۆی لەنێو دیمۆنادا وێنەکانی گرتبوون.

یەکەمین وێستگەی گەشتەکەی گریک بوو، پاشان ڕوسیا، تایلەند و نیپاڵ. لە «کاتماندو»دا، کیژێکی ئیسرائیلی بینی و بە شەرمەوە دلّداری لەگەڵدا کرد. ئەو خۆی وەک «مۆردی» ناساند و ڕاشکاوانەش ڕایگەیاند سەر بە باڵی چەپی پاسیفیستەکانە و لەوانەشە نەگەڕێتەوە ئیسرائیل. سەردانی پەرستگا بوداییەکانی کردن و کەڵکەڵەی وای لەسەر دابوو، ببێتە بوودایی.

دوای کاتماندو، ڤانونو گەشتی زیاتری بەرەو ڕۆژهەڵاتی دوور کرد، تا لە ئوسترالیادا گیرسایەوە. بۆ یەک دوو مانگ کارێکی سەیری لە «سیدنی»دا کرد، بەڵام زۆرینەی کات هەر بەتەنیایی و سەرگەردانی مایەوە. ئەنگۆرەیەکیان پیاسەیەکی بەنێو بێئابڕووترین گەڕەکی شارەکەدا

کرد، ئەو گەڕەکەی پڕ لەشفرۆش، دز و جەردە، سەوداکاری دەرمان و تلیاک بوو. لەو تاریکییەدا و لە بەرانبەریدا تیری سەر کڵێسای سەنت جۆرج بە دیارکەوت، ئەو شوێنەی ناودار بوو بەوەی داڵدەی گیانە تۆراو و نامراد، دز، بێنەوا، هەژار و نەدارانی لە پیاو و ژنانی تۆبەکار دەدا. ئیدی ئەویش لێ وەژوور کڵێساکە کەوت، لەوێ کەشیشێکی ئەنگلیکانی بەناوی «جۆن ماک نایت» بینی. کەشیشە چاکەکە یەکسەر تێگەیشت کە ڤانونو بەدوای ماڵ و خێزانێکدا دەگەڕێ. پەیوەندییەکی گەرموگوڕی لەگەڵ میوانە شەرمن و ناپارێزراوەکەدا کرد. لەو هەفتانەی بەدوایدا هاتن، هەردوو پیاوەکان گفتوگۆیەکی دوورودرێژیان لەگەڵ یەکدا کرد و لە کۆتاییشدا و لە ٧ی ئابی ١٩٨٦دا ڤانونو بووە کریستیان و سەرانشۆ[223] کرا وا ناوێکی نوێی لێندرا: «جۆن کرۆسمان».

ئەوەش بۆ جوویێکی گوێڕایەڵ، کە لە مەراکش لەدایک بووبێ و هەموو ژیانی گەنجێتی لە قوتابخانەکانی تەلموود یەشیڤیای بیر سەبعەدا بەسەر بردبێ، قەڵەمبازێکی گەورە بوو. ئەوەش ڕاست بوو ساڵانێک لەمەوپێش دینەکەی لاوازبوو، بەڵام لە دین وەرگەڕانەکەی لە ناسەقامگیری و دان بەخەتادا نان لە نامرادی لە جووایەتی، جیاوازتر بوو. خۆ ئەگەر هاتبا و نەچووبایە نێو ئەو کڵێسایەی «سەنت جۆرج» و باوکە «جۆن»ی نەبینیبایە، لەوانەبوو ببێتە بودایی یان دینێکی دیکە. بەڵام بە گەڕانەوەی بۆ باوەشی جووایەتی، دیسان گەڕایەوە ئیسرائیل. ئەو ڕقهەڵگرتنەی لە وڵاتەکەی هێدی هێدی بووە هاندەرێکی سەرەکی بۆ کردەوەکانی ئایندەی.

---

[223] سەرانشۆکردن: تەعمیدکردن.

لەمیانەی ئەو دیدارە کۆمەڵاتییانەی لەنێو کڵێسەکەدا، ڤانونو بۆ برادەرە نوێکانی باسی کارەکەی خۆی لە ئیسرائیل کرد، وێنای دامەزراوەی کارلێکەری دیمۆنای بۆ کردن، هەوڵیدا سلایدێکی نمایشی ئەو وێنانەش کە بە کامێراکەی گرتبوونی نیشانیان بدا. ئەوانیش هیچیان لێهەڵنەکڕاند؛ ئاخر ئەوان فریان بەسەر ئەو قسانەی ئەوەوە نەبوو. بەڵام لەوێدا پیاوێک لەنێو ئامادەبوواندا هەبوو، قسەکانی ئەو سەرنجی ڕاکێشابوو؛ ئەویش «ئۆسکار گوریرۆ»ی کۆلۆمبی بوو، کە گەشتیار و ڕۆژنامەوانێکی ناوبەناو بوو. پاشان هەر دوو پیاوەکە بەیەکەوە پەرژینی کڵێساکەیان بۆیە کردەوە، بۆ ماوەیەکیش لە هەمان ئەپارتماندا ژیان. «گوریرۆ» پەی بە بایەخی وێنەکانی ڤانونو برد و لە مێشکی خۆیدا وایدانابوو کە پارەیەکی زۆر دەکەن.

ڤانونوش زۆر پێویستی بە پارە بوو، بەڵام بیریشی لەوە کردەوە کە دەتوانێ بەو دەستکەوت و ناودارێتیەی پەیدای دەکا، تەکانێک بە ئاشتی نێوان ئیسرائیل و عەرەب بدا. ئەمەش پلانە بنەڕەتیەکەی ئەو نەبوو: ئاخر ئاشتی ئەو هۆکارە نەبوو کە لە سۆنگەیەوە ئیسرائیلی بەجێهێشتبوو، ئەو فیلمەش هەڵیگرتبوو، چەندین مانگەی پێشتر دنیای پێگەڕابوو. بەڵام خۆ پەیداکردنی برە پارەیەک و پاراستنی جیهان لە بۆمبی ناوەکی ئیسرائیل، دەبێتە دنەدەرێکی مێرخاسانە بۆی. بە تێپەڕینی ڕۆژیش، جەنگی تایبەتیانەی لە دژی پڕۆژەی ناوەکی ئیسرائیل پەرەی دەسەند، ئیدی بووە هۆکارێکی سەرەکی بۆ ئەوەی ئەو وێنانەی بڵاوبکاتەوە. بەڵام ڤانونو لەوەش تێگەیشتبوو، کە وەک ئیسرائیلییێک کۆتایی پێ دێ. ئاخر ئەگەر شتەکان بڵاو بکاتەوە هەرگیز ناتوانێ بگەڕێتەوە ئیسرائیل، چونکە ئەوکات وەک ناپاک و دوژمنی دەوڵەت دەسوتێندرێ.

بەڵام وێڕای ئەمەش، هێشتا مجێزەکە هەر مەزن بوو. ڤانونو و گۆریرۆ بە یەکەوە لە «سیدنی» چوونە تاقیگەیەکی وێنەشوشتنەوە. ئەو وێنانەی دەزگەی ٢یان شوشتنەوە و هەوڵیاندا لە نووسینگە خۆجێیەکانی گۆڤارە ئەمریکایی و تەلەفزیۆنە ئوسترالیەکان نزیک بکەونەوە، ئەمما بێهودە بوو. ئەو دەزگە میدیایانە شتەکەیان بەهەند هەڵنەگرت و وایان دانا، کەوا ئەو ساختەکارانە بە دوای پارەی مفتدا[224] دەگەڕێن. کەس بڕوای بەو پیاوە گەنجە شەرمن و تەرکەدنیایە نەدەکرد، کە وێنەی نهێنیترین دامودەزگەی ئیسرائیلی پێبێ.

لەکۆتاییدا گوریرۆ بەرەو ئیسپانیا و ئینگسلتانێ فڕی، ئەم جارەیان زێڕی دۆزیەوە. نووسەرانی سەندەی تایمزی لەندەنی، کە گوێیان لە چیرۆکە بوو، لە توانستی دراماتیکی ئە وتارەی دەربارەی کوورەی ناوەکی ئیسرائیلی دەنووسرێ، تێگەیشتن نەخاسمە ئەگەر هاتوو بە وێنە و نەخشە و هێلکارییەکان پاڵپشت بێ. لەگەڵ ئەوەشدا دەبوایە زۆریش وریا بان. ئاخر لەمێژ نەبوو ئەوان ئازاریان بەدەست بڵاوکردنەوەی "یاداشتەکانی هیتلەر"ەوە چەشتبوو، کە پێشتر کڕیبوویان و دواتر دەرچوو هی فشەکەرێکی دەستی دووەمیشە. هەر بۆیە، داوای تاقیکردنەوەیەکی تەواوی ئەو کەرەستانەیان کرد کە «گوریرو» لەگەڵ خۆی هێنابوونی.

لەو نێوەشدا تەلەفزیۆنێکی فەرمی ئوستڕالی پەیوەندی بە باڵوێزخانەی ئیسرائیلی لە «کانبێرا»وە کرد، بەوەی کابرایەکی سەیر بە خۆی و هەندێ وێنەی دامەزراوەی دیمۆناوە هاتووە و هاووڵاتی ئیسرائیلییشە.

---

[224] پارەی مفت: ئەو پارەیەی لە خۆڕا و بێ ماندووبوون پەیدا بەبێ.

چیرۆکەکە بەرگوێی ڕۆژنامەوانێکی ئیسرائیلی کەوت، کە هەواڵنێرێکی ڕۆژنامەکانی تەلئەبیب بوو.

ئیدی وەک هەورەبروسکە، دەزگەی هەواڵگری نهێنی ئیسرائیلی هەژا: ئاخر کارمەندێکی پێشووی دەزگەی کارلێکەری ٢ ی دیمۆنا هەوڵیداوە چارەنووسسازترین نهێنی ئیسرائیلی بفرۆشێ. «حایم کارمۆن» بەڕێوبەری ئاسایشپارێزی وەزارەتی بەرگری بێدەرەتانانە گوتی: "سیستمەکە شکستی هێنا، ئێمە لەکاتی خۆیدا نەمانگرت."

هەواڵەکە گەیشتە دەستەی سەروەزیر – شیمۆن پێرێزی سەروەزیر و سەروەزیرەکانی پێشوو ڕابین و شامێر- ئەندامی یەکەی نیشتمانی حکوومەت بوون. بڕیارياندا دەستبەجێ ڤانونو بگرن و بیهێننەوە ئیسرائیل. هەندێ لە یاریدەدەرانیان پێشنیازی کوشتنیان کرد لەجیاتی ئەوەی بیگرن و بیهێنەوە وڵات، بەڵام ئەو بیرۆکەیە پەسەند نەکرا. سەروەزیر دەستی دایە تەلەفۆن و زەنگی بۆ *ڕامسادە*کە لێدا.

✡ ✡ ✡

لە ١٩٨٢ەوە، مۆساد بەڕێوبەرێکی نوێی هەبوو: «ناحوم ئادمۆنی» بوو. پاش نزیکەی بیست ساڵ لەدوای ئەوەی ژەنەڕاڵەکانی هێزی بەرگری لە پشت مێزی بەڕێوەبەرایەتی مۆسادا دانیشتبوون، لە دواییدا ڕێکخراوەکە سەرۆکێکی نوێ پەیدابوو، کەسێک کە لەنێوەوە کاری بۆ دەکرد. ناحوم ئادمۆنی لە ئۆرشەلیم لەدایک ببوو، کارمەندێکی دێرینەی هەردوو

دەزگەی «شای» و «ئامان» بوو. ئەو جێگری «ئیسحاق هۆفی» بوە، دوای خانەنشینبوونی «هۆفی» لە ١٩٨٢دا، جێگەی گرتەوە و بووە ڕامساد. ئەو حەفت ساڵی بە *ڕامسادی* ڕاکێشا، بەڵام خۆ ئەو حەفت ساڵانە لە ساڵە هەرە باشەکانی کۆمەڵگەی هەواڵگری نەبوون. لەنێوان ١٩٨٢ - ١٩٨٩دا چەندین ڕوداو مۆسادی هەراسان کرد: کێفەڕاتی[225] «پۆلارد»، لەو کاتەدا تەقییەوە کە شرۆڤەکارێکی مەدەنی هەواڵگر لە واشنتن بە تۆمەتی سووسەکاری بۆ یەکەی هەواڵگری ئیسڕائیلی – گۆڵمەزی کۆنترا ئێران- گیرا، ئیسڕائیلیش تێوەگلابوو، بە هۆیەوە کۆمەڵێک لە ئاژانەکانی مۆساد لە هەندەران لە سۆنگەی کەمتەخەرمییەوە گیران؛ بەڵام خۆ زیانە هەرە گەورەکە بەر ئیسڕائیل کەوت، بە دڵنیاییشەوە بە هۆی مۆردەخای ڤانونووە بوو. هەر ئەو کاتەی «شیمۆن پێرێز» زەنگی بۆ «ئادمۆنی» لێدا، ئەویش دەستبەجێ ئۆپەراسیۆنێکی بۆ گرتنی ڤانونو بەگەڕخست. هەرزوو کۆمپیوتەریش کۆدەناوێکی بۆ ئۆپەراسیۆنەکە دانا: «کانیوک».

✡ ✡ ✡

بە پەلە ناحوم ئادمونی یەکەی «کاسارای» ڕەوانەی ئوستراليا كرد تا ڤانونو بدۆزنەوە. بەڵام بە گەیشتنی ئەوان، بۆیان دەرکەوت کە درەنگ کەوتوون. ئاخر چۆلەکەکە فڕیبوو، خۆی گەیاندبووە ئینگلستانێ.

---

[225] کێفەڕات: گۆڵمەز، گۆبەند، کارەسات.

ئەوەبوو کەمێک دوای دیدارەکەی «گوریرو»، سەرنووسەری «سەندەی تایمز»، ئەستێرەی بەشی ناوخۆی هەفتەنامە، «پیتەر هاونامی» ناردبووە ئوسترالیا تا چاوی بە ڤانونو بکەوێ. کاتێکیش سواری فڕۆکەکە بوو، زانیبوی زانا ئینگلیزەکان هەندێ لەو وێنانەی «گوریرو» لەگەڵ خۆی هێنابوون، پشکنیبوو، بۆیان دەرکەوتبوو کە وێنەکان ڕاستەقینەن. ئیدی دانیشتنەکەی ڕۆژنامەنووسەکە لەگەڵ ڤانونودا لە سیدنی بەرهەمی هەبوو، بڕوای بە نوێنەری هەفتەنامەکە هێنا، کە چیرۆکی کابرا ڕاستییە. ئەو بە شێوەیەکی تایبەت بە حاشالێکردنەکەی ڤانونو لەو قسەیەی کە گۆریرۆ گوتبووی، گوایە ڤانونو زانایەکی ئیسرائیلییە، کارانگاز ببوو. ئاخر ڤانونو ڕاستییەکەی پێگوتبوو: ئەو تەنیا تەکنیککارێکی دامودەزگەی دیمۆنا بوو.

ئینجا ڤانونو لەگەڵ «هاونام»دا بەرەو لەندەن فڕین و گوریرۆیان لە ئوسترالیا بەجێهێشت. لە لەندەنیشدا، ڤانونو لە لایەن کەسانی هەفتەنامەکەدا خرایە بن لێکۆڵینەوەیەکی چڕوپڕ. ئەو هەموو ئەو شتەی دەیزانی، پێیگوتن، بۆ بەریتانیەکانیش پەردەی لەسەر بۆمبی نیترۆنی هەڵدایەوە، کە لە توانایدا هەبوو زیندەوەرەکان بکوژێ بەڵام بینا و باڵەخانە و ژێرخان بە دەستلێنەدراوی بهێڵێتەوە. هەروەها وێنای ئەو ڕێکارانەشی بۆکردن کە بۆ کۆکردنەوەی بۆمب لە دەزگەی ٢دا دەکران. هێشتاش دوای ئەو هەموو ماوەیە دیاربوو دەترسا و پەشۆکاو بوو. ئەو دەترسا لە لایەن دەزگەی هەواڵگری ئیسرائیلییەوە بکوژرێ یان بڕفێندرێ. کارمەدانی «سەندەی تایمز»یش هەوڵیاندا هێوری بکەنەوە؛ ئەوان بردیانە هوتێلێکی دیکە و دەستەیەک لە کارمەندەکانی خۆیان خزمەتیان کرد و ببونە چاودێر بەسەر میوانە گرانبەهاکەیان، وەک چۆن ئاگایان لە مندالی

ساوا دەبێ ئاوا بوون. ئەوان -بێهودە- مکوڕ بوون، بەوەی نابێ بە تەنیا بەنێو شەقامەکاندا بسووڕێتەوە.

کاتێکیش لێکۆڵینەوەکە تەواو بوو، ئەوان بڕە پارەیەکی باشیان خستەبەردەم: ١٠٠،٠٠٠ دۆلار بۆ چیرۆک و وێنەکانی، ٤٠٪یش لە مافی دابەشکردنی وتارەکانی ڕۆژنامەکان و ٢٥٪یش لەو کتێبانەی بڵاودەکرێنەوە -ئەگەر باسوخواسی کتێب بێتە گۆڕێ-. ئەوان پێیان گوت، کەوا ماخۆی سەندەی تایمز «ڕوپێرت مەردۆخ» خاوەنی کۆمپانیای فیلمسازی توێنتی سەنچری فۆکس Twentieth Century Foxە، بیر لەوە دەکاتەوە فیلمێک لەسەر ژیان و ڕۆژگاری ڤانونودا سازبکا. لەوانەیە ڕۆڵی ڤانونو لە لایەن «ڕۆبەرت دە نیرۆ» بگێڕدرێ.

خانەخوێکانی ڤانونو لە لەندەن هەموو شتێکی لەدەستهاتوویان بۆ ڤانونو بەدیهێنا تەنیا یەک شت نەبێ: ئەویش ژن بوو. ئاخر کە ڤانونو بۆ سێکس و باوەشی گەرمی ئافرەتێک برسی بوو، هیچی بەدەست نەکەوت. کاتێکیش لەنێو ستافی سەندەی تایمز ئەندامێکیان «ڕۆوێنا وبستەر»ی شۆخ و شەنگ هەبوو، ڤانونو بێهوودە هەوڵیدا سەرنجی خانمەکە بۆخۆی ڕابکێشی و لەگەڵی جووت بێ، بەڵام ڕەتیکردەوە. سێکس قۆچی قوربانیەکە بوو، بەڵام نووسەرە زیرەکەکانی سەندەی تایمز لییتێنەگەیشتن.

هەروەها ئەوان لەوەش نەگەیشتن کە ترسی ڤانونو لە دەزگەی هەواڵگری ئیسرائیلی، ڕاست و دروستە. یەکێک لە هەواڵنێرە تێگەشتووەکان نێردرایە ئیسرائیل تا بزاندرێ ئەوەی ڤانونو دەیڵێ ڕاستە. ئەو لەبارەی ئەوەوە قسەی لەگەڵ ڕۆژنامەوانێکی ئیسرائیلی کرد، ئەویش دەستبەجێ لە لایەن

خۆیەوە «شاباک»ی لێ ئاگادار کردەوە. ئیدی هەر یەک دوو سەعات دوای ئەوە تیمێکی چەند کەسی گەیشتنە لەندەن. تیمەکە لە لایەن جێگری ڕامساد «شاباتی شاڤیت»ەوە سەرپەرشتی دەکرا. ئۆپەراسیۆنەکەش بە فەرماندەی جێگری دوەمی ڕامساد و سەرۆکی کاساریا «بنی زیڤی» بوو.

دوو لە ئاژانەکانی مۆساد خۆیان وەک وێنەگر نیشاندا و چوونە نێو باڵەخانەی سەندەی تایمز و چەند وێنەی کرێکارە نارەزایەکانیان گرت کە ئەوکات خۆپیشاندانیان کردبوو. دوای یەک دوو ڕۆژیش ڤانونویان بینی و وێنەشیان گرت و بە دوایدا چوونە شەقامەکانی لەندەن، ئەوان شێوازی "شانە"یان بەکارهێنا کە لە لایەن «زڤی مالکین» ئاژانی دێرینی مۆسادەوە پەرەی پێدرابوو. وێڕای ئەوەی ئاژانەکان سایەی گومانلێکراوەکە دەکەن، ئەو ناوچەیەی سەردانیشی دەکا گسکی دەدەن، هەروەها لەگەڵ ئەو شوێنانەی پێشتر سەردانی کردبوو. بەم جۆرە لە ٢٤ی ئەیلوولدا، ڤانونو گەیشتە گۆڕەپانی «لیسیستەر»، کە خۆشەویسترین شوێنی گەشتیارانە. لەلای ڕۆژنامەکاندا ئەو کیژێکی بینی "زۆر بە «فاراه فاوێت»ی ئەستێرەی زنجیرە نمایشی تەلەفزیۆنی "فریشتەکانی چارلس" دەچوو.

کیژەکە moوزەردێکی جوان بوو، بە چاوی ڤانونوش "شۆخ و پەری" بوو. لەو کاتەی کچەکە لە ڕیزێک لەبەردەم کۆتەڵێک ڕاوەستا بوو، ڤانونو بەرەو لای کشا. کچەکەش ئاوڕێکی دایەوە و ڤانونوی بینی، نیگایەکی درێژی ئەفسووناوی. نیگاکانیان بۆ ساتێک لەیەک گیر بوون، ئیدی نۆرەی کچەکەهات و ڕۆژنامەیەکی کڕی و لەوێ ڕۆیشت. ڤانونوش لێیوەرسوڕایەوە، بەڵام هەموو ئازایەتی خۆی کۆکردبووەوە و داوای لە کیژەکە کرد، بەڵکو یەک دوو قسە بەیەکەوە بکەن. کیژەکەش بە

بزەکردنەوە سەری قایلبوونی بۆ لەقاند. دەمەتەقێیەکی سەرپێییان کرد. کیژەکە خۆی ناساند کە ناوی «سیندی»یە، کچە جوویێکی ئارایشتکار لە فیلادلڤیاوە، گوایە بە پشوویێک هاتۆتە ئەورووپا.

ڤانونوش بە گومان بوو. لەو یەک دوو ڕۆژەی دوایدا دەمارەکانی گرژ بوون. خەڵکی سەندەی تایمز بێ کۆتایی هەر چاوپێکەوتنیان لەگەڵ سازدەدا و بڵاوکردنەوەی چیرۆکەکەشیان وەخراندبوو. ترسیشی لە دەزگەی هەواڵگری ئیسرائیلی زیاتر ببوو، بەتایبەتیش دوای ئەوەی بۆیان ڕونکردبووەوە کە ڕۆژنامەیەکی وەک سەندەی تایمز، چاوپێکەوتنەکانی دەنێرێتە لای بەرانبەریش تا بۆچوونیان بزانێ. ئیدی ئەو هەستی بە تەنیایی و تورەیی و بێ ئۆقرەیی دەکرد.

ئەمە بوو، هەمووی هەر لەپڕ بوو — کە «سیندی» هاتە نێو یاریەکەوە.

✡ ✡ ✡

- "ئەرێ تۆ سەر بە مۆسادی؟" بە نیوە گاڵتەیەکەوە «ڤانونو» وای لە کچەکە پرسی.
- "نا، نەخێر،" کچەکەش وەها وەڵامی دایەوە؛ "نەخێر. ئەرێ مۆساد چییە؟"

ئینجا کچەکە پرسیاری ناوەکەی لێکرد.

- "جۆرج." ئەو وەهای پێگوت.

ئەمەش ئەو ناوە بوو کەلە دابەزینی هوتێلەکەدا ناوی خۆی پێ تۆمارکردبوو.

- کچەکەش خەندەیەکی بۆ کرد: "دەی وەرە. خۆ تۆ جۆرج نی."

کاتێکیش چوونە قاوەخانەکە، ئینجا ڤانونو ناوە ڕاستەقینەکەی خۆی بۆ ئاشکرا کرد، باسی هەفتەنامەی سەندەی تایمز و کێشەکانی خۆیشی بۆ کرد. دەستبەجێ کیژەکە پێشنیازی ئەوەی بۆ کرد بچێتە نیویۆرک، کە دەتوانێ لەوێ ڕۆژنامە و پارێزەری باشی بۆ بدۆزێتەوە.

بەڵام خۆ ئەو گوێی لێنەگرت، بە ڕاستیش گوێی لەو پێشنیازەی نەگرت. «مۆردەخای ڤانونو» هەر لەیەکەم نیگاوە کەوتبووە داوی خۆشەویستی کچەکەوە. ئەو چەندین جاری دیکە لەو یەک دوو ڕۆژە کەمەی بە دوای یەکەم دیداریاندا هات، «سیندی» بینی، بەگوێرەی قسەی خۆیشی ئەو ڕۆژانەی، خۆشترین ڕۆژانی ژیانی بوون. ئەوان بە یەکەوە بەنێو پارکەکاندا پیاسەیان کرد، دەستیان خستە نێودەستی یەکدییەوە، چونە سینەما و سەیری فیلمەکانی "شاهیدەکان" هاریسۆن فۆرد و فیلمی "هانا و خوشکەکانی" ودی ئالێنیان بینی. هەروەها ئەوان بەیەکەوە نمایشی موزیکیان لەسەر جادەی ٤٢دا بینی و زۆریشیان ماچومووچ کردن. ئەو ئامێزە گەرمە و ماچە شیرینانەی ئەوێ دەمێی هەرگیز لەبیر نەدەچوونەوە.

«سیندی» ماچی گەرمی پێبەخشین، بەڵام لێبڕاوانەش ڕەتیکردەوە لەگەڵی جووت بێ. خاتوونەکە پێیگوت ناتوانێ بانگهێشتی ژووری هوتێلەکەی خۆی بکا، چونکە لەگەڵ کیژێکی دیکە لە ژوورەکەدایە؛ هەروەها ئەوەشی

ڕەتکردەوە کە لەگەڵ ڤانونودا بچێتە هوتێلەکە. کچەکە هەر پێی دەگوت کەوا ئەو وروژاو و هەڵچووە، ئەمەش نابێ. ئاخر ئەمە لە لەندەن نابێ.

ئینجا کچەکە بیرۆکەیەکی هەبوو: "باشە بۆچی لەگەڵم نایەیتە ڕۆما؟ خوشکم لەوێ دەژیێ، لەوێ ئەپارتمانێکی هەیە، دەکرێ لەوێ کاتی ڕاستەقینەی خۆمانمان هەبێ و لەوێ هەموو خەمێکی خۆت بەبا دەدەی."

ڤانونو لەسەرەتادا ئەم پێشنیازەی کچەکەی ڕەتکردەوە. بەڵام خۆ «سیندی» لەسەر چوونە ڕۆما هەر سوور بوو و بلیتێکی بزنسکلاسیشی کڕی، کاتێکیش لەکۆتاییدا توانی قەناعەت بە کوڕەکە بێنێ، بلیتێکیشی بۆ ئەو کڕی و پێیگوت: "لە دواییدا پارەکەم بۆ ببژێرەوە."

کوڕەش بەرگەی ئارەزووە شێتانەکەی خۆی نەگرت و خۆی بەدەستەوە دا.

خۆ ئەگەر ڤانونو پیاوێکی هۆشمەند بوایە، هەردەبوو ڕاستەوخۆ تێگەیشتابیە، کە کەوتۆتە داوێکی هەنگوینی – دۆخی دەزگەی هەواڵگری نهێنی بۆ سەرکێشکردن و دنەدانی مجێز بە ئافرەت. هەروەک ئەو حاڵەتە، کە کچێک لەسەر شەقام دەبینێ و تەواو بۆی دەڕووخێ و ئامادەیە هەموو شتێکی بۆ بکا- لەگەڵ خۆی دەیباتەماڵی خوشکی لە ڕۆما، هەرچەندە بە ئاستەم دەیناسێ بەڵام بلیتێکی فڕۆکەشی بۆ دەکڕێ. ئاخر کە کچەکە ناتوانێ لە لەندەن لەگەڵیدا سەرجێ بکا، کەچی لە ڕۆما دەتوانێ وابکا، ئەمە چەندی بە چەند. پیاوی خاوەنهەست دەبوایە لێکیبدابایەوە، کە چیرۆکی کچەکە گوماناویە، تەنانەت گەوجانەشە. بەڵام دەروونناسانی مۆساد ئەم جارەیان کاری خۆیان بە باشی ڕاییکردبوو:

کتومت دەیانزانی ڤانونو هەڵوەدای چییە، هەروەها دەیانزانی چۆن بە ماچێکی شیرین نابینا بووە و لەوەش بەڵێنی شیرینتر لە لایەن ژنێکی ناسک و نازدار و سێکسی.

«پیتەر هاونام»ی سەندەی تایمز، پیاوێکی هەستیار بوو. هەر کاتێک بە باسوخواسی «سیندی» زانی، هەستیکرد شتێکی شاش لە ئارادایە. هەوڵیشیدا قەناعەت بە ڤانونو بێنێ کە چیدی کیژەکە نەبینێ، بەڵام قسەکانی هەر ئاسنی سارد کوتان بوو. ڤانونو دانی داوەکەی خواردبوو، هیچ شتێکی ئەو دنیایە وایلێنەدەکرد ڕایەکەی پێبگۆڕێ.

جارێکیان داوای لە «پیتەر» کرد بە ترومبێلەکەی خۆی بیگەیەنێتە ئەو قاوەخانەیەی کە «سیندی» چاوەڕێی دەکا، پیتەریش نیگایەکی لە ژنە گەنجە نازدارەکە کرد (دواتر لەسەر ئەو کورتە دیدارەیدا توانی ئادگاری ڕووخسارەکەی بکێشێ). کاتێکیش «پیتەر» بە نیازی ڤانونوی زانی کە بە تەمایە "بۆ یەک دوو ڕۆژ" شارەکە جێبێڵێ، دیسان هەوڵیدا لە سەفەرەکەی سارد بکاتەوە، بەڵام هەر بێهودە بوو. هێشتاش هەر هۆشداری دایە ڤانونو، نەکا وڵاتەکە بە جێبێڵێ و پاسپۆرتەکەشی لەلای کارمەندەکەی پرسگەی پێشوازی هوتێلەکە دانەنێ. بەڵام خۆ «پیتەر هانام»یش بیری بۆ ئەوە نەدەچوو، کە ڤانونو بۆ ڕۆما بفڕێ، هەر بۆ ئەوەی بتوانێ لەگەڵ «سیندی» بنوێ.

«سیندی»ش لەبەر هۆکارێکی تەواو جیاواز، قایلببوو لە ڕۆما لەگەڵ ڤانونو بنوێ. ئیسرائیل نەیدەویست ڤانونو لەسەر خاکی بەریتانیا بڕفێنێ. ئاخر «شیمۆن»ی سەروەزیر نەیدەویست تووشی هیچ ڕووبەڕووبوونەوەیەکی گەورە لەگەڵ مارگرێت تاتچەر، "خانمە ئاسنینەکە"

ببێ. مۆسادیش لە بەریتانیای مەزندا هەستی بە ئاسوودەیی نەدەکرد. چونکە هەر یەک دوو مانگی پێشتر بوو، دەسەڵاتدارانی ئاڵمان لەناو چاوەیەکی تەلەفۆندا جانتایەکیان دۆزیبووەوە، کە هەشت پاسپۆرتی ساختەکراوی بەریتانیای تێدا بوو. بۆ بەدبەختیش دۆزەکە سەریکێشا بۆ ئاشکراکردنی ناسنامەی خاوەنەکەی و پەیوەندی لەگەڵ باڵوێزخانەی ئیسرائیلی لە لەندەن. حکوومەتی بەریتانیاش زۆر تووڕە بوو؛ مۆسادیش دەبووایە بەڵێن بدا چیدیکە سەروەری بەریتانیا پێشێل نەکا. هەر بۆیە، چ «شیمۆن پێرێز» و چ مۆساد بیریان لەوە نەدەکردەوە کە ئۆپەراسیۆنێکی شاراوە لە بەریتانیای مەزندا بکەن.

ڕۆما باشترین دەرەتانیان بوو. پەیوەندی نێوان مۆساد و دەزگەی هەواڵگری نهێنی ئیتالییەکان گەرموگوڕ و توندوبەند بوو. «ناحوم ئادمونی» ڕامساد و «ئادمیرال فولڤیۆ مارتینی» سەرۆکی دەزگەی هەواڵگری ئیتالیا، ببوونە برادەری باشی یەکدی. لەو پاشاگەردانییە درێژخایەنیەی باڵی بەسەر ئیتالیادا کێشا بوو، دڵنیابوون لەوەی هەرگیز ئیتالیا ناتوانێ ئەوە بسەلمێنێ کە ڤانونو لەسەر خاکەکەی ڕفێندراوە.

✡ ✡ ✡

«سیندی» و «مۆردی[226]» لە ٣٠ ئەیلوولی ١٩٨٦دا، دەست لەناو دەست سواری گەشتەفڕینی ژمارە ٥٠٤ی هێڵی ئاسمانی بەریتانی بوون بەرەو

[226] مەبەست مۆردەخای ڤانونوە.

ڕۆما فڕین. کاتێکیش لە سەعات نۆی شەودا هەردوو دڵدارەکە گەیشتن، پیاوێکی دڵخۆش بە چەپکە گوڵێکەوە پێشوازی لێکردن. کابرای پێشوازیکەر بە ترومبێلەکەی خۆی، میوانەکانی گەیاندنە ئەپارتمانەکەی خوشکی سیندی. لەماوەی گەشتەکەشدا، «سیندی» دەستی هەر لەناو دەستی «مۆردی» بوو، بەردەوامیش دڵدارە شادمانەکەی ماچ دەکرد.

ترومبێلەکە لەلای خانووێکی بچووک وەستا و کچەکەش دەرگەکەی کردەوە. ڤانونو یەکەمین کەس بوو لێوەژوور کەوت. لە هیکەوەش دەرگەکەی لە دواوە لەسەر داخرا، ئینجا دوو پیاو بازیان بۆ هەڵدا و تێروپڕ کوتایان، قوترەترێنیان[227] کرد و فڕێیان دایە سەر ناوکەوەکە. ئەویش سەرنجیدا، یەکێک لە پیاوەکان مووزەردە. لەو کاتەی دەست و پێیان بەستن، کچەکە دانەویەوە و دەرزییێکی لە قۆڵی دا. ئیدی هەموو شتێک تەڵخ بوو، کەوتە خەوێکی گران.

ڤانێکی بازرگانی کە ڤانونوی لەهۆشچووی تێدابوو، بەرەو باکووری وڵات لێخوڕا. ترومبێلەکە بۆ چەندین سەعات هاژۆترا؛ لەلای ڤانونووە دوو پیاو و ژنێک هەبوون. دوای یەک دوو سەعات دەرزییێکی دیکەیان لێدایەوە. «سیندی»ش ونبوو. ترومبێلەکەش گەیشتە بەندەری «لا سپێزا»: لەوێ ڤانونو ڕاکێشرایە نێو بەلەمێکی خێرا و بەرەو دەریای کراوە هاژۆترا کە لەوێ کەشتی «تاپوز»ی بارهەڵگرەکە چاوەڕێبوو (بەگوێرەی سەرچاوەی دیکە کەشتی ئێس ئێس نۆگا بوو). داوا لە ئەندامانی تاقمی کەشتییەکە کرابوو بچنە نێو کابینەی تاقم و لەوێدا بمێننەوە. بەڵام ئەوانەی ئەرکی

[227] قوترەترێن: حەسیرمەیدان.

چاودێرییان هەبوو، بینیان بەلەمێکی خێرا گەیشتە ئەوان. کندرە[228] پەیژەیەک فڕێدرا خوارەوە، دوو پیاو و ژنێک بەسەریدا سەرکەوتن. ئەوانیش پیاوێکی بێهۆشیان هەڵگرتبوو و هێنایانە یەکەمین کابینەی هاوکارەکانیان و دەرگەیان لەسەر گاڵە دا. ئەوسا دەستبەجێ کەشتیەکە بە ئاراستەی ئیسرائیل کەوتەڕێ.

ڤانونو لە تەواوی گەشتەکەی ناو کەشتییەکەدا هەر لەنێو کابینە بچکۆلەدا هێڵدرایەوە. ئەو چیدی «سیندی» نەبینییەوە. ئەو خەمی کیژەکەی بوو. نەیدەزانی ئاخۆ چی بەسەردا هاتووە. ئەو تێنەگەیشت، کەوا کچەکە ئەندامی دەستەکەی مۆساد بوو؛ ئەو هەر لە دەروازەی خانووەکە جێیهێڵا و لەوانەشە هەر ئەو کاتیش ئیتالیای جێهێڵا بێ. ئەو ژنەی یاوەری ڤانونوشی بۆ نێو کەشتییەکە کرد، پزیشک بوو، بەردەوام لەماوەی گەشتەکە دەزری سڕکردنی تێسرەواند.

لە مەودایەکی زۆر دووری کەناراوی ئیسرائیل نەبوو، کە کەشتیەکە لەنگەرەکەی خۆی فڕێدایە خوار، لەوێ ڤانونو گواسترایەوە سەر گەمییێکی مووشەک هەڵگر. لەوێ لە لایەن ئەفسەرەکانی پۆلیس و ئاژانەکانی شاباکەوە وەرگیرا، ئەوانیش بە فەرمی دەستبەسەریان کرد و لەگەڵ خۆیان بردیانە گرتووخانەی «شیکما» لە «ئەشکەلۆن».

✡ ✡ ✡

[228] کندر: پەت.

له ماوەی لێپێچینەوەکەیدا، ڤانونو بەوەی زانی، لەو کاتەی دەیانهێنایەوە ئیسرائیل، هەفتەنامەی سەندەی تایمز کەوتە بڵاوکردنەوەی زنجیرەیەک وتار لەسەر بنەمای ئەو ئاشکراکردنانەی ئەو. وتارەکان بەو وێنە و هێڵکاریانەوە بڵاوکرانەوەو بوونە سەرباسی زۆرینەی ڕۆژنامەکانی جیهان. سەندەی تایمز ئەوەشی ئاشکرا کرد، کە هەموو ئەو مەزندانەی پێشتر بۆ هێز و توانای ناوەکی ئیسرائیل هەڵە بووە. ئاخر شارەزایان وایان دانابوو کە ئیسرائیل ماخۆی هەر ١٠ تا ٢٠ بۆمبی سەرەتایی ناوەکییە. کەچی ئەو زانیارییانەی ڤانونو سەلماندی، ئیسرائیل بۆتە هێزێکی ناوەکی، جبەخانە سەربازییەکەی بەلای کەمییەوە ١٥٠ تا ٢٠٠ بۆمبی هەرە پێشکەوتووی ناوەکی تێدایە؛ هەروەها توانای ئەوەشی هەیە کە چەکی هایدرۆجینی و نیترۆنی بەرهەم هێنابێ. ڤانونوش بە هەستیاری و وروژاوی ئاشکراکردنەکانی ترسا. ئەو دەترسا نەبادا ئیسرائیلییەکان بیکوژن؛ ئەو لە «سیندی» لە کیژە دۆستەکەشی دەترسا، ئاخر بڕوای نەدەکرد، بەشێک بێ لەو پیلانەی دژی کرا.

بۆ ماوەی نزیکەی چل ڕۆژ، جیهان نەیدەزانی ئاخۆ ڤانونو چی بەسەردا هاتووە. ڕۆژنامەکان ڕاپۆرتی هەرە هەستیاریان بڵاودەکردەوە، کە هیچ پەیوەندی بە ڕاستییەوە نەبوو. ڕۆژنامە بەریتانییەکانیش وردەکاری تەواویان بڵاوکردەوە کەوا ئەو لە لەندەنەوە فڕێندراوە و بە "قەفەزی دیپپلۆماسی"یەوە بۆ نێو ئیسرائیل ئاودیو کراوە. ڕۆژنامەکانی دیکەش لە زاری شاهیدەکانەوە، ئەوانەی ڤانونویان لەگەڵ کیژێکی ناسک و نازداردا بینیبوو، سواری یەختێک کرابوو کە بۆ ئیسرائیل دەچوو. ئەندامانی پەرلەمانی بەریتانییش لە لەندەندا داوای لێکۆڵینەوەوە گرتنەبەری ڕێکاری دژی ئیسرائیلیان کرد.

بە فەرمیش لە ناوەڕاستی نۆڤێمبەرا ڤانونو تۆمەتبار کرا، چەندین جاریش لەبەردەم دادگادا ئامادە کرا. ئەو بڕیاریدا زیندانیکەرەکانی بگەوجێنێ. ئەو کتومت دەیزانی کە هەواڵنێران لەو کاتەی دەیبەن بۆ دادگا، لەسەر ڕێ چاوەڕێی دەکەن. ئیدی لە یەکێ لەو جارانەی کە بۆ دادگایان دەبرد، ڤانونو لە پشتی ترومبێلێکی پۆلیس داندرابوو، وەستا تا ئەوکاتەی دەگاتە بەردەم ئاپۆرای ڕۆژنامەنووس و وێنەگرەکان. ئینجا لە پڕێکەوە لەپی دەستی خۆی لە پەنجەرەی ترومبێلەکە هێنایە دەر. ڕۆژنامەنووس، هەواڵنێر و وێنەگرانیش لەپی دەستیان خوێندەوە، ئەم دەستەواژەیەی خوارەوەی لەسەر نووسرابوو:

*ڤانونو لە ڕۆما، لە ئیتالیاوە ڕفێندرا، لە ١٩٨٦/٠٩/٣٠ و لە سەعات ٢١:٠٠دا بە گەشتەفڕینی ٥٠٤ گەیشتە ڕۆما.*

ئەم ئاشکراکردنەی زیانی بە پەیوەندییەکانی ئۆرشەلیم و لەندەن نەگەیاند، چونکە ڕوون و ئاشکرا بوو، ڤانونو بە خواستی ئازادانەی خۆی بە گەشتە فڕێنێکی بازرگانییەوە لە بەریتانیاوە ڕۆیشتبوو. هەرچەندە لە ڕۆماش سەرۆکی دەزگەی هەواڵگری ئیتالی تورە و نامراد ببوو، بەڵام دوای ماوەیەک ئەو زیانەی بەر هەردوولایان کەوتبوو قەرەبووکرایەوە.

ڤانونوش بە تۆمەتی سیخوڕی و ناپاکیی تاوانبار کرا. بڕیاری زیندانیکردنی بۆ ماوەی هەژدە ساڵ بەتەنگەدا درا. بەڵام لەودیو زێیەکاندا ئەو بە سیخوڕ و ناپاک نەدەزاندرا. دەزگە و دەستە و کۆمەڵەی هاوکاری بە ناوی ئەو لە ئەورووپا و ئەمریکادا بە شەو و ڕۆژ لەکاردا بوون، ئەو وەک شەڕڤانێکی ئاشتی، وەک شەهیدێک ناسێندرا کە ژیانی خۆی لەپێناو ڕاگرتنی پڕۆژەی ناوەکی ئیسرائیلدا بەختکرد، پەسن درا.

هەڵبەتە ڤانونوش فڕی بەسەر ئەو جۆرە شتەوە نەبوو[229]. دروشمی پاڵەوانێتی و ئایدۆلۆژی کە بەکارهێندرا، هەر بۆ ئەو نامرادەی ئەوبوو لەبەرانبەر دەزگەی ٢دا وەک کاردانەوە نواندی. ئەو لەو کاتەی لە دیمۆنادا کاریدەکرد، بەنیاز نەبوو دژی پڕۆژەی ناوەکی ئیسرائیلی بوەستێتەوە. خۆ ئەگەر لەوێ لەسەرکار لانەبرا با، تا ڕۆژی ئەمڕۆش هەر لەوێ دەمایەوە. تەنانەت ئەو کاتەش کە لە وڵاتەکەی ڕۆیشت، ئەو پەلەی نەبوو تا جەنگە پیرۆزەکەی دەست پێبکا، بەڵکو بە جیهاندا گەڕا، چووە نیپال و تایلاند، لە ئوستراليا بۆ کریستیانیبوون سەرانشۆ کرا؛ خۆ ئەگەر «گوریرو»ی نەدیتبا لەوانەبوو ئەو وێنانەی لەسەر قەپەنگی گۆڵدا و لە نێو هۆڵی کۆکردنەوە و پێکەوەنانی بۆمبەکانی گرتبوونی، هەر لە نێو کۆڵەپشتەکەی مابایەوە. بەڵام خەڵکی باش و ساویلکەی ئەم جیهانەمان ڤانونوی وەک جەنگاوەرێک دژی مەترسی ناوەکی ئیسرائیل بینی. ژن و مێردێکی شیرینی ئەمریکی، ئەویان وەک گوڵی خۆیان بە تەبەنی دانا، تەنانەت کە هێشتا خانەوادەکەی ئەو هەر لە ژیاندا مابوون، تا گەیشتە ئەو ڕادەیەی کریستیانە نیازباشەکانی دیکەش بیکەنە بەربژاری خەڵاتی نۆبل.

کاتێکیش ئەو دوای هەژدە ساڵ، لە زیندان دەرچوو، ئەوەی هەڵبژارد لە کڵێسەی ئۆرشەلیمدا بژیێ. ئەو ئێستا ڕقی خۆی بۆ ئیسرائیل دەردا، ڕەتی کردەوە لەوێ بژیێ، حاشایی لە زمانی عیبیریش کرد و چیدی پێی نەدوا، خۆی هەر بە «جۆن کرۆسمان» دەناسێنێ، وتار لە ڕۆژنامە عەرەبییەکان

[229] فڕی بە سەرەوە نەبوو: هیچ پەیوەندی پێوە نەبوو.

بڵاودەکاتەوە، بە دوای بووکێکی عەرەبی یان فەلەستینییدا دەگەڕێ ("هەر تەنیا ئیسرائیلی نەبێ").

ئەدی سیندی؟ لەبەر ئەوەی ئەوان لە ئۆپەراسیۆنەکە بەپەلە بوون و ئیدی باری ناچاری وایکرد ڕووپۆشێکی تەواو بۆ شاردنەوەی سیندی نەدۆزنەوە، ئیدی کیژەکە ناوی خوشکەکەی «سیندی هانین» و پاسپۆرتەکەی بەکارهێنا، ئەمەش یارمەتی هەواڵنێرە بەریتانی و ئیسرائیلییەکانی دا تا ناسنامەی ڕاستەقینەکەی بزانن. بۆیان دەرکەوت کە ناوە ڕاستەقینەکەی «چارلی بن تۆڤ نێی هانین»ی کیژی ملیۆنێرێکی ئەمریکییە، کە سەرمایەیەکی زۆری لە بازرگانی تایە کەڵەکە کردبوو. کچەکە زایۆننیستێکی دڵسۆز بوو، لە تەمەنی حەڤدە ساڵیدا کۆچ دەکاتە ئیسرائیل. ئاژانێکی مۆساد دەیهێنێتە ڕیزی ڕێکخراوەکە. نمرەی تاقیکردنەوەی بەرزبووە، هاندەرەکەشی چڕوپڕ بووە و پاسپۆرتە ئەمریکاییەکەشی یارمەتیدەر بووە. ئیدی دوو ساڵ چووەتە بن مەشقێکی تاقەتپڕوکێن، بەر لەوەی بۆ ئۆپەراسیۆنەکەی «کانیوک» لەگەڵ چەند ئەندامێکی دیکەی مۆساددا بفرێتە لەندەن. دوای ڕفاندنی ڤانونوش و دوای بڵاوبوونەوەی هەواڵەکان و ڕۆڵی ئەو لە ئۆپەراسیۆنەکەدا، دەبوایە دەست لە چالاکییەکانی ئەو بوارەدا هەڵبگرێ.

ئەمڕۆش «چارلی هانین بن تۆڤ» لە ئۆرلاندۆی فلۆریدادا دەژی. خۆی و مێردەکەی خەریکی بزنسی زەویوزارن، شێوە ژیانێکی جووانەی ئەمریکی دەژین. گۆبەندی ڤانونو وایکرد «چارلی» وەک ئاژانێکی مۆساد بکشێتەوە، ئەمەش لە چاوی هاوڕێکانی حەیف بوو کچێکی وا جوان و

باش و زیرەک لەدەست بدەن. هەر لە چاوی کچەکەش بوو، تواندرا ڤانونو لە لەندەنەوە بێئەوەی یاساشکێنیش بکرێ، بهێندرێتەوە ئیسرائیل.

مارگرێت تاچەریش بە ئاسانی جڵەوی ئەو پەرلەمانتارە گێرەشێوانانەی کرد و ڕوونیکردەوە، هیچ کارێکی ناقانونی لەسەر خاکی بەریتانییدا نەکراوە.

بەڵام خۆ زۆری نەبرد تا مۆساد بگەڕێتەوە سەر ئاینوئۆینە[230] کۆنەکانی خۆی. دوو ساڵ پاشتر، ئاژانەکانی مۆساد «ئاری ڕیگێڤ» و « یاکۆڤ باراد» فەلەستینییێکیان لە لەندەندا کردبووە ئاژانێکی دووسەرە. فەلەستینییەکەش گیرا، بەڵام تاتچەریش وێستگەی مۆسادی لە لەندەن داخست و «ڕیگێڤ» و «باراد»یشی لە وڵاتەکەی دەرکردن.

دیسان مۆساد بەڵێنی دا بە جوانی ڕەفتار بنوێنێ. هەرواشیان کرد، ئەمەش بەردەوام بوو تا ئەو کاتەی گۆبەندی «مەحموود ئەلمەبحوح» پەیدابوو ...

---

[230] ئاینوئۆین: فرتوفێڵ.

## بەندی شازدە: تۆپە زەبەلاحەکەی سەددام

لە ٢٣ی مارتی ١٩١٨دا و لە گەرمەی جەنگی یەکەمی جیهاندا، شێلکە تۆپێکی گەورە لە ناوجەرگەی «پلەیس دەلا ڕەپوبلیک» لە پاریس گرمەی هات و تەقیەوە. سەعاتێک دواتر، شێلکە تۆپێکی دیکە ناوەندی پاریسی هەژاند و هەشت کەسی کوشتن. تەقینەوەکە پاریسییەکانی تۆقاند، لەبەرئەوەی شارەکە لە بەرەی شەڕەوە دوور بوو، وەهاش مەزندەدەکرا پاریس سەلامەت بێ و تۆپی نەگاتێ. دەستبەجێ فەرماندەی هەرێمی پاریس چەندین دەستەی چاودێری و پشکنینی ناردنە دارستان و ناوچەکانی دەوروبەری پایتەخت، مەزەندەیان وابوو ڕەنگبێ دەستەیەکی تۆپخانەی ئاڵمانی لەوێ لە شوێنێک خۆیان حەشاردابێ. بەڵام کێوماڵکردنەکە بێ ئەنجام بوو، هیچیان نەدۆزییەوە. ئینجا فەرەنسییەکان وایان لێکدایەوە، لەوانەیە ئەو شێلکە بۆردمانانە لە کەشتییێکی ئاسمانییەوە هاتبێ، هەرچەندە هیچ «زیپەلین[231]»یشیان لە ئاسماندا بەرچاو نەکەوتبوو. شەش ڕۆژ دوای ئەوە، لە ڕۆژی هەینی پیرۆز (چاک)، دیسان شێلکەیەکی دیکەی تۆپەکان لە پاریس تەقیینەوە؛ ئەمجارەیان ڕاستەوخۆ بەر کڵێسای «سێینت گێرڤایس» کەوت، کە لەشکری چوارەمی لێبوو. تەقینەوەکە ٩١ کەسی کوشت و سەدانی دیکەشی بریندار کرد.

ئیدی ترس و دڵەڕاوکێ بەنێو شاردا بڵاوبووەوە. قۆشەکانی سوپاش بە دەرەوەی پایتەخت وەربوون، کەچی هیچیان نەدۆزییەوە. ئاخر ئەوکات

---

[231] Zeppelin زێپەلین جۆرە کەشتیکی ئاسمانی بوو، ئاڵمانەکان لە سەرەتای سەدەی ڕابردوو داهێنەری بوون و لە جەنگی جیهانی یەکەمیشدا بۆ بۆمب فڕێدان بەکاریان هێنا.

کەس گوێی لەوە نەببوو، کە تۆپێک هەیە لە مەودایەکی یەکجار دوورەوە بگاتە پاریس. ڕۆژنامەکانیش بۆمبەکانیان بە دێوەزمەیەک بەراوردکرد، کە لە دوورەوە بۆمبا دەهاوێژێ هەروەک تۆپەکەی «یۆلیوس ڤێرنێ»ی نووسەر، کە لە کتێبەکەی خۆیدا بەناوی «لە زەویەوە بۆ مانگ»دا وێنای کردبوو. تۆپەکەی کەڵکەڵەی سەری «یۆلیوس ڤێرنێ» دەیتوانی تەواوی کەشتی ئاسمانی لەسەر مانگ ئاگر بدا.

فەرەنسییەکان لەو پرسەدا بە بەخت بوون. ئاخر جەنگەکە هەر لە هەمان ساڵدا بە سەرکەوتنی هاوپەیمانان بەسەر ئیمپریالیزمی ئاڵمان کۆتایی پێهات. ئینجا بەکاوەخۆ[232] زانیاری سەبارەت بەو تۆپە سامناکەکە پەیدابوو، کە مەرگ و ترسوبیمی لە پایتەختی فەرەنسییەکان چاندبوو. هەندێکیان ناویان لێنا "تۆپی پاریس"، هەندێکی دیکەش ناوی "تۆپی «وێلهێم»یان بەسەردا بڕی، مەبەستیش «وێلهێلمی دووەم»ی ئیمپراتۆری ئاڵمان بوو. دواتر دەرکەوت تۆپەکە چەکێکی قورس بوو، لە لایەن پیشەسازی جەنگی ئاڵمانەوە پەرەپێدرابوو، سێ جۆرە تۆپی لەو چەشنەیان دروست کردبوون. ئەوکات هێشتا هیچ دەربارەی لەو جۆرە چەکە نەبیسترابوو، کە بە تێکڕایی ١٢٨ کیلۆمەتر دەڕۆیشت، هەر گوللە تۆپێکیشی سێ پێ درێژ بوو، باروتی پێهەڵدانەکەشی دوازدە پێ درێژ بوو. گوللە تۆپەکانیش ٤٢ کیلۆمەتر بەرزدەبوونەوە. ئەم ڕیکۆردەش تەنیا لە لایەن ڕۆکێتی ئاڵمانی جۆری «V-2» لە جەنگ دووەمی جیهاندا شکێندرا. «کرووپ[233]» ئەو سێ تۆپە زەبەلاحەی لەژێر بارێکی زۆر

[232] بەکاوەخۆ: بە هێواشی، بەرەبەرە.

[233] کرووپ: بەرەبابێکی ئاڵمانین و چوارسەد ساڵ تەمەنیانە و خەڵکی «ئێسن»ن، بە پیشەسازی چەک، بەتایبەتیش بە دروستکردنی تۆپخانە بەناوبانگ بوون.

نهێنیدا دروست کردبوو. تۆپەکانیش بە قیتارێکی تایبەت لە شوێنێک و پێگەیەک بۆ یەکێکی دیکە دەگوێزرانەوە، گواستنەوەکەش تاڕادەیەک ڕۆژانە بوو. هەر تۆپێکیشان هەشتا پیاوی تۆپخانەی لەگەڵدا بوو، لێشیان قەدەغەکرابوو باسی تۆپەکە لەلای هیچ کەسێک بکەن. فەرمان درابوو، دەبێ ئەو تۆپە دێوەزمانە بەوپەڕی نهێنییەوە حەشار بدەن.

کاتێکیش جەنگەکە لە کۆتایی خۆی نزیک بووەوە، بە خێرایی مانۆڕی توانستی تۆپە زەبەللاحەکە شێوێندرا. فڕۆکەکانی بەریتانی تۆپی کەتە و قەبەیان دۆزینەوە، ڕاویان نان هەر بۆمبیان بەسەردا بەردەدانەوە فەرەنسییەکانیش لە پێگە نزیکەکانیان لە بەرەی پێشەوەی شەڕ، دایانە بەر ئاگری بۆمبەکانیان. بەڵام هێشتاش هیچ لەو هێرشکردنانە سەرکەوتوو نەبوون. تاکە تۆپێک کە لاشەڕ خرابێ، تاکێکیان بوو لە ئانوساتی تۆپهاوێشتنی خۆیدا تەقییەوە و پێنج سەربازیشی کوشتن. دووەکانی دیکە لەگەڵ کۆتاییهاتنی جەنگدا، ون بوون و هیچ شوێنەوارێکیان نەدۆزرایەوە. ئەوەی بەسەریاندا هات، هەر بە تەلیسم مایەوە. دەکرێ تۆپەکان لە بارییەک هەڵوەشێندرابنەوە، یاخود لە شوێنێک، لە قووڵایی ئەشکەوتێک یان کانێکی چۆڵکراودا شاردرابنەوە.

ئیدی تۆپە زەبەللاحەکە بووە پاشماوەیەکی ئەفسانەیی و زۆر کەسیش بڕوای وابوو، کە نهێنی تۆپەکان هەرگیز نادۆزرێتەوە. بەڵام لە ١٩٦٥دا، پیرەژنێکی ئاڵمان گەیشتە وڵاتی «کەنەدا» و «د. جیرالد بول»ی زانای تەمەن سی و حەوت ساڵەی لەوێ بینی. ناوبراو بەرپرس بوو لە بەرنامەی «های ئەلتیتیود ڕیسیچ» لە زانکۆی «ماک گیل» لە مۆنتریالی کەنەدا دا. خانمەکەش خزمێکی «فریتز راوزنبێرگەر»ی بەڕێوەبەری

کۆچکردووی دیزاینی پیشەسازی «کرووپ» بوو. پیرەژنەکە دەستنووسێکی لە ئەرشیڤی ماڵباتەکەی دۆزیبووەوە، کە وێنا و هێڵکاری و وردەکاری تۆپە زەبەلاحەکەی تێدابوو لەگەڵ چۆنیەتی کارکردنی، ئیدی ئەم دەستنووسەی دایە دکتۆر «بول».

دەستنووسەکە ئەندێشەی «بول»ی فڕاند. ئاخر ئەو ناووڕوومەتێکی باشی هەبوو، پیتۆلێکیش بوو بۆخۆی، چونکە لە تەمەنی بیست و سێ ساڵیدا دکتۆرای وەرگرتبوو، بەمەش گەنجترین کەس بوو لە زانکۆی کەنەدیدا بەو پلە زانستییە بگا. «بول» خەونی بە دروستکردنی تۆپێکی زەبەللاحەوە دەبینی، کە لە دووری سەدان کیلۆمەترەوە نیشانەی خۆی بپێکێ و تەنانەت مانگی دەستکردیش هەڵبداتە بۆشایی ئاسمان. ئینجا بە بەکارهێنانی ئەو دەستنووسە، کتێبێکی دەربارەی تۆپەکەی ویلهێلمەوە نووسی و ئەگەری زانستییەکەشی لە ئایندەدا بۆ کارێکی وەها ڕوونکردەوە.

بەڵام خۆ کتێبەکە بە تەنیا بەس نەبوو. هەروەک چۆن «بول» فەندێکی لە زانکۆکەی خۆی دەستکەوت، لە حکوومەتەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و کەنەداشی دەستکەوت. لەسەر خاکی «باربادۆس[234]»یش تۆپە زەبەللاحەکەی تاقیکردەوە، تا ئەوکات درێژترین تۆپی جیهان بوو. تۆپی تایین ٣٦ مەتر درێژ و تیرەکە (کالیبەر)یشی ٤٢٤ ملیمەتر بوو. بە سەدان لە کرێکار، تەکنیککار و ئەندازیار، کە زۆریان خۆجێی بوون کاریان لە دروستکردن و تاقیکردنەوەی ئەو باسکە زل و کەتە ئاگرپڕژێنەدا کرد.

---

[234] Barbados باربادۆس ڕۆژهەڵاتی دوورگەکانی کاریبییە و دەوڵەتێکی سەربەخۆیە و لەنێو یەکێتی کۆمۆنوێلسی بەریتانیا دایە.

تۆپەکەی « بول» لە مانۆڕێکی نمایش و تاقیکردنەوەی تەقەپێکردنەکەیدا بە پلەیەکی نایاب سەرکەوتوو بوو، قورسایی گەورەی بۆ مەودایەکی وا دوور هەڵدا، ڕیکۆردشکێن بوو. ئەویش گوتی، خۆ ئەگەر لەبری گوللە تۆپ، موشەکی تێخستبا، کە تەقەمەنییەکی ڕەقی تێدابایە، ئەوا دەیتوانی موشەکێکی ٩١ کیلۆگرامی بۆ دوورایی ٤٠٠٠ کیلۆمەتر یان بە بەرزایی ٢٥٠ کیلۆمەتر هەڵبدا.

تۆپەکەی «بول» دەستکەوتێکی مەزن بوو، بەڵام لەبەر چەندین هۆ، حکوومەتەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و کەنەدا بڕیاریاندا، پڕۆژەکە بوەستێنن. لە ١٩٨٦یشدا «بول» ناچار کرا «باربادۆس» بەجێبێڵی. ئیدی ئەم نامرادبوونەی هیچ سنوورێکی نەناسی. بە داخ و ڕقەوە دابەزییە سەر "بیرۆکراتەکان"، کە پڕۆژەکەیان لەباربرد.

بۆ ماوەیەک ئەو گوللەتۆپی بەرهەم هێنان، تەنانەت پەنجا هەزار گوللە تۆپی بۆ ئیسرائیل ناردن تا بۆ تۆپە ئەمریکیەکانی خۆیان بەکاریانبێنن. بۆ ئەم خزمەتانە ئەو بە ڕەگەزنامەی ئەمریکیش پاداشت کرا. بەڵام ئەو کەم حەوسەڵە بوو، نەیدەتوانی بۆ هەمیشە خۆی بزمک بکا[235]، بۆیە دەمەقاڵێی زۆری لەگەڵ ئەفسەر و کاربەدەستی پلە باڵادا کرد. ئەو هەستکردنەی بە سووکایەتی لە دەمی داخستنی پڕۆژەکەی لە باربادۆسدا، لێی جیا نەدەبووەوە، گڕی تێبەردابوو، دەیکوڵاند، ئامادەبوو هەموو شتێک بکا هەر

[235] بزمککردن: کاتی خۆی ماڵدارەکان گۆلک (گوێرەکە)، یان کارۆکەیان بزمک دەکرد، شتێکیان بەسەر لمووزەوە دەکرد، شتێکی هەندێ دڕ بوو، کاتێ نزیکی گوانی دایکیان دەبوونەوە، دایکەکە لەبەریان هەڵدەهات، بەم جۆرە شیریان پێنەدەخورا. ئیدی لەوێوە ئەو ئیدیۆمە هات، واتە زار گیران، کەسێک کە نەتوانێ کۆنترۆڵێ دەمی خۆی بکا.

بۆ ئەوەی لەسەر دروستکردنی تۆپەکەی بەردەوام بێ. ئاخر خولیایەک بوو، لە کەللەی دابوو، هیچ شتێکیش نەیدەوەستاند.

سەرەتا تۆپی GC-45ی دروستکرد، کە پێشکەوتووترین تۆپ بوو لەسەردەمی خۆیدا و مەودای چل کیلۆمەتریش دەڕۆیشت. «بولیش» ئەو تۆپەی دەفرۆشتە هەر کەسێک، بیکڕیبا. وێرای گەمارۆی نەتەوە یەکگرتووەکان لەسەر چەکفرۆشتن بە باشووری ئەفریقیا، بەڵام «بول» تۆپەکەی فرۆشتە سوپاکەی ئەوان، چونکە بۆ جەنگی دژی دەوڵەتی «ئەنگۆلا»ی دراوسێیان، پێویستیان پێبوو. لەوەش زیاتر، «بول» باوەڕنامەی ڕێپێدرانی وەرگرت کە لەسەر خاکی باشووری ئەفریقادا، تۆپەکان دروست بکا.

هەندێک دەڵێن؛ سی ئای ئەی بە نهێنییەوە پشتگیری چالاکییە قاچاغەکانی «بول»ی کردووە. بەڵام کاتێکیش شتەکە ئاشکرا بوو، برادەرە «سی ئای ئەی»یەکانی «بول» دەستیان لێشوشت، کابرا بەتەنیا مایەوە، ئیدی بووە نێچیرێکی ئاسانی سزاکانی نەتەوە یەکگرتووەکان و بووە قاچاخچییەکی بێبەزەیی چەکوچۆڵ. ناچاریش کرا بگەڕێتەوە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لەوێش شتێکی سەرسامهێنی لەچاوەڕوانیدا بوو: دادگایەکی ئەمریکی بە تۆمەتی بازرگانیکردن بە چەکی قاچاخەوە تاوانباری کرد و حوکمی شەش مانگ زیندانی بۆ بڕیەوە. کاتێکیش ئازادکرا و گەڕایەوە کەنەدا، بە ٥٥٠٠٠ دۆلار سزا درا. ئیدی توڕە و دڵشکاو، لەوێوە چووە بەلجیکا، بە هاوکاری یەکێتی کرێکارانی بارووت لە بەلجیکادا، کۆمپانیایەکی نوێی دامەزراند.

بەڵام هێشتا کەفوکوڵی خولیاکەی نەنیشتەوە. هەر خەونی بە تۆپێکی زەبەللاحەوە دەبینی، ئاخر خەیاڵەکەی «یۆلیوس ڤێرنێ» شایستە بوو. ئەویش هەروەک «فاوستی گۆتە»، ئامادەبوو لەپێناوی ئەوەی خەونەکەی بەدیبێنێ، گیانی خۆی بفرۆشێتە ئەهریمەنیش. هەر بە ڕاستیش ئەهریمەنەکەی دۆزییەوە: سەدام حوسێن، ئەو دیکتاتۆرەی شێت و شەیدای مەزنێتی بوو.

لە هەشتاکاندا، عێراق دژی ئێران لە شەڕدا بوو. «بول»یش دووسەد تۆپی جۆری GC-45 فرۆشتنە عێراق. تۆپەکان لە نەمسا[236] دروستکرابوون و لەڕێی بەندەری «عەقەبە»ی ئوردنەوە ئاودیوی عێڕاق کران. بەڵام خۆ ئەوەش هەر سەرەتایەک بوو.

سەدام حوسێنیش هەروەک «بول» دوای ئەوەی ئیسرائیل کوورەی ناوەکی تەمووزی بۆمباباران کرد و خەونەکەی عێراقی لەگۆڕ نا بەوەی ببێتە هێزێکی ناوەکی، نامراد بوو. خەریکبوو لە ئێرەیی پێبردن دەتەقی، بەوەی چۆن ئیسرائیل لەسەروبەندی ئەوەدایە مانگی دەستکردیش هەڵداتە بۆشایی ئاسمان.

«بول»یش ئەوەی خستە بەردەم سەدام کە درێژترین تۆپ لە جیهاندا دروست بکا. ئیدی بە هۆی ئەو تۆپەوە، هەروەک «بول» بەڵێنی بە سەدام دابوو، دەتوانێ مانگی دەستکردیش هەڵداتە ئاسمان و هەر شوێنێکیش بە دوورایی هەزاران کیلۆمەتریش بێ. بداتە بەر شێلکەی ئاگری تۆپەکانی. سەدامیش پەی بەوە برد بەڵکو بتوانێ مەڵبەندی پڕ

[236] لە وانەیە ئەوانەی لە تەمەنی من و هەراشترن ناوی تۆپی نەمساوییان بیستبێ، کە عێراق دژی ئێرانی بەکارهێنا.(وەرگێڕ)

لەحەشاماتی ئیسرائیلی بۆمباباران بکا، بۆیە بەخۆشیەوە خستنەڕوویەکەی «بول»ی پەسەند کرد. «بولیش پڕۆژەکەی ناونا "پڕۆژەی بابل".

«بول» بەم جۆرە نەخشەکەی بۆ بابل داڕشت: تۆپێکی ١٥٠ مەتر درێژ، کێشەکەی ٢١٠٠ تەن بێ، تیرەی تۆپەکەشی یەک مەتر بێ! بەڵام بەر لەدروستکردنی ئەو تۆپە زەبەللاحە، «بول» بڕیاریدا شتێکی پێشینەی هاوشێوە بۆ تاقیکردنەوە دروست بکا. ناویشی لێنا "بەچکە بابل" هەرچەندە ئەو بەچکەیە لە هەموو تۆپەکانی پێش خۆی گەورەتر بوو. تۆپەکە ٤٥ مەتر درێژ بوو، فەرماندەی تۆپخانەی سەدامیش پێزانینی بۆ نمایشەکە هەبوو. بەڵام خۆ ئەوە بە بەراورد بەوەی هەر بەڕاستی لە بیابانی عێراق دەردەکەوت هیچ نەبوو.

«بول» شوێنێکی بۆ تۆپەکەی دەویست گردەڵانێکی ڕووتەن بێ، لەوێدا پێکهاتەکانی درێژترین و خێراترین تۆپی سەر ئەم زەمینەی کە خەریک بوو سەرهەڵبدا، لێدانا. دوای دەستنیشانکردنی شوێنەکە، داوای پارچەکان و بەشەکانی پێکهاتەی تۆپەکەی کرد، دەبوایە لە ئەورووپاوە بۆی بهاتبایە. هەڵبەت پێکهاتە سەرەکییەکەش لوولەی تۆپەکە بوو، دەبوایە بۆ ئەم شتەش پۆڵایەکی یەکجار زۆر بەکاربێنێ. ئەو داوای ئەو لوولەکانەی لە ئینگلستان، ئیسپانیا، هۆڵەندا و سویسڕاوە کرد. شتە بەڕاداندراوەکەش لەژێر سەرپۆشی "پارچە و بەشی لوولەکێشی قەبەی نەوتەوە" بوو. چونکە ئەوکات عێراق لەبن سزای گەمارۆی توندی نێودەوڵەتیدا بوو، ئینجا جارێکی دیکە ئەو کەرەستانە بەناوی ئوردنی دراوسێوە داواکرانەوە.

لوولەکان دەهاتن. بەڵام دیوی هەرە سامناکی کردەوەی هاوردەکردنەکە ئەوەبوو، کە زۆرینەی دەوڵەت و کۆمپانیاکان کە ئەو جۆرە کەرەستانەیان بەرهەم دەهێنا، لەوە تێگەیشتبوون، ئەو پێکهاتانە بۆ هیچ نین تەنیا بۆ دروستکردنی چەکێکی کوشندەی قەبە نەبێ؛ خۆپەرستی و چاوبرسێتییان هەروەک لە جەنگە جیاجیاکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، هەر واتای ئەوەی دەگەیاند، کە ئەوان هیچ کێشەیەکیان لە پێفرۆشتنی ئەو شتانەدا نییە. بۆ لوولە و بۆڕییە قەبەکانیش مۆڵەتی دەرچوون دەرکرا، لەسەر بارهەڵگرەکان بارکران و بە ڕێگەی خۆشیدا نێردران. زۆریشیان بەبێ گرفت گەیشتنە عێراق.

لەشکرە تایبەتییەکەی «بول» لە تەکنیککار و ئەندازیارەکان خەریکی پێکەوەنانی پارچەکانی تۆپەکە بوون، ڕووشیان لە ڕۆژئاوا، لە ئیسرائیل کرد. بەڵام هێشتا «بول» تەواو پێی ڕازی نەبوو. ئەو دوو جۆرە تۆپی عێراقی دروستکردن، «المجنون» و «الفاو» بوو. «المجنون» واتە تۆپە شێتەکە، هەر زوو خرایە نێو تۆپخانەی عێراقییەوە.

«بول» ئەوەشی پەسەندکرد، ڕۆکێتی «سکود» کە لەنێو جبەخانەی سەدامدا هەبوو دەستکاری بکا، وای لێبکا کڵاوەیەکی بۆ دروست بکا. ئەو توانا و نمایشی ڕۆکێتەکەی باشتر کرد؛ هەر ئەو ڕۆکێتەش لە شەڕی یەکەمی کەنداودا دژی ئیسرائیل بەکارهێندرا.

لێرەوە بوو، «بول» سنووری خۆی بەزاند. بەگوێرەی ئیفادەی کوڕەکەی «بول» ئیسرائیل «بول»ی ئاگاداركردبووە کە چالاکییە دژوارییەکانی بوەستێنێ. بەڵام خۆ ئەو گوێی پێنەدا. ئیسرائیلیش لەوەدا بەتەنێ نەبوو، کە زانایەکە بوەستێنێ. هەروەها سی ئای ئەی و MI6 و ئێرانییەکانیش

نیگەرانی ئەو کارە تەواونەکراوەی «بول » بوون. لەمیانەی جەنگی عێراق- ئێراندا، عێراقییەکان بەو چەکەی زاناکە دروستی کردبوو، لە ئێرانی دا. دیاربوو «جیرالد بول» باکی بە زۆربوونی دوژمنەکانی نەبوو، ئەوانیش بڕیاریاندا کۆتایی بە پرۆژەکەی بهێنن.

کاتێکیش ئەو گوێی بە هۆشدارییەکان نەدا، ئاژانە بیانیەکانیش لێیکەوتنەخۆ[237] و بەدوای هەنگاوەکانیدا ڕۆیشتن. چەندان جار لە زستانی ١٩٩٠دا، چەندین کەسی نەناسراو بەسەر ئەپارتمانەکەی ئەویان دادا، کە کەوتبووە گەڕەکی «ئوکل» لە برۆکسل. ئەوان لە ئەپارتمانەکەدا هیچیان نەبرد، تەنیا کەلوپەلەکانیان بەسەر یەک وەرگێڕا و دۆلاب و چەکمەجەکانیان خاڵی کردبوونەوە، بە جۆرێک پەیامێکی ڕوون و ئاشکرایان بۆ بەجێهێشتبوو. ئەمەش ئاگادارکردنەوەیەکی دیکە بوو کەوا: ئێمە لێرەین. ئێمە دەتوانین بێینە نێو ماڵەکەت، هەروەها دەتوانین لەوەش زیاتر بکەین.

دیسان «بول» هەر گوێی بەو ئاگادارکردنەوانە نەدا. پارچەکانی تۆپەکە بەردەوام بوو هەر دەگەیشتن، ئیدی یەک لەدوای یەک لەسەر گردە ڕووتەنەکە لەسەر یەک دادەندران. پێدەچوو هیچ کردەوەیەک ئەو پرۆژەی بابلە نەوەستێنی، بەدەر لە یەکێکیان نەبێ.

لە ٢٢ی مارتی ١٩٩٠دا، «بول» گەڕایەوە ئەپارتمانەکەی خۆی لە برۆکسل. لەوکاتەی لە گیرفانەکەی خۆی بۆ کلیلەکان دەگەڕا، پیاویک لە دالآنە تاریکەکەوە لێی وەدەرکەوت، دەمانچەیەکی بێدەنگی لەدەستدا بوو،

[237] لێکەوتنەخۆ: واتە بە وریابونەوە مشووریان خوارد.

چەند گوللەیەکی سرەواندە پشتەسەری. بەم جۆرە باوکی تۆپە زەبەلاحەکە بەسەر دەمدا کەوت و هەر لە شوێنەکەش گیانی لەدەستدا.

✡ ✡ ✡

ڕۆژنامە جیهانییەکان سەبارەت بە ناسنامەی بکوژەکان کەوتنە نێو زەنگاوێک. هەندێک دەیانگوت سی ئای ئەی لەناوی بردووە، ئەوانی دیکە پەنجەی تاوانیان بۆ MI6، ئەنگۆلا، ئێران... ڕادەکێشا، بەڵام زۆر لە چاودێران لەسەر ئەوە کۆکبوون کە ئیسرائیل بەم کارە هەڵسابێ. پۆلیسی بەلجیکیش لێکۆڵینەوەی خۆی کرد، بەڵام هیچی نەدۆزییەوە. بکوژەکانی «جیرالد بول» تا ئەمڕۆشی لەگەڵدابێ نەدۆزرانەوە.

لەگەڵ مەرگی «بول»دا، دەستبەجێ تۆپە زەبەلاحەکەش وەستا. یاریدەدەران، ئەندازیاران، لێکۆڵەرەوان و کڕیارانیش بڵاوەیان لێکرد. ڕاستە ئەوان بە پارچەکان و بەشەکان ئاشنا بوون، بەڵام خۆ ماستەر پلانەکە هەر لەنێو مێشکی خودی «بول»دا بوو، هەر ئەویش دەیتوانی کارەکە بڕوێنێ. ئیدی مەرگی ئەو بووە مەرگی پڕۆژەکەی بابلیش.

دوو هەفتە پاش مەرگی بول، دەسەڵاتدارە بەریتانیەکان لەپشت پەردەوە دەرکەوتن. ئەوان لەکۆتاییدا ئەو بەشە بارەیان دەست بەسەرداگرت، کە لە بەندەری «تیس»دا بوو، بریتی بوو لە هەشت لوولەی پۆڵایین و لەسەر مۆڵەتنامەکەشی نووسرابوو "لوولەکێشی نەوت"، ڕاگیرابوو. ئەمەیان هەوڵێکی باش بوو، بەڵام دوای چی، زۆر دواکەوت: ئاخر بەریتانیەکان چل و چوار بۆڕی پۆڵاینی وایان بە ناوی بۆڕی نەوت لەدەستدابوو، ئەوان گەیشتبوونە عێراق. لە هەفتەکانی دواتردا پێکهاتەی دیکەی بەشەکانی تۆپە زەبەللاحەکە لە پێنج دەوڵەتی ئەورووپی دیکەدا

دەستی بەسەردا گیرا. لێکۆڵینەوەیەکی فەرمی لە ئینگلستاندا هەوڵیدا بیسەلمێنێ کە چۆن کۆمپانیایەکی ڕێزلێگیراوی وەک «شیفیلد فۆرگ ماستەرس» چاوپۆشی لە مەبەستی دیاریکراوی سەدام حوسێن بۆ بەدەستهێنانی ئەو لوولەکانە بەناوی لوولەی نەوت، بۆ تۆپەکە کردووە.

کاتێکیش سوپای ئەمریکا لە ٢٠٠٣دا عێراقی داگیرکرد. بارستەیەک لەو بۆڕیە لەسەر یەک کەڵەکەبووانەیان لە عەمبارەکانی ئەل ئەسکەندەریە بە دووری ٣٠ مایل لە خوارووی بەغداوە دۆزینەوە، کە تۆزیان لەسەر کەوتبوو. ئەو لوولە ژەنگگرتووانە پاشماوەی شوێنەواری پلانە مەزنەکەی «د.جیرالد بول» بوون.

✡ ✡ ✡

کوشتنی «جیرالد بول» لەکاتێکدا بوو، کە گۆڕانکاری قووڵ لە خەسڵەتی مۆساد پەیدابوو. ئاخر «شاباتی شاڤیت» ڕامسادە نوێیەکە، کاتێک لە ١٩٨٩دا وەک بەرپرس دەستبەکار بوو، بینی دەزگەکە لەسەردەمی بەرێی جیاوازە. ئاخر ئەو جەنگاوەرەی پێشووی «سەیارەت ماتکال» و بەرپرسی «کاسارا»، دیاربوو کالآیەک بوو بەقەد بالآی کارەکە. کاتێکیش لە سەرەتای هەفتاکاندا بە شێوەیەکی سیستماتیک بەرەو لەناوبردنی سەرکردەکانی ئەیلوولی ڕەش هەنگاویان دەنا، زۆرتریش لەو کردەوانە لە هەشتاکان و نەوەدەکان کران، هەمووشی جەختکردنەوە بوو لەوەی ئاراستەی مۆساد لە دەزگەیەکی هەواڵگرییەوە بەرەو ئۆپەراسیۆنە تایبەتییەکان گۆڕاوە. وردە وردە چالاکییەکانی مۆساد بوونە ئۆپەراسیۆنی دژ بە هەڕەشەی دژواری مێلیشیایی و نامێلیشیاییەکانی سەر دەوڵەتی

ئیسرائیلی. ئۆرگانە فەرمییەکانی دەوڵەت بۆ چۆکپێدادانی تیرۆر ناتوانا بوون. تاڕادەیەک سەرکردە تیرۆریستەکان لە هەندەران سەلامەت بوون، لەوێوە نەخشەی پەلامارەکانیان دادەڕشت، پیاوەکانیان دەناردنە گژ دەزگە و هاووڵاتیە ئیسرائیلییەکان لە هەر کوچە و گۆشەیەکی دنیایێ. هەرچەندە ئیسرائیل دەیزانی ئەوانە کێن و بەتەمای چین، بەڵام نەیدەتوانی بیانگرێ و بیانهێنێتە بەردەم دادگا. تاکە ڕێگە لەبەردەم مۆساد مابووەوە، ئەوەبوو، بیانکوژێ. لەڕاستیدا بۆ ئەوانەی وەک «داڤید مۆلاد» کە ئەو کارانەیان لەئەستۆ گرتبوو، کردەوەیەکی دڵڕەقانە و توند بوو، بەڵام کاتێک سەرکردە تیرۆرستەکانیان دەکوشت و ڕێکخراوەکانیان بۆ ماوەیەکی زۆر لە پەل و پۆ دەخست، ئیدی دەگەیشتنە مەبەستەکەی خۆیان. ڕاوەدونانی دەستەی ئەیلوولی ڕەشیش باشترین نموونە بوو. دۆزی «جیرالد بول»یش هەمان ئەنجامی بەدەستەوە دا. هەرچەندە کوشتنەکەی هەرگیز بە شێوەیەکی فەرمی نەناسرا، مردنی ئەو لە هەمان کاتدا مەرگی پڕۆژە ئەهریمەنەکەیشی بەدوای خۆیدا هێنا. هەمان شتیش دەرهەق بە «وەدیع حداد» کرا.

✡ ✡ ✡

هەمووی بە پاکەتە چوکلاتێک دەستی پێکرد.

«د. وەدیع حداد» سەرۆکی بەرەی میللی فەلەستینیەکانی لوبنان، یەکێ لە دوژمنە هەرە سەرسەختەکانی ئیسرائیل بوو. کردەوە هەرە شوومەکەشی

ڕفاندنی فڕۆکەیەکی فەڕەنسی بوو لە ٢٧ی حوزەیرانی ١٩٧٦ کە لە گەشتەفڕینی خۆیدا بوو لە تەلئەبیبەوە بەرەو پاریس دەڕۆیشت. چەند تیرۆرستێک، عەرەب، ئاڵمان و باشووری ئەفریقایی فڕۆکەوانەکەیان ناچار کرد لە «ئەنتەبە»ی پایتەختی ئۆگەندا بنیشێتەوە، ئینجا لەوێ داوای گۆڕینەوەی بارمتە جووە سەرنشینەکانیان بە مەترسیدارترین تیرۆرستەکانی جیهان بکەن. کەچی لە کردەوەیەکی پاڵەوانانەدا، کۆماندۆ ئیسرائیلیەکان هەزاران مایلیان بڕی و لە ئەنتەبە دابەزین، لەوێ تیرۆرستەکانیان کوشتن و بارمتەکانیشیان ئازاد کردن. دوای کردەوەکەی ئەنتەبە، «حداد» تێگەیشت کە ژیانی لە مەترسیدایە، بۆیە باریکردە بنکە سەرەکیەکەی لە بەغدا، لەوێ هەستی کرد ژیانی پارێزراو دەبێ. ئیدی لە عێراقەوە لەسەر ناردنی تیرۆرستان تا دژی ئیسرائیل بجووڵێنەوە، بەردەوام بوو.

مۆسادیش بڕیاریدابوو ئەو تیرۆرستە سامناکە بکوژێ، بەڵام چۆن؟ ئۆپەراسیۆنە بە ئەرکەکە کەوتە گەڕ، بەو مەبەستەی هەموو شتێک لەبارەی حەدادەوە بدۆزرێتەوە، نەخاسمە خاڵە لاواز و خەوشدارەکانی.

ساڵێک دوای ڕوداوەکەی ئەنتەبە، ئاژانەکانی مۆساد ئەوەیان بۆ دەرکەوت، کە «حەداد» شێتی چوکلاتە، بەتایبەتی چوکلاتە نایابەکەی بەلجیکی. زانیاری لەسەر ئەو کەموکورتییەی «حەداد» لە فەلەستینییێکی باوەڕپێکراوەوە گەیشت، ئەو دزەی کردبووە نێو بەرەی میللی حەدادەوە.

ئینجا «ئیسحاق هۆفی» *ڕامساد* زانیارییەکانی دایە دەست «مێناحیم بێگن»ی سەروەزیر، ئەویش دەستبەجێ ئۆپەراسیۆنەکەی پەسەند کرد. ئەوسا ئاژانەکانی مۆساد یەکێک لە باشترین یاریدەدەری باوەڕپێکراوی

«حەداد»یان ڕاسپارد، کە بە ئەرکێک لە ئەورووپا بوو، بەوەی لە گەڕانەوەیدا پاکەتێکی گەورەی چوکلات، ئەوەی لەدەمدا دەتاوێتەوە و لەجۆری «گۆدیڤیا»یە بۆ گەورەکەی ببا. شارەزایانی مۆساد ژارێکی کوشندەیان لەنێو ئەو چوکلاتە شیرین و بە کریمانەدا کرد. ئەوان پێیانوابوو «حەداد» کە زۆر حەزی لە«گۆدیڤیا»یە، هەموو چوکلاتەکان هەر بەخۆی دەخوا و لەگەڵ هیچ کەسێکدا بەشی ناکا. ئاژانەکە پاکەتە چوکلاتە ژەهراویەکەی بۆ «حەداد» هێنا، ئەویش دەستبەجێ سەری هەڵپچڕی، هەمووی لەسەر یەک خواردن. لەماوەی چەند هەفتەیەکی کەمدا، وای لێکرد مجێزی خواردنی نەمێنێ و کێشی دابەزێ. تاقیکردنەوەی خوێن لەلای دکتۆرەکان نیشانەی نەمانێکی تیژی خۆپارێزی خوێن بوو. کەسیش لە بەغدا تێنەگەیشت، ئاخۆ چی بەسەر سەرکردەی بەرەی میللیدا هاتووە.

ئیدی تا دەهات تەندروستی «حەداد» لەنگ دەبوو. ئەو لەڕولاواز، هەر بە تەنیا ئێسکو پێستی مایەوە و لەجێگەدا کەوت. کاتێکیش حاڵی زۆر شڕ بوو، بە پەلە گەیەندرایە نۆڕینگەیەکی پزیشکی لە ئاڵمانیای ڕۆژهەڵات. ئەویش وەک زۆر لە وڵاتانی بلۆکی ڕۆژهەڵاتی، بەخشندانە پشتگیری تیرۆرستە فەلەستینیەکانیان دەکرد و چەک و مەشقیان پێدەکردن و ئاوارەکانیان لەخۆدەگرتن. بەڵام لەوێش شارەزا باڵاکان نەیانتوانی یارمەتی نەخۆشەکە بدەن. پزیشکەکانی ئاڵمانی ڕۆژهەڵات ژیانی «حەداد»یان پێڕزگار نەکرا، ئەوەبوو لە ٣٠ی مارتی ١٩٧٨بە حاڵەتێکی نەناسراو مرد. ئەو سەرکردە تیرۆرستە چل و هەشت ساڵە، ئەو ملیۆنان دۆلارەی کەڵەکەی کردبوو، لەکاتێکدا شەڕی وڵاتپارێزانەی لە دژی ئیسرائیل لەئارادا بوو، بۆ خوشکەکەی بەجێهێشت.

گریمانەی دکتۆرەکانی ئاڵمان ئەوە بوو، «حەداد» بە نەخۆشییێکی یەکلاکەرەوە مردووە کە سیستمی پارێزبەندی تێکداوە. کەسیش گومانی بۆ مۆساد نەچوو. هەندێک لە یاریدەدەرە نزیکەکانی حەداد دەسەڵاتدارە عێراقییەکانیان بە ژەهراویکردنەکە تۆمەتبار کرد، چونکە ئەو ڕژێمی هەراسان کردبوو. ئینجا دوای چەندین ساڵ نووسەرێکی ئیسرائیلی ڕاستییەکەی سەبارەت بە تێوەگلانی مۆساد لە مەرگە حەتمییەکەی حەداد بڵاوکردەوە. کاتێکیش «یاسر عەرەفات» کە ٣٠ ساڵ پاشتر مرد، یاریدەدەرانی پەنجەی تاوانی مردنەکەیان بۆ مۆساد ڕاهێشت. وێڕای ئەو هەموو تاقیکردنەوانەی دکتۆرە فەرەنسییەکان کردیان، تۆمەتبارکردنەکە نەسەلمێندرا.

لەگەڵ مەرگی «حەداد»دا، ڕێکخراوە دژوارەکەشی ڕما. پەلامارەکانی گرووپەکەی حەداد بۆسەر ئیسرائیل، بەتەواوی وەستا و شەڕێکی درێژ لەگەڵ پیسترین دوژمنی ئیسرائیل لە کۆڵ بوویەوە.

پاش «جیرالد بول» و «*وەدیع حەداد*»، نۆرەی «شەقاقی»ش هات.

✡ ✡ ✡

لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەمیندا، سوڵتانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی فەرماندەیەکی لەشکری دەریایی، کە فەرماندەیەکی ناودار و ئیقلیمگیربوو نارد تا دەست بەسەر دوورگەی «ماڵتا» لە دەریای سپی ناوەڕاستدا

بگرێ. سەرلەشکرەکەی سوڵتانیش هەر ڕۆیشت و ڕۆیشت، چەندین مانگ بەنێو دەریای سپی ناوەڕاستدا گەڕا.

بەڵام خۆ هیچی نەدۆزییەوە.

ئەدمیرالەکە گەڕایەوە ئەستەمبولێ، ڕاپۆرتی خۆی بۆ سوڵتان بەرزکردەوە و ڕایگەیاند: *"ماڵتا یۆک!"* (بە تورکی، واتە ماڵتا نیە).

بەڵام لە سەردەمی ئێمەدا کەسانێک هەبوون ماڵتایان دۆزییەوە، وەنەبێ هەر ئەوێیان دۆزیبێتەوە بەڵکو پیاوێکی دەمامکداریشیان تێدا دۆزییەوە، کابرا وایدانابوو لەبن ناسنامەیەکی دیکەدا بەشێوەیەکی زۆر نهێنی گەشت دەکا، ئەویش «د. فەتحی شەقاقی»ی سەرۆکی جیهادی ئیسلامی بوو.

لە ٢٦ی ئۆکتۆبەری ١٩٩٥دا، بەیانیەکی درەنگوەختیش بوو، کاتێ «فەتحی شەقاقی» لە هوتێلی دیپلۆمات لە شاری «سێلما»ی «ماڵتا» هاتەدەر. بەر لەوەی بگەڕێتەوە دیمەشق سەرێکی بازاڕی شارەکەی دا بەڵکو هەندێک شت بکڕێ، بۆ چەندین ساڵیش بوو لە دیمەشق دەژیا. شەقاقی بارۆکەیەکی لەسەر بوو و پاسپۆرتی لیبیاشی هەڵگرتبوو و ناوەکەشی «ئیبراهیم شاوش» بوو. ئەو لە شارە ئارامەکەی ماڵتادا هەستی بە سەلامەتی دەکرد. ئاخر نەیدەزانی چەندین ئاژانی مۆساد، لەو کاتەی گەشتەفڕینەکەی بەر لە هەفتەیەک لە «ماڵتا»وە بەرەو لیبیا دەستپێکردووە، سایەی دەکەن، گەشتەکەشی بۆ ئەوەبوو بەشداری لە کۆنگرەی ڕێکخراوە فەلەستینییە ژێرزەمینیەکاندا بکا.

نۆ مانگ پێش ئەو بەروارە، واتە لە ٢٢ی یەنایەردا دوو بۆمبهاوێژی خۆکوژ، کە ئەندامی ڕێکخراوەکەی جیهادی ئیسلامی شەقاقی بوون، لەنێو

وێستگەیەکی پاس لە دووریانی «بێیت لید» کە زۆر لە «نێتێنیا»وە دوور نەبوو خۆیان تەقاندەوە. بیست و یەک کەسیان کوشت، زۆرینەشیان سەرباز بوون، شەست و هەشت کەسی دیکەشیان بریندار کرد. ئەمەشیان خوێناویترین پەلاماری تیرۆریستانە بووە لە مێژووی ئیسرائیلدا. «ئیسحاق ڕابین»ی سەروەزیریش دەستبەجێ گەیشتە «بێت لید»، بەتەواویش بە وێرانکارییەکە هەژابوو، ئەو کاتەش چاوپێکەوتنەکەی «شەقاقی» لە گۆڤاری «تایمز»دا خۆیندەوە، لە تووڕەیان دەتەقییەوە. «شەقاقی» لە چاوپێکەوتنەکەدا بۆ خۆفشکردنەوە گوتبووی: "ئەمەیان گەورەترین هێرشی میلیشیایانە بووە کە لەنێو فەلەستین {لە دەرەوەی جەنگی عەرەب- ئیسرائیلدا} ڕوویدابێ."

- "گۆڤاری تایمز: پێدەچی لێیرازی بیت؟"

- "شەقاقی: ئەمە دڵنەوایی دەداتە خەڵکەکەمان."

ئیسحاق ڕابینی تووڕەش فەرمانی بە «شاباتی شاڤیت»ی *ڕامساد*، ئەفسەرە پێگەیشتوەکەی نێو مۆساد کرد، کە سەرۆکی جیهادی ئیسلامی بکوژێ.

«شاڤیت»یش ماوەیەک بوو بەدوای «شەقاقی»دا دەگەڕا.

بەگوێرەی هەفتەنامەی «دیر شبیگل»ی ئەڵمانی، مۆساد پێشنیاری کردبوو، کە لەنێو دیمەشق لە «شەقاقی» بدەن. بەڵام «ڕابین» قایل نەبوو. ئاخر ئەو بە نهێنی خەریکی دانوستانی ئاشتی بوو لەگەڵ سەرۆک حافز ئەسەد، نەشیدەویست ئەو دەرفەتە کزەی بە کێشەیەکی دیکە لەگەڵ دەوڵەتە دراوسێکەی باکوور تێک بدا. «ڕابین» داوای پلانێکی جێگرەوەی

دیکەی بۆ ئۆپەراسیۆنەکە کرد. وەک «شاڤیت» ڕوونی کردبووەوە، خودی ئەرکەکە زۆر ئاڵۆزبوو، چونکە «شەقاقی» دەیزانی جێنیشانەی سێرەی مۆسادە. هەر بۆیەش بەدەگمەن نەبووایە، سووریای بەجێنەدەهێشت. لەگەڵ ئەوەشدا «ڕابین» ڕەتیکردەوە لەنێو دیمەشق لەناوببرێ، بەڵکو دەبێ ئۆپەراسیۆنەکە لە دەرەوەی سنووری سووریاوە ئەنجام بدرێ.

بەڵام لەکوێ؟ بۆ ماوەیەک سەرکردەکانی مۆساد سەرەداوی شوێنەکەیان لەدەستدا. بەڵام لەکۆتاییدا، بەختیان یار بوو، ئاخر «شەقاقی» لە کۆنفرانسی ڕێکخراوە ژێرزەمینییەکان کە لە لیبیا دەبەسترا، بانگهێشت کرابوو. سەرەتا، وای وەڵام دانەوە کە ناچێتە کۆنفرانسەکە؛ بەڵام کاتێ پێیگوترا، کە ڕکابەرەکەی ئەو، واتە «سەید موسا»ی سەرۆکی ڕێکخراوی «ئەبو موسا»، کە ڕقی لێدەبووەوە، بەنیازە بەشداری کۆنفرانسە ناوبراوەکە بێ؛ شارەزایانی مۆساد پێیانوابوو، شەقاقی ڕێگە نادا نەیارەکەی بەرەی لەبن پێی دەرکێشی، بۆیە بەهەر نرخێک بێ لە کۆنفرانسەکە ئامادە دەبێ. هەر بەڕاستیش ڕاپۆرتێکی نهێنی لە دیمەشقەوە هات و گریمانەکەی سەلماند: «شەقاقی» چۆتە لیبیا. لە ئۆرشەلیمیش ئیسحاق ڕابین فەرمانی دەستبەکاربوونی ئۆپەراسیۆنەکەی دا.

سەرچاوە ئەورووپییەکان دەڵێن گوایە لەو کاتەوە ئامادەکارییەکانی مۆساد بۆ کردەوەکە دەستپێکردبوو، کە شارەزایانی مۆساد ڕیکۆردی گەشتەکانی «شەقاقی»یان بۆ لیبیا پشکنی بوو. بۆیان دەرکەوتبوو، هەموو جارێک «شەقاقی» لە ماڵتاوە بەرەو تەرابلسی لیبیا دەفڕێ.

ڕامسادەکەش بڕیاریدا لە ماڵتا نەوەک لە لیبیا دەستی خۆیان بوەشێنن. ماڵتا شوێنێکی ئاسانتر و هێمنتر بوو بۆیان. ئاژانەکانی مۆساد لە فرۆکەخانەی «ڤێلێتا»وە چاوەڕێی «شەقاقی»یان کرد، دیاربوو بەر لەوەی بۆ لیبیا بفڕێ، لەوێ کورتە پشوییک بدا. هەمیشە شەقاقی شوێنکەوتوانی بەوە شێت دەکرد، کە تەنها لە سێیەمین ڕۆژی گەشتەفڕین لە دیمەشقەوە بە خۆگۆڕین بەرەو لیبیا بفڕێ. ئەو کەمێک لە ڕاڕەوەکانی ترانزێتدا دەمێنێتەوە ئەوسا بەرەو لیبیا دەکەوێتە ڕێ.

لە ٢٦ی ئۆکتۆبەر و لە سپێدەیەکی زوودا، گەڕایەوە ماڵتا و لە هوتێلی دیپلۆمات دابەزی، کە پێشتریش لەوێ دەمایەوە. لەوێ ژووری ٦١٦ی پێدرا و دەستبەجێش هوتێلەکەی بەجێهێشت. دوو ئاژانی مۆسادیش بە سواری ماتۆڕێکی شین بۆ هەر کوێیەک بڕۆیشتبا، بەدوایەوە بوون. ئەو دوو سەعاتێک بەنێو بازاڕ و مارکێتەکاندا گەڕا. لە ڕێگەی گەڕانەوەیدا بوو بەرەو هوتێلەکەی، کە ماتۆڕەکە گەیشتە تەنیشتی. یەکێک لە ئاژانەکان دواتر سەروبیچمی وا وەسف کرا، کە لە خەڵکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەچوو، لێی نزیکبووەوە، لە مەودایەکی نزیکەوە شەش گوللەی بە دەمانچە بێدەنگەکەی لێ خاڵی کردنەوە. شەقاقی لەسەر لاڕێیەکە ڕاقەنا و بکوژەکەشی بەرەو کۆڵانە نزیکەکە هەڵات، هاوڕێکەی بە ماتۆڕەکە چاوەڕێی دەکرد. ئینجا بەرەو کەناراوە نزیکەکە تێیان تەقاند، لەوێشەوە خۆیان فڕێدایە سەر بەلەمێکی خێرا تا گەیاندیانە نێو قووڵایی دەریا و لەوێش سواری کەشتییەکی بارهەڵگر بوون. کەشتییەکە بەفەرمی چیمەنتۆی لە حەیفاوە بەرەو ئیتالیا دەگواستەوە، بەڵام جیا لە باری چیمەنتۆکە خودی «شاباتی شاڤیت»یشی هەڵگرتبوو، کە لەسەر پشتی کەشتیەکە سەرپەرشتی ئۆپەراسیۆنەکەی دەکرد. ڕێی دەرچوونەکە پێشتر

نەخشەی بۆ کێشرا بوو. کەسیش بەدوای دوو ئاژانەکە نەهات، لەوێشەوە گەیشتنەوە سەر پشتی کەشتتیە داکانەکە و بە سەلامەتی گەیشتنەوە ئیسرائیل.

دوای مەرگی شەقاقی، یاریدەدەرانی لەنێو جیهادی ئیسلامیدا، هەوڵیاندا مەتەڵی تەلیسمە سەرەکییەکە هەڵبێنن: تۆبڵێی چ ناپاکێک بێ کە وردەکاری گەشتەکەی گەیاندبێتە دەستی مۆساد؟ ئاخر بکوژەکان هەموو شتێکیان دەزانی: ڕۆژی دەرچوونی لە ماڵتاوە، ژمارەی گەشتە فڕینەکەی، ناسنامە ساختەکەی، ڕۆژی گەڕانەوەی لە ماڵتاوە بۆ دیمەشق ... دوای پێنج مانگ لە لێکۆڵینەوە، سەرکردەکانی جیهادی ئیسلامی خوێندکارێکی فەلەستینیان گرت کە یاریدەدەرێکی نزیکی شەقاقی بوو، بە ناپاکییان تاوانبار کرد. خوێندکارەکەش لەبن لێکۆڵینەوەدا ڕووخا و دانیپێدا نا: لەو کاتەی ئەو لە بولگاریا دەیخوێند، هێندرابووە نێو ڕیزەکانی مۆساد؛ سەوداکەرانی ڕایانسپاردبوو بچێتە دیمەشق ڕەگەڵ گرووپەکەی شەقاقی بکەوێ. لە ماوەی چوار ساڵی بەدواداهاتوودا، متمانەی شەقاقی بەدەستهێنا و بووە یەکێک لەو کەسە کەمانەی کە بە چالاکییەکانی شەقاقییان دەزانی.

بە پێچەوانەی حەماس و حیزبوڵڵا، کە بەشێکی زۆری هەوڵی خۆیان بۆ چالاکی کۆمەڵایەتی تەرخان دەکرد، جیهادی ئیسلامی یەک تاکە ئامانجی هەبوو: ئەویش تیرۆر بوو. کارەکەیان لە ژمارە شانەیەکی کەمی بە توانا و چالاک پێکهاتبوو، لە فەلەستینیەکانیش بوون، مەبەستی یەکەمین و ئاخیرینیشیان شەڕ دژی ئیسرائیل بوو. فەلەستینیەکانی هەندەران «فەتحی شەقاقی»یان بە باوکی ئایدیۆلۆژیای کردەوە خۆکوژییەکانیان

دەزانی. ئەو یەکەمین کەس بوو، لەنێو ڕێنمایی پیرۆزی ئیسلامەتیدا بۆمبڕێژکردنی خۆکوژی و کوشتن بەڕەوا بزانێ.

ڕێکخراوەکەی «شەقاقی» بەرپرس بوو لە زنجیرەیەک پەلاماری خوێناوی: لە پەلامارەکەی سەر پاسی ژمارە ٤٠٥ لە ٦ی تەمموزی ١٩٨٩ لەسەر ڕێی تەلئەبیب ئۆرشەلیمدا بوو لە ئەنجامدا شازدە کەس کوژران، لە ٤ی فێبرایری دا ١٩٩٠ نۆ کوژراو لە هێرشی پاسێکی گەشتیاری ئیسرائیلی لە نزیک قاهیرە؛ لە ٢٠ نۆڤێمبەری ٢٠٠٠دا هەشت کوژراو لە بۆمبێک لە پاسێکی «کفر دارۆم» لە خوارووی ئسرائیل؛ لە ١١ی نۆڤێمبەری ١٩٩٤دا کوشتنی سێ سەرباز لە هێرشێکی خۆکوژیدا لە بازگەی ڕێی غەززەدا؛ ئینجا ئەو بۆمبڕێژکردنە سامناکەی ٢٢ی ینایری ١٩٩٥ی «بێت لید» کە ٢١ کەس کوژران. ئەو شایستەی ئەو کوشتنە بوو کە لە سەر شەقامەکانیماڵتا و لەسەر دەستی ئاژانەکانی مۆساد وەریگرتەوە. دوای مەرگی شەقاقی، جیهادی ئیسلامی تا ڕاددەیەک لەبەین چوو، ئیدی ساڵانێکی زۆری خایاند تا ڕێکخراوەکە دوای مەرگی سەرکردەکەی، بەخۆی هاتەوە.

ئیسرائیلیش بە کردەی کوشتنەکە بەرپرسیار نەکرا. ئیسحاق ڕابینی سەروەزیریش گوتی: "من نازانم کێ ئەوی کوشتووە، بەڵام ئەوەش ڕاستییەکە، هیچ بۆی پەشیمان نیم."

✡ ✡ ✡

کەمێک دوای ئەوە، ئیسحاق ڕابینیش کوژرا، بەڵام نەوەک بە دەستی تیرۆرستێکی فەلەستینی، بەڵکو بە دەستی پەڕگیرێکی جوو.

# بەندی حەڤدە: نسکۆی عەممان

"باوکە، باوکە!" کیژۆڵەکە بە گریانەوە وەها بانگی کرد، یەکسەریش لە جێبە ڕەشەکە خۆی فڕێدا و بە دوای باوکیدا غاریدایە نووسینگەی باڵەخانە درێژەکەی سەنتەری عەممان.

"باوکە!" کیژەکە وا هاواری کرد و ئیدی ئەم هاوارکردنە بووە مایەی کەتنێکی[238] گەورە لە مێژووی مۆساددا.

✡ ✡ ✡

ئۆپەراسیۆنەکە زۆر بە مەعلانی نەخشەی بۆ داڕێژرابوو. تەنانەت ئەگەر وا پێچووبا شتێکیش لاڕێ بووبا، هەموو دەرفەتێکی سەرکەوتن لە ئارادابوو. ئامانجیش کوشتنی «خالد مەشعەل» بوو، کە تازە کرابووە سەرۆکی مەکتەب سیاسی ڕێکخراوی «حەماس». «خالد»ی تەمەن چل و یەک ساڵە، ئەندازیاری کۆمپیوتەر بوو، پیاوێکی کۆک بوو، بە لەشولارێکی وەرزشی و ڕیشێکی ڕەشەوە. ئەو سەرکردەیەکی هەڵچووی حەماس بوو، لەو چەند کەمە ساڵەی دواییدا ببووە دوژمنی هەرە دژواری ئیسرائیل. ئەو ڕێکخراوە تیرۆرستییە، کە لە ئیسلامییە پەڕگیرەکان پێکهاتبوو، جێگەی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی لەو چەند ساڵانەی دواییدا لە دژایەتی ئیسرائیلدا گرتبووەوە، چونکە یاسر عەرەفات و ئیسحاق ڕابین لە جموجۆڵی دانوستانی ئاشتی ڕێککەوتننامەی «ئۆسلۆ»دا بوون لە سیپتێمبەری ١٩٩٣دا. لەدوای کردەوە خۆکوژییە

[238] کەتن لە زمانی قانوندا ئەو پێشێلکارییە کە پلەیەک لەخوار تاوانەوەیە لەبارەی سزادان، بەڵام لێرە من بە واتای خوازراوی هەڵەی گەورەم بەکارهێناوە.

خوێناویەکەی ٣٠ تەمموزی ١٩٩٧، کە دوو تیرۆریست خۆیان لە نێو بازارێکی قەرەباڵغی «ماهانا یەهودا»دا تەقاندەوە و لە ئەنجامدا ١٦ ئیسرائیلی کوژران و ١٦٩ی دیکەش بریندداربون؛ ئەفسەرە پلەباڵاکانی مۆساد پێشنیازی کوشتنی «خالد مەشعەل»یان کرد. «بنیامین (بیبی) ناتانیاهو»ی سەروەزیریش بەپەلە کۆبوونەوەیەکی کابینەی حکوومەتەکەی کرد و بڕیاردرا یەکێک لە سەرانی حەماس لەناوبەرن. ژەنەڕاڵ «دانی یاتوم»ی ڕامسادیش کە لە ١٩٩٦ەوە لەو پۆستەدا داندرابوو، لە لایەن «ناتانیاهو»وە ڕاسپێردرابوو ئاخۆ کامە کەس دەبێ بکوژرێ.

«یاتۆم»یش تۆمارێکی دووردرێژی سەربازیانەی هەبوو. پیاوێکی سەرڕوتاوەی ماسوولکەداری لێوبەخەندە بوو، خۆی جەنگاوەر و جێگری بەرپرسی «سەیارەت ماتکال» بوو، پاشان ئەفسەری لقی زرێپۆشەکان دواتر فەرماندەی هێزی ناوەڕاستی لەشکری ئیسرائیل، کە هێشتا پلەکەشی مێجەر ژەنەڕاڵ بوو. ئەو بەدڵ و گیان پیاوێکی دڵسۆزی ئیسحاق ڕابینی سەروەزیر بوو، سکرتێری سەربازی ئەو بوو. دوای مردنی ڕابینیش، بۆ سەرسامی زۆر لە خەڵک، کرایە سەرۆکی مۆساد. هەموو ئەوانەی دەیانناسی پێزانینیان بۆ تۆمارە سەربازیانەکەی و کاریگەری هەبوو، بەڵام پێدەچوو ئەو کارامە شایستەیەی نەبێ، کە سەرۆکایەتی دەزگەیەکی هەواڵگری نهێنی پێبسپێردرێ. دیاربوو دەستنیشانکردنەکەی وەک *ڕامساد*، زیاتر ڕەچاوکردنی مەرگی «ڕابین» بووبێ لەوەی باشترین پیاو بۆ ئەو کارە بدۆزنەوە.

دوای کۆبوونەوەکەی لەگەڵ ناتانیاهو لە سەرەتای ئابی ١٩٩٧دا، «یاتوم» کۆبونەوەیەکی بە پەلەی لە بنکەی سەرەکی مۆساد ڕێکخست. سەرانی هۆبە جیاوازەکانی مۆساد لە ژووری کۆنفرانسەکاندا کۆبوونەوە. ئەوانیش

هەریەک لە «ئایزا ماگان»ی جێگری یاتوم؛ «ب» بەرپرسی «کاساری»، هۆبەی تایبەتی ئۆپەراسیۆنەکان؛ «ئیسحاق برازیلالی» بەرپرسی «تێڤل» واتە هۆبەی تایبەتمەند بە هاوکاری دەزگەی هەواڵگری بێگانە؛ «ئیلان میزراحی» بەرپرسی «تزۆمت» واتە هۆبەی کۆکردنەوەی هەواڵگریەکان؛ «د» بەرپرسی «نێڤیۆت» کە تایبەت بوو بە دزەکردنە نێو ئامانجەکانی دوژمن لەگەڵ سەرانی هۆبەکانی لێکۆڵینەوە و تیرۆریزم (ئەو کەسانەی لێرەدا هەر بە پیتی یەکەم ناویان هاتووە، هێشتا هەر لەکاردا ماون).

سەرەتا گفتوگۆیەکان گەیشتنە بنبەست. ئاخر مۆساد لیستێکی تەواوی سەرکردەکانی حەماسی نەبوو. بەناوبانگترین سەرکردەیان «موسا محەمەد ئەبو مەرزوق» بوو، کە پاسپۆرتی ئەمریکی هەبوو، هەر پەلاماردانێکیش بۆ سەر ئەو کێشەی لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لێدەکەوتەوە. لە سەرێکی دیکەوە، بەیەک دەنگی هەموو ئەوانەی لە کۆبونەوەکەدا بوون، خالد مەشعەلیان پێ ئامانجێکی گونجاو بوو؛ بەڵام نووسینگەکەی ئەویش لە عەممان بوو. دوای واژۆکردنی ڕێککەوتننامەی ئاشتی لەگەڵ ئوردندا لە ئۆکتۆبەری ١٩٩٤دا، «ئیسحاق ڕابین»ی سەروەزیر هەموو ئۆپەراسیۆنێکی مۆسادی لەو وڵاتەدا قەدەغە کردبوو. بە درێژایی ئەو ماوەیەش کە «یاتۆم» سکرتێری سەربازی «ڕابین» بوو، دەق بەگوێرەی ڕێنمایەکانی سەرۆکەکەی هەڵدەسووڕا؛ بەڵام دوای ئەوەی کرایە *ڕامساد*، «یاتۆم» بڕیاریدا ڕێنمایی «ڕابین» فەرامۆش بکا، بۆیە ناوی مەشعەلی وەک ئامانجێک لەبەردەم ناتانیاهودا دانا. پێشنیازەکەشی پشتگیری بەرپرسی «کاساری» و ئەفسەری هەواڵگر «میشکا بن داڤیدی» بوو.

ناتانیاهوش قایل بوو، بەڵام هێشتا سوور بوو لەسەر ئەوەی لە قەیران دروستکردن لەگەڵ ئوردن دووربکەونەوە، ئەو فەرمانیدا ئۆپەراسیۆنێکی

"هێمن" بێ و نمایشی لێدان و تەقەی تێدانەبێ. یاتومیش ڕووی دەمی لە گرووپەکەی کیدۆن نا -کە یەکەی گوڵبژێری کاساری بوو- تا ئۆپەراسیۆنەکە ئەنجام بدەن. دکتۆرێکی بیۆکیمیایی، لە هۆبەی لێکۆڵینەوی مۆساد، پێشنیازی بەکارهێنانی جۆرە ژەهرێکی کرد کە لە پەیمانگەی «نێس زیۆنا» پەرەی پێدرا بوو. هەر یەک دوو دڵۆپە لەو ژەهرە، کە بڕژێتە سەر پێستی هەر کەسێک، دەیکوژێ. ژەهرەکەش هیچ شوێنەوارێک لەدوای خۆی جێناهێڵێ و تەنانەت شیکاری تەرمەکەش نایدۆزێتەوە. هەمان ژەهریش لە ڕابردوودا لە گۆبەندی «گۆدیڤیا»دا دژی «وەدیع حەداد»ی سەرۆکی بەرەی میللی فەلەستینیەکانی لوبنان بەکار هێندرابوو. (بڕوانە بەندی ١٦).

"ئایا ئەو ژەهرە تۆی هەراسان نەکرد؟" ئەمەش ئەو پرسیارە بوو کە چەندین ساڵ دواتر «ڕۆنێن بێگمان»ی ڕۆژنامەنووس لە«بن دایڤد»ی کرد. "ئاخر ئەم جۆرە شێوە ناوازەیە بۆ مردن..."

«بن دایڤد»یش وەها وەڵامی دایەوە: "باشە، گوللەیەک لەسەرت بدەن یاخود موشەکێک بە ترومبێلەکەتەوە بنێن مرۆیانەترە لە ژەهراویکردن؟ ... هەڵبەتە ئەوە باشترە کە کەس نەکوژی، بەڵام لە شەڕی دژی تیرۆردا ئەم کارانە هی ئەوە نیین خۆیان لێبەدوور بگری. بڕیاری سەروەزیر بەوەی ئۆپەراسیۆنێکی "بێدەنگ" بکرێ تا پەیوەندییەکانی ئێمە لەگەڵ ئوردن زیانی پێنەگا، لۆژیکێک بوو بۆ خۆی."

✡ ✡ ✡

لە هاوینی ١٩٩٧دا، هەر ڕێبوارێک لەسەر شەقامێکی تەلئەبیب بڕۆیشتبا، دەیبینی دوو گەنج دوو قوتووی کۆکاکۆلا ڕادەهەژێنن، ئینجا سەرەکەی پاڵ دەنێن و دەیکەنەوە. خواردنەوەکە دەنگێکی لێوەدەهات و دەپڕژا. بۆ

ساتێک خەڵکی سەر شەقامەکە چاوێکی بێزارکەرانەیان لە دوو گەنجەکە کرد و لەسەر ڕێڕۆیشتنی خۆیان بەردەوام بوون. ئاخر بە مێشکیاندا نەدەهات، کە دوو گەنجەکە دوو ئاژانی مۆساد بن و مەشق لەسەر کوشتنی «مەشعەل» بکەن: یەکێک لەوان شووشەیەکی کۆکا کۆلا بەم جۆرە دەکاتەوە تا سەرنجی دەوروبەرەکە بۆخۆی ڕابکێشێ، لەکاتێکدا ئەوەی دووەم چەند دلۆپێک لە ژەهر بە پشتەملی نێچیرەکەیدا دەکا.

شەش هەفتە پێش ئۆپەراسیۆنەکە و لە ئابی ١٩٩٧دا، ئاژانە بەراییەکان گەیشتنە ئوردن. ئەوان پاسپۆرتی بیانیان هەڵگرتبوو، ڕۆژانە سایەی مەشعەلیان کرد: کەی لەماڵ دەردەچێ، سەر لە بەیانیان کێی لەگەڵ سواری ترومبێلەکە دەبێ، کامە ڕێگە دەگرێتەبەر و بەرەو کوێ دەڕوا، ئایا ئەو ڕێگەیەی پێیدا دەڕوا لەڕوی قەرەباڵغییەوە چۆنە؟ ئەوان کاتی لە ترومبێل دەرچوون تا دەگاتە نێو باڵەخانەکەیان پێوا، چاودێری ئەوەیان کرد ئایا لەسەر ڕێگەی دەوەستێ و قسە لەگەڵ کەس دەکا کە دەچنە نێو هەمان باڵەخانە، هەروەها هەموو وردە زانیارییەکی گرنگیان کۆکردەوە کە کاربکاتە سەر نەخشەی پلانەکەیان.

تیمی پێشوەخت، ڕاپۆرتی بۆ بنکەی کیدۆن بەرزکردەوە و پوختەی ئەرکەکە بەراییەکان بەو جۆرە بوو: هەموو بەیانییێک، مەشعەل بەبێ پاسەوان لە ماڵەکەی خۆی دەردەچێ. سواری ترومبێلی SUV دەبێ کە یاریدەرێکی لێیدەخوڕێ و بەرەو نووسینگەی ئاسوودەیی فەلەستینیەکان لە سەنتەری «شامیە» لەنێو عەممانداا بەڕێدەکەوێ. دوای ئەوەی مەشعەل لە ترومبێلەکە دادەبەزێ، شوفێرەکە ترومبێلەکە دەبا و دەڕوا. مەشعەلیش مەودایەکی کورت بەپێ دەڕوا تا دەگاتە نێو باڵەخانەکە. نووسینگەی ئاسوودەیی فەلەستینییەکان ناوێکی داپۆشراوە بۆ بنکەی سەرەکی حەماس لە پایتەختی ئوردن.

ڕاپۆرتی چاودێری لە لایەن تیمی پێشوەختەدا پێشنیازی کردبوو، باشترین ڕێگە بۆ لێدانی مەشعەل سەر لەبەیانییە، لەسەر لاڕێیەکە، دوای ئەوەی لە ترومبێلەکەی دادەبەزێ بە پێ دەیەوێ بڕواتە نێو باڵەخانەکە.

ڕاپۆرتەکان بە درێژایی هاوین بەردەوام بوون: چاودێری، ناردنی تیمی دیکە بۆ عەممان بۆ یارمەتیدان، بەکرێگرتنی ماڵی پارێزراو و ترومبێل. بەڵام لەپڕ، لە ٤ی ئەیلوولدا، پەلامارێکی دیکەی تیرۆرستیانە ئۆرشەلیمی هەژاند: سێ ئەندامی حەماس خۆیان لە شەقامی «بن یەهودا»دا تەقاندەوە و پێنج ئیسرائیلییان کوشتن و ١٨١ کەسی دیکەیان بریندار کردن. ئیدی ئیسرائیل نەیدەتوانی لەوە زیاتر چاوەڕێ بکا، کاتی دەستبەکاربوونی تیمەکە هاتبوو.

✡ ✡ ✡

٢٤ی ئەیلوولی ١٩٩٧، ڕۆژێک بەر لە ئۆپەراسیۆنەکە. جووتە گەشتیارێک هەندێک لە لای مەلەوانگەی هوتێلی گەورەی عەممان‌دا مانەوە. پیاوەکە ڕۆبێکی مەلەوانی سپی لەبەردابوو. بە کارمەندەکانی هوتێلەکەی گوت، کەوا تازە لەبن باری لێدانی دڵ هەڵساوەتەوە؛ ڕۆیشتنە هێواشە خۆپارێزیەکەشی بەڵگەبوو، هێشتا هەر لەبن لێکەوتەی نەخۆشیەکەی دەناڵێنێ. ئەو ژنە گەنجەی یاوەریشی پزیشک بوو. ناوە ناوە لە ڕێی بازندی دەستی پەستانی خوێن و لێدانی دڵی دەپشکنی. زۆربەی کاتەکانیش لەسەر تەختەبەندێکی مەلەوانگەکە پاڵ دەکەوت. دڵنەخۆشەکە خودی «میشکا بن داڤید» بوو، کە بەرپرس بوو لە پەیوەندیکردن لەنێوان بنکەی سەرەکی مۆساد و ئاژانەکانی سەر گۆڕەپانی کار. ژنەکەش هەر ئاژانێکی مۆساد بوو، بەڕاستیش پزیشک بوو کە دەرزی دژەژەهرەکەی پێبوو کە بەنیاز بوو بە ژەهر لە خالد مەشعەل بدەن. دژە ژەهرەکەش لەکاتێکدا بەکاردەهات، گەر هاتبا و بەڕێکەوت لەمیانەی ئۆپەراسیۆنەکەدا

دڵۆپەی ژەهرەکە بەر ئاژانێکی کیدۆن بکەوێ. دەستبەجێ لێدانی دژەژەهرەکە تاکە هۆیە بۆ ئەوەی ئەو کەسەی دڵۆپە ژەهرەکانی بەر جەستە بکەوێ، لە مەرگی دڵنیا ڕزگاری ببێ.

لەکاتێکدا نەخۆشە ساختەکە و دکتۆرەکە لە مەلەوانگەکە چاوەڕێ بوون، دەستەی زەبروەشێن دوا ئامادەکارییەکانی خۆیان کرد. لەو کەمە ڕۆژانەی دواییدا، چەندین ئاژان گەیشتنە عەممان؛ ئەوان ترۆمبێلی قوتاربوونیان دەهاژۆت و ڕۆڵی لاوەکیان دەبینی. دوای ئەوانیش دەستەی زەبروەشێنەکە گەیشت: بریتیبوون لە دوو ئاژانی کیدۆن، گوایە دوو گەشتیاری کەنەدین و ناوەکانیشیان «شاون کەندال» و « باری بیدز» بوون. هەردووکیان لە هوتێلی ئینتەرناسیونال دابەزین. لە پرسیار و وەڵام سەبارەت بە هەردوو ئاژانەکە، چەندین پرسیاری وروژاو سەبارەت بەو گەشتیارانە بەرپابوون: باشە بۆ ئەوانە بۆ کردەوەکە هەڵبژێردران، خۆ تەنانەت لە هیچ وڵاتێکی عەرەبیدا لە هیچ ئۆپەراسیۆنێکدا ڕۆڵیان نەبینیوە؟ ئەدی بۆچی پاسپۆرتی کەنەدیان هەڵگرتووە، تەنانەت مشوورخۆرێکی دارایش دەزانێ کە ئەوانە کەنەدی نین؟ ئینگلیزییەکەشیان زۆر فەرمییانەیە و ئەکسێنتەکەشیان ئیسرائیلییانە، بێ سێودوو کەمترین لێکۆڵینەوە دەتوانێ دەمامکیان لەسەر لاببا. بەڵام هەموو ئەمانە لەچاو هەڵەی تیمی چاودێری هیچ نەبوون، ئیدی هەر دوای ئۆپەراسیۆنەکە کەموکورتییەکان ئاشکرا بوون.

دەستەی زەبروەشێن شوێنی خۆیان لەنێو دەروازەی باڵەخانەی «سەنتەری شەیما» گرت، ئەوەی نووسینگەی مەشعەلی لێبوو. ڕووبەڕووبونەوەی نێوان ئاژانەکانی کیدۆن و مەشعەل وا داندرا خێرا و یەکلاکەرەوە بێ. «شاون» و«باری» دەبوایە لە مەشعەل نزیک ببنەوە، ژەهرە گیراوەکەی بەسەر پشتملیدا بڕژێنن ئینجا بەو ترۆمبێلەی لەنزیک

ئەویّ ڕاگیرابوو، هەڵبێن. هەر دوو "کەنەدییەکە" دوای مەشق و ڕاهێنانیان لەسەر شەقامی تەلئەبیب، بۆ کارەکەیان ئامادەبوون. «شاون» دەبوایە بوتڵی کۆکا کۆلای بەدەستەوە بوایە؛ کاتێک مەشعەل بەرەوڕوویان دەهات کۆلایەکە بهەژێنیّ و هەر بەڕێکەوتیش کۆلایەکە بە ئاراستەی ئەودا بپڕژێنیّ. بەڵام هەڵبەتە خۆ کۆلایەکە مەبەستی چیرۆکەکە نەبوو. «باری» کە قوتوویێکی بچکۆلانەی ژەهری پێبوو، بیچمی سەرەکی داخواز بوو لە کردەوەکەدا؛ دەبوایە لەمیانەی چەند چرکەیەکدا، ژەهرەکە بەرەو لای مەشعەل بڕشێنیّ. لەو کاتەشدا پرژانی کۆکاکۆلایەکە سەرنجەکان لەسەر پێداکردنی ژەهرەکە لادەبا؛ ئەوسا گیراوەی ژەهرەکە بەسەر پێستی کابرادا دەڕژیّ و بە هۆی "لێدانی دڵ" دەمریّ.

دوو گەشتیاری دیکەش، پیاوێک و ژنێک لە هۆڵی پێشوازی نێو باڵەخانەکە ئامادەبوون، ئەمەش بۆ ئەوەی نەبادا تیمی دەستوەشێن پێویستیان بە یارمەتی بیّ. بۆ نموونە ئەگەر خالد مەشعەل خێرا بێتە ناو باڵەخانەکە، یان هەردوو کەنەدییەکە پێپڕانەگەن و نەیگەینیّ، ئەوا لەوکاتەدا ئەو تیمەی وەک یەدەگ لە ژوورەوەیە، دێنەدەر و خۆ بە مەشعەل دادەدەن و چونەژوورەوەی دوا دەخەن، تا ئەو کاتەی ژەهرڕژێنەکەی دەگاتە سەر.

بەم جۆرە، مۆساد لەو بڕوایەدا بوو، ئەوان بیّ هیچ ڕووبەڕووبونەوەی ئوردنییەکان کارەکەیان بە پەرێزخاوێنی ڕایی دەکەن.

کلیلی سەرکەوتنی کردەوەکەش ڕەوشی مەیدانییەکە بوو: ناوچەی مەبەست لە پاسەوان، ئەندامانی خانەوادە، خزم و ناسیاو، ئەفسەرانی پۆلیس، مێلیشای حەماس لەگەڵ کەسانی دیکە، کە ببنە بەربەست بە دوور بیّ. هەر بەڕاستیش ڕێنمایەکان بۆ هەر هەشت ئاژانەکە ڕوون و ئاشکرابوو: ئۆپەراسیۆنەکە تەنها لە ڕەوشێکدا دەکریّ، کە هەموو ئەو

مەرجانەی سەرەوەی تێدا بێ. «دانی یاتوم» بە بیری بوو کە پێیگوتبوون: "ئەگەر هاتوو دۆخەکە لەگەڵ پلانە بنەڕەتییەکەدا جیاواز بوو، ئەوا هەمیشە دەتوانین دواتر نەخشەکە جێبەجێ بکەین." هەروەک ئێمە زانیمان، هەر بەڕاستیش وا قەوما. ئاژانەکان چەندین جار هاتنە شوێنی مەبەست و کردەوەکەیان لەبەر پەیدابوونی کێشەی چاوەڕواننەکراو، وەک هەبوونی ئەفسەرانی پۆلیسی ئوردنی لە ناوچەکە، هەبوونی پاسەوان و یاوەری مەشعەل یان لە دوا ساتدا مەشعەل بڕیاریدا کە نەچێتە نووسینگەکەی، هەڵوەشاندبووەوە.

✡ ✡ ✡

ڕۆژی بەزمەکە؛ ٢٥ی ئەیلوولی ١٩٩٧.

فەرماندەی ئۆپەراسیۆنەکە لەسەر شەقامی بەرانبەر نووسینگەی باڵەخانەکە جێگەی خۆی گرت. بڕیاریدابوو کە تەلەفۆنی دەستی یاخود ئامێری ئەلکترۆنی بۆ پەیوەندیکردن لەگەڵ یەکدیدا بەکارنەهێنن، بەڵکو هەموو ئاژانەکان هەر لەڕێی ئاماژە و زمانی جەستە پەیوەندی بەیەکەوە بکەن. لە دۆخێکیشدا ئەگەر پێویست بکا، کردەوەکە هەڵبوەشێننەوە، ئەوا فەرماندەکە شەپقەکەی وەک ئاماژەیەک دادەکەنێ.

لەپشت باڵەخانەکەش، ترومبێلێک لە دەروازەی گەراجەکە بۆ هەر دوو ئاژانەکە وەستابوو. «شاون» و«باری» گەیشتنە شوێنی خۆیان، بە هەمان شێوەش جووتەکە، پیاو و ژنەکە لە هۆڵی پێشوازی باڵەخانەکە ئامادە بوون.

هەموو شتێک ساز و ئامادە بوو.

له ماڵی «خالد مەشعەل»دا، هەموو بەیانییێک وەک ڕۆتینێکی دروست وابوو، بە تەنیا دەردەچوو، بەڵام ئەو ڕۆژە لەدوا ساتدا گۆڕانکارییێکی بچکۆلە ڕوویدا. ژنەکەی مەشعەل داوای لە مێردەکەی کرد، بەڵکو ئەمڕۆ هەردوو منداڵەکانی لەگەڵ خۆی بباتە قوتابخانە. جاران هەر دایکەکە دەیبردن. منداڵەکانیش لەگەڵ باوکیاندا سواری ترۆمبێلەکە بوون، بەڵام تیمی چاوەڕوانیەکەی مۆساد تێبینی ئەو شتەیان نەکرد و ڕاپۆرتیان دایە کیدۆنەکان کەوا «مەشعەل» کەوتۆتە ڕێ، هەر بەتەنیا خۆی و شوفێرەکەیەتی. ئاژانەکان لەوەدا سەرنەکەوتن کە منداڵەکان لەپشتی ترۆمبێلەکەدا ببینن. ئاخر جامی ترۆمبێلەکە تاریک بوو، لە دەرەوەڕا ناوەوەی ترۆمبێلەکە دیار نەدەبوو.

مەشعەل گەیشتە سەنتەری «شامیە»، لە ترۆمبێلەکە دابەزی، لاڕێیەکەی بڕی، خەریکبوو پێ بنێتە سەر پەیژەکانی دەروازەی باڵەخانەکە. هەر دوو ئەندامی دەستەی دەستوەشێنەکەش لێی نزیک بوونەوە، دە مەتر، پێنج، سێ .... بەڵام لەوکات و لە پڕێکەوە کیژۆڵەیەکی مەشعەل لە ترۆمبێلەکە بەدیارکەوت و بانگی کرد: "باوکە باوکە!" و بەرەو باوکی غاری دا. شوفێرەکەش لە ترۆمبێلەکە هاتەخوار بە دوای منداڵەکەدا ڕایکرد. فەرماندەی ئۆپەراسیۆنەکەش هەوڵیدا ئاماژەیەک بداتە پیاوەکانی و کردەوەکە هەڵبوەشێنێتەوە. بەڵام لەو ساتە بڕیاردەرەدا، هەردوو ئاژانەکان لە مەشعەل وەرسووڕانەوە و گەیشتنە پشت دینگەی باڵەخانەکە، بۆ ساتێک فەرماندەکەیان لەبەرچاو نەما. لەوەش خراپتر، ئەوان کیژۆڵەکەیان نەبینی، شوفێرەکەشیان نەبینی کە بەدوای کیژەکەدا غاری دا.

پیاوە دەستوەشێنەکان لەسەر جووڵەکەیان بەردەوام بوون. ئەوان گەیشتنە مەشعەل و «شاون» بوتڵە کۆکا کۆلایەکەی هەژاند و پاڵی

بەسەرەکەیەوە نا تا بکریێتەوە. بەڵام لەو کاتەدا و بۆ یەکەمجار سەری بوتڵەکە نەکرایەوە. ئیدی کردەی لەخشتەبردنەکە و سەرنجڕاکێشانەکە شکستی هێنا. لەو کاتەش شوفێرەکەی «مەشعەل» کە بە دوای مناڵەکەدا غاری دەدا، بینی غەوارەیەک دەستی بەرزکردۆتەوە، ئیدی لە شوێنی خۆی وا تێگەیی کە کابرا خەریکە گەورەکەی ئەو بداتە بەر چەقۆ. ئینجا لەجێی خۆی هاواری کرد، بەرەو ڕووی «باری» چوو، هەوڵیدا بەو ڕۆژنامە لوولدراوەکەیی دەستی لێیبدا. مەشعەلیش گوێی لە هاتوهاواری شوفێرەکەی بوو و ئاوڕی دایەوە. لەو ساتەدا، ڕشێنەکەی دەستی «باری» یەک دوو دڵۆپ بەر گوێی مەشعەل کەوت. هەستی کرد وەک ئەوەی دەرزییێکی سووکی لێبدەن وابوو، بەڵام تێگەیشت شاشییێک لە گۆڕێدا هەیە، ئیدی تا هێزی تێدا بوو هەڵات. هەرچی «شاون»و «باری»یش بوون خێرا بەرەو لای تڕومبێلەکەیان ڕۆیشتن.

هەر لەویٚ، کاراکتەرێکی دیکە لەسەر شانۆی ڕووداوەکە پەیدا بوو" «محەمەد ئەبو سەیف» ئەندامێکی میلیشیای حەماس لە ڕێگەدا بوو هەندیٚ بەڵگەنامە بداتە دەستی مەشعەل. ئەویش گوێی لە هاوارەکە بوو، ڕووبەڕوبونەوەی سەرکردەکەی و دوو ئاژانەکەشی بینی. لەو کاتەی مەشعەل لەتاو ژیانی هەڵدەهات، «ئەبو سەیف» هەوڵیدا «شاون»و «باری» بوەستێنیٚ، کە خەریکبوون بگەنە لای تڕومبێلەکە، سێیەمین توخمی ئەرکە شکستخواردووەکە. کابرا خۆی لە «شاون» کرد، ئەویش بە بوتڵە کۆکا کۆلا نەکراوەی لێیدایەوە. «شاون» و «باری» توانیان لە دەستی ڕزگار ببن و خۆیان هەڵدایە نێو تڕومبێلەکە و بۆی دەرچوون.

بەڵام ئەوسا ئەوان کوشندەترین هەڵەی ئۆپەراسیۆنەکەیان کرد. شوفێرەکە بە «شاون» و «باری» گوت، ئەبو سەیف ژمارەی تڕومبێلەکەی نووسی. ئینجا دەستەی دەستوەشێن بڕیاریاندا تڕومبێلەکە

بەجێبێڵن. ترسان نەبادا «ئەبو سەیف» پۆلیسی لێئاگادار بکاتەوە، ئینجا وەک نەخشەیان بۆ دارِشتبوو کاتێ ئەوان بە ترِومبێلەکە دێنەوە هوتێلەکە، لەوانەیە لەوێ بگیرێن. ئەو کاتیش هیچ ماڵێکی پارێزراویان لەوێ نەبوو هیچ ناونیشانێکیان نەبوو پەنای بۆ بەرن، هیچ دەرچەی هەڵاتنیشیان نەبوو. «شاون» و «باری» دوای چەند کۆڵانێک لە ترِومبێلەکە دابەزین، شوفێرەکەش پێی لە بەنزین نا بەڵکو ترِومبێلەکە لە شوێنێک فرِێ بدا.

بەڵام خۆ دەرچوو «ئەبو سەیف» ئەو موجاهیدە دێرینە بە دەستێکی سووک لەکۆڵیان نەبووەوە. ئەو پیاوە چوست[239] و کەرِەپە لە ترِومبێلە ئیسرِائیلییەکە سوورِایەوە. «باری» و «شاون» کە لە ترِومبێلەکە هاتبوونە خوارو بە پێ لەسەر جادە دەرِۆیشتن، سەرنجی کابرایان نەدا تا هات و یەخەی «باری» گرت و هەر هاواری دەکرد کەوا ئەم پیاوە لە خالد مەشعەلی داوە. «شاون»یش کە لە دیوەکەی دیکەی شەقامەکە بوو، بەپەلە بە هانای هاورِێکەیەوە چوو. ئەویش زەبرێکی لەسەری «ئەبو سەیف» داو هەندێکی بە سووکی بریندار کرد و فرِێی دایە نێو جۆگەیەکی دەم جادەکە. ئیدی زۆرانبازیەکەیان بەردەوام بوو؛ هەرزووش خەڵک لە دەورەیان خرِ بوونەوە، بینیان دوو لایدە لە عەرەبێک دەدەن. پۆلیسیش هەر ئەوکات گەیشتە شوێنی رِووداوەکە، بڵاوەیان بە خەڵکەکە کرد و تاکسییێکیان رِاگرت و هەردوو لایدەکە و ئەو پیاوەی کە زۆریشی لێدرابوو خستە نێو ترِومبێلەکە. تاکسی بەرەو بنکەی پۆلیس لێیخورِی.

لە بنکەی پۆلیسدا، سەرەتا وایان زانی «ئەبو سەیف» پەلاماری ئەو دوو کەسە بیانیەی داوە؛ بەڵام دوای ئەوەی «ئەبو سەیف» بە خۆی هاتەوە، ئەو هەردوو بیانیەکەی بەوە تۆمەتبار کرد کە پەلاماری خالد مەشعەلیان

---

[239] چوست: چاپووک. گورج.

داوه. ئوردنییەکانیش لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا کرد، کاتێکیش تێگەیشتن کە ئەوان کەنەدین، یەکسەر کونسولخانەی کەنەدییان لێئاگادارکردنەوە. دیپلۆماتەکەش بۆ ماوەیەک قسەی لەگەڵ «شاون» و «باری» کرد و ئینجا لەگەڵ ئوردنییەکان و پاشان گوتی: "من نازانم ئەو پیاوانە کێن، بەڵام لەیەک شت دڵنیام، ئەوانە کەنەدی نین!"

هێشتاش ئوردنییەکان نرخی ئەو گەنجینەیان نەزانی کە کەوتبووە بن دەستیان، بەڵام بڕیاریاندا جارێ هەردوو کەسەکە بەدەستبەسەری بهێڵنەوە و ڕێگەشیان پێدان تەلەفونێک بکەن. ئاژانەکانیش پەیوەندییان بە بنکەی مۆسادی ئەورووپاوە کرد و ڕایانگەیاند کەوا دەستبەسەر کراون. هەر لە هەمان کاتیشدا، خانمە ئاژانێکی مۆساد کە بەشداری ئۆپەراسیۆنەکە بوو لەبەردەم سەنتەری شەیماوە سەیری دۆخەکەی کرد، تێگەیشت کە شکستێکی گەورە لە گۆڕێدایە و بڕیاریدا «میشکا بن داڤید»ی، "دڵنەخۆشەکە" کە ئەفسەرێکی پلەباڵای مۆساد بوو لە ئوردن، ئاگادار بکاتەوە. بۆیە خانمەکە خێرا بەرەو هوتێلەکە ڕۆیشت. بە بینینی ژنەکە، کابرا تێگەیشت شتێکی خراپ ڕوویداوە. ئاخر ڕێنماییەکەی پێشتر وابوو، هیچ کەس لەو نزیک نەبێتەوە، تەنها لەیەک حاڵەت بەدەر: ئەگەر هاتوو ئۆپەراسیۆنەکە شکستی خوارد یان هەموو ئاژانەکان بە سەلامەتی لە وڵاتەکە دەرچووبن.

«بن داڤید» دەستبەجێ ڕۆبەکەی فڕێدا و خۆی گۆڕی، خێرا چووە شوێنی کۆبوونەوەی نهێنی، کە پێشتر ئامادە کرابوو. زۆریشی پێنەچوو فەرماندەی ئۆپەراسیۆنەکەش گەیشت. ئەویش ئاگای لە نوشستیەکە بوو. بەڵام هێشتاش هیچ کامیان خەیاڵیان بۆ ئەو پاشاگەردانییە نەچوو کە لێی کەوتەوە.

دەمودەست «میشکا» ڕاپۆرتی خۆی دایە بنکەی سەرەکی مۆساد. دانی یاتومی ڕامسادیش پرسەکەی لەگەڵ سەرۆکی هۆبەکان تاوتوێ کرد، ئینجا بڕیاردرا ئاژانەکان پەنا بۆ باڵوێزخانەی ئیسرائیل لە عەممان ببەن و هەوڵنەدەن ئەو ڕێگە هەلاتنانە بەکاربهێنن کە پێشتر لەسەری ڕێککەوتبوون. ئینجا با بگەڕێینەوە ئوردن؛ هەمووان شوێنی کۆبوونەوەکەیان جێهێشت و ڕوویان لە باڵوێزخانەکەیان کرد. تەنیا دکتۆرەکە لەنێو هوتێلەکەدا مایەوە.

لەو نێوەشدا، لە گەڕەکێکی عەمماندا، ئەو ژەهرە کوشندەیەی بەر مەشعەل کەوتبوو، خەریکبوو کاری خۆی بکا. ئەو کەوت و دەستبەجێش گەیەندرایە نەخۆشخانە. ئیسرائیلیەکانیش پەییان بەوە برد، ئەگەر هاتوو دژەژەهرەکەی نەگاتێ، ئەوا لەیەک دوو سەعاتی داهاتوودا دەمرێ.

ناتانیاهوش لەنێو ترومبێلدا بوو، بەرەو ئاهەنگێکی سەری ساڵی جوو دەڕۆیشت، کە هەواڵە ناخۆشەکەی پێگەیشت... دەبێ بگاتە بنکەی سەرەکی مۆساد شتێکی سەیر ڕوویداوە. «دانی یاتوم» بە کورتی سەروەزیری ئاگادار کردەوە. ناتانیاهوش سامگرتی بوو. فەرمانیدا ڕامسادەکە بەرەو عەممان بفڕێ، لەوێ شا حوسێن ببینێ، هەموو شتێکی پێ بڵێ، بەبێ لادان یان هیچ درۆیەک. هەر لە بنکەی مۆسادەوە سەروەزیر تەلەفۆنێکیشی بۆ شا حوسێن کرد و پێیگوت، کە *ڕامسادەکەی* بۆ پرسێکی زۆر گرنگ دەنێرێتە لا. پاشاش هەرچەندە هیچ بیرۆکەیەکی نەبوو ئاخۆ کۆبوونەوەکە بۆ چییە، کەچی دەستبەجێ قایلبوو.

یاریدەرەکانی ناتانیاهو کە ئەوکات پاڵپشتی بوون، گوتیان ئەو تووشی سەرسامی بوو، هەر بۆیەشە ڕێنمایی دایە «یاتوم» بەهەر شتێکی شاحوسێن دەیەوێ بۆ گۆڕینەوەی ئاژانەکان ڕازی بێ. هەروەها فەرمانی بە ڕامسادەکە کرد ئەو بڕە دژەژەهرەش بداتە ئوردنییەکان بۆ ئەوەی

مەشعەل لە مردنی مسۆگەر ڕزگار بکەن. «شارۆن»یش دواتر گوتی: "من ناتانیاهوم لە گۆبەندی مەشعەلدا بینی. پارچە پارچە ببوو، ئێمەش دەبووایە دیسان کۆی بکەینەوە ... ئەو لەژێر فشاردا بوو، ئامادەی دەستبەرداربوونی هەر شتێک بوو..."

پاشان شاحوسێنیش بە پەشۆکاوی گوێی لە یاتوم گرت و فەرمانی بە پیاوەکانی خۆی کرد، بزانن ئاخۆ ڕەوشی مەشعەل چۆنە. دەستبەجێ مەزندە دەقاودەقەکە گەیشت: دۆخی پیاوەکە بەخێرایی بەرەو خراپی دەڕوا. پاشا دەستبەجێ بڕیاریدا بیگەیەننە نەخۆشخانەی پاشایەتی و خستنەڕووەکەی «یاتۆم»یشی پەسەند کرد، کە دژە ژەهرەکەیان لێوەربگرێ تا ژیانی کابرای پێ ڕزگار بکا. بەڵام لە وەرچەرخانێکی تەوسدارانەی ئەو گۆبەندەدا، ئیسرائیلی و ئوردنییەکان لە کێبەرکێی دژی کاتدا بوون بۆ ئەوەی ژیانی دوژمنەکەیان کە تیرۆرستێکی سەرسەخت بوو، ڕزگار بکەن.

«میشکا بن دایڤد» گەڕایەوە هوتێلەکە. دەرزی دژەژەهرەکەی لە بەرکدا بوو. "من هەر بەو دەرزیە دژەژەهرە لەوێ دەسووڕامەوە."دواتر لە چاوپێکەوتنێکدا ئاوها باسی ڕەوشەکەی کرد: "دەمزانی هیچ سوودی نەماوە، چونکە هیچ کام لە پیاوەکانی ئێمە ژەهرەکەیان بەرنەکەوتبوو. تەنیا ئامانجەکەمان تووش ببوو.. ئیدی هاتمەسەر ئەوەی بڕیاربدەم، دەرزیەکە فڕێ بدەم و لەکۆڵ خۆمی بکەمەوە، ئاخر دەشترسام نەبادا بگیرێم و دەرمانەکەشم لەدەست بێ. بەڵام هەر ئەو کات بوو زەنگێکم لە یەکەی فەرماندەوە لە ئیسرائیلەوە بۆهات. لێیپرسیم ئاخۆ هێشتا دژەژەهرەکەم پێماوە، کاتێکیش گوتم بەڵێ، داوای لێکردم بچمە ژووری پێشوازی هوتێلەکە، کاپتنێکی لەشکری ئوردنی لەوێ چاوەڕێم دەکا تا دەرمانەکە وەربگرێ و ڕاستەوخۆ بیباتە نەخۆشخانەکە.

بەڵام هەر ئەوکات کێشەیەکی نەخوازراوی دیکەش سەریهەڵدا: ئەو خانمە پزیشکە کەوا بەتەمابوو دژەژەهرەکە لە مەشعەل بدا کە لە گیانەڵا بوو، ڕەتیکردەوە دەرمانەکەی لێبدا، مەگەر ڕامسادەکە بەخۆی ڕاینەسپێرێ. «دانی یاتوم»یش کە کۆشکی پاشایەتی بەجێهێشتبوو و لەڕێگەدا بوو بچێتە باڵوێزخانەکەی، زەنگی بۆ دکتۆرەکە لێدا بەڵکو لەگەڵ «مێشکا»دا بڕوا و دەرزییەکە لە کابرا بدا. بەڵام دوای گەیشتنی ئەوان بە نەخۆشخانەکە، ئوردنییەکان گردەبڕانە ڕەتیانکردەوە پزیشکێکی ئیسرائیلی دژەژەهرەکە لە نەخۆشەکە بدا، ترسان نەبا هەوڵەکەیان بۆ ئەوەبێ کارەکەی خۆیان تەواو بکەن...

شتەکە لەوەش ئاڵۆزتر بوو، پزیشکی پاشا کە بەرپرس بوو لە ڕزگارکردنی ژیانی مەشعەل، ڕازی نەبوو دژەژەهرەکە بەکاربهێنێ، مەگەر نەزانێ پێکهاتە (فۆرمۆلە)ی ژەهرەکە و دژەژەهرەکە چییە. ئەو نەیدەویست بەرپرسیارێتی سەر ژیانی مەشعەل هەڵبگرێ، نەبادا ئیسرائیلییەکان کڵاوی لەسەر بنێن و کابرا بکوژن. ئیدی تەنگژەیەکی دیکە سەریهەڵدا. هەردوولاش لەسەر هەڵوێستی خۆیان مکوڕ بوون، ئوردنییەکان داوای پێکهاتەکەیان دەکرد و ئیسرائیلیەکانیش ڕەتیانکردەوە.

تا دەهات ڕەوشی خالد مەشعەلیش خراپتر دەبوو. هەناسەی نەدەدا و خرایە بن چاودێری چڕوپڕی نەخۆشخانەی پاشایەتی. ئیدی بۆ هەمووان ڕوون و ئاشکرا بوو، مەشعەل خەریکە بمرێ، ئەمەش بە کارەسات بەسەر پەیوەندی هەردوو وڵات دەشکایەوە. پاشا کە بە قووڵی هەستی بەو ئازارە کرد کە لە زەبری ئیسرائیلییەکانەوە هات، هەڕەشەی ئەوەی کرد، سوپاکەی بەکاردێنێ و بچێتەسەر باڵوێزخانەکە و هەر چوار ئاژانەکانی مۆساد بگرێ، کە پەنایان بردبووە بەر ئەوێ. هەروەها

ئەوەشی گوت، کە کۆتایی بە هەموو هاوکارییێکی سیاسی و سەربازی لەگەڵ ئیسرائیلدا دێنێ.

چرکەی کاتژمێر هەر لێیدەدا و پەیوەندی نێوانی هەردوولاش گرژتر دەبوو. پاشا ڕایگەیاند، ئەگەر مەشعەل بمرێ، ئەوا ئەویش بڕیار لەسەر بکوژەکان دەدا بکوژرێنەوە، بکوژەکانیش لەلای پۆلیسی ئوردنی دەستبەسەر بوون. هەروەها زەنگێکی بە پەلەشی بۆ «بیل کلنتن»ی سەرۆکی وڵاتە یەکگرتوەکان لێدا.

سەرۆکی ئەمریکاش فشاری خستە سەر ئیسرائیلییەکان کە داڕشتەی ژەهر و دەرمانەکە بە ئوردنییەکان بڵێن. ناتانیاهوش لەو کۆبونەوە بۆ ئەو کۆبوونەوە لە ماراسۆندا بوو. لە دواییدا ملکەچ بوو، پێکهاتەی داڕشتەی ژەهر و دەرمانەکەیان پێ بڵێ.

ئەوسا دکتۆرە ئوردنییەکە دەرزییە دژەژەهرەکەی لە خالد مەشعەل دا. کاردانەوەکەش دەستبەجێ بوو. مەشعەل چاوەکانی هەڵهێنان.

کاتێکیش هەواڵی چاکبوونەوەی مەشعەل بەگوێی ئیسرائیل گەیشتەوە، ئەوان ئاهێکیان بەبەردا هاتەوە، سوپاس بۆ خودا، وەک ئەوەی ئەو برایەی کە دەمێکە لە ئوردن ون بووە، ڕزگاری بووبێ!

«میشکا بن دایڤد» و خانمە دکتۆرەکە بۆیان هەبوو ئوردن بەجێبێڵن. هێشتا شەش ئاژانی مۆساد مابوون، چواریان لەنێو باڵوێزخانەکە و دوانیشیان لەنێو دەستی پۆلیسی ئوردنیدا بوون.

لە یەکەی چاودێری چڕوپڕی نەخۆشخانەکەدا، بەردەوام ڕەوشی مەشعەل بەرەو باشی دەڕۆیشت. ئینجا ئیسرائیل نێردەیەکی باڵای ناردە عەممان، کە ناتانیاهوی سەروەزیر و ئارییێل شارۆنی وەزیری کاروباری

دەرەوە و ئیسحاق مۆردەخای وەزیری بەرگرییشی تێدا بوو. هێشتاش شا حوسێن ئامادە نەبوو شاندەکە ببینێ، بەڵکو «حەسەن»ی برای ڕاسپارد بیانبینێ.

دوای ئەوە «ئێفرام هالڤی» کە جێگری *ڕامسادی* پێشوو بوو، دۆستێکی شا حوسێنیش بوو، گەیشتە ئوردن. «هالڤی» ببووە باڵوێزی ئیسرائیل لە یەکێتی ئەورووپا لە بروکسل. ئەویش دەستبەجێ گەیشتە عەممان و سەودایەکی خستە بەردەم پاشا. بۆ گۆڕینەوەی هەر چوار ئاژانەکەی مۆساد کە لەنێو باڵوێزخانەکەدا بوو، ئیسرائیل «شێخ ئەحمەد یاسین» سەرکردە و دامەزرێنەری کاریزمای حەماس کە لای ئەوان زیندانی کرابوو، بەربدا. پاشا بەم گۆڕینەوەیە قایل بوو، ئەوسا هەر چوار ئاژانەکە لەگەڵ «هالڤی»دا گەڕانەوە ئیسرائیل.

دوایین دانوستان بە «ئاریێل شارۆن» سپێردرا، ئەویش پەیوەندییێکی دۆستانەی لەگەڵ شا حوسێندا هەبوو.

«شارۆن» داوای ئازادکردنی ئەو ئاژانانەی کیدۆنی کردن کە لای پۆلیسی ئوردنی دەستبەسەر بوون. لەبەرانبەریشدا ئوردن داوای بەردانی بیست گیراوی ئوردنی کرد کە لەلای ئیسرائیلییەکان بوون. شارۆن بە سەودایەکە قایل بوو. بەڵام لەدوا ساتدا، ئوردنییەکان ڕای خۆیان گۆڕی، داوای سازشی زیاتریان لە ئیسرائیل کرد. ئینجا «شارۆن» لەبەردەم شاحوسێندا حەوسەڵەی خۆی لەدەستدا و بە تووڕەییەوە گوتی: "ئەگەر تۆ لەسەر شتی وەها بەردەوام بی، گرفت نییە، با پیاوەکانمان هەر لەبن دەستی تۆدا بمێننەوە، بەڵام ئێمەش ئاوەکەت دەگرینەوە (ئیسرائیل ئاوی دەدایە ئوردن) و جارێکی دیکە مەشعەل هەر لەناودەبەین."

ئەو هەڵچوونەی شارۆن بەردار بوو، سەودایەکە سەری گرت. دوو کۆپتەری ئیسرائیلی لە ئوردن دابەزین. یەکێکیان هەردوو ئاژانەکەی کیدۆنی هەڵگرت و گەڕایەوە ئیسرائیل. ئەوی دیکەشیان «شێخ ئەحمەد یاسین»ی هەڵگرتبوو، لە زیندانی ئیسرائیل بەردرابوو.

دوای ئەوە میدیای جیهانی و ئیسرائیلی ڕەخنەیان لە ئۆپەراسیۆنەکەی مۆساد گرت و گاڵتەشیان پێکردن. لە پاشخانی گۆبەندی ئۆپەراسیۆنەکەدا هێرشی توندیش کرایە سەر ناتانیاهو؛ ئەویش چارەی نەما لیژنەیەکی گەورەی بۆ لێکۆڵینەوە "لە ئۆپەراسیۆنە شکستخواردوەکەی ئوردن" پێکهێنا.

لیژنەکە بە تەواوی دامێنی سەروەزیری لە گۆبەندەکدا خاوێن ڕاگرت، بەڵام ڕامسادەکەی کورتهێنانی نمایشەکە و بەوەی ئۆپەراسیۆنەکە هەر لە سەرەتاوە نوشستی پێوە دیاربوو، سەرکۆنە کرد. لەگەڵ ئەوەشدا داوایان لێنەکرد دەست لەکار هەڵبگرێ.

دوابەدوای نسکۆی عەممان، پەیوەندیەکانی ئیسرائیل- ئوردن گەیشتە نزمترین ئاستی خۆی. «خالد مەشعەل» بووە یەکێک لە بیچمە سەرەکییەکانی حەماس، لەنێو ڕێکخراوەکەدا بووە یەکێک لە سەرکردە هەرە دیارەکان. دوای مردنی «شێخ ئەحمەد یاسین»یش، لە هەموو لایەکەوە هەر ڕۆڵی ڕابەرایەتی مەشعەل بەدیارکەوت. نمایشی مۆسادیش لە ئیسرائیل و جیهاندا -تەنانەت لە چاوی سەرکردە و ئاژانەکانیشی- بەخراپی شکا. «دانی یاتوم» کە بە هۆی ئۆپەراسیۆنەکە سەرنەکەوت، ڕاشکاوانە کەوتە بەر ڕەخنەی ئەفسەرانی مۆساد. «ئالیزا ماگان»ی جێگری یاتوم، بە بوێرییەوە گوتی، کە ئەو شایستەی پلەی *ڕامساد* نەبوو.

وێرای ئەو ڕەخنانەش «یاتوم» نەیدەویست خۆی بەرکەنار بکا. تاکە کەسێک کە لەو ئۆپەراسیۆنە شێواوەدا بەرپرسیارێتی هەڵگرت، بەرپرسی «کاسارا» بوو، دەستبەجێ دەستی لەکار کێشایەوە. هێشتا پێنج مانگی خایاند، واتە تا فێبرایری ١٩٩٨، کاتێک ئاژانێکی مۆساد لە سویسرا گیرا، لەو کاتەی خەریکبوو بۆ «دانی یاتوم» گوێ لە تەلەفۆنی ئەندامێکی حیزبوڵڵا بگرێ، ئیدی ئەوکات و لەدواییدا دەستبەرداری پۆستەکەی بوو. ئەو لە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ ڕۆژنامەی «حائارێتز»دا گوتی "ئەز بەرپرسیارێتی فەرماندەیی هەڵدەگرم." بەهۆی ئەو شێوانەی لە کردەوەکانی ئوردن و سویسرادا ڕوویدا، بڕیاری خۆی دا دەست لەکار بکێشێتەوە.

«ئەفراهام هالڤی» جێگری *ڕامساد*، کە سەرکەوتووانە دانوستانی لەگەڵ شا حوسێندا کرد و هەر چوار ئاژانەکە، کە لە نسکۆیەکەی عەممانداتێوەگلابوون بەردا، پاشان لەجێی «یاتوم»، کرایە سەرۆکی مۆساد.

## بەندی هەژدە: لە کۆریای باکوورەوە لەگەڵ خۆشەویستی

لە ئەنگۆرەیەکی خۆشی تەمموزی ٢٠٠٧ لە لەندەن، میوانێک ژوورەکەی خۆی لە هوتێلی «کینگستۆن» جێهێڵا. ئەو بە ئەسانسێرەکە دابەزیە نێو هۆڵی پێشوازی هوتێلەکە و لەوێشەوە دەرچووە سەر شەقام، ترومبێلێک لەوێ چاوەڕێی دەکرد. کابرا ئەفسەرێکی پلەباڵای سووری بوو، هەر ئەو ئێوارەیە لە دیمەشقەوە هاتبوو. هەنووکەش ئەو بەڕێوەیە تا لە کۆبوونەوەکەی ئامادە بێ.

هەر کاتێکیش لە دەرگە بازنەیە خولخۆرەکە چووەدەر، دوو پیاو کە لە گۆشەیەکی هۆڵی پێشوازی هوتێلەکە لەسەر کورسییەکان پاڵیان دابووەوە، هەڵسان. ئەوان دەیانزانی دەقاودەق بۆ کوێ دەڕۆن. یەکسەر ڕوویان لە ژوورەکەی کابرای سووری کرد، بەو ئامێرە ئەلەکترۆنیانەی لە دەستیان بوو، توانیان دەرگەکە بکەنەوە و بچنەژوور. خۆیان بۆ پشکنینێکی ڕێکوپێک ئامادەکردبوو، بەڵام ئەمجارەیان، ئەرکەکەیان زۆر ئاسان بوو. ئاخر لاپتۆپەکەی کابرا لەسەر مێزەکە داندرابوو. ئینجا هەردوو پیاوەکە لاپتۆپەکەیان پێکرد، هەر پرسی یەک دوو خولەک بوو، کە دانەیەکی پێشکەوتووی ئاڵۆزی ئەسپی ترۆجان (تەرواده)[240]یان خستە نێو لاپتۆپەکە. بەرنامەکەش ڕێگەی پێدان چاودێری هەموو فایلەکانی نێو

[240] ئەسپی تەڕوادە (ترۆجان) مەبەست ئەو بەرنامە کوشندەیە بۆ تێکدانی سۆفتوێری کۆمپیوتەر یان بۆ دزینی ناوەڕۆکەکەی بەکاردێ. بۆیەش ناوی ئەسپی تەڕوادەیە، کە ئاماژەیە بە چیرۆکە بەناوبانگەکەی شەڕی تەڕوادە (ترۆی)، چۆن لەڕێی ئەسپێکی دارینی کەتە و زلەوە توانیان دوژمنەکەیان لە خشتە ببەن و بچنە نێو قەڵاکەیان.

لاپتۆپەکە بکەن و دانەیەک لە یادەوەری ئەوەی تێدایە لەبەر بگرنەوە. کارەکە تەواو بوو، هەردوو پیاوەکەش لە ژوورەکە بێوەی هاتنەدەرەوە.

شرۆڤەکارانی مۆساد لە تەلئەبیب لە فایلەکانی نێو لاپتۆپەکەیان کۆڵییەوە و پێیەوە سەرسام بوون. لە کۆبوونەوەیەکی بە پەلەی سەرانی هۆبەکاندا، وێنای ئەو گەنجینە لەنرخنەهاتووەی کە کەوتە بندەستیان، کردیان: کۆی فایلەکان، وێنەکان، هێڵکاری و نەخشەکان و هەموو ئەو بەڵگەنامانەی لەنێویدا بوون، بۆ یەکەمین جار بوو بەم جۆرە پەردە لەسەر بەرنامەی نهێنی ناوەکی سووریدا هەڵبدرێتەوە. شتەکان تا ئەوپەڕی پلەی باڵایی گرنگ بوون بە ڕێنمایی کارلێککەری ناوەکییش کە لە بیابانێکی دووری سووریادا کاریان تێدا دەکرد؛ هەموو ئەو نامە و نامەکارییانەی نێوان حکوومەتی سووری و کاربەدەستە پلەباڵاکانی بەڕێوەبەرایەتی کۆریای باکوور، لەگەڵ وێنە وردەکارییەکانی شوێنی کارلێککردنی بەرنامەکە. وێنەیەکی دیکەش دوو پیاوی نیشاندان، کە یەکێکیان دەرچوو کاربەدەستێکی فەرمی پلە باڵای پڕۆژەی ناوەکی کۆریا و ئەویدیکەشیان «ئیبراهیم سەلمان»ی بەرپرسی کۆمسیۆنی وزەی ناوەکی سووری بوو.

دۆزینەوەی شتەکان سەلمێنەری چەندین ڕاپۆرتی دیکەبوون، کە لە ٢٠٠٦ و ٢٠٠٧دا گەیشتبوونە دەستی دەزگەی هەواڵگری ئیسرائیلی. ڕاپۆرتەکان ئاماژەیان بۆ ئەوە دەکرد، کە حکوومەتی سووریا زۆر بەنهێنی سەرقاڵی دروستکردنی کارلێککردنی ناوەکییە لە دیوێکی بیابان لە «دێرزوور»، کە دەکەوێتە بەشی هەرە دووری باکووری خۆرهەڵاتی وڵاتەکە. ئەو دیوە دابڕاوەی بیابانەکە، نزیک سنووری تورکیایە و هەر چەند سەد مایلێکیش لە سنووری عێراقەوە دوورە. لەوانەیە سەرسامترین لایەنی ئاشکرابووی

ئەو ڕاپۆرتانە، ئەو ڕاستییە بووبێ، کە توانستی سوورییەکان لە لایەن کۆریای باکوورەوە نەخشەی بۆ کێشراوە و هەر لە لایەن شارەزایەکانی سەرپەرشتی دەکرێ، سەرتاپاشی بە پاڵپشتی دارایی دەوڵەتی ئێرانە.

✡ ✡ ✡

ئەو پەیوەندییە توندوتۆڵەی نێوان سووریا و کۆریای باکوور لە ١٩٩٠ەوە سەریهەڵدا، لەو ساڵەدا «کیم ئیل سونگ»ی سەرۆکی کۆریای باکوور سەردانی دیمەشقی کرد و لەسەر وروژاندن و هاندانی «حافز ئەلئەسەد»ی سەرۆکی سووریا، هەردوو وڵاتەکە ڕێککەوتنێکی هاوکاریی سەربازیی و تەکنەلۆژییان لەگەڵ یەکدا مۆرکرد. هەرچەندە لە گفتوگۆی نێوانیاندا باسوخواسی پرسی ناوەکیش هاتەگۆڕێ، بەڵام «ئەسەد» ئەو پرسەی لە لا لاوەکی بوو، ئەو تیشکۆی خۆی زیاتر خستە سەر پەرەپێدانی چەکی کیمیایی و بایەلۆجی. لەوەش زیاتر، ئەو نەخشەی کڕینی کوورەی ناوەکی لەگەڵ ڕووسیادا هەڵوەشاندەوە. لە فێبرایری ١٩٩١دا، لە میانی ئۆپەراسیۆنی گەردەلوولی بیاباندا، یەکەمین کەشتی کۆریای باکوور گەیشتە بەندەرەکانی سووریا کە باری مووشەکی سکۆدی پێبوو. هەواڵی گەیشتنی ئەو جۆرە مووشەکانە گەیشتنە بەر گوێی «موشێ ئارێنس»ی وەزیری بەرگری ئیسرائیل. چەندین فەرماندە لەگەڵ ڕێنمایی زەبرێکی سەربازییدا بوون تا بەر لەوەی ئەو مووشەکانەی سکۆد لە دژیان بەکاربهێندرێن، تێکوپێک بشکێندرێن. بەڵام

«ئاریێنز» بیرۆکەکەی بەلاوە نا، خوازیار بوو لە پێکدادانێک دووربکەوێتەوە کە بە هۆیەوە ئاگر لە هەرێمەکە بەربێ.

لە میانەی بەخاکسپاردنی «حافز ئەسەد»یش لە حوزەیرانی ٢٠٠٠دا، جێگرەوەکەی، کە کوڕەکەی خۆی «بەشار ئەسەد» بوو چاوی بە نێردەیەکی دیکەی کۆریای باکوور کەوت. ئەم جارەیان هەردوولایان بە دڵنیاییەوە پرسی کارلێککەری ناوەکییان لە سووریا تاوتوێ کرد، بە جۆرێک پڕۆژەکە لە لایەن ئاژانسی لێکۆڵینەوەی زانستی سووریەوە سەرپەرشتی بکرێ. لە تەممووزی ٢٠٠٢شدا، کۆبوونەوەیەکی نهێنی دیکە لە دیمەشق لەگەڵ کاربەدەستە پلە باڵاکانی سووریا، ئێران و کۆریای باکووردا سازدرا و هەر لەوێش گەیشتنە ڕێککەوتنێکی سێقۆڵی. بەگوێرەی ڕێککەوتنەکە، دەبوایە کۆریای باکوور، کوورەی ناوەکی لە سووریا دابمەزرێنێ، ئێرانیش خەرجییە داراییەکەی بدا. تێچوونی پڕۆژەکەش هەر لە نەخشەی بەراییەوە تا بەرهەمهێنانی چەکی پلەی پلوتونیۆم، بە ٢ ملیار دۆلار خەمڵێندرا.

بۆ پێنج ساڵی دوای بەرواری ڕێککەوتنامەکە، سەرباری هەندێ زانیاری پچڕپچڕ کە لە دیمەشقەوە ختووکە دەدرا، نە سی ئای ئەی و نە مۆسادیش لە پڕۆژەکەی سووریا ئاگادار نەبوون. هەرچەندە هەندێک ئاماژەی گڵۆپی سوور خۆڕسکانە هەڵکران، بەڵام پشتگوێ خران. دەزگەی هەواڵگری ئەمریکایی لەوەدا سەرنەکەوت، لەو زانیارییانەی کۆکرابوونەوە شتێک هەڵبکرێنێ، لەکاتێکدا مۆساد و ئامانیش هەر لە ڕێی مەزندەکانی خۆیانەوە لەخشتەبران بەوەی سووریا نە بەنیازە و نە تواناشی هەیە چەکی ناوەکی بەدەست بێنێ. کەسیش لە بەدحاڵیبوونەکەی نەکۆڵییەوە،

هەرچەندە هەندێک بەڵگەش هەبوون؛ لەوانە: لە ٢٠٠٥دا، کەشتییەکی بارهەڵگر «ئاندۆرا» کە چیمەنتۆی هەڵگرتبوو لە کۆریای باکوورەوە گەیشتە سووریا و لەنزیک شاری «نەهاریا»ی کەناراوی ئیسرائیلییەوە نغرۆ بوو؛ لە ٢٠٠٦یشدا، دووەمین کەشتی بارهەڵگری کۆریایی و لەبن ئاڵای «پەنەما»ییەوە لە قوبرسەوە دەستی بەسەردا گیرا، کە باری چیمەنتۆ و وێستگەی ڕاداری گەڕۆکی پێبوو؛ لە هەردوو حاڵەتیشدا سەلمێندرا ئەو "چیمەنتۆ"یەی باری کردبوو، کەرەستە و ئامرازی کوورەی ناوەکی بوون. لە کۆتاییدا لە ٢٠٠٦دا، شارەزا ناوەکییەکانی ئێران سەردانی دیمەشقیان کرد تا ڕادەی پێشکەوتنی پێواژۆی بنیادنانی توانستی پڕۆژەکە بەسەر بکەنەوە. دەزگەی هەواڵگری ئەمریکی و ئیسرائیلیش بە سەردانەکەیان زانی، بەڵام لەوەدا سەرنەکەوتن ئاخۆ سەردانەکە بە پڕۆژەکەی «دێرزوور»ەوە گرێدراوە یان نا.

سوورییەکان ئەوپەڕی ڕێکاری چاوکرانەوە و وریاییان بۆ پاراستنی پڕۆژە نهێنییەکەیان بەکارهێنا. ئەوان ڕێگەیان لە هەموو جۆرە پەیوەندییێکی ستافی کارمەند لەنێو پڕۆژەکەدا گرت. هەڵگرتنی هەر جۆرە تەلەفۆنی دەستی و ئەلکترۆنی لەوێدا قەدەغەبوو؛ هەموو پەیوەندییەکان لەڕێی تەتەرەوە دەکران، ئەو بەدەست پەیامەکانی دەهێنان و دەبردن. چالاکیی شوێنەکەش لە ڕێی ئاسمانەوە بەدی نەدەکرا، ئاخر خۆ مانگی دەستکردی ئەمریکی و بەریتانی بەسەریاندا دەسووڕانەوە.

ئینجا لە هیکەوە، لە ٧ی فێبرایری ٢٠٠٧دا، ڕێبوارێک لە فڕۆکەخانەی دیمەشق دابەزی. ڕێبوارەکە «عەلی ڕەزا ئەسغەری» بوو، ژەنەڕاڵێکی ئێرانی و جێگری وەزیری بەرگری پێشوو بوو، ئەو یەکێک بوو لە

سەرکردەکانی سوپای پاسداران (بڕوانە بەندی دوو). ئەو لە فرۆکەخانەکەدا مایەوە تا ئەو کاتەی دڵنیاکرایەوە کە ماڵباتەکەی ئێرانیان بەجێهێشتووە. ئینجا بەرەو تورکیا فڕی. هەر زووش لەگەڵ گەیشتنە ئەستەنبولێ، ون بوو.

یەک مانگ دوای ئەوە، زاندرا کە «ئەسغەری» یاخیبوویێکی ڕۆژئاوایی بووە، سی ئای ئەیش لەپشت نەخشەی ئۆپەراسیۆنەکەی بووە. ئەو لە بنکەیەکی ئەمریکا لە ئاڵمان لێیکۆڵدرایەوە کەوتە بن باری پرسیار و وەڵام، لەوێدا پەردەی لەسەر هەبوونی نەخشەی سووریا- ئێران بۆ چەکی ناوەکی و ڕێککەوتنی نێوان سووریا- ئێران- کۆریای باکوور هەڵدایەوە. ئەو بە ئەوانەی پرسیاریان لێکرد گوت؛ کە ئێران بە تەنیا لە ڕووی داراییەوە پشتگیری پڕۆژەکەی «دێرزوور»ی دەکرد و فشاری زۆریشی لە سووریا دەکرد، بەڵکو تا بکرێ بەزوویی پڕۆژەکە ڕاستەڕێ بکا. ئەو زانیاری شایستە و وردیشی دایە سی ئای ئەی و مۆساد سەبارەت بە بەرەوپێشەوەچوونی پێواژۆی پڕۆژەکە، هەروەها ناسنامەی کاربەدەستە سەرەکییەکانی سووری و ئێرانیشی بۆ ئاشکرا کردن، ئەوانەی ڕۆڵی سەرەکییان لە پڕۆژەکەدا هەبوو.

✡ ✡ ✡

ئەو زانیارییە نوێیە مۆسادی تەزاند و یەکسەر خستییە سەر باری ئەوەی لە کاردانەوەدا نەخشە بۆ دژە ئۆپەراسیۆنێک دابنێ. لە ٢٠٠٢ەوە

«داگان» جێگەی «ئێفرایم هالڤی» گرتبووەوە، (بڕوانە بەندی ١١) ببووە ڕامساد. بەگوێرەی سەرچاوە هەواڵە بیانییەکان، «داگان» یەکە و ئاژانی ڕاسپاردن تا زانیارییەکانی «ئەسغەری» پشتڕاست بکەنەوە. «یەهود ئۆلمەرت»ی سەروەزیریش کۆبوونەوەیەکی بەسەرانی سوپا، وەزارەتی بەرگری و دەزگە هەواڵگرییەکان کرد. ئەوانیش بە کۆدەنگی ئۆپەراسیۆنێکی بەپەلەیان پەسەند کرد تا زانیاری سەلمێنەر و گردەبڕانە لەسەر توانستی پڕۆژەکەی «دێرزوور» پەیدا بکەن. ئاخر ئیسڕائیل ڕێگەی نەدەدا سووریا، کە دژوارترین مێملێەتی، ببێتە هێزێک، چەکی ناوەکی لەبن دەستدا بێ.

هەر پێنج مانگ دوای هەڵگەڕانەوەکەی «ئەسغەری» بوو، مۆساد ئەو زانیارییە سەرەکییانەی نێو لاپتۆپی کاربەدەستە باڵاکەی سوورییان بەدەست کەوت. ئەوسا سەرانی مۆساد و ئامان بەڵگەی حاشاهەڵنەگرییان دایە دەست «یەهود ئۆلمەرت»، ئەو زانیارییانەی کە حکوومەت پێویستی پێبوو.

زۆری نەبرد، هەر دوای ئەوە، «داگان» قەڵەمبازێکی دیکەی هاوێشت. لە ئۆپەراسیۆنێکی بوێر و داهێنەرانەدا، ئەفسەری دۆزی مۆساد توانی یەکێک لەو زانایانەی لەنێو کوورەکەدا ئیشی دەکرد، بهێنێتە ڕیز. ئەویش بە تایبەتی وێنەی هەردوولای کوورەکە و تەنانەت ڤیدیۆیەکی کەرەستە و ئامێرەکەی ناویشی بۆ گرتن. ئەمەش یەکەمین وێنەی کوورەکە بوون کە لەسەر زەمینەوە گیرابن، گەیشتنە دەستی مۆساد. وێنەکان بونیادێکی زەبەللاحی قووچەکییان نیشاندا کە دیوارێکی تەنک بەڵام بەهێزییان هەبوو. وێنەی دیکە دیوی دەرەوەیان نیشاندا، کە ڕوویێکی دارەبەست

بوو بۆ پاڵپشتی دیواری ئەو باڵەخانەیە کە کوورەکەی تێدابوو. هەروەها وێنەی دیکەش، هی باڵەخانەی دووەم، بچووکتر کە پڕ کەرەستەی لوولەی نەوتی بوو، هەروەها چەندین بارهەڵگریش لە گۆڕەپانەکەی ئەوێ ڕاگیرابوون. بونیادی سێهەمیش پێدەچوو تاوەرێک بێ، ئاو بۆ پڕۆژەکە دابین بکا.

✡ ✡ ✡

مۆسادیش بە باشی ئەمریکییەکانیان لە هەموو هەنگاوێکیان ئاگادار کردنەوە، تەنانەت وێنەیەکی لەبەرگیراوەی ڕاپۆرت و وێنەکانیشیان دانێ، بە وێنەی ئەو مانگە دەستکردییانە و پەیامە گوێزراوەکانی نێوان سووریا و کۆریای باکوور. لەژێر فشاری پێداگیرییانەی ئیسرائیل، ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش مانگێکی دەستکردی خۆی بۆ پشکنین ناردە سەر ئاسمانی ئەوێ. وێنە و پەیامە ئەلیکترۆنەکانی سەتەلایتی هەردوولا، ئەو تەلەفۆن و پەیامە ئاڵوگۆڕییانەی سوورییەکان لە شوێنەکەدا دەکران، نیشانەی ئەوە بوو کە ئەوان بەخێرایی خەریکی دروستکردنی پڕۆژەکەیانن.

لە حوزەیرانی ٢٠٠٧دا «یەهود ئۆلمەرت» بەرەو واشنتن فڕی و لە هەگبەیدا هەموو ئەو کەرەستە و بەڵگەنامە کۆکراوانەی ئیسرائیلی تێدا بوو. لەوێ چاوی بە سەرۆک «بوش» کەوت و پێی گوت کە ئیسرائیل بڕیاریداوە ئەو کارلێککەرەی سوورییەکان خاپوور بکا. «ئۆلمەرت»

پێشنیازی ئەوەی بۆ هاوتایەکەی کرد، کە ئەمریکییەکان پەلامارێکی ئاسمانی بکەنە سەر شوێنەکە و لەگەڵ خاکدا تەختی بکەن، کەچی سەرۆکی ئەمریکا ئەمەی ڕەتکردەوە. بەگوێرەی سەرچاوەی هەواڵی ئەمریکایی، کۆشکی سپی وەڵامی سەرۆوەزیری ئیسرائیلی دایەوە، بەوەی "وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەوەی هەڵبژاردوە کە هێرش نەکاتە سەر کارلێککەرە ناوەکییەکەی سووریا". «کۆندالیزا ڕایز»ی وەزیری دەرەوە و «ڕۆبەرت گێیتس»ی وەزیری بەرگری، هەوڵیاندا قەناعەت بە ئیسرائیل بهێنن، کە "ڕووبەڕووی سووریا ببنەوە بەڵام هێرشی نەکەنە سەر." «بوش» و «ستیڤ هادلی» ڕاوێژکاری ئاسایشی نیشتمانی لە ڕووی بنەماوە پشتگیری خۆیان بۆ وەشاندنی زەبرێکی سەربازی دەربڕی، بەڵام کردەوەکەیان وەخراند، تا لە لایەن دەزگەی هەواڵگرییەوە بەرچاوڕوونی زیاتر سەبارەت بە هەڕەشەکەوە دەگات.

لە تەمموزی ٢٠٠٧دا، مووشەکێکی بەرز و بەرنامەی «ئوفێک ٧»ی بۆ سووسەکاری بۆ ئاسمان هەڵدا، بۆ ئەوەی وردەکاری زیاتر لەسەر کوورە ناوەکییەکەی سووریا پەیدابکا. کاتێکیش وێنەکانی ئەو بەرنامە هەڵدراوە لە لایەن شارەزا ئیسرائیلی و ئەمریکییەکان شیکرانەوە، بەرچاوڕوونییێکی باش پەیدابوو، بەوەی سووریا کارلێککەری ناوەکی بە ناسنامەی توانستی کۆریای باکوور دروست دەکا. ئەو ڤیدیۆیەی ئیسرائیل دایە وڵاتە یەکگرتووەکان، نیشانیدا کە ناوەڕۆکی هەردوولای کارلێککەرەکە دروست و ڕاستەقینەیە، ئەمە و لەگەڵ ڕێگەی بەکارهێنانی و لێککردنەوەی یۆرانیۆمی ڕەق لەنێو مۆڵگەی توانستەکەدا. ڤیدیۆی دیکەش ڕووخساری ئەندازیارە کۆرییەکانی نیشان دەدا، کە لەنێو شوێنەکەدا کاریان دەکرد. بەڵگەی زیاتریش، توانای یەکەی ٨٢٠٠ی ئامان

بوو کە ئەو پەیام گۆڕینەوەیەی نێوان دیمەشق و «پیۆنگیانگ»ی پشتڕاستکردەوە.

هەموو ئەو بەڵگانە ڕەوانەی واشنتن کران، کەچی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەر داوای بەڵگەی حاشاهەڵنەگری دەکرد، ئاخۆ هەر بەڕاستی مۆڵگەی توانستەکە بۆ کوورەی ناوەکییە و کەرەستە تیشکدەرەوەیە و ئاخۆ تیشکە کاراکان لە شوێنەکە هەن یان نا. ئیسرائیلیش هەستیکرد کە هیچ بژاردەی دیکەی نییە، بەدەر لەوەی ئەو زانیاریانەش بەدەست بێنێ.

✡ ✡ ✡

لە ئابی ٢٠٠٧دا، ئیسرائیل بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگری سەلمێنەری کارلێککەری سووری لە «دێرزور» دەستکەوت. بەڵگەکەش لەڕێی یەکەی کۆماندۆی گوڵبژێر «سەیارەت ماتکال»ەوە بە ئۆپەراسیۆنێک کە تیایدا چەندین سەربازی ئیسرائیلی گیانی خۆیان خستبووە سەر لەپی دەست، بە چنگ کەوت. کۆماندۆکانی «سەیارەت ماتکال» بەشەو بە دوو هەلیکۆپتەرەوە بەرەو سووریا فڕین. ئەوان جلی سەربازی سووریان لەبەرکردبوو. ئەوان بە سنوور بەزاندن، بەتێپەڕین بەسەر ناوچە چڕوپڕەکان و وێستگەی ڕادار و بنکە سەربازییەکان، بەبێ ئەوەی بدۆزرێنەوە لە «دێرزوور» نزیکبوونەوە، ئەوسا چوونە لای دیوەکەی مۆڵگەی کوورەکە و نموونەیان لە خاکوخۆڵی دەوروبەری دەزگەی کارلێککەرە ناوەکییەکە کۆکردەوە. دوای ئەوەی بێوەی گەڕانەوە، لە

ئیسرائیل ئەو نموونانە پشکێندران، دەرکەوت کە ڕاددەیەکی زۆری باڵای تیشکدانەوەی تێدایە، ئەمەش ئەو بەڵگە حاشاهەڵنەگرە بوو، کە هەر بەڕاستی مادەی تیشکدەرەوە لە شوێنەکەدا هەیە.

ئەو بەڵگە نوێیەش درایە «ستیڤ هادلی». جارێکی دیکە شارەزا ئەمریکییەکان نموونەی خاکوخۆڵەکەیان پشکنی، لەوەش تێگەیشتن، کە کەرەستەکە هەر بەڕاستی دژوارە. ئەویش یاریدەدەرەکانی خۆی بانگ کرد، ئینجا «هادلی» بەرەنجامی ڕاوێژەکەیان خستە بەردەم سەرۆک بوش لە هۆڵی «ئۆڤال ئۆفیس». پاشان «هادلی» قسەی لەگەڵ «داگان»دا کرد، پێیگوت هەر بەڕاستی شوێنەکە هی کوورەی ناوەکییە و دۆخێکی دژوارە. ئیدی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا قایلە بەوەی دەبێ ئەو توانستە ناوەکییەی سووریا لەناوببرێ، کۆدەناوی ئۆپەراسیۆنی دێرزووریش بووە «ئۆرکارد». «جۆرج دەبلیو بوش» لە یادەوەرییەکانیدا نووسیویەتی؛ بۆ ماوەیەک لێدانی کوورەکەی بەهەند هەڵگرتبوو، بەڵام دوای تاوتوێکردنی باسەکە لەگەڵ تیمی ئاسایشی نەتەوەییدا، لەدواییدا گەیشتە بڕیارێک بەدژی هێرشکردن بشکێتەوە. ئاخر هەستی کرد "بۆمبارانکردنی دەوڵەتێکی خاوەن سەروەری و بەبێ هیچ ئاگادارکردنەوەیەکی ڕەوا، دەکرێ کاردانەوەیەکی توندی لێبکەوێتەوە." هەروەها ئەوەشی ڕەتکردەوە کە سەربازانی ئەمریکی لەبن هەر ڕووپۆشێکی دیکەدا، ئەو کارە ئەنجام بدەن.

لەگەڵ ئەوەشدا، «ئۆلمەرت» تەلەفۆنی لەگەڵ بۆشدا کرد و داوای لێکرد کوورەکە تێکوپێک بدا. لە میانەی وتووێژەکەیاندا، «بوش» لە ژووری ئۆڤال ئۆفیسدا بوو، چەندین یاریدەدەری لە دەورە بوون لەوانە:

کۆندالیزای وەزیری کاروباری دەرەوە، «دیک چینی» جێگری سەرۆک، «ستیڤ هادلی» و «ئێلیۆت ئابرام»ی جێگری «هادلی» و ئەوانی دی. لە ڕاوێژی بەراییدا، «کۆندالیزا ڕایز» قەناعەتی بە سەرۆک هێنا، داوای ئیسرائیلییەکان ڕەت بکاتەوە.

- "«جۆرج»، داوات لێدەکەم کۆمەڵگەی کوورەکە بۆمبابارانی بکەی." ئۆلمەرت وای بە جۆرج بوش گوت.

- "من ناتوانم ڕەوایەتی بە هێرشکردنە سەر دەوڵەتێکی خاوەن سەروەری بدەم،" بوشیش وای بەرسڤ دایەوە؛ "مەگەر دەزگەی هەواڵگری من دەستهەڵنەبڕێ و بڵێ ئەوێ بەرنامەی چەککدارییە." «بوش» ڕایسپارد کە "دیپلۆماسی بەکاربێنێ."

- "ستراتیژیەکەی تۆ زۆر مایەی پەرێشانییە بۆ من،" ئۆلمەرتیش بە مەردی وای پێگوتەوە؛ "من ئەوە دەکەم کە پێموایە بۆ پاراستنی ئیسرائیل پێویستە."

- "ئەو کابرایە زۆری بڕوا بە خۆی هەیە،" دواتر بوش گوتی؛ "هەر بۆیە حەز بەچارەی دەکەم."

✡ ✡ ✡

بەگوێرەی سەندەی تایمزی لەندەنی، «ئۆلمەرت»ی سەروەزیر لەگەڵ «ئێهود باراک»ی وەزیری بەرگری و «تزیپی لیڤنی» کۆبووەوە، هەر

سێکیان لەگەڵ سەرانی دەزگە هەواڵگرییەکان تاوتوێی بەڵگە نوێکانیان کرد، هەروەها تاوتوێی ئەگەری زەبرێکی سەربازیشیان کرد. لەکۆتاییدا زارەکە هەڵدرا[241]: دەزگەی کارلێککەری سووری دەبێ لەناوببرێ. سەروەزیریش «بنیامین ناتانیاهو»ی سەرۆکی ئۆپۆزسیۆنی لە بڕیارەکەیان ئاگادارکردەوە، ئەویش لەناخی دڵەوە پشتگیری لێکرد.

ڕۆژی پەلامارەکەش بە شەوی ٥ی ئەیلوولی ٢٠٠٧ دەستنیشان کرا.

ڕۆژێک پێشتر، بەگوێرەی ڕاپۆرتەکانی سەندەی تایمز، یەکەیەکی گوڵبژێری دیکەی کۆماندۆ بەناوی «شالداگ» واتە چەقۆوەشێن، گەیشتە دێرزوور. پیاوەکان نزیکەی هەموو ڕۆژەکە لەوێ لەنزیک شوێنی کوورەکەدا خۆیان حەشاردابوو. ئەرکەکەیان ئەوە بوو شوێنی کوورەکە بە تیشکی لێزەر ڕۆناک بکەن، تا بۆ شەوەکەی فڕۆکەکان بتوانن نیشانەکانیان بە دەقاودەق بپێکن. لە سەعات ١١ی شەوی ٥ی ئەیلوولدا، دە فڕۆکەی F-15 لە بنکەی ڕامات داڤیدی ئاسمانی بە ئاراستەی ڕۆژئاوا بەرەو دەریای سپی ناوەڕاست هەڵسان. دوای ٣٠ خولەک سێ لەو فڕۆکانە فەرمانیان پێکرا بگەڕێنەوە بنکەی خۆیان. دەبوایە هەر حەفتەکەی دیکەش بەرەو سنووری تورکیا-سووریا پێشڕەوی بکەن، لەوێشەوە سەربەرەو خوار ببنەوە بۆ «دێرزوور». لەسەر ڕێگەی خۆیان بۆمبارانی وێستگەی ڕاداریان کرد و توانستی هێزی دژە ئاسمانی سووریایان بۆ

[241]نووسەرەکان دەستەواژەی The die was castیان بەکارهێناوە، کە واتای ئەوە دەگەیەنێ لە یاریدا زار هەڵدەدەی یان سەربازێک دەبەیتە پێش وەک داشەهارە، ئەمەش بۆ قسەیەکی ناوداری یۆلیوس قەیسەر دەگەڕێتەوە، کاتێک دەگاتە «ڕوبیکن» بۆ ئەوەی شەڕی ناوخۆ لە کۆماری ڕۆمان دەستپێبکا، ئەم قسەیە دەکا بە لاتینی (as iacta alea est) واتای ئەوە دەدا کارێک هەنگاوێکی ناوە گەڕانەوەی بۆ نییە.

ناسینەوەی فڕۆکەی نەیار پەکخست. چەند خولەکێک دواتر گەیشتنە «دێرزوور»؛ لەوێ لە مەودایەکی تەواو مەزندەبۆکراودا ئەوان مووشەکی «ماڤەریک»ی هەوا بۆ زەمینیان گرتە ئامانجەکە، هەر مووشەکێکیش نیو تەن قورس بوو، بەوردی نیشانەکەی خۆشیان پێکا. ئەو کوورە سوورییەی کە بەنیازبوون بۆمبی ناوەکی لێدروست بکەن تا ئیسرائیلی پێخاپوور بکەن، لەماوەی چەند چرکەیەکدا ئاداری لەسەر پادارداا نەما.

«یەهود ئۆلمەرت»ی سەرۆکوەزیر مشووری ئەوەی دەخوارد لە هەر پێکدادانێکی سەربازی لەگەڵ سووریا دووربکەوێتەوە، بۆیە بەپەلە پەیوەندی بە «ڕەجەب تەیب ئەردۆگان»ی سەرۆکوەزیری تورکیاوە کرد تا پەیامێک بگەیەنێتە ئەسەد، کەوا ئیسرائیل نیازی نییە جەنگ لەگەڵ سووریادا هەڵبگیرسێنێ، ئۆلمەرت لەسەر ئەوە پێداگر بوو، کە ڕێگە نادەن ئەوان هەنگاو بەرەو سووریایەکی ناوەکی هەڵبنێن. بەڵام خۆ ئەو سەلماندنەی ئۆلمەرت پێویست نەبوو. هەر بۆ بەیانییەکەی دوای بۆمبارانکردنەکە، لە دیمەشق کاردانەوەکە تەواو بێدەنگی بوو. تەنانەت وتەبێژی حکوومەت قسەیەکیشی لەو بارەیەوە دەرنەبڕی. هەر ئەوەبوو لە سەعات سێی دوای نیوەڕۆی هەمان ڕۆژدا، حکوومەت لێدوانێکی فەرمی لە ئاژانسی ڕاگەیەندنەکەیدا بڵاوکردەوە. لە لێدوانەکەدا هاتبوو، فڕۆکەکانی ئیسرائیلی لە سەعات یەکی نیوەی شەودا دزەیان کردۆتە نێو ئاسمانی سووریا و "هێزی ئاسمانی ئێمەش ناچاریان کردوون پاشەکشە بکەن، ئەمەش دوای ئەوەی بۆمبەکانی خۆیان لە شوێنێکی چۆڵی دوورەدەستدا خاڵی کردۆتەوە. نە خەڵک و نە کەرەستەکانمان هیچ زیانیان پێنەگەیشتووە."

میدیای جیهانیش نامراد بوو لەوەی بزانێ ئاخۆ چۆن مۆساد ئەو وێنە و ڤیدیۆیانەی نێو باڵەخانەی کوورەی ناوەکی سووریا بەدەست کەوتوون. تەلەفزیۆنی ABC ڕاپۆرتێکی بڵاوکردەوە کەوا ئیسرائیل کەسێکی لەنێو کوورەی ناوەکی سووریادا چاندبوو یاخود مۆساد یەکێک لە ئەندازیارەکانی هێناوەتە ڕیزی خۆی تا ئەو وێنانەی دەزگەکەیان بۆ بگرێ.

لە ئەپریلی ٢٠٠٨دا، دوای حەفت مانگ بەسەر هێرشی کاولکردنی توانستی کارلێککەرەکەدا، حکومەتی ئەمریکی ڕایگەیاند کە سووریا بە پاڵپشتی کۆریای باکوور کوورەی ناوەکی بنیاد نابوو و شتەکەشیان "بۆ مەبەستی ئاشتییانە نەبوو." جۆرج دەبلیو بوشیش ڕای وابوو، زەبروەشاندنەکەی ئۆلمەرت "دژی کوورەی سووریا ئەو بڕوا و متمانەیەی ئیسرائیلی گەڕاندەوە کە لەماوەی شەڕی لوبنان لە ٢٠٠٦دا لەدەستی دابوو، ئەوکات «بوش» پێیوابوو شەڕەکەیان دروست نەبوو.

کاربەدەستانی دەزگەی هەواڵگری ئەمریکی سلایدی سەرسوڕهێنەریان نیشانی کۆنگرێسمان و سیناتۆرەکان دا کە زۆر ڕوون و ئاشکرا هاوشێوەی کوورەی سووریایی و هی پیۆنگیۆنی کۆریای باکوور نیشاندەدا؛ سلایدەکان لەگەڵ وێنەی مانگی دەستکرد و هێڵکاری و نەخشەکان، هەروەک گرتەی ڤیدیۆیی سەلمێنەری کەرەستەکانی کوورەی ناوەکی بوون.

✡ ✡ ✡

ئیسرائیل هەر توانی تەنیا دوو هەفتە نهێنی ڕانەگەیاندنی ئۆپەراسیۆنەکە ڕابگرێ، لەو ماوەیەدا هەر حاشای دەکرد کەوا لە کوورە ناوەکییەکەی دابێ. بەڵام ئەوکات سەرکردەی ئۆپۆزسیۆن «بنیامین ناتانیاهو» لە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ کەناڵێکی زیندووی میدیایدا ڕایگەیاند: "کاتێک کابینەی حکومەت بۆ ئاسایشپارێزی ئیسرائیل کردەوەیەک دەکا، من پاڵپشتی تەواویان دەکەم ... لێرەشەوە من هەر لە ساتی یەکەمەوە هاوبەشیان بووم و پشتگیری تەواوی خۆم بۆ دەربڕین."

✡ ✡ ✡

دوایین قۆناغی پرۆژەی ناوەکی سووریا پاش یازدە مانگ هات، ئەویش لە ٢ی ئابی ٢٠٠٨دا بوو. ئەو ئەنگۆرەیە، ئاهەنگێکی دۆستانە لەسەر قەپەنگی پانوبەرین لە ماڵێک لەسەر لێواری کەناراوی «رمال الزعبية»ی باکووری بەندەری «تەرتوس»ی سووریا بوو. خانووەکە لە ئاو نزیک بوو، دیمەنێکی نایابی هەبوو بەسەر دەریای سپی ناوەڕاستدا دەیڕوانی. قەپەنگەکە بەرەو ڕووی شەپۆلە تاریکەکانی دەریا بوو، داڵدەدەری پەنابەری شێداری کەناراوەکەی سووریا بوو. شنەبایەکی تەڕ و تازە و ساردی دەریا قرچەی گەرمای هاوینی دەڕەواندەوە، سەر و و دڵی مرۆڤی فێنک دەکردەوە. میوانەکان لەیەک لای قەپەنگەکە دانیشتبون، هەمووشیان دۆستی نزیکی ماخۆی ڤێلایەکە، ژەنەڕاڵ «محەمەد سولەیمان» بوون، هەر ئەویش بۆ خۆشی و پشووی دوای هەفتە بانگهێشتی کردبوون.

«سولەیمان» ڕاوێژکارێکی سەربازی و کاروباری بەرگری نزیکی ئەسەد بوو. هەر ئەویش سەرپەرشتی دروستکردنی کوورە ناوەکییەکەی کردبوو، باری ئاسایشیشی دەپاراست. لە بەرزترین ئەڵقەی دەسەڵات لە سووریادا، ئەو بە سێبەری ئەسەد دەناسرا. نووسینگەی ئەو لە کۆشکدا نزیک نووسینگەی سەرۆک بوو، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا لە دەرەوە و ناوەوەی وڵات کەم کەس دەیانناسی.

هەرگیز میدیای سووری ناوی کابرای نەدەهێنا، بەڵام مۆساد دەیناسی و لە نزیکەوە بە دوای چالاکیەکانیەوە بوو. «سولەیمان»ی تەمەن چل و حەوت ساڵە، ئەندازیاری لە زانکۆی دیمەشق خوێندبوو، هەر لەوێش ببووە برادەری خوێندکارێکی دیکە کە «باسل ئەلئەسەد»ی کوڕە هەرە خۆشەویستەکەی سەرۆک حافز ئەسەد بوو. کاتێکیش «باسل» بە ڕووداوی ڕێگە لە ١٩٩٤دا مرد، ئەسەدی باوک سولەیمانی بە «بەشار»ی کوڕە گەنجەکەی ناساند. ئەسەدیش لە ٢٠٠٠دا بە نەخۆشی تیراوە مرد و «بەشار»یش جێگەی گرتەوە و بووە سەرۆک و «سولەیمان»ی کردە دەستەڕاست و هەموو متمانەیەکی پێبەخشی.

✡ ✡ ✡

هەر زوو «سولەیمان» بووە یەکێک لە باڵادەستترین پیاوەکانی سووریا. سەرۆک ئەسەدیش بەرپرسیارێتی سەرپەرشتیکردنی ورووژاوترین کاروباری سەربازی پێسپارد. ئەو بووە ئەڵقەی پەیوەندی نێوان سەرۆک

و دەزگەی هەواڵگری ئێرانی، بەتایبەتیش بۆ ڕێکخستنی هاوکاری هەرە نهێنییان لەگەڵ ڕێکخراوە تیرۆرستییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. هەروەها ئەو ڕێکخەری سەرەکی پەیوەندییەکانی سووری بوو لەگەڵ حیزبوللا و پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە سەرکردەی سەربازییان «عیماد موغنیە»وە هەبوو. پاش ئەوەی ئیسرائیل لە ئایاری ٢٠٠٠دا لە ناوچەی ئاسایشی باشووری لوبناندا کشایەوە، سولەیمان بەرپرسیار بوو لە گواستنەوەی چەک و تفاق لە ئێران و سوریاوە بۆ حیزبوللا، بەتایبەتیش ڕادەستکردنی ڕۆکێتی دوورمەودا. لەمیانەی دووەمین جەنگی لوبنانیش لە ٢٠٠٦دا، یەکێک لەو ڕۆکێتانە ڕاستەوخۆ بەر کرێکارەکانی هێڵی ئاسنینی ئیسرائیلی لە «حەیفا» کەوت و هەشت کرێکاری کوشتن. دواتریش هەر لەژێر سەرپەرشتی «سولەیمان»دا مووشەکی زەوی بۆ ئاسمان درایە حیزبوللا، بە هۆیەوە شکستی بە چالاکییەکانی هێزی ئاسمانی ئیسرائیلی لەسەر ئاسمانی لوبنان هێنا.

بەدەر لەوەش، «سولەیمان» پێگەیەکی ناوازەی دیکەی زۆر نهێنی وەرگرت: ئەو ئەندامێکی پلەباڵای کۆمیتەی لێکۆڵەرەوانی سووریا بوو، پەیوەندیداربوو بە پەرەپێدانی ڕۆکێتی دوورهاوێژ، بە چەکی کیمیایی و بایەلۆژی و لێکۆڵینەوەی ناوەکییەوە. ئەو سەرپەرشتی ئەو ئەڵقە پەیوەندیەی لەگەڵ کۆریای باکوور دەکرد، ڕێکخەری ئەو کەشتیە بارهەڵگرانەش بوو، کە بەشەکانی کارلێکەرەکەیان لە کۆریاوە دەگواستەوە سووریا و هەر خۆیشی بەڕێوەبەری ئەو ڕێکارە ئاسایشپارێزانەی دابڕاندنی تەکنیککار و ئەندازیارە کۆرییەکان بوو، ئەوانەی لە کۆمەڵگە کارلێککەرەکەی پڕۆژەکەدا کاریان دەکرد.

خاپوورکردنی کۆمەڵگەی کارلێککەری ناوەکی سووری لە لایەن ئیسرائیلەوە زەبرێکی گورچکبڕ بوو بەر «سولەیمان» کەوت. دوای بەخۆهاتنەوەی لە هێدمەی هێرشەکەدا، ئەو نەخشەی بۆ دروستکردنی کوورەی دیکە دانا. ئەم جارەیان هێشتا بڕیاریان لەسەر شوێنەکەی نەدابوو. بەڵام تا دەهات ژیانی «سولەیمان» ئاڵۆزتر دەبوو. ئاخر دەیزانی لە لایەن دەزگەی هەواڵگری ئەمریکا و ئیسرائیلەوە داواکراوە. بۆیە بەر لە دەستپێکی نەخشەکان بۆ هەنگاوی داهاتوو، چەند ڕۆژێک لە خانووەکەی خۆی لە «رمال الزعبیة» دا پشووی دا. کۆتایی هەفتەیەکی ئارام لەگەڵ دۆستە باشەکان و خواردنێکی بە لەززەت و نایاب، دیاربوو باشترین شت بوو تا دڵەڕاوکێکەی بڕەوێنێتەوە.

✡ ✡ ✡

لە ناوەڕاستی ئەو مێزە گەورەیەی لەسەری دانیشتبوون، «سولەیمان» سەیری ئەو شەپۆلە بەرزونزمانەی نێو دەریای دەکرد، کە بە ئاراستەی ئەو دەهاتن. بەڵام ئەو لەوەدا نابینا بوو، تێبینی دوو بیچمی نەجووڵاو، بێهەستوخوست بکا، کە لە دووری ١٥٠ گەزێکەوە[242] لەسەر سک دەخشان. ئەوان بەنێو دەریا، لەو شوێنەی کە بەلەمێک لە دووری مایلێک لە ماڵەکەی «سولەیمان» داینابوون، بە مەلەوە هاتن. ئەوان دوو

[242] گەز: بۆیە گەزم بەکارهێناوە چونکە نووسەرەکان یاردیان بەکارهێناوە، یاردیش درێژییەکی ئەمریکاییە و کەمێک لە مەتر کەمترە، گەزیش کاتی خۆی بەکاردەهات، و ئەویش قولانجێک لە مەتر کورتتر بوو.

کۆماندۆی هێزی دەریایی ئیسرائیلی و نیشانشکێنی زۆر شارەزا بوون، ئامێری هەناسەدانی بن ئاویان پێبوو، بە بناولێدانی[243] ژێرئاوەوە بەرەو کەنار تا لای ماڵەکەی «سولەیمان» هاتن. کاتێکیش پێیان گەیشتە بندین[244]، هەڵسان و بەرەو ماڵەکە ڕۆیشتن. ئەوان هەم لە ماڵەکە و هەم لە قەپەنگەکەشیان ڕوانی، سەیری هەموو ئەوانەیان کرد کە لە دەوری مێزەکەدا دانیشتبوون و تیشکۆی خۆیان خستە سەر یەک ئامانج" ئەو ژەنەڕاڵەی لەنێوان میوانەکاندا دانیشتووە.

لە سەعات نۆی شەوەوە، نیشانشکێنەکان جێگەی خۆیان گرت و مەودایەکەیان ڕاستکردەوە. قەپەنگەکەش هەر جمەی دەهات، دوو میوانی بانگهێشتنەکراویش بە جلی بناوانلێدەری دەرياييەوە، ویستیان زۆر دڵنیا بن لەوەی بتوانن ژەنەڕاڵەکە بپێکن بێ ئەوە ئازاری یەک کەسی دیکە بدەن. ئەوان لە ئاوەکە هاتنەدەر و یەک دوو هەنگاویان بۆ پێشەوە هەڵهێنا، ئینجا بەبێ دەنگی سێرەی تفەنگی دەستیان لە سەری «سولەیمان» گرت. هێمایەکی ئەلەکترۆنیش لەبن گوێیاندا سرتەیەکی لێوەهات، ئیدی هەردووکیان بەیەکەوە و لەیەک کاتدا تفەنگەکانیان ئاگردا. لێدانەکان کوشندە بوون. سەری «سولەیمان» بە پشتدا هات و کەوتە سەر مێزە خوانە ڕازاوە پڕ لەخواردنەکە. یەکەمجار میوانەکان نەیانزانی چی ڕوویدا. تەنیا ئەو کاتەی سەرنجیان دا خوێن لە کەللەسەری سولەیمان دەڕژێ، ئەوسا تێگەیشتن چ باسە. ئینجا لەسەر قەپەنگەکە قیامەت ڕابوو؛ هەر بابا بوو بەلایەکدا دەچوو، هەبوون ویستیان یارمەتی

[243] بناولێدان: ئەوانەی مەلەی بن ئاولێدەدەن، غەواسە.

[244] بنی ئاو، بنی دەریا ، بنی گۆم، قاع.

خانەخوێکە بدەن، ئەوانی دیکە لە ترسان خۆیان نەوی کرد یان بەبێهودە هەر دەسووڕانەوە و هاوار و قیژەیان لێبەرز بووەوە. لەو هەرا و هەنگامەیەشدا هەر دوو نیشانشکێنەکەش وەک بەرزەکی بانان بۆی دەرچوون.

هەفتەنامەی سەندەی تایمز ڕووداوەکەی بە جیاوازییێکی کەمەوە گێڕاوەتەوە. هەفتەنامەکە نووسیبووی؛ نیشانشکێنەکان ئەندامی یەکەی کۆماندۆی فلۆتیلا ١٣ی ئیسرائیلی بوون، بەسەر پشتی یەختێک کە هی بزنسمانێکی ئیسرائیلی بوو، گەیشتبونە سەر کەناراوی سووریا، لەوێش دوای تەواوکردنی ئەرکەکەیان هەر بەهەمان یەخت گەڕابوونەوە.

✡ ✡ ✡

کاتێکیش هەواڵەکە گەیشتەوە دیمەشق، بووە مایەی هێدمەیەکی گەورە، بەڵام حکومەت بێدەنگی لێکرد و لە میدیاشدا ڕوداوەکەی ڕووماڵ نەکرد. دامەزراوەی سەربازی و ئاسایشپارێزیش شڵەژان. ئاخر تیمێکی وا چۆن توانیان بگەنە «تەرتوس» کە ١٤٠ مایل لە دیمەشقەوە دوورە؟ چۆن توانیان دەرباز بن؟ تۆ بڵێی لە سووریادا هیچ شوێنێکی ئارام بۆ سەرکردەکان نەمابێتەوە؟

دوای یەک دوو ڕۆژ کورتەیەکی هەواڵەکە بڵاوکرایەوە؛ "سووریا لە بکەرەکانی تاوانەکە دەکۆڵێتەوە." بەڵام خۆ ڕۆژنامەگەری لە وڵاتە عەرەبییەکانی دیکەدا چاوەڕێی کاردانەوەی فەرمییان نەکرد. ئەوان هەر لە

سەرەتاوە ڕووماڵێکی تایبەتی ڕووداوەکەیان بڵاوکردەوە، ڕاپۆرتی وردەکاری سەرنجڕاکێشی و پێلیێهەڵبڕانەی سەبارەت بە ناسنامەی بکوژەکان تێدابوو. میدیای عەرەبی تیشکۆی خۆیان خستبووە سەر ئەو توخمەی کە بەرژەوەندی لە کوشتنی ژەنەڕاڵدا هەبوو، پەنجەی تۆمەتبارکردنیشیان بۆ ئیسرائیل ڕاهێشت، ئەوەیان گوت کەوا ئیسرائیل ئەم کارەی کردووە، چونکە «سولەیمان» ڕۆڵی لە کارلێکەری پڕۆژەکەی «دێرزوور»دا هەبووە.

✡ ✡ ✡

لە کاردانەوەی ڕووداوەکەشدا، دەزگە هەواڵگرییەکانی ڕۆژئاوا هەڵوێستی جیا جیایان هەبوو. بەڵام خۆ کەسیان فرمێسکیان بۆ مەرگی «سولەیمان» هەڵنەڕشت. لە حوزەیرانی ٢٠١٠دا، سوپاسالاری هێزی بەرگری ئیسرائیلی پەسنی یەکەی «فۆلتێلا ١٣»دا بەوەی "مێرخاسی مەیدانن"، کەچی ناوەڕۆکەکەیشی ئاشکرا نەکرد.

ڕەنگە مرۆ لەوەدا سەرسام بێ، ئاخۆ یەکەی کۆماندۆی هێزی دەریایی بە لای کەمییەوە شانازی ئۆپەراسیۆنەکەی «سولەیمان»ی پێبڕاوە یان نا.

## بەندی نۆزدە: خۆشەویستی و مەرگ لەدوای نیوەڕۆدا

لە ١٢ی فێبرایەری ٢٠٠٨دا، چەندین پیاو بە دزییەوە دەوروخولی باڵەخانەی ئەپارتمانی گەڕەکێکی تایبەتی دیمەشقیان دا. لەو دوای نیوەڕۆیە درەنگەدا، بینیان میتسیوبیشی پاجیرۆیەکی ڕەنگ زیوینSUV لە گەراجی باڵەخانەکەدا ڕایگرت. پیاوێک بە قاتێکی ڕەش و بە ڕدێنێکی قەڵەمکراوی ڕێکوپێک لە ترۆمبێلەکە دابەزی و چووە نێو باڵەخانەکەوە. ئەو هیچ پاسەوانی لەگەڵدا نەبوون. ئاژانە بڵاوبووەکانی سەر شەقام و کۆڵانەکان بە نێرەرەی بنگوێیان شتێکیان چرپاند و گوتیان "پیاوەکە" گەیشتە دیمەشق، ئێستاش بەرەو ئەپارتمانەکە بەڕێوەیە. ئەوان دەیانزانی ئەو پیاوە قاتڕەشە لە سەروبەندی ئەوەدایە ژنە دۆستەکەی بە نهێنی ببینێ؛ «نیهاد حەیدەر[245]»یش ئافرەتێکی سووری بوو، چاوەڕێی کابرایەکەی دەکرد بچێتە لای. پیاوەکەش دیاریەکی خنجیلانەی پێبوو، ئاخر هەر لەو هەفتەیەدا خانمەکە یادی سێیەمین ساڵڕۆژی لەدایکبوونی بوو.

دڵدارەکان یەک دوو سەعاتیان لە ئەپارتمانە نایابەکەدا بەسەربرد، کە لە لایەن «ڕامی مەعلوف»ی بزنسمانی سەرکەوتوو و کوڕەخاڵی «بەشار ئەسەد» خرابووە خزمەتیان.

کەمێک بەر لە سەعات دەی شەو، پیاوە قاتڕەشەکە، باڵەخانەکەی جێهێڵا و سواری پاجیرۆ زیوینەکە بووەوە. دەچووە کۆبوونەوەیەک لە ماڵێکی

---

[245] Nihad Haidar

پارێزراوی نهێنییەوە، لە گەڕەکی «کفر سوسە»، لەوێ لەگەڵ نێردەی ئێرانییەکان، سووریەکان و فەلەستینییەکان دادەنیشت.

بەگوێرەی زانیارییەکانی سەنتەری ئێکپرێسی لەندەنی، ئاژانەکان بەدوایدا ڕۆیشتن، سایەیان کرد ئەو وێنە نوێیەیان لەگەڵ ئەو وێنەیەی لەسەر شاشەی مۆبایلەکەیان بوو بەراوردکرد، بۆ ئەوەی لە ناسینەوەیدا کەمترین هەڵە نەکەن. ئەوان پەیوەندی نێرەرەکەیان نەپچڕاند و هەر جووڵەیەکی کابرایان دەگەیاندە بنکەی فەرماندەیی مۆساد.

کاتێکیش پیاوەکە لە باڵەخانەکە چووەدەر، کە تێیدا یەک دوو سەعاتی لەگەڵ «نیهاد»دا بەسەر بردبوو، ئاژانەکان دەرفەتێکی باشیان هەبوو تا ڕووخسارەکەی لەگەڵ ئەوەی لەسەر شاشەی تەلەفۆنەکەیان بوو بەراورد بکەن. ئیدی ناسنامەکەیان بە سەلمێندراوی گەیاندەوە هاوکارەکانیان لە بنکەی سەرەکی تەلئەبیب. ئینجا وروژانێکی خۆش باڵی بەسەر مۆساددا کێشا. سەرانی هۆبەکان لە هۆبەی «مایەر داگان»دا کۆبوونەوە، لەوێشدا هەموو کەرەستەی پێویست بۆ چاودێریکردنی ئۆپەراسیۆنەکە لە کاتی ڕاستی خۆیدا ئامادەکرابوو.

پیاوەکە سلفی لە پاجیرۆ زیوینەکە دا.

"ئەو بەڕێوەیە،" یەکێک لە ئاژانەکان وای چرپاندە ئەو مایکە نێرەرە بچووکەی بن گوێی.

ئەو پیاوەی نێو تڕوومبێلی پاجیرۆی زیوین «عیماد موغنیە»، بوو کە لەو ساڵانەی ڕابردوودا پاشخانێکی خوێنینی هەبوو.

✡ ✡ ✡

١٥ی نۆڤێمبەر ٢٠٠١.

بۆ بەدواداچوونی پەلامارەکەی تاوەرە جمکەکە، FBI پۆستەرێکی گەورەی چاپ و بڵاوکردەوە کە لیستێک بوو لەو کەسانەی داواکراوترین تیرۆرستەکانی جیهان بوون.

پۆستەرەکە بە دروشمی FBI، وەزارەتی دەرەوە و وەزارەتی داد مۆرکرابوو.

لیستەکە ناوی بیست و دوو کەسی بە وێنەوە تێدابوو.

یەکەمین ناویش دژوارترین کەسیان بوو.

پاداشتیش بۆ دەستگیرکردنی بڕی پێنج ملیۆن دۆلار بوو.

تا پەلامارەکەی تاوەرە جمکەکە، ئەو لە هەموو تیرۆرستەکانی دیکە لە مەرگی زۆرترین ئەمریکایی بەرپرسیارتر بوو.

**عیماد موغنیە.**

- ١٨ی ئەپریل ١٩٨٣ – بۆمببارانکردنی باڵوێزخانەی ئەمریکی لە بەیروتی پایتەختی لوبنان و کوژرانی ٦٣ کەس.
- ٢٣ی ئۆکتۆبەری ١٩٨٣، بۆمببارانکردنی بنکەی مارێنزی ئەمریکی لە بەیروت و کوژرانی ٢٤١ کەس.
- ٢٣ی ئۆکتۆبەری ١٩٨٣، (هەر لە هەمان ڕۆژ) بۆمببارانکردنی بنکەی پەڕەشووتوانانی فەرەنسی لە بەیروت و کوژرانی ٥٨ کەس.

ئەمە وێڕای ڕفاندن و کوشتنی کاربەدەستی سی ئای ئەی «ویلیەم بێکلی»، چەندین هێرش بۆسەر باڵوێزخانەی ئەمریکا لە «کوێت»؛ ڕفاندنی فڕۆکەی TWA و دوو فڕۆکەی کۆمپانیای ئاسمانی کوێتی؛ کوشتنی کۆلۆنێل «دەبلیو ئار هیگنس» چاودێری هێزەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە خوارووی لوبنان؛ قەتڵوعامکردنی بیست سەربازی ئەمریکی لە عەرەبستانی سعوودیدا ...

کاتێکیش لیستی ناوبراو نێردرایە ئیسڕائیل، مۆسادیش ئەو داتایانەی خوارەوەی بۆ زیادکرد:

- ٤ی نۆڤێمبەری ١٩٨٣، بۆمببارانکردنی بنکەی هێزی بەرگری ئیسڕائیلی لە «تیرە» لە لوبنان و کوژرانی ٦٠ کەس.
- ١٠ی مارتی ١٩٨٥، هێرشکردنە سەر کاروانێکی هێزی بەرگری ئیسڕائیلی لە «مێتوللا» لەسەر سنووری ئیسڕائیل لوبنان و کوژرانی ٨ کەس.
- ١٧ی مارتی ١٩٩٢، بۆمببارانکردنی باڵوێزخانەی ئیسڕائیل لە ئەرجەنتین و کوژرانی ٢٩ کەس.
- ١٨ی حوزەیرانی ١٩٩٤، بۆمببارانکردنی مەڵبەندی کۆمەڵگەی جوو لە «بۆینس ئایرس» و کوژرانی ٨٦ کەس.

ئەمە وێڕای ڕفاندن و کوشتنی سێ سەربازی ئیسڕائیلی لە «هاردۆڤ»ی سەرسنوور، ڕفاندنی بزنسمانی ئیسڕائیلی «ئیلهانان تاننباوم»،

بۆمببارانکردنی نزیک کیبوتی «ماتزوبا» و لە هەمووشی وێرانتر: ڕفاندن و کوشتنی دوو سەربازی ئیسرائیلی بە ناوەکانی «ڕێگێڤ» و «گۆلدسوار» لەسەر سنووری لوبنان، کە شەڕی دووەمی لوبنانی لێکەوتەوە.

✡ ✡ ✡

«عیماد موغنیە»، تیرۆرستی سەرسەخت لەپشت هەموو ئەو تاوانانەوە بوو، ئەو مۆتەکەیەک بوو بۆ خۆی، بەردەوامیش لەنێو پایتەختەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا لە جرتوفرتدا بوو. ئەو خۆی لە وێنە بە دوور دەگرت و داوای چاوپێکەوتنیشی ڕەتدەکردەوە. دەزگە هەواڵگرییە نهێنییەکانی ڕۆژئاوا زۆر شتیان لەبارەوە دەزانی، بەڵام تا ڕادەیەکیش هیچ شتیان دەربارەی ڕووخسارەکەی، دەربارەی خووەکانی، دەربارەی حەشارگەکانی نەدەزانی. ئەوان ئەوەیان دەیانزانی، کە لە ١٩٦٢دا لە گوندێکی خوارووی لوبناندا لەدایک ببوو. بەگوێرەی برگەی ڕاپۆرتەکان، دایبابەکەی شیعەی دڵسۆز بوون؛ لەکاتێکدا ئەو لە تەمەنی مێردمنداڵیدا، چووبووە بەیروت و لەوێ لە گەڕەکێکی هەژارنشین، کە زۆربەی ئاکنجییەکانی فەلەستینی لایەنگری ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی بوون، گەورە ببوو. ئەو وازی لە خوێندنی ئامادەیی هێنا و چووە ڕیزی ڕێکخراوی «فەتح»، باڵی تیرۆرستی ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی. پاشان بووە پاسەوانی «ئەبو ئەیاد»ی جێگری «عەرەفات»؛ ئینجا ئەندامی هێزی ١٧، کە یەکەیەکی تایبەتی ئاسایشپارێزی ڕێکخراوی فەتح بوو، کە لە ناوەڕاستی حەفتاکان بە فەرماندەیی «عەلی حەسەن سەلامە»ی شازادەسوور پێکهێندرابوو (بڕوانە بەندی دوازدە). بەڵام لە

١٩٨٢دا، ئیسرائیل جەنگی لوبنانی هەڵگیرساند، پێیگوترا ئۆپەراسیۆنی ئاشتی بۆ خەلیل، بە هۆیەوە چووە نێو لوبنان و ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستینی لەوێ وەدەرنا. ئیدی ئەو ئەندامانەی قوتاریان بوو بە سەرۆکایەتی یاسر عەرەفات بۆ تونس دوورخرانەوە. «موغنیە»ش بڕیاریدا بمێنێتەوە و پاشان چووە ڕیزی یەکەمین گرووپی دامەزرێنەرانی حزبوڵلا.

حیزبوڵڵاش –دەقاودەق واتای حیزبی خودا دەگەیەنێ- ڕێکخراوێکی تیرۆرستی شیعەگەرایە و لە ١٩٨٢دا لە کاردانەوەی داگیرکردنی ئیسرائیل بۆ سەر لوبنان دامەزرا. ڕێکخراوەکە ئایەتوڵلا خومەینی جۆشی دا و مەشق و چەک و تفاقیشیان لە لایەن سوپای پاسدارانەوە بوو، ئیدی حیزبوڵلا بووە دوژمنە هەرە دژوارەکەی ئیسرائیل و مەبەستەکەشیان بەوە پێناسە دەکرد کە "دوایین کشانەوەی ئیسرائیل لە لوبنان دەستپێکی کۆتایی لەناوچوونیانە." هەر لە ڕۆژی یەکەمی دروستبوونیەوە، حیزبوڵڵا دەستی دایە کردەی توندوتیژی تیرۆرستانە لە دژی ئیسرائیل. «موغنیە»ش سەرمەشقترین نموونەی هەڵسووڕاوی ئەو گرووپە تازەسەرهەڵدراوە بوو.

وەک پیاوێکی ڕاستەقینەی بەر سێبەر، ئەوەی لێبژارد، بە نهێنی و دوور لە چاوی کامێرا و جەماوەر دەستبەکار بێ. ئەو ڕاپۆرتانەی لەسەر ئەو هەبوون، پچڕپچڕ و زۆریشیان دژیەک بوون. سەرچاوەیەکیان وای وێناکرد، کە پاسەوانی تایبەتی «شێخ فەتحوڵڵا»ی ڕابەری ڕۆحی حیزبوڵلا بووە، کەچی سەرچاوەیەکی دیکە دەڵێ گوایە ئەو سەردەستەی ئۆپەراسیۆنەکانی ڕێکخراوەکە، عەقڵی ڕێکخەری پشت سەرکەشترین

کردەوەکانی ڕێکخراوەکە بووە، کە کوشتارگە و گۆمی خوێنی لێکەوتەوە. بە پێچەوانەی ڕابەری ئێستای حیزبوللا «شێخ نەسروللا»، هەرگیز «موغنیە» لە تەلەفزیۆن دەرنەکەوت، قەتاوقەت دوانی قین لە دلانەی نەدان؛ بەلام هەرزوو گەیشتە ئەو پلە هەرە کاریگەر و فێلبازترین تیرۆرستی جیهان، هەروەک «کارلۆس» لەسەردەمی خۆی، هەروەها هەروەک هاوڕێ و پێشەنگی مەزنی خۆی «ئوسامە بن لادن».

«موغنیە» تیرۆرستێکی بێبەزەیی و خولقێنەر بوو. ئەو لەو کاتەی نەخشەداڕێژەر و جێبەجێکاری چەندین کوشتارگەش بوو، لە لوبنان و لە کۆتایی ئۆپەراسیۆنی ئاشتی بۆ خەلیل، لەپڕ دەرکەوت. لە ئۆکتۆبەری ١٩٨٣دا تەمەنی هەر بیست و دوو ساڵ بوو، کە ترۆمبێلی باربەری پڕ لە مادەی تەقینەوە، بۆمبڕێژی خۆکوژی دەناردنە مۆڵگەی مارینزی ئەمریکی و یەکەی پەڕەشووتوانانی فەرەنسی لە بەیروت؛ هەرچەند ڕۆژێکی کەمیش دوای ئەوە، هەمان سیناریۆی دژی هێزی بەرگری ئیسرائیلی لە بنکەی سەرەکی «تیرە» دووبارە کردەوە. لە تەمەنی بیست و دوو ساڵیدا، فەرماندەیی گرووپێکی تیرۆرستی کرد بۆ پەلاماردانی باڵوێزخانە قایمەکەی ئەمریکییەکان لە کوێت و پاش ئەوەش یەکەمین فڕۆکەی لەوێ فڕاند. لەدوای هەر ئۆپەراسیۆنێکیش، دەبوو بە هەڵم، کەس نەیدەبینی. لە تەمەنی بیست و سێ ساڵیدا، فڕۆکەیەکی TWA کە لە ئەسیناوە بۆ ڕۆما دەفڕی، فڕاند و فڕۆکەوانەکەشی ناچارکرد لە فڕۆکەخانەی بەیروت بنیشێتەوە. لەمیانەی کردەوەی فڕاندنەکەشدا، «ڕۆبەرت دین ستیثن»ی لێخوڕی دەریاوانی کوشت و تەرمەکەشی لە دەرگەی فڕۆکەوانەکە فڕێدایە خوار. «موغنیە» دوای فڕاندنەکە کە حەڤدە ڕۆژی خایاند، هەلات؛

بەڵام ئەمجارەیان یادەوەرییێکی بەجێهێشت: ئەویش پەنجەمۆرەکەی بوو لە ئاودەستی فڕۆکەکەدا.

تا ڕاددەیەک هیچ شتێک سەبارەت بە ژیانی تایبەتی نەزاندرا، بەدەر لەوەی کە دۆتامێکی خۆی هێنابوو، کوڕێک و کچێکی لێهەبوو. لە تەمەنێکی هەرە گەنجییەوە، دەیزانی کە کەوتۆتە بەر سێرەی نیشانەی چەندین دەزگەی هەواڵگری نهێنی ڕۆژئاوایی و هەوڵدەدەن ناسنامەکەی هەڵبدەنەوە. ئەویش لە لیبیا نەشتەرگەرییێکی جوانکاری بەرایی بۆ دەموچاوی خۆی کرد، ڕیشی بەردایەوە، دووریش کەوتەوە لە تیشکی ناووشۆرەتی ڕاگەیاندن. تەنیا یەک تاکە وێنەی موغنیەی قەڵەو، ڕیشدار هەبوو، کە چاویلکەی لەچاو و شەپقەشی لەسەر بوو، هەر ئەو وێنەیەش لەنێو فایلەکانی دەزگە هەواڵگرییە ڕۆژئاواییەکان دەسووڕایەوە. ئەو وەسفەش خەوشدار بوو؛ FBIی وێنەی موغنیەی وا کێشابوو کە "لەدایکبووی لوبنانە، بە عەرەبی قسە دەکا، پرچ و ڕدێنێکی بۆرەی هەیە و درێژی باڵاشی ١٧٠ سانتیمەتر و کێشەکەشی ٦٠ کیلۆگرام دەبێ". ئاخر زەحمەت بوو بڕوا بکرێ کەسێکی جەستە تێروپڕ چۆن بتوانێ خۆی والێبکا و ببێتە تەنیا ٦٠ کیلۆ ... بەڵام ئەو وێناکردنە تەنیا سەلمێنەری ئەوەبوو، موغنیە زۆر وریا بوو، توانیبووی دوژمنەکانی لە خشتە ببا.

دوای هەموو ئەو هێرشانە، ئەو بۆمببارانکردن و ڕفاندنانە کە پێیهەڵسا، بووە پاڵەوانێکی بە شانوباڵهەڵدراوی حیزبوڵڵا. پەسنی ئاڵۆزی و پێشکەوتووی، بوێری و بەهرەی ئۆپەراسیۆنەکانی دەکرا، کە بەهۆیەوە باسکی سەربازی حیزبوڵڵا ترسوبیمی لە جیهانی دەزگە هەواڵگرییەکان بڵاوکردەوە. کاتێکیش دەسەڵاتی «موغنیە» پەرەی دەسەند، زیاتر دەبووە

جێئامانجی ئیسرائیلی و ڕۆژئاواییەکان بۆ لەناوبردن. خۆیشی ئەم شتەی باش دەزانی، خۆی شێتی مەزنێتی ببوو، ژیانێک دەژی ژیانی نەمریی، گومانی لە هەموو کەسێک هەبوو، تەنانەت باوەڕپێکراوە هەرە نزیکەکانیشی، بۆیە زوو زوو پاسەوانەکانی خۆی دەگۆڕین، هەر شەوە و لە شوێنێک دەڕازا[246]؛ گەشتەکانیشی لە نێوان بەیروت، دیمەشق و تەهران لەژێر پەردەیەکی ئەستووری نهێنییدا دەکرد.

بەگوێرەی ئەو فایلە تایبەتییەی لە لایەن دەزگە نهێنییەکانی ئیسرائیلی و ئەوانی دیدا بۆی کرابووەوە، «موغنیە» کەسێکی تەنیاخواز بوو، زۆر کاریزمایی بوو، زۆریش بە جۆش بوو، زانیاری زۆریشی سەبارەت بە ئامێرە ئەلکترۆنییە تازەکان و کارپێکەرەکانیان هەبوو. توانایەکی سەردەقشکێنی لە گۆڕینی ناسنامە و ڕووخساردا هەبوو، بە جۆرێک دەیتوانی دوژمنەکانی بگەوجێنێ؛ دەزگەی نهێنی ئیسرائیلی ناویلێنابوو "تیرۆرستە حەفت[247] ڕۆحەکە."

«داڤید بارکای»ی ئەفسەری ئامان، مێجەری پێشووی دەزگەی نهێنییەکەی ٥٠٤، پرۆفایلەکەی موغنییەی پوختە کردبووەوە، لە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ سەندەی تایمزی لەندەنییدا گوتی: "ئێمە چەندین جار لە کۆتایی هەشتاکاندا هەوڵماندا ملی بشکێنین. زانیاریمان لەبارەی کۆکردەوە، بەڵام چەند لێی نزیک دەبووینەوە، ئەو زانیاریانەی دەستمان

[246] ڕازان: نوستن، دەڕازا، دەنوست.

[247] ئەوەی ڕاستی بێ نووسەرەکان نووسیویانە نۆ گیان، بەڵام لەبەرئەوەی دەستەواژەکە لە کوردەواریدا حەفت گیانە، پشیلەی حەفت گیان، بۆیە منیش کردمە حەفت.

پێوەدەگرتن، کورتهێنتر دەبوون؛ ئاخر نە خاڵێکی لاواز، نە ئافرەت، نە پارە، نە بەنج، نە بە هیچ شتێک دەستمان نەگەیشتێ."

✡ ✡ ✡

ڕاوەدوونانی «موغنیە» چەندین ساڵی خایاند. لە ١٩٩٨دا خەریکبوو لەو کاتەی فڕۆکەکەی لە پاریس دەگۆڕی بکەوێتە بن دەستی دەسەڵاتدارانی فەرەنسی. سی ئای ئەی زانیاری سەبارەت بە کابرا بە وێنە و وردەکاری پاسپۆرتە ساختەکەشیەوە کە لە گەشتەکەیدا بەکاریهێنا، دابووە فەرەنسییەکان. بەڵام فەرەنسییەکان ترسی ئەوەیان هەبوو، نەبادا گرتنی «موغنیە» بێتە مایەی کوشتنی ئەو بارمتەکراوە فەرەنسییانەی هاوزەمان لە لوبناندا گیرابوون، بۆیە چاوپۆشییان لێکرد، ئەویش بێوەی بۆی دەرچوو. دەزگەی هەواڵگری ئەمریکایی هەوڵیدا لە ١٩٨٦ لە ئەورووپا و لە ١٩٩٥یش لە عەرەبستانی سعوودییەدا بیگرێ. بەڵام ئەو وەک هەمیشە نەزاندرا بۆکوێ چوو، ئایا زەوی قووتی دا یان ئاسمان هەڵیکێشا.

لەو ساڵانەدا، موغنییە بە قووڵی سەرقاڵی نەخشەداڕشتن و جێبەجێکردنی هێرشکردنە سەر ئیسرائیلی و جووەکانی ئەرجەنتین بوو. لە ١٩٩٢دا، پەلامارێکی بۆ سەر باڵوێزخانەی ئیسرائیلی لە بۆینس ئایرس ڕێکخست بەهۆی ترومبێلێکی باربەری پڕ لە تەقینەوە و لە لایەن شوفێرێکی خۆکوژیشەوە لێدەخوڕا. لە کردەوەکەدا بیست و دوو کەس کوژران. هەندێک لە سەرانی مۆساد ئەو ئۆپەراسیۆنەیان وەک کردەتۆڵەیەک لەبەرانبەر «شێخ عەباس ئەلموسەوی»ی ڕابەری حیزبوڵلا کە بە کۆپتەرێک لە خوارووی لوبنان پەلاماردرا و کوژرا، دانا.

دوو ساڵ دواتریش، بۆمبێکی دیکە «بۆینس ئایرسی» هەژاندەوە، ئەم جارەیان لە مەڵبەندی کۆمەڵگەی جووەکان قەوما، هەشتا و شەش کەسی کوشتن. دیسان هەندێ شارەزا لەو بڕوایەدا بوون، ئەمەشیان لە تۆڵەی «مستەفا دیرانی»یەوەیە، یەکێ لە سەرکردەکانیان لە لوبنان لەسەر دەستی ئیسرائیلییەکان ڕفێندرا.

تاقمە هەواڵگرییەکان لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئیسرائیل، کە ئەوێ ڕۆژێ بەرەو «بۆینس ئایرس» فڕین، لە هەردوو بۆمبەکانیان کۆڵییەوە، گەیشتنە ئەنجامێک کە پەیوەندییان بەیەکەوە هەبووە. شێوەی کاری هەردوو کردەوەکە مایەی ناسینەوە بوو، ئەویش پڕکردنی ترۆمبێلێکی باربەر بە تەقینەوە و ناردنی بۆ شوێنی ئامانج بە هۆی بکوژێکی خۆکوژ کە ترۆمبێلەکە لێدەخوڕێ. «موغنیە» کاتی خۆی لە هەڕەتی چالاکییەکانیدا هەر هەمان شێوازی لە بەیروت و «تیرە»دا بەکارهێنابوو. لێکۆڵەرەوەکان سەلماندییان، دەزگەی هەواڵگری ئێرانی و هاوکارە خۆجێیەکانیش دەستیان لەگەڵ بۆمبڕێژکردنەکەدا هەبووە. لە بۆینس ئایرس و لە لایەن سەوداکارێکی شیعەمەزەب بە ناوی «کارلۆس ئالبێرتۆ تالادین»ەوە ترۆمبێلەکانیان پێفرۆشرابوون. شوێنهەڵگرتنەکەش بۆ «عیماد موغنییە» سەرکێش بوو.

✡ ✡ ✡

«موغنیە» لەو ساڵانەدا بۆ ماوەیەکی زۆر هەر لە ئێراندا ماوەتەوە. دوای کوشتنی «شێخ ئەلموسەوی» دەترسا لەوەی ئیسرائیل ئەویش بکوژێ. لە تاران تیمێکی ئۆپەراسیۆنی لە شەڕڤانانی حیزبوڵڵا و ئەفسەرە هەواڵگرییەکانی ئێرانی پێکهێنا. هاوشانەکانی ئەو لە پێکهێنانی ئەو

یەکەیەدا سوپاسالاری سوپای پاسداران «موحسن ڕەزایی» و «عەلی فەتاحیان»ی وەزیری ئیتلاعات بوو. پێدەچوو هەر ئەو یەکەیە، هەردوو هێرشە کوشندەکەی «بۆینس ئایرس»یان بە ئەنجام گەیاندبێ. پەلامارەکانیش یەک بەرەنجامیان هەبوو: «موغنیە» ببووە داواکراوترین کەس بۆ ئیسرائیل. بەو کردەوانە، بە خۆی حوکمی مەرگی لەسەر خۆی دا.

لە دیسێمبەری ١٩٩٤دا، «موغنیە» لە بەیروت بیندرا؛ هەر کەمێکیش دوای ئەوە، لە هەوڵێکی کوشتن بە ترومبێلێکی مینرێژکراو لە خوارووی لوبناندا ڕزگاری بوو. هەر زووش پۆلیسی لوبنان شتەکەیان دۆزیەوە و بڵاویان کردەوە: بارە تەقینەوەیەک خراوەتە ژێر ترومبێلێک کە لەنزیک مزگەوتێک، کە «شێخ فەزلوڵڵا» وتاری بۆنەنامەیەکی تێدا دەخوێندەوە، ڕاگیرابوو. تەقینەوەکەش دووکانی «فوئاد موغنیە»ی برای «عیماد»ی وێرانکرد، تەرمەکەشی لەنێو داروپەردووی خاشاکدا دۆزرایەوە. بەڵام «عیماد» بە خۆی کە نیاز بوو لەوێ بێ، لە دوا ساتدا ڕای خۆی گۆڕیبوو، بڕیاریدا نەچێتە ئەوێ، بەم جۆرە قوتار بوو. دیسان حەفت ڕۆحییەکەی بە هانایەوە هات.

هەر یەک دوو هەفتە دوای تەقینەوەکە، دەزگەی ئاسایشپارێز بە هاوکاری حیزبوڵڵا، چەند کەسێکی مەدەنیان بە گومانی ئەوەی دەستیان لە کردەوە هێرشبەریەکەدا هەبوو، وەک هاوکارێکی مۆساد گرت. گومانلێکراوە سەرەکییەکەش ناوی «ئەحمەد حەللاق» بوو.

بەگوێرەی ڕاگەیاندنی پۆلیس، «حەللاق» و ژنەکەی ترومبێلەکەیان لە نزیک دووکانەکەی «فوئاد موغنیە» ڕاگرتبوو. «حەللاق» یش دەچێتە

دووکانەکە تا بزانێ ئاخۆ «فوئاد» لەوێیە، تۆقەی لەگەڵدا دەکا، ئینجا دەگەڕێتەوە لای ترومبێلەکەی خۆی و بۆمبەکە کارا دەکا." «ئەلسەفیر» ڕۆژنامەی لوبنانی لە سەرچاوەی هەندێ باوەڕپێکراوەوە نووسیبووی «حەللاق» بەشداری دانیشتنی ئەفسەرێکی پلەباڵای مۆسادی لە قوبرس کردبوو؛ مۆسادەکەش ڕێنمایی دابووێ چۆن بۆمبەکە قورمیش بکا و بیتەقێنێتەوە و لەبەرانبەریشدا بڕی ١٠٠٠٠٠ دۆلاری ئەمریکی وەرگرتبوو. دوابەدوای ئەوەش «حەللاق» لەسێدارە درا.

ئەمجارەشیان «موغنیە» دەربازی بوو، بەڵام ئاژانەکانی مۆساد کۆڵیان نەدا. ئەوان بە مەعلانییەوە هەموو زانیارییێکی ورد و درشتیان لەسەر کۆکردەوە. ڕاپۆرتی ئاژانسە هەواڵگرییە بیانییەکانیشیان دیکەشیان خستەسەر، ئینجا لە شێوازی تایبەتییانەی «موغنیە»یان کۆڵیەوە. لە ٢٠٠٢شدا مۆساد ڕاپۆرتێکی دیکەی سەبارەت بە کابرا پێگەیشت، کە گرێدراوبوو بە دەستهەبوونی لە باری کەشتییێکی پەنجا تۆن لە چەکوچۆڵ کە بۆ تیرۆریستە فەلەستینییەکان دەهات. بەڵام دیسان خۆی بزرکردەوە، هەرچەندە بەندوباوی ئەوەش لە ئارادابوو، کە بۆتە سوپاسالاری حیزبوڵڵا جێگرەوەی «شێخ نەسرولڵا». پەیوەندییە سەرەکییەکانی ئەو لەگەڵ هەواڵگری ئێرانییەکاندا بوو، دەشگوترا بەیەکەوە لەگەڵ سوپای «ئەلقودس» (ناوە عەرەبییەکەی ئۆرشەلیم)، بەرپرسیارە لە هاوکاریکردنی کۆمەڵگە شیعەکان و ڕێکخراوە تیرۆرستییە جڵەوکراوەکانی دەستی ئێران لەسەرتاسەری دنیادا. ئەو پێگە باڵایەی موغنیە هەیبوو، بووە پاڵپشتی ئەو ڕێکارانەی دەیگرتنەبەر. دەنگودوویی بەردەوام جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە، دیسان ڕووخساری خۆی گۆڕیوەتەوە، پێدەچێ نەشتەرگەرییێکی دیکەی جوانکاری کردبێ.

بەگوێرەی هەواڵی سەرچاوە ئەوروپییەکان و لە کۆتایی جەنگی دووەمی لوبناندا، مۆساد یەک دوو فەلەستینی کە لە لوبنان دەژیان، هێنابوونە ڕیزی خۆی، ئەوانەش بە توندی دژی حیزبوڵلا بوون. یەکێک لەو کەسانە کیژەخاڵێکی موغنیەی لە گوند هەبوو. کچەکەش هەواڵی گەشتی ئەورووپا و گەڕانەوەی موغنیە بۆ لوبنانی بەوەی شێوەی ڕووخساری بە تەواوی گۆڕاوە و لە ڕواڵەتدا بۆتە کەسێکی دیکە، بە ئاژانە نوێکەی مۆساد گوتبوو.

ئیدی مۆساد کەوتە هەمبەر داڕسانێکی نوێوە، گەڕان و سوڕان بە نۆڕینگەی نەشتەرگەرییە جوانکارییەکانی ئەورووپا.

هەواڵی سەردەقشکێنی چاوەڕواننەکراو لە بەرلینەوەڕا هات. بەگوێرەی «گۆردۆن تۆماس[248]» نووسەری بەریتانی، ئاژانێکی مۆسادی دانیشتووی بەرلین بە ناوی «ڕیوڤن»، هەواڵدزێکی ئاڵمان دەبینێ کە پەیوەندی نهێنی بە خەڵکی پێشووی بەرلینی ڕۆژهەڵاتەوە هەبوو. هەواڵدزەکە بە ئاژانەکە ڕادەگەیەنێ، کە «عیماد موغنیە» لەو زووانە چەندین نەشتەرگەری جوانکاری کردوون و بە تەواوی سیمای دەموچاوی خۆی گۆڕیوە. نەشتەرگەریەکەش لە نۆڕینگەیەکدا کردبوو کە پێشتر سەر بە «ستاسی»یەوە بوو، «ستاسی»یش دەزگەی هەواڵگری نهێنی پێشووی ئاڵمانیای ڕۆژهەڵات بوو. «ستاسی» ئەو نۆڕینگەیەی بۆ گۆڕینی ڕووخسار و دەموچاوی ئەو ئاژانانە بەکاردەهێنا، کە بەکاری نهێنییەوە دەیناردنە ڕۆژئاوا.

---

[248] شایانی باسە، گۆردۆن تۆماس نووسەری ئەو کتێبەیە، کە من وەک نۆبەرەی وەرگێڕانەکانم بە ناوی «نهێنییەکانی مۆساد» لە ٢٠٠٨دا چاپکرد و تا ئێستاش سێ جاران چاپ کراوەتەوە.

دوای دانوستانێکی توند و زەحمەت، «ڕیوڤن» قایلبوو کە بەخشیشێکی چەور بداتە کابرای ئاڵمان، تا فایلی نۆرینگەکەی بۆ بێنێ، کە ٣٤ وێنەی نۆژەنی «موغنیە»ی تێدا بوو.

لە ئەنجامی شرۆڤەکردنی شارەزایانی لای «مایەر داگان» بۆ وێنەکان دەرکەوت، کە «موغنیە» نەشتەرگەری جوانکاری بۆ شەویلاگەی خوارەوە کردووە، شەویلاگەی خوارەوەی هەندێ کورت کردۆتەوە، ئەو ئێسکەی لێبکراوەتەوە لە شوێنێکی دیکەی بەکارهاتووە، بۆ ئەوەی ڕووخسارێکی باریکی هەبێ تا لەڕوو لاواز دەربکەوێ. چەندین ددانی پێشەوەشی بە ددانی دەستکردی شێوە جیاواز گۆڕیون. دەستکاری چاوەکانیشی کردبوو، پێستی دەوری چاوەکانی گورچ کردبوون. ڕووخسار گۆڕینەکە بە ڕەنگکردنی پرچ بە ڕەنگێکی بۆز گۆڕیبوو، چاویلکەکانیشی کردبوونە لێنزی سەر چاو. ئیدی «موغنیە» بە «موغنیە» ڕەسەنەکەی جاران نەدەچوو، ئەو وێنانەش، کە لە هەشتاکانەوە لە لایەن دەزگە هەواڵگرییە ڕۆژئاواییەکان کۆدەکرانەوە، هیچ کەڵکیان نەما.

بەگوێرەی سەرچاوە هەواڵە بیانییەکان، مۆساد پلانێکی بۆ کوشتنی «موغنیە» دانا. «مایەر داگان» بانگی پیاوە هەرە باشەکانی خۆی کرد، بە بەرپرسی «کاسارا» و فەرماندەی تیمی کیدۆن و چەندین ئەفسەری پلەباڵای دیکە کە سەروسەودایان لەگەڵ فایلی موغنیەدا هەبوو. هەر زوو ئەوە ڕوون و ئاشکرا بوو، کە هیچ ڕێگەیەک لەبەردەستدا نییە، بۆ ئەوەی موغنیە لە وڵاتێکی غەیرە موسڵماندا بکوژن. ئەو بە دەگمەن دەچووە وڵاتانی ڕۆژئاوا و زیاتر لە ئێران و سووریادا هەستی بە ئارامی و ئاسایش دەکرد. ئیسرائیلییەکانیش دەیانزانی هەر کردەوەیەک لەو وڵاتانە

سەرکەشییێکی گەورەی تێدایە. ئەوەش ڕاستبوو، کە ئیسرائیل لە ڕابردوودا لە وڵاتە عەرەبییەکان دەستی خۆی دەوەشاند و لە ماوەی ئۆپەراسیۆنی تۆڵەی خودا، کودەتایەکی کرد. فەرماندەکانی لەوەش دوورتر ڕۆیشتن، ئەوان چوونە سەر خاکی تونس و لەوێ سەرکردەی تیرۆرستەکان «ئەبو جیهاد»یان کوشت. بەڵام تاران و دیمەشق زۆر جێی گومان بوون، لەوێ ئاسایشی زیاتر هەبوو، هەروەها لە بەیروت و تونسیش دژوارتر بوون. لە سەرێکی دیکەشەوە، «مایەر» بە کاریگەریی مەزنی سەرکەوتنی ئەو ئۆپەراسیۆنەی دەزانی ئەگەر هاتوو سەرکەوتوو بێ. ئاخر کوشتنی کوشندەترین سەرکردەی تیرۆرست لەنێو دیمەشقدا، واتای ئەوەی دەگەیاند، کە هیچ کەسێک ناتوانێ لەبەر باسکی درێژی مۆساد ڕابکا. مۆڵگە و حەشارگە قایمەکانی دوژمنەکانی ئیسرائیل شڵەژان و ترسیان تێدا بڵاودەبێتەوە و ئۆقرە و ئارامیش لەبەر سەرکردە تیرۆرستەکان هەڵدەگیرێ.

بەگوێرەی ڕۆژنامەی «ئیندیپێندتی» لەندەنی ئەو نەخشەیەی لە بنکەی سەرەکی مۆساد بۆ تاوتوێکردن خرایەڕوو، لەسەر بنەمای ئەگەری هاتنی «موغنیە» بوو، کە لە ١٢ی فێبرایری ٢٠٠٨دا بێتە دیمەشق. ئاخر لەو ڕۆژەشدا پێیوابوو ئەو لەوێ کاربەدەستە ئێرانی و سوورییەکان لە ئاهەنگی ساڵڕۆژی شۆڕشی ئێرانیدا دەبینێ.

دوای ئەوە لە ئەگەری ئەو هاتنەی کۆڵدرایەوە، بڕیاردرا ئۆپەراسیۆنەکە لەڕێی راگرتنی ترومبێلێکی ساختەوە بێ کە ڕاستەوخۆ لە تەنیشت ترومبێلەکەی موغنییەوە ڕابگیرێ.

ئیدی مۆساد کەوتبووە جموجۆڵێکی بەجۆش تا لە هەموو لایەکەوە زانیاری کۆبکاتەوە بە سەرچاوەکانی هەواڵگری بێگانەشەوە: تۆ بڵێی موغنیە بێتە دیمەشق؟ خۆ ئەگەر هات، تۆ بڵێی چ ناسنامەیەک بۆ خۆی هەڵدەبژێرێ؟ بەچ جۆرە ترومبێلێک دێ؟ لەکوێ دەمێنێتەوە؟ کێی لەگەڵدا دەبێ؟ لە چ کاتێکدا دەگات و نەخشەی کۆبوونەوەی لەگەڵ کاربەدەستە ئێرانی و سوورییەکان کەیە؟ تۆ بڵێی دەسەڵاتدارە سوورییەکان لە گەیشتنی ئاگادار بکرێنەوە؟ ئایا سەرکردەکانی حیزبوڵڵا زانیاریان دەربارەی هاتنەکەی هەیە؟

ڕاپۆرتی هەڵسەنگاندن، ئەگەری هەرە لەپێشی لەناوبردنەکە لەسەر سەرچاوە باوەڕپێکراو و دەرەقەتهاتووەکان ڕۆندرا بوو. ئەوە سەلمێندرا، کە پیاوەکە بە تەمایە سەردانی دیمەشق بکا. ئەو زانیارییەش بەگوێرەی ڕۆژنامەی «ئەلبەلەد»ی لوبنانی لە ئاژانێکەوە پشتڕاستکرابووەوە، کە ئامێرێکی گوێهەڵخەری لە ترومبێلەکانی موغنیە و سەرکردەکانی حیزبوڵڵا دانابوو.

ئیدی لەو خاڵەوە دەستەی «کاسارا» بە لێزانی و بە ئامادەکاری تەواوەوە کەوتە خۆ. بە ڕێگەی جیا و پێچاوپێچی شوێنبزرکەرەوە، چەندین تیمی کیدۆن گەیشتنە دیمەشق. تیمێکی تایبەتیش ماددەی تەقینەوەی ئاودیوی پایتەختی سوورییەکان کرد.

لە دوایین ساتدا، زانیاری چ نوێ و چارەنووساز لە لایەن هەواڵدزێکی مۆسادەوە گەیشت. بەگوێرەی ڕاپۆرتەکەی کابرا، هەر کاتێک «موغنیە» هاتبایە دیمەشق، ئەوا سەردانی یارەکەی دەکرد. بۆ یەکەمین جاریش، ئەو وەستا سووسەکارییەی مۆساد بەو پەیوەندییە ژێربەژێرە دڵدارییەی

موغنیە بزانێ. ئافرەتێکی شۆخوشەنگ، «ناهد حەیدەر» لە ئەپارتمانە نهێنییەکی ناو شاری دیمەشقەوە چاوەڕێی هاتنی موغنیەی دەکرد. لەپێشدا «ناهد»خان دەیزانی کەی موغنیە لە بەیروت یان لە تارانەوە دەگاتە دیمەشق. ئەویش لەوە ڕاهاتبوو هەر بەخۆی سەری لانەی دۆستە شۆخەکەی بدا، ئەو نە پاسەوان، نە شوفێریشی لەگەڵ خۆی نەدەبرد.

چەندین پەیامی زەنگی ئاگادارکردنەوەیان بۆ چاودێران لێدا، کەوا کابرا گەیشتە دیمەشق. بەڵام ئایا ئەم جارەیان «موغنیە» سەری کچە دۆستەکەی دەدا؟ ئایا ماخۆی ئەپارتمانەکە دەزانێ کە ئەو بەڕێوەیە؟

ئێوارەی پێش ڕۆژی ئۆپەراسیۆنەکە، ئەندامانی دەستەی دەستوەشێن گەیشتنە دیمەشق. ئەوان لە چەندین شاری جیاجیای ئەورووپاوە بەرەو دیمەشق فڕین. بەگوێرەی ڕۆژنامەی ئینديپێندتی بەریتانی، تیمەکە لە سێ ئاژان پێکهاتبوو: یەکیان بە کۆمپانیای ئاسمانی فەرەنسا لە پاریسەوە؛ دووەمیان لە «میلان»ەوە بە ئەلئیتالیا و سێهەمیشیان بە کورتە گەشتە فڕینێک بە فڕۆکەیەکی ئوردنی لە عەممانەوە گەیشتنە پایتەختی سووریا. ناسنامەی ساختەی هەر سێ کەسەکە نیشانی دەدا کەوا بزنسمانن، دووان لەوان هی کاروباری فرۆشتنی ترومبێل و سێیەمەکەشیان هی ئاژانێکی گەشتکردن. لەگەڵ گەیشتنیان ڕایانگەیاند کەوا بۆ بەسەربردنی کورتە پشووییێک هاتوونەتە سووریا. لەگەڵ دابەزینیشیان بە ئاسانی و بەبێ گرفت بەنێو پۆلیسی کۆچبەرانی فڕۆکەخانەی دیمەشق ڕەتبوون. ئەوان بە جودا چوونە نێو دیمەشق، هەر ئەو کاتەش خۆیان گەیاندەوە یەک، کە دڵنیابوون لەوەی هیچ چاوێکی سووسەکاریان لەسەر نییە. پاشان لەڕێی یارمەتیدانی کەسانی دیکەوە، کە لە بەیروتەوەڕا هاتبوون و

ترومبێلیان بۆ بەکرێگرتبوون و چاوەڕێیان دەکردن، هەر بۆ زانیاریش ترومبێلەکەی بارکراو بە ماددەی تەقینەوە پڕبوو لە کەلوپەلی پلاستیکی و وردە تۆپی ئاسنین.

هەر سێ پیاوەکەی دەستەی دەستوەشێن دەرگەی گەراجەکەیان لەسەر خۆیان داخست، لەوێ خەریکی ڕێکخستنی مادە تەقینەوەکان بوون و کردیانە نێو ترومبێلە بەکرێگیراوەکە. وەک دواتر چەندین ڕۆژنامە ڕایانگەیاند، قورمیشکردنی تەقینەوەکە لەنێو بۆنیتی پێشەوەی ترومبێلەکەی موغنیە دانەندرابوو، بەڵکو لە جێگەی ڕادیۆی ترومبێلە بەکرێگراوەکە داندرابوو.

تیمێکی دیکەی چاودێری مۆساد چاوەڕێیان دەکرد ئاخۆ کەی «موغنیە» لە بەیروتەوە دەگا. ڕۆڵی ئەوان سایەکردنی بوو، بە دواداچوونی ئەو بوو بۆ ئەو باڵەخانەیەی کە تێیدا دڵدارەکەی خۆی دەبینێ و ئاگادارکردنەوەی هاوڕێکانی خۆیان بوون لە بەڕێکەوتنی کابرا. ئەوان بە دوای موغنیەدا ڕۆیشتن و دڵنیابوون لەوەی گەیشتۆتە شوێنی دیدارەکە لە «کفر سوسە». لەنێو ئەو کەسانەی لەوێ دەیبینین، باڵوێزە نوێکەی ئێران لە دیمەشق و نهێنیترین پیاوی سووریا «محەمەد سولەیمان» بوو. «سولەیمان» لەنێو ئەوانی دیکەدا بەرپرسی گواستنەوەی چەکوچۆڵ بوو لە ئێران و سووریاوە بۆ دەستی حیزبوڵلا، ئەو خۆیشی پەیوەندییێکی توندوتۆڵی لەگەڵ «عیماد موغنیە»دا هەبوو. «سولەیمان» ئەو پیاوەی پەیوەندی بە پڕۆژەی نهێنی ناوەکی سووریاوە هەبوو، دوای ئەوە هەر تەنیا شەش مانگ ژیا؛ ئەویش لەمیانەی سازکردنی ئاهەنگەخوانێکی بۆ

دۆست و برادەرانی لە ماڵەکەی خۆی لە قەراغی دەریاوە لە ٢ی ئابدا کوژرا، (بڕوانە بەندی ١٨.)

هەر هەمان ئەنگۆرە، باڵیۆزخانەی ئێران ئاهەنگێکی بە بۆنەی ساڵڕۆژی شۆڕشەکەیان، لە مەڵبەندی کلتووری لە «کفر سوسە» ڕێکخستبوو، کە زۆر لە ماڵە پارێزراوەکەی موغنیە کە کاربەدەستە ئێرانی و سوورییەکانی دەدی، نزیک بوو. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو بڕیاریدا نەچێتە ئاهەنگەکە، تەنیا ویستی لەگەڵ هاوکارە ئێرانی و سووریەکان تاوتوێی شتەکان بکا و دیمەشق بەجێبێڵێ.

لە سپێدەی ١٢ی فێبرایەردا، تیمەکانی مۆساد لە شوێنەکەدا جێگیر بوون. چاودێریکارەکانیش لە دەوروبەری باڵەخانەکەدا، کە یەکەمین جێنزرگەی «موغنیە» بوو، جێگەی خۆیان گرت. لەدوای نیوەڕۆیەکی درەنگدا، ڕاپۆرتی خۆیان دا، کە «موغنیە» گەیشتۆتە ئەپارتمانەکەی «ناهد»خان و لە ئەنگۆرەشدا ڕاپۆرتیان بۆ سەرووی خۆیان بەرزکردەوە، کەوا کابرا بەڕێوەیە بچێتە دووەمین شوێنی مەبەستی خۆی. ئەوانیش خواخوایان بوو ئەمە دواین جێشوێنی بێ.

✡ ✡ ✡

«پاجیرۆکە» لە دیمەشق تێپەڕی و گەیشتە «کفر سوسە». چاودێریکەرەکان شوێنیان هەڵگرت، بەردەوام لەسەر جووڵەکانی هەواڵیان دەدا. ترومبێلە ساختەکە هێندرایە ئەو ناوچەیەی «موغنیە» ترومبێلەکەی خۆی لێڕادەگرت. کاراکردنی قورمیشکردنەکەی دەبووایە لە مەودایەکی دوور و لەڕێگەی ئامێرێکی ئەلکترۆنییەوە بوایە. ئەو ئاژانانەی

تڕومبێلەکەیان ساختەکردبوو، دەمێک بوو شوێنی خۆیان بەجێهێشتبوو، ئەوان بەرەو فڕۆکەخانە بەڕێوە بوون.

نیشانەی هەستیاری ئەلکترۆنیش بەدوای تڕومبێلە پاجیرۆ SUVیە ڕەنگ زیوینەکەوە بوو. نیشانەکە وەستا. دەستەی یارمەتیدەریش تڕومبێلە ساختەکەیان لە نزیک پاجیرۆ ڕەنگ زیوینەکە ڕاگرت.

کەمێک بەر لە سەعات دەی شەو، تەقینەوەیەکی بە هێزی هەورەبروسکە ئاسا گەڕەکی «کفر سوسە»ی ڕاچڵەکاند، شوێنەکەش زۆر لە قوتابخانەی ئێرانییەکان (ئەوکات چۆڵ بوو) و پارکی گشتییەوە دوور نەبوو. دەقاودەق لەو ساتەی «موغنیە» سواری تڕومبێلەکەی خۆی دەبێ، تڕومبێلەکەی تەنیشتی دەتەقێتەوە.

«موغنیە» مرد.

بە مردنی موغنیە حیزبوڵڵا تا سەر ئێسقان تووشی هێدمە بوو؛ ئەمەش زەبرێکی کوشندەبوو بەر حکوومەتی سووریا کەوت، ئاخر هەر چەند مانگێکی کەم بوو بەسەر خاپوورکردنی کوورە ناوەکییەکە تێپەڕیبوو.

شەش مانگ دوای مەرگی موغنیە، لە نۆڤێمبەری ٢٠٠٨دا، دەسەڵاتدارە لوبنانییەکان ڕایانگەیاند، سیخوڕێکیان دۆزیوەتەوە کە کاری بۆ مۆساد کردووە. یەکێک بەناوی «عەلی جەڕاح» کە تەمەنی پەنجا ساڵ بوو لە دۆڵی «بیقاع»دا گیرا، گوایە بیست ساڵی ڕابردوو کاری بۆ مۆساد کردووە و مانگانەش بڕی ٧٠٠٠ دۆلاری وەرگرتووە. ئەو تۆمەتبارکرا بەوەی بەردەوام بە کاری مۆساد سەری سووریای دەدا. لە فێبرایری ٢٠٠٨دا، یەک دوو ڕۆژ بەر لە ئۆپەراسیۆنەکە، ئەو چووبووە «کفر

سوسە»‌. دەزگەی ئاسایشی لوبنانی «جەڕاح»ی گرت و هەرچەندە بە شێوەیەکی زانایانەش شاردبوونیەوە بەڵام کامێرایەکی پێشکەوتوو، ڤیدیۆ کامێرا و گی پی ئێسیان لەنێو ترۆومبێلەکەیدا دۆزیەوە. «جەڕاح» لەبن لێکۆڵینەوەدا ڕووخا و دانیپێدا نا، کەوا سەوداکارە مۆسادەکانی ڕێنماییان دابووێ چاودێری بکا، وێنە بگرێ و زانیاری دەربارەی ئەو گەڕەکە کۆ بکاتەوە کە موغنیە سەردانی دەکرد، لەگەڵ ئەو لانە دڵدارییەی کە ژوانی لەگەڵ «ناهد»دا هەبوو.

ئیسرائیلیش حاشایی لە هەموو پەیوەندێک بە کوشتنەکەوە کرد، بەڵام قسەکەری حیزبوڵلا ئەو تۆمەتەی دووپات دەکردەوە کە "زایۆنیستە ئیسرائیلییەکان ئەو پاڵەوانەی جیهادیان کوشتووە، کە وەک شەهیدێک مردووە."

وتەبێژی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاش «سین ماک کۆرماک» ڕوانینێکی دیکەی هەبوو. ئەو «موغنیە»ی بە "بکوژێکی خوێنسارد، بە بکوژێکی بەکۆمەڵ و بە تیرۆرستێک وێناکرد، کە دەستی لە لەناوبردنی ژمارەیەکی زۆر لە مرۆڤدا هەبووە."

«ماک کۆرماک» گەیشتبووە ئەو ئاکامە، کە "ئێستا جیهان بەبێ ئەو باشتر بووە."

## بەندی بیست: کامێراکان پێبوون

لە بەرایی یانیوەری ٢٠١٠دا، دوو ترۆمبێلی ئاودی ڕەشی جۆری A-6 بەنێو دەرگەی قەڵائاسای باڵەخانەیەکی بۆرەی سەر گردێکی باکووری تەلئەبیبدا ڕەتبوون. باڵەخانەکە ناوی "کۆلیژەکە" بوو، خۆی هەر بە ڕاستی بنکەی سەرەکی مۆساد بوو. «مایەر داگان»ی ڕامساد پێشوازی لە «بنیامین ناتانیاهو»ی سەروەزیر کرد، کە لە ترۆمبێلی دووەمدا بوو. هەر کەمێک پێشتریش ناتانیاهو ساڵێکی دیکەی بۆ خزمەتگوزاری «داگان » درێژکردبووەوە.

«داگان» و سەرانی مۆساد دوای سەرکەوتنی دوایین ئۆپەراسیۆنەکانیان، هەستیان بە خۆشبینی و متمانە کرد: تێکوپێکدانی کوورەی ناوەکی سووریا، کوشتنی «موغنیە» و «سولەیمان». هەنووکەش ئەوەی پێویست بوو بیکەن، پچڕاندنی ئەو بەیەکگرێدانەی نێوان ئێران و تیرۆرستەکان و ئەڵقەی پەیوەندیەکە بوو کە ناوی «ئەلمەبحوح» بوو. بەگوێرەی «ڕۆنێن بێرگمان»، کۆدەناوی مۆساد بۆ لەنابردنی «ئەلمەبحوح» "شاشەی پلازاما" بوو.

لە ژووری هەواڵنامەکدا، «داگان» و یاریدەرە پلە باڵاکانی نەخشەی خۆیان بۆ کوشتنی «مەحمود عەبدولڕەئوف ئەلمەبحوح[249]»، سەرکردەی حەماس و چەقی بازنەی سیستمی بەقاچاخهێنانی چەک بوو لە ئێران بە

[249] محمود عبدالروف المبحوح (١٩٦٠-٢٠١٠) یەکێ لە فەرماندە هەرە دیارەکانی تیپەکانی عزالدین القسامی بزووتنەوەی حەماسی فەلەستینی بوو.

ڕێگەی سودان، میسر و نیمچەدوورگەی سیناوە بۆ کەرتی غەززە. هەروەک «داگان» گوتبووی، دەبوایە «ئەلمەبحوح» لە «دوبەی»، کە یەکێک لە میرنشینە یەکگرتووەکانی عەرەبی سەر کەنداوی فارسی بوو، بکوژرێ.

ناتانیاهوش لەناوبردنی "شاشەی پلازما"ی پەسەند کرد، ئیدی ڕاستەوخۆ دەست بە ئامادەکارییەکان کرا. نەخشەکە وابوو «ئەلمەبحوح» لە ژووری خۆی لە هوتێلەکەی لە «دوبەی»یدا بکوژرێ. سەندەی تایمزی لەندەنیش لە ڕاپۆرتەکەی خۆیدا نووسیبووی، ئەندامانی دەستەی دەستوەشێنی مۆساد بۆ مەشقکردن لەسەر کوشتنەکە، لە هوتێلێکی تەلئەبیبدا بەبێ ئەوەی سەرنجی بەڕێوەبەری هوتێلەکەش بدەن، دابەزین.

«مەحمود ئەلمەبحوح» کە بە «ئەبو عەبد»یش ناسراوبوو، لە ١٩٦٠دا لە ئۆردوگای ئاوارەکانی «جەبەلیا»، لە سەرووی کەرتی عەززە لەدایک ببوو. لە کۆتایی حەفتاکانیشدا، چووە ڕیزی ئیخوان موسلمین و بووە موسڵمانێکی بەجۆش. ئەوکات بەشداربوو لە وێرانکردنی قاوەخانەیەک کە قوماری تێدا دەکرا. لە ١٩٨٦یشدا، لە لایەن سوپای ئیسرائیلییەوە گیرا، چونکە کلاشنکۆفێکی لێگیرا، بەڵام دوای کەمتر لە ساڵێک بەردرا و ئینجا چووە ڕیزی تیپەکانی عیزەددین قەسام، باڵی سەربازی بزووتنەوەی حەماس.

«سەلاح شحادە» کە فەرماندەی «ئەلمەبحوح» بوو، ئەرکێکی تایبەتی بە ناوبراو و بە چەند تیرۆرستێکی دیکەی نێو حەماس سپاردبوو: ڕفاندن و کوشتنی سەربازە ئیسرائیلییەکان. لە ١٦ فێبرایری ١٩٨٩دا، «ئەلمەبحوح» و ئەندامەکانی دیکەی حەماس ترومبێلێکیان دزی، جلی جووە

ئەرسەدۆکسەکانیان لەبەرکردن و لە ڕێگەدا بۆ «ئاڤی ساسپۆرتاس» ڕاوەستان و هەڵیانگرت. «ساسپۆرتاس» سەربازێکی ئیسرائیلی بوو لە پشوو بوو، دەیەویست بەزوویی بگاتەوە ماڵ. کاتێک «ساسپۆرتاس» سواری ترومبێلەکەیان دەبێ، یەکسەر «ئەلمەبحوح» ڕووی بۆ وەردەگێڕێ و گوللەیەکی لەنێو چاوان دەدا. دوای ئەوەی «ئەلمەبحوح» و برادەرەکانی وێنەی خۆیان لەگەڵ تەرمی قوربانییەکەیان دەگرن، ئینجا دەینێژن. سێ مانگیش دوای کوشتنی «ساسپۆرتاس»، هەر هەمان «ئەلمەبحوح» و هەندێ لە ئەندامانی حەماس، سەربازێکی دیکە بەناوی «ئیلان سادۆن» لەسەر دووڕیانی «ڕێعم» دەگرن و دەیدەنە بەر ڕێژنەی گوللە و هەر لەوێ ساردی دەکەنەوە. پاشان لە چاوپێکەوتنێک لەگەڵ «ئەلجەزیرە»دا، «ئەلمەبحوح» دانی پێدادەنێ کە بەشداری لە کوشتنەکان کردووە و تەرمەکانیشیان ناشتوون.

دوای دووەمین کردەی کوشتن، «ئەلمەبحوح» بەرەو میسر هەڵدێ، لەوێشەوە بۆ ئوردن و ئینجا لەسەر کردەوە تیرۆرستیەکانی بەردەوام دەبێ، بەزۆریش چالاکییەکانی ئاودیوکردنی چەک و مادەی تەقەمەنی بووە بۆ غەززە. پاشان دەگەڕێتەوە قاهیرە، لەوێ میسرییەکان دەیگرن و بەشی زۆری ساڵی ۲۰۰۳ لە زیندانی میسرییەکان بەسەرد دەبا، پاشان هەڵدێ و خۆی دەگەیەنێتە سووریا. ئیدی بووە تیرۆرستێکی ترسناک و پۆلیسی ئیسرائیل، میسر و ئوردن بە دوایەوە بوون. ئەو لە لایەن بەرپرسەکانی بە ڕێکخەرێکی بەهرەمەند دەزاندرا و بە پلەکانی دەسەڵاتی قووچەکی حەماسدا سەرکەوت، تیشکۆی هەوڵ و تێکۆشانی خۆی زیاتر دەخستە سەر بە قاچاخ ئاودیوکردنی چەک لە ئێرانەوە بۆ کەرتی غەززە.

«ئەلمەبحوح» لەوە تێگەیشتبوو، بەهۆی کردەوەکانی لە لایەن مۆسادەوە داواکراوە؛ هەروەها دەیزانی کە ئیسرائیل لەسەر خوێنی ئەو دوو سەربازەی کوشتبوونی، لێیخۆش نابێ. بۆیە زۆر وریابوو، زوو زوو ناسنامەی خۆی دەگۆڕی، بۆ ڕاییکردنی کاروبارەکانی، وەک بزنسمانێک بەنێو شارەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دەهات و دەچوو. ئەو بە برادەرێکی گوتبوو، کاتێ لە هوتێلێک دەمێنێتەوە، دەرکەی ژوورەکەی خۆی بە مێز و کورسییەکان دەگرێ، "بۆئەوەی لەپڕ بەسەریدا نەدرێ".

لە چاوپێکەوتنێکی سەیریدا لەگەڵ تۆڕی هەواڵی «ئەلجەزیرە»دا، «ئەلمەبحوح» وەها لەسەر شاشەکە دەرکەوت، کە سەری بە پەڕۆیەکی ڕەش داپۆشرابوو. لە دیدارەکەدا گوتی: "ئەوان سێ جاران هەوڵیانداوە دەستم لێبوەشێنن. جارێکیان لە دوبەی، یەکێکی دیکەشیان کە هەر شەش مانگ پێشتر بوو لە لوبنان و سێهەمین جاریشیان بەر لە دوو مانگ پێش ئێستا لە سووریا دوای کوشتنی موغنیە بوو. ئەوەش ئەو باج و خەراجەیە لەبەرانبەر ئەو دژایەتییەی ئیسرائیلدا دەیدەی."

ڕاستیەکەی ئەوە بوو، «ئەلمەبحوح» بە نابەدڵی ئەو چاوپێکەوتنەی لەگەڵ کەناڵەکەدا کردبوو؛ ئاخر پێیوابوو حەوجەی[250] ئەو سەرکێشییە نەبوو، بەڵام ملکەچی فەرمانی سەرکردایەتی حەماس بوو. پاشان هەندێک هەبوون پێداگیربوون لەسەر ئەوەی، ئەو دیدارە ڕێی بۆ مۆساد خۆشکرد بیدۆزێتەوە. ئاخر «ئەلمەبحوح» قایلبوو لەبەردەم شاشەی کامێرادا دەربکەوێ، بەڵام بە یەک مەرج: ئەویش کە ڕووخساری بە تەواوی تاریک بکرێ. دوای تۆمارکردنی دیدارەکە، شریتی ڤیدیۆکە بۆ پشکنین نێردرایە

[250] حەوجە نەبوو: پێویست نەبوو.

غەززە. لەوێدا دەرچوو کە تاریککردنی ڕووخسارەکەی سەرکەوتوو نەبووە، بۆیە ڕایانسپارد جارێکی دیکە چاوپێکەوتنەکە بکاتەوە. پەخشکردنی دیدارە نوێکەش وەخرێندرا، هەر ئەو کاتەش پەخش کرا، کە کابرا کوژرابوو. «ئەلمەبحوحیش» پرسیاریکرد ئاخۆ چی بەسەر دیدارە تۆمارکراوەکەیدا هات، لە وەڵامدا پێیگوترا؛ کاسێتە ڤیدیۆکەی لەنێو ئەرشیفی حەماسدا هەڵگیراوە. هەندێکیش هەیە بڕوای وایە، هەر ئەو کاسێتە ڤیدیۆییە بوو گەیشتە دەستی ئاژانەکان کە هەڵوەدای دۆزینەوەی کابرا بوون.

چەند هەفتەیەکی کەم دوای تۆمارکردنی چاوپێکەوتنەکە، ئەندامێکی پلەباڵای حەماس زەنگێکی تەلەفۆنی لە عەرەبێکەوە بۆ هات، خۆی وەها نمایش کرد پەیوەندی بە گرووپێکەوە هەیە کە تایبەتمەندن بە بە قاچاغبردنی چەک و سپیکردنەوەی پارەوپوول. ئەو هەندێ داوای پڕمجێزی بۆ حەماسی تێنووی چەک خستەڕوو، کە نەیاندەتوانی ڕەتی بکەنەوە و ئینجا داوای دیتنی «ئەلمەبحوح»ی لە «دوبەی» کرد. شتەکەش سەیربوو، کە شوێنی دیدارەکە «دوبەی» بێ؛ ئاخر دوبەی ئەو شارە جەنجاڵە بوو کە هەر بەڕاستی «ئەلمەبحوح» هاوشانە ئێرانیەکانی تێدا دەبینی. لەوانەیە ئەو تەلەفۆنە تەلیسماویە زەنگی حوکمی مەرگی ئەو بووبێ.

✡ ✡ ✡

ئیدی ئەوکات قۆناغێکی چاوەڕواننەکراوی مێژووی شەڕی خەفیە[251] بوو: کردەی لەناوبردنی "شاشەی پلازما" وەک فیلم تۆمارکراو بۆ هەمیشە لەنێو کامێرای بازنەی داخراوی ئاسایشپارێزیدا هەڵگیرا، هەمووشی لەبارەی دوبەیەوە بوو، هەر لەڕێی فرۆکەخانەکەوە تا دەگاتە هۆڵی پێشوازی هوتێلەکە، ڕاڕەوەکان و ئەسانسێرەکانی.

ئەو کاسێتە تۆمارکراوانەش بەڵگەی بێوێنەی ئەو ئۆپەراسیۆنە نەپچڕاوە و قۆناغە بەدواداهاتوەکانین: ئەو ڕێکارانە ڕێگەیان بە سەدان ملیۆن تەماشاچی سەر ئەم ڕوی زەویەدا، بە پاڵکەوتوویی لەسەر کورسی و ئەسکەملەکانیان و سەیری ئۆپەراسیۆنە نهێنی و کوشندەکەی دەستەی دەستوەشێن بکەن.

- ❖ دووشەممە، ١٨ینایری ٢٠١٠.

چەندین ئاژانی مۆساد لە دوبەی دابەزین. ئەوان پێشەنگی تیمێکی گەورەی بیست و حەفت کەسی بوون، کە لە ماوەی بیست و چوار سەعاتی داهاتوودا خۆیان دەگەیاندە دوبەی. دوازدە کەس لەوان بە پاسپۆرتی بەریتانی، چواریان ئوسترالی، یەکیان ئاڵمانی و شەش کەسی دیکەشیان ئێرلەندی.

ئەو ئاژانانە لە هوتێلە جیاجیاکانی شارەکە دابەزین.

- ❖ سێشەمە، ١٩ی ینایری ٢٠١٠.

---

[251] خەفیە: سیخوڕ.

- 12:09ی نیوەڕۆ/ دوو ئاژانی سەرڕووتاوەی تەمەن چل و سێ، چل و چوار بوون، «میخائیل بۆدنهایمەر» بە پاسپۆرتی ئاڵمانی و برادەرەکەی بەناوی «جێمس لیۆنارد» بە پاسپۆرتی بەریتانی لە فڕۆکەخانەی دوبەی دابەزین. بەگوێرەی زانیاری پۆلیسی خۆجێی، هەردوو پیاوەکە دەستەی پێشوەختەی ئەو گرووپە بوون کە بۆ کوشتنی «ئەلمبەحوح» هاتبون.

- 12:30ی نیوەڕۆ/ فەرماندەی ئۆپەراسیۆنەکە «کێڤن داڤێرن» پیاوێکی وەرزشوان و ڕدێن تەمشوولە[252]ی عەینەکلەچاو، ڕاستەوخۆ لە پاریسەوە گەیشتە دوبەی. جێگرەکەی خۆی بە ناوی «گایل فۆلیارد» کە خانمێکی ڕووگەش و سەرنجڕاکێشی قژسوور بوو، یاوەری بوو. هەردووکیان بە پاسپۆرتی ئێرلەندیەوە هاتبوون.

- 01:21ی دوای نیوەڕۆ/ «گایل فۆلیارد» لە هوتێلە گرانبەهاکەی «جمرية» و لە ژورێکی نهۆمی یازدەهەم دابەزی. کاتێکیش کارمەندەکەی پێشوازی ناوونیشانی خۆی لێپرسی، بێ سێودووکردن گوتی: مێمەیر ڕۆد ٧٨، دوبلن، ئیرلەند. دواتر دەرکەوت ناوونیشانەکە هەر بوونی نەبوو.

- 01:31ی دوای نیوەڕۆ/ «کێڤ داڤەرن»ی فەرماندەی ئۆپەراسیۆنەکە، خۆی گەیاندە جێگرەکەی و لە هەمان هوتێلی «جمرة» ژووری ٣٣٠٨ی بەکرێ گرت.

---

[252] ڕدێن تەمشوولە: ڕدێنی سەکسوکی.

- 02:29ی دوای نیوەڕۆ/ لە فرۆکەخانەکە «پیتەر ئێلیڤینگەر» ئەندامێکی دیکەی تیمەکە بەیەکەوە گەیشتنە شارەکە.

- 10:15ی بەیانی/ «مەحموود ئەلمەبحوح» بە گەشتەفڕینێکی ئیماراتی لە دیمەشقەوە بەرەو دوبەی بەڕێکەوت. لە دوبەیش وا چاوەڕواندەکرا چاوی بە ئێرانییەکان بکەوێ تا باری کەشتییێکی دیکەی پڕچەک بە قاچاغ بگەیەنێتە غەززە.

- 10:30ی بەیانی/ ڕێکخەری ئۆپەراسیۆنەکە «پیتەر» لە هوتێلەکەی هاتەدەر و لە ناوجەرگەی بازاڕە گەورەکە چاوی بە دەستەی دەستوەشێن کەوت.

- 10:50ی بەیانی/ «کێڤن» و «گایل»، فەرماندە و جێگرەکەی خۆیان گەیاندە کۆبونەوەکە. «کێڤن» عەینەکی لەچاودا نەبوو، کورتەسمێڵەکەشی نەمابوو.

- 12:18ی نیوەڕۆ/ کۆبوونەوەکەیان تەواو بوو، دەستەکە بڵاوەیان لێکرد. «کێڤن» گەڕایەوە هوتێلەکەی «جمرة» و پارەی خۆی داو لەوێ دەرچوو. کامێرای ئاسایش نیشانیدا، کە ئەو خۆی بە هوتێلێکی دیکەدا کرد، لەوێ بارۆکەیەکی لەسەرنا، عەینەکی لەچاوکردن و سمێڵێکی ساختەشی دانا.

- 02:12ی دوای نیوەڕۆ/ دوو ئاژان بە جلی یاری تێنسەوە خۆیان بە هوتێلە گرانبەها و نایابەکەی «ئەلبوستان ڕۆتانا»دا کرد. ئەوان چاودێربوون، چاوەڕێی «ئەلمەبحوح»یان دەکرد، قەول وابوو لە سەعاتی داهاتوودا بگاتە ئەوێ.

- 03:12ی دوای نیوەڕۆ/ «گایل»یش هوتێلی «جمرة»ی بەجێهێشت. بۆ ئەو شەوەی لەوێی بەسەر برد، بڕی ٤٠٠ دۆلاری دا.

- 03:15ی دوای نیوەڕۆ/ «مەحموود ئەلمەبحوح» لە فڕۆکەخانەی دوبەی دابەزی. لە لای پۆلیسی کۆچبەرانی فڕۆکەخانەکە، پاسپۆرتێکی ساختەی عێراقی نیشاندان و واشی ڕاگەیاند کە کاروباری هێنان و ناردنی کوتاڵ دەکا.

- 03:25ی دوای نیوەڕۆ/ «گایل» چووە هوتێلێکی دیکە، لەوێ خانمەکە جلەکانی خۆی گۆڕی، دەموچاوی خۆی میکەپ کرد و بارۆکەیەکیشی لەسەر نا.

- 03:28ی دوای نیوەڕۆ/ «ئەلمەبحوح» گەیشتە هوتێلی «ئەلبوستان ڕۆتانا». لەوێ ناوی خۆی تۆمارکرد. داوای ژوورێکی کرد کە پەنجەرەکانی داخرا بن و بێ چارپایەش بێ. ژووری ژمارە ٢٣٠یان لەنهۆمی دووەم دایێ. ئەویش بە ئەسانسێر چووە نهۆمی دووەم، بێئاگا لەوەی دوو چاودێری مۆساد بەجلی یاریکەری تێنسەوە، لەگەڵ ئەودا لەهەمان ئەسانسۆر سوار بوونە.

- 03:30ی دوای نیوەڕۆ/ چاودێرەکان ڕاپۆرتی خۆیان لەڕێی نێرەرە تایبەتیەکەیان دا، بەوەی «ئەلمەبحوح» گەیشتە ژوورەکەی خۆی، کە ژوورەکەش ڕاستەوخۆ ڕووی لە ژووری ژمارە ٢٣٧ بوو.

- 03:53ی دوای نیوەڕۆ/ «پیتەر» ڕێکخەری ئۆپەراسیۆنەکە گەیشتە هوتێلەکەی «ئەلمەبحوح» و چووە مەڵبەندی بزنس. لەوێ زەنگی بۆ کارمەندی پێشوازی هوتێلەکە لێدا و ژوری ٢٣٧ی داواکرد و گرت.

- 04:03ی ئێوارە/ چاودێرە نوێکان جێگەی ئەوانەی پێش خۆیان گرتەوە و چاوەڕێیان کرد ئاخۆ کەی «ئەلمەبحوح» لە ژوورەکەی دەردەچێ.

- 04:14ی ئێوارە/ هەموو ئەندامانی دەستەی دەستوەشێن گەیشتنە هوتێلی «ئەلبوستان ڕۆتانا».

- 04:23ی ئێوارە/ «ئەلمەبحوح» لە ژوورەکەی هاتەدەر، چاوێکی بە هۆڵی پێشوازیدا گێڕا تا لە بێ پەرێزی دڵنیابێ، ئینجا لە هوتێلەکە هاتەدەر. چاودێرەکان سایەیان کرد.

- 04:24ی ئێوارە/ چاودێرەکان لەڕێی نێرەرەکەیان وردەکاریان سەبارەت بەو ترومبێلەی «ئەلمەبحوح» سواری بوو بۆ ناوشار، پێڕاگەیاند.

- 04:27ی ئێوارە/ «پیتەر»ی ڕێکخەر هاتە نێو هۆڵی پێشوازی هوتێلەکە و جانتاکەی دایە دەست «کێڤن داڤیرن»، پێدەچوو کەلوپەلی پێویست بۆ کوشتنی « ئەلمەبحوح»ی تێدا بێ.

- 04:33ی ئێوارە/ «پیتەر» چووە لای مێزی پێشوازی، ناوی خۆی تۆمارکرد و کلیلی ژووری ٢٣٧ی وەرگرت کە بەرانبەری ژووری «ئەلمەبحوح» بوو.

- 04:40ی ئێوارە/ «پیتەر» کلیلەکەی دایە دەسی «کێڤن» خۆیشی بۆ شوێنێکی نادیار ڕۆیشت.

- 04:44ی ئێوارە/ «کیڤن» چووە ژووری ٢٣٧. سەیری پەنجەرە و کونی دەرکەی کرد، بە جۆرێک بتوانێ چاودێری «ئەلمەبحوح» بکا، کە دێتەوە و دەچێتە ژوورەکەی خۆی.

- 05:06ی ئێوارە/ «گایل» چووە ژووری ٢٣٧. ئیدی خانمەکە و «کێڤن» دانیشتن و چاودێربوون و بەردەوام ڕاپۆرتیان لەسەر جووڵەی «ئەلمەبحوح» لەنێو بازاڕ بۆ دەهات.

- 05:36ی ئێوارە/ یەکێک لە چاودێرەکان بە خۆی و شەپقەی سەری هاتە نێو هوتێلەکە. لە سووچێکی بەتاڵی هوتێلەکەیدا شەپقەکەی داکەند و بارۆکەیەکی لەسەر نا.

- 06:21ی ئەنگۆرە/ «گایل» ژوورەکەی ژمارە ٢٣٧ی بەجێهێشت، جانتایەکی لە دەست بوو کە پێشتر «پیتەر» دابوویە «کێڤن». ئینجا خانمەکە چووە پارکی هوتێلەکە و جانتاکەی ڕادەستی ئەندامێکی دیکەی تیمەکە کرد.

- 06:23ی ئەنگۆرە/ بۆ یەکەمین کەسی دەستەی دەستوەشێن شوێنی پارکەکەیان بەجێهێشت و هاتنە نێو هۆڵی چاوەڕوانی هوتێلەکە.

- 06:34ی ئەنگۆرە/ دووەمین کەسی دەستەی دەستوەشێن هاتە نێو هوتێلەکە و لە گۆشەیەکی دووری هۆڵە پێشوازییە نایابەکە دانیشت، تا پێیکرا لە کەسی یەکەمەوە دووربوو.

- 06:43ی ئەنگۆرە/ یەکەمین ئەندامی چاودێری، ئەوەی جلی وەرزشوانی تێنسی لەبەردابوو، هوتێلەکەی بەجێهێشت.

- 07:30ی ئەنگۆرە/ «پیتەر» ڕێکخەرە لۆجستیکەکە، بە گەشتەفڕینێک لە دوبەیەوە بەرەو میونیخ/ ئاڵمان فڕی.

- 08:00ی شەو/ کارمەندانی خاوێنکردنەوە، لە نهۆمی دووەمی هوتێلەکە هاتنەخوار. جووتەی دەستوەشێن هەوڵیاندا بچنە ژوورەکەی «ئەلمەبحوح».

- 08:04ی شەو/ «کێڤن» کە لە لای ئەسانسێرەکەوە بوو، ئاماژەی بۆ دەستەی دەستوەشێنەکە کرد، بچنە نێو ژوورەکە، چونکە ئەسانسێرەکە لە نهۆمی دووەم دەوەستێ و میوانانی هوتێلەکە لێیدادەبەزن. کۆنترۆلی سیستمی ئەلەکترۆنی هەوڵی دزەکردنی ژووری ٢٣٠، هۆدەکەی «ئەلمەبحوح»ی تۆمارکردبوو.

- 08:20ی شەو/ «ئەلمەبحوح» گەڕایەوە هوتێلەکە. چاودێرەکان ئاگاداری «پیتەر»یان کردەوە، کە کابرا بەرەو ئەسانسێرەکە دەڕوا.

- 08:27ی شەو/ «ئەلمەبحوح» گەیشتەوە ژوورەکەی خۆی. «کێڤن» و «گایل» لە ڕاڕەوی نهۆمی دووەمدا، لە لای ئەسانسێرەکە پاسەوان بوون. لە ژووری ژمارە ٢٣٠دا، کردەی کوشتنەکە بەڕێوەچوو.

- 08:46ی شەو/ چوار ئەندامی دەستەی دەستوەشێن، هوتێلەکەیان جێهێشت.

- 08:47ی شەو/ «گایل» و ئەندامێکی دیکەی دەستەی دەستوەشێنیش هوتێلەکەی جێهێشت.

- 08:51ی شەو/ «کیڤن» دوای کوشتنی «ئەلمەبحوح» چووە ژوور و تابلۆیەکی لە دەسکی دەرکەکەوە کرد، نووسرابوو: *تکایە هەراسانم مەکەن.*

- 08:52ی شەو/ دەستەی چاودێری هوتێلەکەیان جێهێشت.

- 10:30ی شەو/ «کیڤن» و «گایل» بە گەشتەفڕینێکی ڕاستەوخۆ بۆ پاریس، دوبەیان بەجێهێشت. دیاربوو هەر لەهەمان کاتدا تەواوی ئەندامانی تیمەکە، «دوبەی»ەیان بەرەو ئامانجی جیاجیا بەجێهێشت.

✡ ✡ ✡

لە سەعات 10:10ی شەوەوە ژنەکەی «ئەلمەبحوح» زەنگی بۆ مێردەکەی لێدا. تەلەفۆنەکەی هەر لێیدەدا دواتر چووە سەر ئامێری خۆوەڵامدەرەوە. ئەو دیسان و دیسان بێهوودە زەنگی لێدایەوە. برادەرێکی نزیکی ئەلمەبحوحیش هەوڵیدا پەیوەندی پێوە بکا، بەڵام بێ ئەنجام بوو. پەیام بۆ تەلەفۆنەکەی نێردران، ئەوانیش هەر بێ وەڵام بوون. کات تێدەپەڕی و هیچ ئاماژەیەکیش لە ئەلمەبحوحەوە نەبوو. ئیدی هاوسەرەکەی بە دڵەڕاوکێوە تەلەفۆنی بۆ کاربەدەستە پلەباڵاکانی حەماس

کرد، ئەوانیش بڕیاریاندا حەماسێکی دانیشتووی دوبەی بنێرنە هوتێلی «ئەلبوستان ڕۆتانا». پیاوەکەش گەیشتە لای مێزی پێشوازی هوتێلەکە و زەنگی بۆ ژووری ۲۳۰ لێدا؛ لەوێش هەر بێ وەڵام بوو.

دوای نیوەی شەو و لەکۆتاییدا کارمەندانی هوتێلەکە چوونە ژوورەکەی ئەلمەبحوح و دەرگەکەیان کردەوە، بەڵام چی ببینن، بەسەر تەرمەکەیدا کەوتن. هەر خێراش پزیشک چوو، تەرمەکەی پشکنی و گەیشتە ئەو بەرەنجامە کە مردنەکە بەهۆی وەستانی لێدانی دڵەوە بووە.

✡ ✡ ✡

حەماس لێدوانێکی فەرمیی خۆی سەبارەت بە مەرگی ئەلمەبحوح وەها ڕاگەیاند، کە بە هۆیەکی پزیشکیەوە بووە. بەڵام خێزانەکەی ئەوەیان ڕەتکردەوە، سووربون لەسەر ئەوەی، مۆساد ئەلمەبحوحی کوشتووە. تەرمەکەی بۆ توێکاری پزیشکی نێردرا، لەکاتێکدا نموونەیەکیش لە خوێنی بۆ تاقیگەیەک لە فەرەنساوە ڕۆیشت. ڕاپۆرتی تاقیگەکە پاش نۆ ڕۆژان هاتەوە. ئیدی حەماس رایگەیاند، مۆساد ئەلمەبحوحیان کوشتووە، سەرەتا بە ئامێرێکی ئەلکترۆنی لێیانداوە ئینجا بالیفێکیان لەسەر دەم داناوە و خنکاندوویانە. لەهەمان کاتیشدا پۆلیسی دوبەی ڕایگەیاند هیچ شوێنەوارێکی ژەهراویبوون لە خوێنی مردووەکەدا نەدۆزراوەتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، گەیشتنە ئەو ئەنجامە، کە مۆساد ئەلمەبحوحیان لەسەر خاکی ئەوان کوشتووە. لە ۳۱ی ینایریش، واتە دوازدە ڕۆژ دوای مەرگی کابرا،

«سەندەی تایمز»ی لەندەنی شتێکی سەبارەت بە ژەهراوییبوونی ئەلمەبحوح لە لایەن مۆسادەوە بڵاوکردەوە. ڕاپۆرتوانان گوتیان، گوایە دەستەی دەستوەشێن چوونەتە ژووری ئەلمەبحوح و دەرزییێکی ژاراویان لێداوە کە بووەتە مایەی هورژمهێنانی لێدانی دڵ؛ ئینجا ئاژانەکان وێنەی هەموو ئەو بەڵگەنامانەیان گرت کە کابرا لەگەڵ خۆی هەڵیگرتبوون، ئەوسا لە ژوورەکە چوونەتەدەر و لەگەڵ دەستی خۆشیان ئەو تابلۆیەی لێنووسرابوو *تکایە هەراسانم مەکە*، بە دیوی دەرەوەی دەرکەیان وەکردبوو.

لە ٢٨ی فبرایردا، جێگری سەرۆکی پۆلیسی دوبەی بە ڕۆژنامەوانانی گوت، کە تاقیگەی فەرەنسی لەنێو خوێنی ئەلمەبحوحدا ماددەیەکی هایدرۆکلۆرایدی ئازارشکێنیان دۆزیوەتەوە، ماددەکەش بۆ بەنجکردنی پێش نەشتەرگەری بەکاردێ. وەک جێگری بەرپرسی پۆلیسەکە گوتی، ماددەکە ماسوولکەکان خاودەکاتەوە و دواتریش وا لەکەسەکە دەکا لە هۆش خۆی بچێ. ئەو ڕای وابوو، پەلاماردەرەکان دەرزییێکی ماددەی سڕکەریان لە قوربانییەکە دابێ، پاشان خنکاندوویانە، تا وەها دەربکەوێ بەشێوەیەکی سروشتی گیانی لەدەستداوە.

«گۆردۆن تۆماس»ی ڕۆژنامەوانیش وتارێکی لە ڕۆژنامەی تێلێگرافی لەندەنی سەبارەت بە "بڕوانامەی مۆساد بۆ کوشتن" بڵاوکردبووەوە. تێیدا «تۆماس» پێداگربوو لەسەر ئەوەی، شێوازی کارەکەی مەرگی ئەلمەبحوح هاوشێوەی کردەی کوشتنەکانی دیکەی پێشووی مۆساد بوو. ئەو ئەوەشی خستبووەسەر، کە یازدە ئەندامەکەی دەستەی دەستوەشێن، شەشیان ئافرەت بوون، لەنێو چل و هەشت ئەندامی یەکەی ئۆپەراسیۆنی

کیدۆندا گوڵبژێرکراون. «یۆسی مێلمان»یش لە ڕۆژنامەی «حائاریتز»ەوە جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە، کە جووڵەی بکوژەکان لە کامێراکانی ئاسایش و ئەوانی دیکەدا دەرکەوتووە، هاوچەشنە لەگەڵ ئۆپەراسیۆنەکانی پێشوتری مۆساد: گەیشتن بە گەشتەفڕینی جیاجیا و لە بەشە جیاوازەکانی جیهان، مانەوە لە هوتێلی جیاجیادا، تەلەفۆنکردن لە ڕێی دەزگەی نێودەوڵەتی، ئەو جلانەی کە ناسینەوەیان سەخت دەکا، لەگەڵ خۆنمایشکردنێک کە بە گەشتیاری ڕاستەقینە بچن و هەوڵیانداوە بزنس لەگەڵ خۆشی و ڕابواردن تێکەڵ بکەن. بەڵام شارەزایانی دیکە، ئەو تیۆریەیان بەلاوە ناوە، ئەوان دەڵێن، دەق ئەو شێوازە بووە، کە لە لایەن زۆرترین ئاژانسی هەواڵگری ڕۆژئاوایەوە بەکارهێندراوە، بۆیە ئەستەمە ڕوون و ئاشکرا بزاندرێ، کێ بە کردەی کوشتنەکە هەڵساوە.

هەفتەنامەی «دیرشبیگلی» ئاڵمانیش پەردەی لەسەر ئاشکرانامەکەی BND دەزگەی هەواڵگری ئاڵمانی هەڵدایەوە، کە ڕاپۆرتی داوەتە ئەندامانی پەرلەمانی ئاڵمان، بەوەی ئەلمەبحوح بە دەستی ئاژانەکانی مۆساد کوژراوە. هەر دیرشبیگلیش کردەوەکە وها وەسف دەکا، کە «میخائیل بۆدنهایمەر»ی لەدایکبووی ئیسرائیل، لە ٢٠٠٩ەوە داوای پاسپۆرتی ئاڵمانی کردبوو، چونکە دایبابی لە ئاڵمان لەدایک بوون. ئیدی بە پاسپۆرتە نوێکەی ٨ی نۆڤێمبەری ٢٠٠٩ لە فرانکفۆرتەوە بەرەو دوبەی فڕیبوو، لەوێشەوە بۆ هۆنگ کۆنگ، بۆئەوەی ببێتە بەڵگەنامەیەکی ناسنامەی پێش و پاش کردەی کوشتنەکە. هەر بەگوێرەی زانیاری «دیرشبیگل»ەوە، نۆ ئاژانەکەی دیکە لەهەمان ڕۆژ لە نۆڤێمبەری ٢٠٠٩دا لە فڕۆکەخانەی جیاجیای ئەورووپاوە بەرەو دوبەی فڕیبوون. دیاربوو

ئەمەش مەشقکردنێک بوو بۆ ئۆپەراسیۆنێکی ڕاستەقینە، کە لە ینایری ٢٠١٠دا کرا.

لە چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەی «العربية»دا، بەرپرسی پۆلیسی دوبەی «ضاحی خلفان تميم» ڕوونیکردەوە ئاخۆ بۆچی دڵنیایە لەوەی، مۆساد ئەلمەبحوحی کوشتووە: "یەکەم؛ ئێمە نموونەیەکی DNA و جێپەنجەمۆرمان دەستکەوتووە. دووەمیش؛ هەموو ئەندامانی دەستەی دەستوەشێن پاسپۆرتی ڕاستەقینەیان پێبووە کە وردەکارییەکانی ساختە بووە، کاتێکش دەرکەوتووە هەندێ لە خاوەنەکانیان {ماخۆی پاسپۆرتەکان} ئیسرائیلین، کەواتە بیر لە چی دەکەیتەوە، ئەوان واتە خاوەنی ڕاستەقینەی پاسپۆرتەکان مەبحوحیان کوشتبێ؟ ... ئەوە مۆساد بووە بەو کارە هەڵساوە، سەد لەسەدا!"

ئیدی هەر زوو بەرپرسی پۆلیسی دووبەی بووە ئەستێرەی میدیا، بە چەندین سەعات لە بەردەم کامێرای تەلەفزیۆنییە جیهانییەکان دادەنیشت، دیداری لەگەڵ هەرکەسێک سازدەدا کە گوێی بۆ گرتبا. ئەوە ببووە خۆشەویستەکەی هەواڵنێرانی تەلەفزیۆنەکان، بەزۆریش لە سایەی سەری کامێرای ئاسایشپارێزی دوبەیەوە بوو. ئەو فیلمی ڤیدیۆیی نیشانی ڕۆژنامەوانان دەدا، ڕاستیەکەش ئەوەبوو لە کۆی کاسێتەکانی کامێرای چاودێری ئاسایشپارێزیەوە کە بەنێو دوبەیدا بڵاوببوونەوە، کۆکردبوونەوە. «تەمیم» بە زیرەکی ڕوونکردنەوەی دەدا، نیشانی دەدا چۆن ئەندامانی دەستەی دەستوەشێن بەنێو میرنشینەکەدا دەهاتن و دەچوون، چۆن چوونەتە نێو هوتێلەکان و لێیەوە دەردەچوون، دەچوونە بازاڕ و دووکانەکان، چۆن دەچوونە نێو فڕۆکەخانەکە، هەمووی لە

پێناوی سایەکردنی ئەلمەبحوح بوو، کە زۆرجار جلەکانیان دەگۆڕی و خۆیان وەک کەسێکی دیکە نمایش دەکرد.

بەگوێرەی قسەکانی «تەمیم» دەستاڕی دەستەی دەستوەشێن بە یازدە ئەندامیان سووڕا: سێ هاوولاتی ئێرلەندی، شەش بەریتانی، یەک فەرەنسی و یەکیش ئالمانی. ئەوان لە دەرەوەڕا و بە گەشتە فڕینی جیاجیای فڕۆکەخانەکانی ئەورووپاوە گەیشتبوونە دوبەی، هەندێکیان شەوی بەر لە ئۆپەراسیۆنەکە گەیشتن، ئەوانی دیکەش هاوزەمان لەگەڵ گەیشتنی «ئەلمەبحوح»، یەک دووێکیشیان هەر بە چەند سەعاتێکی کەم بەر لە ئۆپەراسیۆنەکە هاتبوون. ٦٤٠ سەعاتی فیلمی گیراوی کامێرای ئاسایشپارێز، یارمەتی پۆلیسی دوبەی دا وردەکاری مەرگی ئەلمەبحوح هەر لە هاتنەناوەوەیان تا گەیشتە تۆپکە و کوشتنی تۆمارکرابوو.

لە لایەن کاربەدەستانی دەزگەی کۆچبەرانەوە هی وێنەی ئەوانەی هەموو وەک ڕێبوار هاتبنە نێو دوبەی یان لێیوە دەرچووبن گیراوە، ئەمەش بووە مایەی ئەو ئاکامەی بەرپرسی پۆلیس بڵێ، نەوەک هەر یازدە کەس، بەڵکو ژمارەیەکی زیاتری ئاژانەکانی مۆساد بەشداری ئۆپەراسیۆنەکە ببوون. ئەو ژمارە فەرمییەی ئەو ناوی برد، بیست و حەوت کەس بوون، بەڵام دواتر «تەمیم» چەند ناوێکی دیکەشی خستەسەر لیستی گومانلێکراوان.

هێشتاش بە ئەنجامگەیشتنی ئەوە، چەندین پرسی وروژاندن: ئایا مۆساد نەیدەزانی کامێراکانی ئاسایشپارێزی بە هەموو شوێنێکی دوبەیدا بڵاوبوونەتەوە؟ بەگوێرەی قسەکانی «تەمیم» بێ، ئاژانەکانی ئیسرائیل چەندین جار سەردانی دوبەیان کردووە، تا ئامادەکاری ئۆپەراسیۆنەکە بکەن. ئایا ئەوان کامێراکانی ئاسایشپارێزیان نەبینیوە؟ خۆ ئەگەر

زانیبێتیان، ئەوا لەوانەیە هاتن و چوونیان، لە هوتێل دەرچوون و هاتنەوەیان، گۆڕینی جلوبەرگ و باڕۆکەی سەر و سمێڵەکان، هیچ نەبووە مەگەر هەر نمایشێک بێ لە بەرانبەر کامێراکان؛ خۆ ژمارەیەکیش لەوان هەر بەشداری ئۆپەراسیۆنەکەیان نەکردبوو، تەنها بۆ لەخشتەبردن وایان کردبوو، بۆ ئەوانەی دواتر کاسێتی ڤیدیۆیەکان لێدەدەنەوە.

بە دیوێکی دیکەشدا: بەرپرسی پۆلیس فشەی ئەوەی دەکرد؛ گوایە سەرجەم ئەندامانی دەستەی دەستوەشێن کاتێ بە بەردەم پۆلیسی کۆچبەرانی نێو فڕۆکەخانەدا چوونە، وێنەیان گیراوە. بەڵام ئاخۆ مۆساد نەیدەزانی کە پێواژۆیەکی وەها لە دوبەی هەیە؟ ئایا ئەوان لەوە دڵنیا نەبوونە، بەم جۆرە ڕووخساری ئاژانەکانیان دەزاندرێ و دەمامکیان لەسەر لادەچێ و دەکرێ دواتر بناسرێنەوە؟

سێیەمین پرسیاریش: باشە چۆن کامێراکانی ئاسایشپارێزی هەموو جووڵە و شێوەی ئاژانە نهێنییەکانیان لە هەموو چرکەیەکدا گرتووە، تەنیا هی دوو کەس نەبێ، چ لە کاتی چوونەژوور یان هاتنەدەرەوە لە ژووری «ئەلمەبحوح»؟

«تەمیم»ی سەرۆکی پۆلیس ئەوەشی ئاشکرا کرد، گوایە ئەندامانی دەستەی دەستوەشێن ژمارە تەلەفۆنێکیان لە نەمسا بۆ پەیوەندییەکانی خۆیان بەکارهێناوە؛ بە بەدواداچوون بۆ تەلەفۆنە تۆمارکراوەکان، «تەمیم» دەیتوانی ناسنامەی بیانییەکان کە ژمارەکەیان بەکارهێناوە دیاربکا، پێدەچی ئەندامی مۆساد بن. هەروەها ئاماژەش بۆ ئەوە دەکا کە چەندین ئاژان لە ڕێگەی پێیۆنییر- ماستەرکارت و کریدیت کارتی

کۆمپانیای «ئیۆنا»وە سەر بە ئیسرائیلەوەیە، تێچوونی خەرجییەکانی خۆیان داوە.

ئەوەی لەو ئۆپەراسیۆنەدا وەک ئاشکرا کرا، سەرنجڕاکێشترین شت ئەوەبوو، کە زۆرینەی ئەندامانی دەستەی دەستوەشێن بە پاسپۆرتی ڕاسەقینەی هاووڵاتی ئیسرائیلی لەگەڵ دوو ڕەگەزنامەیی هاتوچۆیان کردوە، تەنها کەمێکیان نەبێ کە بە پاسپۆرتی ساختەکراوەوە هاتوچۆیان کردووە. پێدەچوو ئەمەش هەر بێ هۆ نەبووە. ئاخر دەستەی دەستوەشێن لە وڵاتێکی عەرەبی دەستبەکاربوون کە بە خاکی دوژمن دادەندرێ، بۆیە ئەگەر هاتوو ئەندامانی تیمەکە گیران، دەکرێ داوای پارێزگاری لە کونسولەکانی بەریتانیای مەزن، ئاڵمان، فەرەنسە و ئوستralیا بکەن ... خۆ ئەگەر کونسولەکانیش بەنێو کۆمپیوتەرەکانی خۆیاندا بگەڕێن، ئەوا دەزانن هەر بەڕاستی ئەو کەسانە هەن، ئیدی قایل دەبن پشتگیریان بکەن. خۆ ئەگەر پێچەوانەش بێتەوە، دەستەی دەستوەشێن پاسپۆرتی ساختە بەکاربێنێ، ئەوا هەر دەستبەجێ لەخشتەبردنەکە دەردەکەوێ و ئاژانەکان بەبێ چەتری پارێزگاری دەمێننەوە.

✡ ✡ ✡

دوای ئاشکرابوونی ئەو هەموو زانیارییانە، لە لایەن ئەو دەوڵەتانەی کە پاسپۆرتەکان هی ئەوان بوون، ڕەخنەی توند لە ئیسرائیل گیرا. بەریتانیای مەزن، ئوسترالیا و ئیرلەندا نوێنەرەکانی مۆسادی لەسەر خاکی خۆیان دەرکرد. پۆلەنداش کەسێکی بەناوی «ئوری برۆدسکی» لە فڕۆکەخانەی وارشۆ گرت و ڕادەستی ئاڵمانیای کردەوە. (لە کۆتایشدا برۆدسکی دوای ئەوەی بڕی ٦٠٠٠٠ یۆرۆی وەک سزا دا، بەردرا. هەرچی «بۆدنهایمەر»یش بوو نەدۆزرایەوە.) دەوڵەتەکانی دیکەش بە توندی ناڕەزایەتی خۆیان دەربڕی. بەڵام دیاربوو ئەو کاردانەوەیان بە دووڕوویەوە گرێدرابوو، ئاخر بەکارهێنانی پاسپۆرتی ساختە و دەستکاری کرا و ڕێسایەکی پێوانەیی چالاکی دەزگە هەواڵگرییە نهێنییەکان بوو؛ ئەو وڵاتانەی ئیسرائیلیان پێتاوانبار کرد، هەمان کردەوەی مۆسادیان دەکرد. کاتێکیش ڕایەڵەی سووسەکاری ڕووسیا لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا ئاشکرا بوو، کەس ئەندامەکانی ئەو دەستەی تاوانبارنەکرد بەوەی کە کاغەز و ناسنامەی ساختەی بەریتانی یان ئەمریکییان بەکارهێناوە.

ڕاپۆرتی ڕۆژنامەکان سەبارەت بە ئۆپەراسیۆنەکەی دوبەی ئەو تێبینیەی خستەڕوو کە ئۆپەراسیۆنەکە سەرکەوتوو بووە، بەڵام چەند هەڵەیەکی گەورەی تێدا کراوە، بێباکی زۆری ئیسرائیل بۆ دوبەی و دەوڵەتە ڕۆژئاواییەکان لە دەرەنجامی کردەوەکەدا دەرکەوتووە. ئەمەش زەبرێک بوو لە ناوورووومەتی نێودەوڵەتی ئیسرائیل نەوەک لە چالاکی دەزگە نهێنیەکەی کەوت. ئاخر زۆری نەبرد شاندی دیکە جێگەی ئەندامە دەرکراوەکانی پێشووتری مۆسادیان گرتەوە. ئەو بەڵێنەی سەرۆکی پۆلیسی دوبەی، بەوەی زۆری پێناچی ناسنامەی دەستەی دەستوەشێن

ئاشکرا دەبێ و بە دونیا ڕادەگەیەندرێ، هەر پرسیارێکی بێ وەڵام مایەوە. هیچ کام لە ئاژانەکانی مۆسادی تیمەکەی دوبەی لە لای هیچ دەزگەیەکی پۆلیس نە ناسرانەوە و نە گیران.

هێشتاش «دوبەی» هێمایەکە بۆ داڕسانێکی نوێ کە لەم جیهانە گۆڕاوەدا ڕووبەڕووی دەزگەی هەواڵگری نهێنی دەبێتەوە. ڕۆژی ئەوە گەز و ئەوە ئەرز بەسەرچوو. کامێرای ئاسایشپارێزی، وێنە و پەنجەمۆری لای پۆلیسی کۆچبەران لە فڕۆکەخانە و بەندەر و دەروازە سنورییەکان و خێرایی پشکنینی پاسپۆرت، DNA ... هەموو ئەمانە داخوازی ئامێر و کەرەستەی زۆر ئاڵۆز و شێوازی پێشکەوتوو لە خەفییە و سوسەکارە دەمامکدراوەکان دەکا، کە بۆ ئەرکە زیانبەخشەکانیان تاریکە ڕێگەکان تەی دەکەن.

✡ ✡ ✡

لە ٧ی ئەپریلی ٢٠١١دا، فڕۆکەیەکی نەناسراو لەسەر جادە، لە دووری پازدە کیلۆمەتر لە خواروی بەندەری سودان لەشارە ئەفریقیەکەی سوداندا، مووشەکێکی گرتە تڕومبێلێکی پڕ سەرنشین. بەگوێرەی سەرچاوەی هەواڵی ئیسرائیلی، بە فڕۆکەیەکی جۆری «شۆڤاڵ» بێ فڕۆکەوان کە چوار هەزار کیلۆمەتر بێئەوەی سوتەمەنی خۆی پڕبکاتەوە و فڕی و بارێکی یەک تەنیشی هەڵگرتبوو. «شۆڤاڵ»ـەکە نەوەیەکی نوێی فڕۆکە بێ فڕۆکەوانەکان بوو کە ئیسرائیل لە سەرکێشییێکی نوێدا لە

سنووری بەرەنگاربونەوەی تیرۆریزمدا بەکاریهێنا، ئەم جۆرەش جێگەی ئەو فڕۆکانەی بە فڕۆکەوانی گرتەوە. فڕۆکە بێ فڕۆکەوانەکانی ئیسرائیلی لە باشترین فڕۆکەکانی جیهانن، کاری هەواڵگری دەکەن و ئەرکی پەلاماردانی خۆیان لە سەرتاسەری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ڕایی دەکەن.

یەکێک لەو کەسانەی لەنێو ترۆمبێلە پەلاماردراوەکەی سوودان کوژرا، دەگوترا سەرکردەیەکی بزووتنەوەی حەماس بوو. ئاخر حەماس سودانی وەک ڕێگەیەک بۆ بەقاچاخبردنی چەک لە ئێران بۆ غەززە بەکار دەهێنا. باری چەک و تفاق بە کەشتی دەهات، لە بەندەری سودان دادەبەزێندرا، لەوێش بە کاروانی ترۆمبێلان لە ڕێی میسر، ئنجا «سینا» دەگەیەندرایە غەززە، شوفێرەکانیش ئەو ڕێگە دووروودرێژەیان بەناو سنوور و بازگەکاندا دەبڕی.

هەر دوای ڕووداوەکە، دەستبەجێ دەسەڵاتدارانی سودان ئیسرائیلیان بە کردەوەکە تۆمەتبار کرد.

پێشتریش ئیسرائیل لە ٢٠٠٩دا هێرشی کردبووە سەر کاروانێکی چەکی لەو جۆرە؛ ئاخر ترۆمبێلە باربەرەکان چەک، مووشەک و ماددەی تەقینەوە و وێرانکەریان بارکردبوو، هەموو بارەکە وێرانکراو چل کەسیش کە یاوەری کاروانەکە بوون، کوژران.

دەگوترا یەکێک لەوان کە کوژرا، سەرکردەیەکی حەماس بوو، بەرپرس بوو لە بەقاچاغ ئاودیوکردنی چەک لە ئێرانەوە بۆ غەززە.

## بەندی بیست و یەک: لە وڵاتی سەبەئی شاژنەوە

گرووپێک منداڵی ئەسیوپی، پێست ڕەش، جل سپی، هاتنە سەر تەختەی شانۆی هۆڵێکی گەورە لە ئۆرشەلیم. ئەو منداڵانە بە جۆرە جوانییێکی نازدار پیرۆزکرابوون، بە چاوە ڕەشە گەورەکانیان، بە پرسنی و تاسەوە سەیری ئامادەبووانیان دەکرد. ئاوازدانەری بەناوبانگی ئیسرائیلیش «شلۆمۆ گرۆنیک» لەلای پیانۆکەی خۆی وەستا بوو. نۆتە بەراییەکان بە ڕەوانی بەر گوێی جەماوەری ئامادەبوو کەوتن، منداڵەکان زۆر بە جوانی بە کۆرس ئەو گۆرانییەیان دەگوتەوە:

مانگ لە بانەوە چاوی لێیە

تێشوویێکی بچکۆلەی خواردنیشم پێیە

لەژێر پێشمان نابڕێتەوە بیابان

دایەش بە برا بچکۆلەکەم دەدا پەیمان

" کەمێکی دی، هەر کەمێکی دی

دەی قاچت هەڵێنە، دوا تەکان

ئۆرشەلیمە لە دوورەوە چاوی لێمان."

✡ ✡ ✡

ئەمە "گۆرانی گەشتەکە" بوو، «حایم ئیدیسی» شاعیر دایڕشتبوو، تێیدا وەسفی ئەو کۆڕەوە سەرکێشیەی جووەکانی ئەسیوپیای بۆ وڵاتی بەڵێنپێدراو دەکرد. ئامادەبووانیش لە خۆشیان چەپڵەی گەرمووگوڕیان بۆ لێدەدان. لەوانەیە ئەمە نیازی «ئیسی» شاعیر نەبووبێ و بەڵکو ئەمە

جۆشوخرۆشی جەماوەری ئامادەبووش نەبێ، بەڵام گۆرانی منداڵەکان و کە جوڵێنەرترین -هەروەها سامناکترین- بەندی کۆڕەوی جووە ئەسیوپییەکان بوو بۆ وڵاتی باب و باپیران:

تیشکی مانگ خێرابوو

تێشوەکەمان بڕا بوو

لە شەویشدا جەردە هاتن

بە سیکارد[253] و شیمشێری تیژ

لە بیابانیش، خوێنی دایکم بوو ڕژا بوو

مانگیش خۆی شاهیدم بوو

منیش دوای ئەو مابوومەوە

بەڵێنم بە برا بچکۆلەکەم دابوو:

"کەمێکی دی، هەر کەمێک

خەونەکە هەر دەبێ بێتە دی، من کەفیل

زۆری پێناچێ دەگەینە وڵاتی ئیسرائیل."

✡ ✡ ✡

هیچ کۆمەڵگەیەکی ئیسرائیلی ئەوەندەی هۆزە جووەکەی ئەسیوپیا ژان و ناسۆری نەچێشت تا بگاتە ئیسرائیل.

هەر خۆی بووە ژیانێکی ئەفسانەیی.

---

[253] سیکارد: چەقۆیەکی گەورە.

پێدەچێ شتێکی زۆر سەرنجڕاکێش بێ کە لە کتێبە مێژووییەکان خوازرابێتەوە. هۆزێکی جوو لە جیهانی دەرەوە دابڕابوو، لەناو جەرگەی ئەفریقیادا چەقیان بەستبوو، لە شاخ و دۆڵەکانی ئەسیوپیا، لە وڵاتی شاژنی سەبەئدا دەژیان. چوار هەزار ساڵە ئەم هۆزە دەقی بە بیروباوەڕەکەیەوە، بە دینێکی پاک و بێوەی تەوراتییانە گرتووە.

ئەو هۆزە ئارام و شەرمنە، لەنێو مێژوودا ون بوو. ڕابەرەکانی، «کەسیم» ڕیشسپییە بە ویقارەکانیان لەبن ڕۆبی سپیپۆشەوە، وەک شوانێک ڕێنوێنی ژیانی نوێی گەلەکەیان بەنێو ڕێسا و دەستوورە کۆنباوەکانی جووایەتی و دابونەریتدا دەکرد. ئەوان ئەو هۆزە بوون، لەو کاتدا بە ئاشتی و ئارامی لەگەڵ ژینگەی دەوروبەریاندا دەژیان، بەڵام لە کاتی دیکەدا لە سەر دەستی دەسەڵاتدارە دڵڕەقەکاندا چەوسێندرانەوە. وێڕای ئەوەش لە لایەن ڕابی و شارەزا تیۆلۆجییە جووەکانی جیهانی دەرەوەدا، بە ڕیسوایی و شەرمەزاری سەیر دەکران، گوایە ئەوان "فلاشا"ن و جووی ڕەسەن نین.

کەچی جووەکانی ئەسیوپیا کۆڵیان نەدا. نەوە لە دوای نەوە بە دنەدانی دابونەریت، کە لە باوک بۆ کوڕ و لە دایک بۆ کچ بەجێدەما، توند دەستیان بە ئۆلەکەی خۆیانەوە گرتبوو، خەونیشیان بە ڕۆژێک دەبینی کە دەربازیان ببێ و ڕێگەی وڵاتی ئیسرائیل بگرنەبەر.

ژمارەیەکی کەمیان لە ماوەی سی ساڵەی یەکەمی پەیدابوونی دەوڵەتی ئسرائیلدا هاتنە وڵات. تەنانەت لە ماوەی دەسەڵاتی ئیمپراتۆر «هایلی سیلاسی»ی "شێری جودیا"دا کە دۆستێکی نزیک و هاوپەیمانی ئیسرائیل بوو، هیچ هەوڵێکی ڕاستەقینە بۆ هێنانی جووەکانی ئەوێندەرێ بۆ نێو دەوڵەتەکەی ئیسرائیل نەدرا. شتەکان لە ١٩٧٣ەوە گۆڕان، ئەو کاتەی مەزنی ڕابییەکان «ئۆڤادیا یوسف» زۆر ڕاشکاوانە و بە دەنگێکی

بەرزەوە ڕێسای بێوێنەی «هالاخا»ی بڵاوکردەوە، بەوەی جووەکانی ئەسیوپیا، کە ئەوان بەخۆیان دەڵێن "بێتا ئیسرائیل"، جووی تەواوعەیارن. دوو ساڵ دوای ئەوە حکوومەتی ئیسرائیل قانونی گەڕانەوەی جووەکانی ئەسپوپییەکانی داڕشت. ئەو کاتەش لە ١٩٧٧دا «مناحیم بێگن»ی سەروەزیر بانگی بەڕێوبەری مۆساد «ژەنەڕاڵ ئیسحاق (هاکا) هۆفی" کرد و پێیگوت:

"جووەکانی ئەسیوپیام بۆ بێنەوە!"

لە پێکهاتەی بونیادی مۆسادیش یەکەیەکی تایبەت بەناوی «بیتزور» تایبەت بە پاراستنی جووەکانی وڵاتە دوژمنەکان و ڕێکخستنی کۆچی ئەو جووانە بۆ ئیسرائیل هەبوو. دواتر «بیتزور» ناوی بە «تزافیریم» گۆڕا و دەستبەجێ بۆ ئەم پرسە کەوتە کار.

هەر بە ماوەیەکی کەم دوای فەرمانی «بێگن» بە «هاکا»ی ڕامساد، «دایڤد (دێیڤ) کیمخی» گەیشتە «ئەدیس ئەبابا»ی پایتەختی ئەسیوپیا. «دێیڤ» جێگری بەڕێوبەری مۆساد و سەرۆکی «تێڤل» -هۆبەی پەیوەندی نهێنییە نێودەوڵەتییەکان- بوو. ئەو بۆ دیتنی دەسەڵاتداری ئەسیوپیا «مێنگستو هایلی ماریام» هاتبوو. ئەوێ دەمێش، دەرگەی ئەسیوپیا لەسەر کۆچکردنی جووەکان بۆ ئیسرائیل داخرابوو. وڵاتەکە بەهۆی شەڕی ناوەخۆ لە بار یەک ترازا بوو، «مێنگستۆش» داوای یارمەتی لە ئیسرائیل دەکرد تا لە دژی یاخیبووان بوەستێتەوە. «کیمخی»یش ڕەتیکردەوە لە جیاتی «مێنگستۆ»دا شەڕی یاخیبووان بکا، بەڵام بەڵێنی ئەوەی پێدا چەکی بداتێ. ئەمەش هەمووی بە یەک مەرج بەسترابووەوە: «مێنگستۆ» ڕێگە بە کۆچی جووەکان بدا. «کیمخی» گوتی؛ ئێمە داوامان کرد هەر فڕۆکەیەکی هیرکولۆسی ئیسرائیلی لە وڵاتەکەی ئەوان بنیشێتەوە کە بارەکەی کەرەستە و تفاقی سەربازی

دەبێ، لەبەرانبەریشدا دەبێ بە باری پڕ لە جوولەکەی ئەوێ هەڵبستێ و بەرەو ئیسرائیل بگەڕێتەوە. «مێنگستۆ»ش بەم مەرجە قایلبوو. ئیدی کۆڕەوی جووەکان لە ئەسیوپیاوە کەوتەگەڕ.

ئەم ڕێکخستنە شەش مانگ درێژەی کێشا، تا ئەوکاتەی لە فێبرایری ١٩٧٨دا بە "قسە لەدەمدەرچوونێک"ی «مۆشێ دایان»ی وەزیری کاروباری دەرەوە، تێکوپێکچوو. «دایان» بە ڕۆژنامەیەکی سویسرایی گوتبوو، ئیسرائیل چەک دەداتە سوپای «مێنگیستۆ». هەندێکیش گوتیان «مۆشێ دایان» بە ئەنقەست دزەی بەو هەواڵە کردووە، چونکە دژی چەکدارکردنی «مێنگیستۆ»ی مارکسستی و لایەنگری یەکێتی سۆڤیەت بووە.

«مێنگیستۆ» بەم کارە دەهری بوو. نەشیدەتوانی ڕاشکاوانە دان بەو پەیوەندیە نهێنییەی لەگەڵ ئیسرائیلدا بنێ، بەڵام دەستبەجێ ڕێککەوتننەکەی لەگەڵ مۆساددا هەڵوەشاندەوە. بەم جۆرە کەناڵی ڕاستەخۆی کۆچبەرانی جوو داخرا، بەڵام خۆ فەرمانی «بێگن» بۆ «هاکا» هەر بەرکار بوو.

دیسان دەروازەکانی ئەسیوپیا بەسەر کۆچکردندا داخرانەوە، بەڵام نامەیەک لە خەرتوومی پایتەختی سودان کە دەوڵەتێکی دراوسێی ئەسیوپیا بوو، گەیشتە مەکۆی سەرەکی مۆساد، لەپڕ ڕێگەیەکی دیکەی کۆچ بۆ جووەکانی ئەسیوپیا کرایەوە.

نامەکە بە واژۆی «فەریدا ئاکلوم» بوو، جوویێکی ئەسیوپی، مامۆستایەک بوو، ناوبراو توانیبوی سنوور ببەزێنی و بگاتە سودان. لە گۆشەنیگای ئیسرائیلیشەوە، سودان وڵاتێکی دوژمن بوو. وڵاتەکە لەبن باری قاتوقڕی، وشکەساڵی و شەڕی ناوخۆیی دینی و هۆزەکانی داڕزابوو. بە هەزاران

ئاوارە و دەربەدەر لە بەشە جیاجیاکانی وڵاتەکە -و لە ئەسیوپیای دراوسێشیەوە- لە نێو ئۆردوگا و چادرگە پیسوپۆخڵەکان گردببوونەوە. «ئالکوم» لە هەوڵێکی دڵشکاوانە و نامرادنەدا بە نیازی بەهاناوەچوون و کۆمەککردنی کۆچبەرانی جووە ئەسیوپییەکان چەندین نامە و پەیامی بۆ ئیسرائیل و ڕێکخراوە مرۆیەکانی جیهان ناردبوو. یەکێ لەو نامانە گەیشتە بنکەی سەرەکی مۆساد و سەرنجی ئەفسەرێکی پلەباڵای ڕاکێشا. «ئالکوم» لە نامەکەدا نووسیبووی: "ئەز لە سودانم. بلیتێکی فڕۆکەم بۆ بنێرن." مۆسادیش لە جیاتی بلیتی فڕۆکە یەکێک لە پیاوکانی خۆی بە ناوی «دانی لیمۆر» بۆ دیتنی کابرا ناردە سودان.

کاتێکیش ئەوان یەکدیان بینی، هەردووکیان ڕازیبوون، کە «ئالکوم» لە ئۆردوگای ئاوارەکاندا بە دوای جووەکاندا بگەڕێ و «دانی» لێئاگادار بکاتەوە. لە ماوەی چەند مانگێکی کەمدا، هەر بەڕاستی ٣٠ جووی دۆزینەوە و مۆسادیش توانی هەر سی کەسەکە بگەیەنێتە ئیسرائیل. مانگێکیش دوای ئەو کارە، «ئالکوم» بە هاوکاری مۆساد بە دوای سەروسۆراغی جووەکانی دیکە لە خەرتومدا گەڕا. ئەوکات هیچ جوویێکی لەوێدا نەدۆزینەوە، نێردەی مۆساد بڕیاریدا بگەڕێتەوە وڵات. بەڵام بەرلەوەی «دانی» سودان بەجێبێڵێ، قەول وابوو «ئالکوم»یشی لەگەڵدا بڕواتە ئیسرائیل. کەچی ئەو دەیەویست هەر بەدوای خەڵکی جوو لە ناوچەکانی دیکەی سوداندا بگەڕێ. هەرچەندە «دانی لیمۆر» کەسێکی کەڕەپیش بوو، فەرمانی بە «ئالکوم» کرد، بەڵکو کۆتایی بە چالاکییەکانی بهێنێ و لە ماوەی هەفتەیەکدا بگەڕێتەوە ئیسرائیل.

بەڵام «ئالکوم» گویڕایەڵ نەبوو، ئینجا شار بە شار، ئۆردوگا بە ئۆردوگا، بە هیوای دۆزینەوەی جوو دەگەڕاو و دەسووڕا. ئەو تەنانەت یەک تاکە جوولەکەشی لە سودان نەدۆزیەوە، بەڵام دەشیزانی ئەگەر ئێستا

بگەڕێتەوە ئیسرائیل، لەوانەیە ببێتە مایەی کۆتاییهاتن بە کۆچی جووەکانی ئەسیوپیا لەڕێگەی سودان بۆ ئیسرائیل. بۆیە ڕاپۆرتێکی ناڕاستی هۆنییەوە، تێیدا ناوی زۆر لە جووەکانی هێنابوو، گوایە لەسوداندان، ڕاپۆرتەکەشی بۆ مۆساد فاکس کرد و ڕاشیگەیاند بۆ مشورخواردنی ئەوان هەر لە سودان دەمێنێتەوە.

ئەو یەهودییانەش کە ناوی لە لیستەکەدا نووسیبوون، هەر بەڕاست هەبوون و دەژیان، بەڵام خۆ ئەوان لە سودان نەبوون؛ ئەوان هێشتا لە گوندەکانی ئەسیوپیادا دەژیان. ئیدی «ئالکوم» وەک گورگێکی تاقانە لە ئەسیوپیادا دەستی بە کار و چالاکی خۆی کرد. ئەو سەردانی گوندەکانی کرد و قەناعەتی پێکردن بەڵکو بەرەو وڵاتی ئیسرائیل کۆچ بکەن. دەنگۆی ئەوەی گوایە ڕێگەیەکی نهێنی بەرەو ئیسرائیل دۆزراوەتە، خێرا هەر وەک چۆن ئاگر لە پووش و پاوان بەردەبێ، ئاواش هەواڵەکە بەنێو جووە خۆجێیەکانی ئەوێ بڵاوبووەوە. سەرەتا ژمارەیەکی کەم لە پیاوان ڕۆیشتن، پاشان خێزانەکانیان، ئینجا سەرتاپای گوندنشینان، شرۆشیتاڵیان[254] پێچایەوە و کەوتنە ڕێ. بە هەزاران کەس، لەنێویاندا پیر، ئافرەت و منداڵ بە دزییەوە ئەسیوپیایان بەجێهێشت. ئەوان بە خەونی فریادڕەسییەوە چەکدار بوون، بەو بەڵێنە تەوراتییەی کە ڕۆژێک لە ڕۆژەکان دەگەڕێنەوە وڵاتی شیر و هەنگوین.

ئەوان حازرایی خۆراک و ئاوی ڕێگەیان کردبوو، ناوی خوایان لێهێنا و سنوورەکەیان بڕی، ئیدی گەشتێکی تاقەتپڕوکێن و دژواریان بە نێو بیاباندا دەستپێکرد. ئەوان بە شەو ڕێیان دەکرد، بە ڕۆژیش لەنێو ئەشکەوت و کون و کەلەبەر و ئەنوایاندا خۆیان پەنا دەدا. زۆریان

[254] شرۆشیتاڵ: کەلوپەلێکی کەم و بێ بایەخ.

لێنەخۆش کەوتن و مردن. مەلۆتکە و ساواکان لە بەرۆکی داکیان لەبەر وشکبوونەوە گیانیان لەدەست دا. باوک هەبوو لەو ڕەودا چوار ڕۆڵەی لەدەستدا بوو. مار، دووپشک بە هەندێکیانەوە دا و مردن، هەندێکی دیکەش نەخۆشی کوشندەیان لێتەنیەوە و سەریان نایەوە. ئەو ئاو خۆراکەی لەگەڵ خۆشیان هێنابوو کەم بوو، لێیان بڕا. چەندین تاقمی دز و جەردە و تالانکەریش بەسەریان دادان، ئەوەی پێیان مابوو، لێیان سەندن، ئیدی هەر تەرمی لەسەریەک کەڵەکەبوو بوو، لە دوایانەوە بەجێما. سالانێک دواتر، «مێهێرتا باروش»ی خانمە ئەکتەر، کە لە کۆڕەوەکەدا بەشدار ببوو، سەربردەی سامناکی کۆڕەوەکەی گێڕایەوە. وەک ئەو گوتی؛ هەموو سپێدەیەک ڕێڕۆیشتوان تەرمی کەسە مردووەکانیان دەژماردن. هەندێ جار دە تەرم لەسەر لمەکە کەوتبوو، هەندێ جاریش ژمارەکە دەبووە پازدە. ماڵبات نەبوو بەلای کەمییەوە منداڵێکی لەو ڕێیەدا لێنەفەوتا بێ.

لە هاوینی ١٩٨١دا، «دانی لیمۆر» و تیمەکەی مۆساد گەڕانەوە سودان، لەوێ بە ڕووپۆشێکی دیکەوە دەستبەکار بوونەوە. ئەوان ناویان لە خۆیان نابوو «هافیسەکان» ئەمەش کورتکراوەی "هێزی هاکا لە سودان" بوو. مەبەستی سەرەکیشیان پەیوەندیکردن بوو بە جووە ئەسیوپییەکانی سودان.

بەڵام پاشماوەی جووە ڕزگاربووەکانی کۆڕەوەکە، ئاستەنگی دیکەیان بۆ پەیوەندیکردن بە نێردەی مۆساد لە سودان هاتەپێش؛ تەنانەت ئەوانەی گەیشتنە ئۆردوگای ئاوارەکانی دەوروبەری خەرتومیش، کەسانێکی دڵشکاو کۆڵەوار بوون. ئەوان دەبوایە جوایەتی خۆیان بشارنەوە، کەچی هێشتاش لە خۆراکی نا "کۆشیر[255]" کە لە لایەن ڕێکخراوە

[255]کوشیر: خواردنی نەریتییانە بەگوێرەی ڕیسا کۆنەکان دیینی جووایەتی.

خێرخوازییەکان بەسەر ئۆردوگاکاندا دابەش دەکرا، دوور دەکەوتنەوە. ژنەکان لاقەکرابوون، کیژە گەنجەکانیان بە دەستی چەتە و ڕێگرەکان ڕفێندرابوون و هەر بەڕاستیش تاوانباران کاربەدەستی ڕاستەقینەی ئۆردوگاکان بوون. کۆمەڵەیەک کە سەد کچ بوون ڕفێندران و شوێنبزرکران. کەسوکاریان کە بە دوایاندا گەڕان، بۆیان دەرکەوت، کە فرۆشراونەتە عەرەبستانی سعودیە، لەوێ ١٢٠٠ ئافرەت کرابوونە کۆیلە. چەندین جوو بە هۆی دەر و دراوسێ لە ئۆردوگاکان ناسرابوونەوە، لە لایەن پۆلیسی سودانییەوە گیران و ئازار و ئەشکەنجەش دران. ژمارەیەکی زۆریشیان بۆ چەندین مانگ تەنانەت ساڵیش لە ئۆردوگاکاندا مانەوە تا ئەو کاتەی دەرفەتیان بۆ بڕەخسێ بەرەو ئیسرائیل باربکەن.

جووە ئەسیوپییەکان، باجێکی قورسی خەونی ڕۆیشتن بە نێو دەروازەکانی ئیسرائیلیان دا. زیاتر لە چوار هەزار جوو لە قۆناغە جیاجیاکانی کۆڕەوەکەیان مردن. «هێنری گۆلد»، جوویێکی کەنەدی بوو، خۆبەخشانە لە ئۆردوگاکانی سودان و ئەسیوپیا کاری دەکرد، بە قووڵی بەو ڕەوشەی جووەکانی ئەوێ تێیکەوتبوون تاسابوو، بە توندیش ڕەخنەی لە ئیسرائیل گرت، کە بە ڕێکوپێکی هەوڵیان نەداوە ئەرکەکەی خۆیان لەوێ بەدی بێنن.

کەچی مۆساد هەر هەڵوەدای دۆزینەوەی ڕێگەیەکی سەلامەت بوو، تا باقی جووەکانی ئەوێ بگەیەنێتەوە وڵات. کۆڕەوەکەی سودان بە گەشتەفڕینی بازرگانی یەک بەدوای یەکدا هاتوودا دەستی پێکرد، کە هەڵبەتە بە پاسپۆرتی ساختەکراوەوە؛ بەڵام هەر زوو مۆساد بڕیاریدا، جووەکان لەبری گەشتی فڕۆکە لە ڕێگەی دەریاوە بگوازێتەوە، بۆیە چەندین گەمی بەنێو دەریای سوور و ناردن بۆ ئەوەی لەڕێی گەرووی «تیران»وە بیانگەیەنێتە بەندەری «ئیلات».

بۆ ڕووپۆشکردنی ئەم ئۆپەراسیۆنەی گواستنەوەیە، مۆساد لە ئەورووپا کۆمپانیای گەشتوگوزار و گواستنەوەی دروست کرد. "بۆ ئەوەی لە ڕێی دەریاوە کار بکەی، مرۆ پێویستی بە چیرۆکێک دەبێ کردەوەکەی پێپەردەپۆش بکا." ئەمەش قسەی ئاژانێکی مۆساد بوو بە ناوی «یۆناتان شیفا»، یەکێک لە ڕێنوێنانی ئۆپەراسیۆنێک. ناوبراو لەسەر قسەکەی دەڕوا، بەم جۆرە: "خۆ ئەگەر چیرۆکێکی سەرداپۆشینی کردەوەکەت نەبێ، ئەوا دوای هەفتەیەک دەکەویتە بن پرسیاران: ئەرێ تۆ لێرە چی دەکەی؟ تۆ گەشیاری؟ چی لێرە هەیە تا ببینی؟"

ئینجا کۆمپانیاکەش کەناراوێکی بەربەرینی لە نزیک «پۆرت سودان»ەوە بەناوی «ئاراوس» بەکرێ گرت و گرێبەستێکی لەگەڵ حکوومەتی سودان بۆ پەرەپێدانی شوێنەکە بۆ گەمەی ئاویی لە دەریای سوورەوە واژۆ کرد. هەموو کارە کارگێڕییەکان بە «یەهودا گیل» سپێردرا، ئەویش بە لێهاتووی و کارامەیی زۆر و پارەو بەرتیلدان بە کاربەدەستانی سودانی، توانی لە کۆتاییدا مۆڵەتنامەی کارکردن لەو شوێنەی ناوی «ئاراوس» بوو بخاتەگەڕ. ئەو پیاوەش کە شوێنی حەوانەکەی بەڕێوە دەبرد «یۆناتان شیفا» بوو، بەشداری زۆر لە ئۆپەراسیۆنەکانی مۆسادی کردبوو. هەر بەڕاستیش «ئاراوس» وەک گوندێک دروست کرا. بەنگەلۆی تایبەت بۆ تاک و هەروەها خانووی بە کۆمەڵیشی تێدا دروست کران. چەندین ئاژانی مۆساد، بە پاسپۆرتی ساختەوە، لە ئیسرائیلەوە نێردران و بوونە وەستا و کرێکاری دروستکردنی خەڵوەتگای ئارامی یاری دەریایی. ئەوان شوێنی حەوانەوەیان پڕ لە ئامێر و کەرەستەی بناولێدان، هەناسەوەرگرتن لەنێو ئاو، لوولەی بن ئاو و دەمامک پڕکردن. هەر لەنێو چاردگەکەدا نێرەرێکی ڕادیۆیی نهێنیشیان دامەزراند، بەردەوام پەیوەندییان بە بنکەی سەرەکی مۆسادەوە دەکرد. «ئیمانوێل ئاللۆن» کە

لەگەڵ «شیفا»دا لە چەندین ئۆپەراسیۆندا بەشدار ببوو، بە ڕزگارکردنی "پاکیزەکانی سووریا"شەوە، زەنگێکی تەلەفۆنی لە «یۆناتاوە» بۆ هات. "ئەو پێیگوتم: من تۆم بۆ شتێکی تایبەت پێویستە. ئەمجارەیان ئۆپەراسیۆنێکە کوشتنی تێدا نییە؛ شتێکی تایبەتە و جیاوازە؛ شتێکی مرۆییە. من کە ئێستا قسەت لەگەڵ دەکەم، کەچی کەفوکوڵی هەستوسۆزیشم هەڵساوە. من دەمەوێ گوندێکی حەوانەوە لە سودان دروست بکەم." ئەم گوندە بەسەر خەڵکدا کراوە بوو، پۆستەر و ڕیکلامەکەیشی بەسەر دار و دیواری ئاژانسەکانی گواستنەوە لە ئەورووپادا بڵاوکرانەوە.

زۆر لە گەشتیاران ماوەی پشووی خۆیان لە «ئاراوس»دا بەسەر برد، بەلای کەمییەوە، شوێنەکە لەو گۆشەنیگایەوە سەرکەوتوو بوو. بە ڕۆژ خەڵکەکە لەنێو دەریادا بناوی خۆیان لێدەدا، مەلەیان دەکرد و چێژیان لە کاناراوەکەی دەریای سوور وەردەگرت. بەڵام هەر ئەو خەڵکە لەوە بێئاگا بوو، کە بە شەو ئاژانەکانی مۆساد بۆ گوندەکان دەردەچن و جووەکانی ئۆردوگای پەنابەران دەگوازنەوە. ڕێنمایی بناوانلێدان چیرۆکێکی ڕووپۆشی بۆ کارمەندە سوودانییە خۆجێیەکانی شوێنی حەوانەوەکە داهێنا. ئەوان بە کارمەندە خۆجێیەکانیان گوت، کە شەوان لەگەڵ پەرستارە سوێدییەکانی نەخۆشخانەی خاچی سوور دەچنە شاری «کاسالا». کاتێکیش ئەو دەرچوونە خێرخوازییە بەردەوام بوو، بووە مایەی گومان پەیداکردن، هەرچەندە کارمەندە خۆجێیەکان گومانیان پەیدا بوو، کە شتێکی دیکە لە ئارادا هەیە، بەڵام تا ئەوکاتەی ئەوان مووچەی چەوریان دەدرایێ، پێیان باشتر بوو چاوپۆشی لێبکەن.

ئەو گەشتە شەوانەیان بە چوار لۆری کۆنینە دەکردن، ئاژانەکانی مۆساد، لە ژێر فەرماندەیی «دانی لیمۆردا» لە ئۆردوگاکان نزیک دەکەوتنەوە.

ئەندامە لاوەکانی ڕێکخراوە نهێنییەکی ئەسیوپییەکان، کۆمیتەکە، دەستە دەستە جووەکانی کۆدەکردەوە و سواری لۆرییەکانیان دەکردن.

بەڵام خۆ ئەو کارەش ئەوەندە ئاسان نەبوو. ئیسرائیلییەکان ڕووبەڕووی کۆمەڵێ دژواری دەبوونەوە. «دایڤد بن ئوزیل» یەکێ لە فەرماندەکانی ئۆپەراسیۆنەکە، پێیوابوو نزیککەوتنەوە لە ئۆردوگاکان دژوارترین قۆناغی "ئەرک"کەیان بوو. ئەو گوتی: "ئێمە زۆر لە ئۆردوگاکە نزیک بووینەوە. دەکرا ئێمە گیرابāین، بۆیە دەبوایە تا بۆمان بکرابایە بە خێرایی ئەو بەشەی کارەکەمان لەوێ تەواو بکردبایە."

لەو کاتەی کۆمیتەکە تێدەکۆشا جووەکانی ئۆردوگاکانی پەنابەران ببینێتەوە و دەستنیشانیان بکا، لەوێدا زۆریان هەبوون ناسنامەی خۆیان ئاشکرا نەدەکرد، ئاخر لە پۆلیسی سودانی دەترسان. جووەکانی گوندە شاخاوییەکانی ئەسیوپیا پێشتر هەرگیز پیاوی سپیپێستیان نەبینیبوو؛ لەو بڕوایەدا نەبوون کە ئەوان ئیسرائیلی بن و بۆ ڕزگارکردنیان هاتبن، ئاخر نەیاندەزانی کە جوولەکەی سپی پێستیش هەن. تەنها ئەو کاتەی «دانی لیمۆر»، هاتە نێویان و وەک ئەوان نوێژی کرد، ئەوسا بڕوایان کرد کە ئەویش جووە، بەڵام جووێکی سەیر، یەکێک کە بە شێوەیەکی نائاسایی نوێژ دەکا، بەڵام خۆ هەروەک ئەوان لەسەر دینی مووسای بوو.

لە ترسی دزەکرنی زانیارییەکان و ئاشکرا بوونیان، پێشتر ئاژانەکانی مۆساد ئەو جووە ئاوارانەی ئۆردوگاکانیان ئاگادار نەکردبوونەوە. هەر کۆمیتەکە دەبوو لە هەموو ئانوساتێکدا سازوئامادە بن، هەر کاتێکیش پەیوەندیان پێوەکرا، دەبوو هەموو شتێکیان بەجێبێڵن و لەوێ بڕۆن. بەم جۆرە شەو لەدوای شەو، جووەکان پۆل پۆل لە ئۆردوگاکان دەهاتنەدەر و بەدزی بەرەو ئەنوایەکی بچکۆلەی نزیک ئۆردوگاکە دەڕۆیشتن، لەوێش ئاژانەکانی مۆساد چاوەڕێیان دەکردن.

هەر چوار لۆرییەکە دەبوایە سەدان کیلۆمەتریان بەرەو کەناراوی دەریای سوور بڕیبا. ئەوەش ڕێگەیەک بوو بەنێو سوپا و بازگەکانی پشکنینی پۆلیسدا تێپەڕ دەبوو. «دانیش» بەرتیلی دەدایە پاسەوانەکان، ئیدی لۆرییەکان لەسەر ڕەوتی خۆیان بەردەوام دەبوون. لە خاڵی بەیەکگەیشتنیشیان لەسەر کەناراوەکەدا، هێزی دەریایی ئیسرائیلی لە چاوەڕوانیاندا بوو.

گەمی هێزی دەریاوانیش دەبوایە بەبێ دەنگ مەودایەک بڕوا، کۆماندۆکانی هێزی دەریایش بە بەلەمی چووپ دەهاتن و جووەکانیان کۆدەکردنەوە و لەگەڵ خۆیان دەبردن و دەیانگەیاندنە سەر پشتی گەمییە داکانەکە. گەمییە سەرەکییەکەی گواستنەوەی ئاوارەکان ناوی «بات گالیم» بوو، هەموو هەفتە جارێک دەگەیشتە سەر کەنارەکانی سودان. هیچ کام لە ئاژانەکانی مۆساد و کۆماندۆکانی هێزی دەریایی هەرگیز ئەو گردبوونە جووڵێنەری هەست و سۆزیان لەبیر نەدەچوو کە لەوێ برا ئەسیوپییەکانیان و کۆچە دراماتیکەکەیان بەرەو ئیسرائیل دەبینی. ئاژانی مۆساد «دایڤد بن ئوزیل» کردەی گواستنەوەی ئەو جووانەی بۆ سەر بەلەمەکان لە نەوارێکدا وەها تۆمارکردووە: "دەریا هەڵدەچوو. ئێمەش هەر یەکەمان برایەکمان لەباوەش گرتبوو بۆ ئەوەی کەس لە ئاوادا نقووم نەبێ. هەستوسۆزی پیاوەکانمان زۆر بەرز بوو. هەندێک گوتیان دیمەنەکە یادەوەری باوانیان بیردەخاتەوە، ئەوانەی کاتی خۆیان بە قاچاغی کۆچیان کردبووە ئیسرائیل؛ ئەوان هەرکاتێک برادەرەکانمان سواری سەر پشتی کەشتی بوون، هۆن هۆن فرمێسکیان لە چاوان دەهاتەخوار."

"ئەوان بە بێدەنگییەکی تەواوەوە هاتن." «گادی کرۆل»ی فەرماندەی هێزی دەریای وەهای گوت: "پیرەکان، ئافرەتان، مەلۆتکە لەباوەش. ئێمە دەستبەجێ بەنێو دەریا هاروهاجەکەدا ڕۆیشتین. ئەوان لەسەر پشتی

گەمییەکە دانیشتن و ئەلقومیان لەدەم نەهاتەدەر." بەلەمەکانی هێزی دەریایی ئەوانیان گەیاندە بەندەری ئیلات.

ڕۆژێکیان«هێنری گۆلد» جووە کەنەدییێکی خۆبەخش هاتە گوندە گەشتیارییەکە. ئەو لەبەر کاری زۆر و ماندوبوون شل و کەنەفت ببوو، هەندێک لە برادەرەکانی پێیانگوت دەبێ یەک دوو ڕۆژ پاڵداتەوە، لەبەر ڕۆژ خۆی هەڵبخا و لە کاناراوەکەدا مەلەوانی بکا. ئەویش هیچی سەبارەت بەو چالاکییە نهێنییانەی لەوێ دەکران نەدەزانی. بەڵام کاتێک گەڕایەوە گوندەکە، هەستی کرد شتێکی نامۆ هەیە: شتێکی وای لا پەیدا بوو، کە بە کۆمەڵێک لە ئاژانی مۆساد دەورە دراوە. ئاخر ستافەکە سەیر دیاربوون. "ئەوان بە شێوەزارێکی نامۆ دەدوان. ژنێک وای خۆی ناساند کە سویسڕاییە، بەڵام خۆ شێوەزاری سویسڕایی پێوەدیار نەبوو، ئێرانییەکانیش بەهەمان شێوە شێوەزارەکەیان پێوە دیار نەبوو. لەسەر خوانی شێوانیشدا دەفرێکیان لەبەردەم دانا، هی زەلاتەیەک کە زۆر بە تەنکی قاشقاش کرابوو. ئاخر خۆ من گەلێ شوێنی ئەو سەرزەمینە گەڕاوم، بەڵام ئەو جۆرە زەلاتەیە تەنیا لە ئیسڕائیل پێشکەش دەکرا." بۆ بەیانییەکەی، «گۆلد» هیچی دیکە دوودڵ نەبوو، بە زمانی عیبری ڕووی لە مامۆستای بناولێدەر کرد: "دەی پێم بڵێ ئاخۆ پیاوەکانتان لێرە چی دەکەن؟" پیاوەکەش پەشۆکا، سوورهەڵگەڕا و لەسەر کورسییەکەی کەوتە خوار. لە کۆتاییدا هەر بەعیبری پرسیاری لە «گۆلد» کردەوە: "ئەدی تۆ کێی؟" هەر هەمان ڕۆژ، ئەفسەرێکی پلەباڵای مۆساد گەیشتە ئەوێ و «گۆلد»ی لەگەڵ خۆی بردە لایەک. «گۆلد»یش بە تووڕەییەوە سەبارەت بەو ڕەفتارەی لەگەڵ جووە ئاوارەکانی نێو ئۆردوگاکان دەکرێ، ڕووبەڕووی بووەوە.

لە یەکێ لە ئۆپەراسیۆنەکان و لە مارتی ١٩٨٢دا، لەکاتێک چەندین گەمی ئاوارە ئەسیوپییەکانیان هەڵگرتبوون، شەویش تاریک و نوتەک بوو، یەکێ لە بەلەمە چووپدارەکان کە چوار ئاژانی مۆسادی لەسەر پشت بوو، لە نێو گاشەبەردەکانی سەر کەناراوەکە گیری خوارد. لەو کاتیشدا دەستە سەربازێکی سودانی بەخۆیان و کلاشینکۆفەکانیان لەپڕ لەسەر کەنارەکە پەیدابوون و میلی چەکەکانیان بەرەو ڕووی بەلەمە بچکۆلانەکە ڕاکێشا.

«دانی لیمۆر»یش خۆی بۆ ڕاکێشان و بەرەوڕوویان چوو، بە ئینگلیزی بانگی فەرماندەکەیانی کرد: "ئەرێ ئێوە شێت بوون؟ عەقڵتان لەدەست داوە؟ ئەوە چی دەکەن؟ تەقە لە گەشتیاران دەکەن؟" هەر هاواریشی دەکرد، کەوا ئەو گەشتیارانە لەکاتوساتی بناولێدانیاندا بوون، ئەوانەی گوندە گەشتیارییەکەی «ئاراوس»ن بە بەشدارییان لە کردەیەکی بازرگانی گەشتیاری لەگەڵ سودانداا کردووە، ئینجا هەڕەشەی لێکردن کەوا سکاڵایان لە خەرتومەوە لەسەر تۆمار دەکا. ئینجا ئەفسەرەکەیان بە ساردبوونەوە داوای لێبوردنی کرد و ڕوونی کردەوە، کە گومانیان هەبووە، ئەوانە ئەو کەسانە بن کە خەڵک بە قاچاغ سواری بەلەمەکان دەکەن. ئینجا فەرمانی بەدەستەی سەربازەکان کرد و ئەوێیان چۆڵ کرد.

ئاژانەکانی مۆساد سەلامەت دەرچوون، بەڵام دیاربوو ڕەوتی کۆچەکە بە دەریا بەردەوام نەبوو. دەبوایە ڕێگەیەکی نوێ بۆ گواستەوەیان بدۆزرێتەوە. بەیانییێکیان گەشتیارەکانی «ئاراوس» لەخەو هەڵسان، بینیان سەرجەم ستافە بیانییەکە لەوێ نەماون، تەنها هەندێ کەسی خۆجێی مابوون، ئەوانیش بۆ مێوانەکان خەریکی سازکردنی نان و چایەی بەیانی بوون. ئاخر شەوی پێشتر ئاژانەکانی مۆساد چادرگەکەیان جێهێشتبوو. ئەوان لێبوردننامەیەکیان نووسیبوو، تێیدا هاتبوو کە گوندەکەیان لەبەر کورتهێنانی بودجە جێهێشتووە. ئەو گەشتیارانەش کە دەگەڕێنەوە

پارەکانیان دەدرێتەوە. کارەکە تەواو بوو، هەموو بناولێدەرەکانیش پارەی خۆیان پێدرا.

دوای تاوتوێکردنێکی دوورودرێژی پرسەکە لە مەکۆی سەرەکی مۆساددا، *ڕامساد*ەکە بڕیاریدا گواستنەوەی داهاتوو لەڕێی ئاسمانەوە بێ، لەڕێی جۆرە فڕۆکەکانی یەکشاخ- هێرکیلۆس C-130ی هێزی ئاسمانی ئیسڕائیلییەوە. ئەمەش قومارێکی سەرکێشانە بوو، دەبوایە دزە بکرێتە بواری ئاسمانی سودانی و سەربازانی ئیسڕائیلی لەسەر خاکی دەوڵەتێکی دوژمندا بنیشنەوە. بەڵام خۆ ئیسڕائیل هیچ بژاردەیەکی دیکەی لەدەستدا نەبوو: دەبووایە جووە ئەسیوپییەکان ڕزگار کرابان.

لە ئایاری ١٩٨٢دا، ئاژانەکانی مۆساد گەڕانەوە سودان. ئەرکی یەکەمیان دۆزینەوەی شوێنێکی لەبار بوو بۆ نیشتنەوەی فڕۆکە لە باشووری پۆرت سوداندا. فڕۆکەخانەیەکی چۆڵکراوی کۆنی سەردەمی بەریتانییەکانیان دۆزیەوە و ڕێڕەوی هەڵستان و نیشتنەوەشیان چاککردەوە، وایان لێکرد فڕۆکەی قورسی جۆری ڕاینۆ (یەکشاخ)ی لێبنیشێتەوە. ئیدی یەکەمین گرووپی جوو هێندرانە فڕۆکەخانەکە. لایتەکان بۆ نیشتنەوە لەسەر هێڵەکان بەکارهێندران. بەڵام کاتێ فڕۆکەی قەبەی ڕاینۆ (یەکشاخ) نیشتەوە، جووە ئەسیوپییەکان لێی ترسان و زەندەقیان لێچوو. ئاخر ئەو باڵندە ئاسنینە زل و کەتەیە کە بۆ یەکەمجار بوو لە ژیانیان بیبینن و بەو زیڕە و هۆڕەی ماشێنە، کە هەورێکی تۆز و خۆڵاوی لە شوێنەکە هەڵساند، پێیانوابوو ڕاستەوخۆ بۆ ئەوان دێ و پانیان دەکاتەوە. زۆریان هەر لەبەری هەڵاتن، دوای ئەوەی بۆ ماوەیەک ئاژانەکانی مۆساد قسەیان لەگەڵ کردن و قەناعەتیان پێهێنان کە دەعبا نییە و سەلامەتە، ئینجا قایلبون بگەڕێنەوە و سواری ببن. هەندێکیان هەر نەیانسەلماند و سواری دێوەزمە ئاسنینە زەبەلاحەکە نەبوون. قەول وابوو فڕۆکەکە دوای

نیشتنەوە بێوەخران هەڵبفڕێتەوە، بەڵام لەبەر ئەو شلۆقیەی لەنێو ڕیزەکانی جووە ئاوارەکاندا پەیدا بوو، یەک سەعات وەخرا، ئینجا لە کۆتایدا هەڵسا و ٢١٣ جووی هەڵگرت .

لە مەڵبەندی مۆسادیشەوە بروسکەیەکی پیرۆزبایی و دەستخۆشی بۆ ئاژانەکانی سەر مەیدانی پۆرت سودان نێردرا. بەڵام خۆ ئەوان دەرسێکی گرنگ فێربوون. ئیدی لە گەشتەکانی داهاتوودا دەبوایە لۆرییەکان بوەستابان تا ڕاینۆ (یەکشاخ)ەکە هەڵدەنیشت لمووزەکەی خۆی درێژدەکردەوە، ئینجا لۆریەکان تا لای فڕۆکەکە لێدەخوڕان، بۆئەوەی ڕاستەوخۆ جووەکان لەسەر پشتی لۆرییەکان، یەکسەر بۆ نێو هەناوی فڕۆکەکە سوار بن.

ئەم کردەوانەش سەرکەوتوو بوون، بەڵام زۆر درێژەی نەکێشا. دەسەڵاتدارە سودانییەکان بینیان هاتوچۆیەکی زۆر بەسەر ئەو فڕۆکەخانە چۆڵوهۆڵەی جارانەوەیە، ئینجا دەبوایە ئاژانەکانی مۆسادیش ڕێرەوێکی دیکەیان بدۆزیبایەوە. هەر زووش ڕێڕەوێکی دیکەیان دۆزیەوە، ئەم جارەیان چل و شەش کیلۆمەتر لە باشووری ڕۆژئاوای پۆرت سودانەوە بوو. بۆ ئەم هەڵمەتەشیان مۆساد ئۆپەراسیۆنێکی گەورەی ڕزگارکردنی جووەکانی ئەسیوپیا بە حەوت فڕۆکەی هێرکولوس بە ئەنجام گەیاند، کە هەر فڕۆکەیەکیان دووسەد کەسی هەڵدەگرت.

ئۆپەراسیۆنی برایان لەژێر سەرپەرشتی خودی کەسی «هاکا»ی ڕامساد و ژەنەڕاڵ «ئامۆس یارۆن» فەرماندەی لقی پەڕەشوتوانانەوە بوو. لە ماوەی ئەو دوو ساڵەی بەدوایدا هاتن، هەر لە ناوەڕاستی ١٩٨٢ تا ناوەڕاستی ١٩٨٤دا، ئیسرائیل ١٥٠٠ کەسی لە جووەکانی ئەسیوپیاوە گەیاندە وڵات.

ئەو ئۆپەراسیۆنە سەرکەوتووە خەریک بوو شکشت بێنێ. ئاخر هەواڵدزێکی هێزی ئاسایشی سودانی هەستی بە پیاوەکەی مۆساد کە بەکاری پەیوەندی لەنێو ئوردوگای پەنابەران کرد و دۆزیەوە. «ئادیس سۆلۆمۆن» کە جووێکی ئەسیوپی بوو گیرا و بۆ ماوەی چل و دوو ڕۆژ لە لایەن سودانییەکان ئەشکەنجە درا. ئەوان دەیانەویست ناوی سەوداکارانی کردەوەکە، شوێنی کۆبوونەوە و دیدارەکان لەگەڵ ئاژانەکانی مۆسادیان پێبڵێ. بەڵام خۆ «سۆلۆمۆن» لەبن ئەشکەنجەداندا نە ڕووخا و هیچ نهێنییێکی بۆ نەدرکاندن.

لە کۆتایی ١٩٨٤دا دۆخی ئۆردوگای ئاوارەکان زۆر خراپتر بوو. قاتوقڕی و بڵاوبوونەوەی نەخۆشی بووە مایەی مردنی زۆر لە جووەکانی ئەسیوپیا. شەڕی ناوخۆش سودانی هیلاک کردبوو، شەڕەکە هەڕەشەی لە ڕژێمی دیکتاتۆر «جەعفەر نومەیری» دەکرد. ئیدی مانەوە و ڕزگاربوونی ئەو بەند بوو بە پاڵپشتی و باربووی خۆراکی تەڕدەستانەی نەتەوە یەکگرتووەکان.

ئیسرائیلیش داوای لە واشنتن کرد بەڵکو یارمەتی سودان بدا ئەگەر هاتوو ڕێگەیان دا گەشتە ئاسمانییەکان بۆ بردنی جووەکانی ئەوێ بەردەوام بێ. بەڕێوەبەرایەتیەکە ڕازی بوو، باڵوێزی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە «خەرتوم» ڕاسپێردرا دانوستان لەسەر فڕۆکەخانە و ڕێڕەوی ئاسمانی بکا. ئەنجامەکەشی سازشێک بوو: جووەکان ڕاستەوخۆ بۆ ئیسرائیل نەفڕن بەڵکو لە ڕێگەی وڵاتی سێهەمەوە بگەنە ئیسرائیل؛ ئیسرائیل نەدەبوایە لە ئۆپەراسیۆنەکە تێوەبگلێ، ئەو سازشەی لەگەڵ سودان سەبارەت بە ئاوارەکان کرا، لەبەرانبەر کەشتی پڕ لە خۆراک و سووتەمەنی بوو.

باڵویزی وڵاتە یەکگرتوەکان، واشنتنی ئاگادارکردەوە، کە دەکرێ لە ماوەی شەش یان حەفت هەفتە جووەکان لە سودان بگوازرێنەوە.

ئەمەش بووە مایەی لەدایکبوونی ئۆپەراسیۆنی «موسا».

لەو نێوەشدا، «هاکا» لەسەر کار لاچووبوو، جێگرەکەی خۆی «ناحوم ئادمۆنی» ببووە *ڕامساد*، ئەویش لەو ساڵانەی پێشوودا بەوە دەناسرایەوە، کە هەوڵێکی ناوازەی بۆ ڕێکخستنی کۆچی جووەکانی ئەسیوپیا دابوو.

ئیدی «ئادمۆنی» ڕێگەی بە پیاوەکانی دا جووەکان لە ڕێی بەلجیکاوە بگوازنەوە ئیسرائیل. بزنسمانێکی جوو کە کۆمپانیایەکی بچوکی گواستنەوەی ئاسمانی هەبوو، قایلبوو بە فڕۆکە بۆینگەکانی خۆی دەستی یارمەتی بۆ ئۆپەراسیۆنەکە درێژ بکا.

بەم چەشنە، لە ١٨ی نۆڤێمبەری ١٩٨٤دا و لە سەعات یەک و بیست خولەکی دوای نیوەی شەودا یەکەمین فڕۆکەی بەلجیکی لە سودان نیشتەوە. ٢٥٠ جووی هیلاک و کەنەفت و لە برسامردوو، ئاوارەی تۆقاو گەیشتنە نێوفڕۆکەکە. بەڵام خۆ فڕۆکەوانە بەلجیکییەکە ڕەتی کردەوە هەڵبفڕێ، چونکە فڕۆکەکە هەر بەتەنیا ٢١٠ دەمامکی ئۆکسجینی پێبوو، بەشی هەر ٢٥٠ سەرنشینەکەی نەدەکرد. ئەوسا ئەو ئاژانە مۆسادەی بەرپرس لە کردەوەکە دەچێتە لای فڕۆکەوانەکە و بەسرتەوە بەڵام لێبڕاوانە پێیدەڵێ: "تکایە، خۆت ئەو کەسانە لێبگرە کە کامەیان بژیێ و کامەشیان بۆ مردن باشە!" ئەو ئەوەندەشی بۆ لێزیادکرد، بەڵام ئەمجارەیان بە دەنگێکی بەرز: "خۆ ئەگەر نەچییە نێو کابینەی فڕۆکەوانییەکە و دەست بەکارەکەت نەکەی و هەڵنەفڕی، ئەوا هەر لێرە فڕێت دەدەمەدەر و بانگی فڕۆکەوانێکی دیکە دەکەم لە شوێنت دابنیشێ."

ئەمەش بەڵگەوبەندێکی[256] قەناعەتپێکەر بوو. فڕۆکەوانەکە چووە سەر کورسی فڕکەوانییەکەی و یەکەمین گەشتەفڕینی ئۆپەراسیۆنی موسا هەڵفریێ و بە دابەزین لە بروکسل، ئینجا ڕووەوە ئیسرائیل بووەوە. لە ماوەی ئەو چل و حەوت ڕۆژانەی دواتردا، بۆینگەکان سی و شەش گەشتە فڕینی نهێنیان ئەنجام داو ۷۸۰۰ جووی ئەسیوپییان بەرەو ئیسرائیل گواستنەوە.

لە ئیسرائیلیشدا، چاودێری سەربازی ئەوپەڕی هەوڵی خۆی خستەگەڕ تا هیچ هەواڵێک سەبارەت بە ئۆپەراسیۆنی گواستنەوەکە دزە نەکا. ئەو هەوڵەشیان سەری گرت تا «ئاری دوزلین»ی سەرۆکی ئاژانسی جووەکان لێدوانێکی بڵاوکردەوە: "خەریکە یەکێ لە هۆزە جووەکان بگەڕێتەوە نیشتمانەکەمان." دەزگەی ڕۆژنامەوانی جووەکانی نیویۆرکیش دوای ڕۆژنامەی لۆس ئەنجلز تایمز، نامیلکەیان بڵاوکردەوە، تیایدا وردەکاری ئۆپەراسیۆنەکەیان بڵاوکردەوە.

سێ ڕۆژ دوای ئەوە، «شیمۆن پێرێز»ی سەروەزیر قسەی بۆ کەنیست کرد: "حکومەتی ئیسرائیل بە کارێک هەڵسا و پێشی هەڵدەستێ، بەهەرچی لە توانایدا هەیە تا ئۆپەراسیۆنی گواستنەوەکە بەئەنجام بگەیەنێ و تا دوا کەسی جووی ئەوێ بگەڕێنێتەوە نیشتمان،" هەر لەهەمان ڕۆژیشدا سودان گەشتە فڕینەکانی هەڵوەشاندەوە و ئۆپەراسیۆنەکە وەستێندرا. وەنەبێ سودانییەکان بەهۆی وتارەکەوە توڕەبووبن، بەڵکو بە قسەی سەروەزیر ئاگریان گرت، چونکە وەک کاربەدەستە ئەمریکییەکان ڕایانگەیاند: "ئەگەر هاتبا و ئیسرائیلییەکان خۆیان بۆ یەک مانگی دیکە

[256] بەڵگەوبەند: ئەرگومێنت.

ڕاگرتبا و قسەیان نەکردبا، دەکرا هەموو جووەکانی ئەسیوپیا بە سەلامەتی بگوازرابانەوە."

جێگری سەرۆک جۆرج بوش بە قووڵی کەوتبووە بن باندۆری ئۆپەراسیۆنی موسا و ئەو هەوڵەی کە ئیسرائیل هەنگاوی بۆ هەڵێنا و ئەو سەرکێشیەی نواند بۆ گەڕاندنەوەی جووەکانی ئەسیوپیا. ئەویش بڕیاریدا لەلای خۆیەوە کارێک بکا. یەک دوو هەفتە دوای هەڵوەشانەوەی ئۆپەراسۆنی موسا، حەفت لە فڕۆکە هێرکلۆسەکانی ئەمریکا لە فڕۆکەخانەی «ئەلقەداریف» سودان نیشتنەوە. لەگەڵ خۆیان چەندین ئاژانی سی ئای ئەیان هەڵگرتبوون. ئەرکی ئەمریکییەکان خستنەگەڕی ئۆپەراسیۆنی شاژنی سەبەئ بوو، ئیدی باقی ئەو٥٠٠ جووەی مابووەوە ڕاستەوخۆ لە سودانەوە گوازرانەوە بنکەی هێزەکانی ئاسمانی ئیسرائیلی «میتێف ڕامان» لە نەقەب.

دوو مانگ دوای ئەوە، «جەعفەر نومەیری» کودەتای بەسەردا کرا و دەرکرا. ئینجا ئەفسەرە هەواڵگرییەکانی لیبی ڕژانە نێو سودان، بەڵکو بتوانن ئەو ئاژانانەی مۆساد ببیننەوە، کە هێشتا لە خەرتوم مابوونەوە. ئەو سێ ئاژانە مابوونەوە لە لایەن لیبیەکانیش دۆزرانەوە، بەڵام لەدوا ساتدا توانیان دەرباز بن و خۆیان بگەیەنە ماڵی ئاژانێکی سی ئای ئەی. ئەمریکیەکەش ئەوانی لە ماڵەکەی خۆی شاردەوە، پاشان لەنێو سندووقێکدا بەرەو «نایرۆبی» پایتەختی کینیای بردن. «دایڤد مۆلاد» کە یەکێ لە ئەفسەرە پلەبالاکانی مۆساد بوو لە سودان، بە خێشکەیی[257] توانی لە وڵاتەکە دەربچێ. ڕزگارکردنی جووەکانی ئەسیوپیا یەکێک لەو ئۆپەراسیۆنانە بوو بەر لەوەی لە مۆساد خانەنشین بکرێ.

[257] بە خێشکەیی: بە کڕوبێدەنگی.

✡ ✡ ✡

هاوکاری نێوان وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئیسرائیل لە ئۆپەراسیۆنەکانی موسا و شاژنە سەبەئ تەواوعەیار بوو تا ڕادەی بێوێنەیی. بەڵام بۆ بەدبەختی، هەر کەمێک دوای ئەو ڕووداوانە، گۆڵمەزی «پۆلارد» لە واشنتن تەقیەوە: کارمەندێکی جوو لە کۆمەڵگەی هەواڵگری ئەمریکییدا بە ناوی «جۆناتان پۆلارد» بە تۆمەتی سیخوڕی کردن بۆ ئیسرائیل گیرا. حکومەتی وڵاتە یەکگرتووەکان زۆر سەرسام و تووڕە بوو، ئاخر سەرانی دەزگەی سی ئای ئەی لە لایەن هاوپەیمانەکانیانەوە ناپاکییان دەرحەق کرا، سەرباری ئەو هەموو چاکە و پیاوەتییە، سیخوڕیشیان بەسەرەوە بکەن.

حکوومەتی ئیسرائیلیش لە ناخەوە داوای لێبوردنی کرد ئەو بەڵگەنامانە «پۆلارد» دزیبوونی، گەڕاندیەوە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. بەڵام خۆ پەیوەندی هەواڵگری نێوان واشنتن و تەلئەبیب زەبرێکی قورسی بەرکەوت. یەکێکیش لە سەوداکارانی «پۆلارد» دەرچوو «ڕافی ئیتان»ی ئاژانە ئەفسووناویەکەی مۆساد بوو، کە ببووە بەرپرسی ڕێکخراوی هەواڵگری وەزارەتی بەرگری. ڕێکخراوی «لاکام» (نووسینگەی پەیوەندییە زانستییەکان) هەر دەمودەست هەڵوەشایەوە و پێواژۆیەکی دادوەریش دژی «ئیتان» لە واشنتن بەڕێوە چوو. تا ئەمڕۆشی لەگەڵ دابێ «ڕافی ئیتان» لە ترسی گرتن، نەیوێراوە پێ بنێتە سەر خاکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

✡ ✡ ✡

پاشان بە توندی لە لایەن جووە ئەسیوپییەکان ڕەخنە لە ئۆپەراسیۆنی موسا گیرا، چونکە بووە مایەی ئەوەی چوار هەزار کەس سەریان تێدا

بچێ. لە نێو خودی دەزگەی مۆسادیشەوە، «شاباتی شاڤیت» بەرپرسیاری کاساری و ئەفسەرەکانی بە توندی دژی پلانی جێبەجێکردنی ئۆپەراسیۆنەکە بوون، کە لە لایەن هۆبەی «بیتزورە»ەوە ڕاپەڕێندرا. «شاڤیت» و پیاوەکانی گوتیان کەوا «بیتزور» هۆبەیەکی پەراوێزخراوە، ئەو ئامراز و کەرەستانەی نەبوو تا دەرەقەتی ئۆپەراسیۆنێکی کەتە و زلی وەک ئەوەی موسا بێ. کەسانی نێو«بیتزور» لەسەر ئەوە ڕشت بوون کە سەرکەوتنی ئۆپراسیۆنەکە بۆ خودی خەسڵەتە سەلمێنەرەکانی ئۆپەراسیۆنەکە دەگەڕایەوە. ئەوەیان ڕوونکردەوە، ئەوان چەند کەسێکیان لە باشترین ئاژانەکانی خۆیان لە قۆناغە جۆربەجۆرەکانی ئۆپەراسیۆنەکەدا خستبوونەگەڕ.

دەمەقاڵێیەکەش لەو ڕاستیەی نەگۆڕی، کە بەهۆی ئۆپەراسیۆنەکانەوە بە هەزاران جوو گەڕێندرانەوە وڵاتی ئیسرائیل. هێشتاش دوای کۆتاییهاتنی ئۆپەراسیۆنەکانی موسا و شاژنە سەبەئ بە هەزاران جوو لە ئەسیوپیا مابوونەوە. ئەوانیش دەیانەویست بەرەو ئیسرائیل کۆچ بکەن، بەڵام دەروازەکان داخران. ئیسرائیل نەوەک هەر لەبەر هۆکاری ئایدیۆلۆژی و بەهەندهەڵگرتنی زایۆنیستیانە ئۆپەراسیۆنەکانی پێی گرنگ بوون، بەڵکو لەبەر هۆکاری مرۆییانەش؛ چونکە خێزانەکان بە سەختی لەیەک دابڕابوون، منداڵەکان گەیشتبوونە ئیسرائیل کەچی دایک و باوکیان هێشتا لەوێ مابوونەوە، دایباب بێ منداڵ گەیشتبوون، مێرد بێ ژن... ئەو لەیەک دابڕانە زۆر کێشەی گەورە و تراژیدیای کەسی نایەوە، وەک ئەوەی هەندێ گەنج هەر لەبەرئەوەی نەیانتوانی بە بێ پشتگیری دایباب و کەسوکار لەگەڵ ئەو ژیانە نوێیە هەڵبکەن، خۆیان کوشت. نوێنەرانی ئاژانسی جووەکان بە هەزاران لە جووەکانیان لە کەمپەکانی دەروبەری «ئەدیس ئەبابا»ی پایتەختدا بڵاوکردنەوە؛ ئیدی جووەکانی ئەسیوپیا هەر

دەست بە دوعا بوون بۆ ئەوەی ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەوانیش بەرنەوە وڵاتی ئیسرائیل.

ئینجا پەرجووەکە پەیدا بوو.

شەش ساڵ دوای ئۆپەراسیۆنەکەی موسا، لە ئایاری ١٩٩١دا، ئۆپەراسیۆنی «سۆلۆمۆن- سولەیمان» دەستیپێکرد. کاتەکەشی لە گەرمەی شەڕی ناوخۆدا بوو، لەشکری یاخیبوان دژی ڕژێمی جونتای مێلیشییا لە هەموو لایەکەوە لە ئەدیس ئابابای پایتەخت نزیک ببوونەوە. ئۆپەراسیۆنەکەش لە دوا ساتەکانی ڕێککەوتنامەکەوە دەستی پێکرد، پەیوەندییەکەش لەنێوان حکومەتی ئیسرائیل و دەسەڵاتداریتی گەمارۆدرای «مێنگستۆ» لە دوا ڕۆژەکانی ڕووخانی بە هۆی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە ڕێکخرا.

ڕێکەوتنامەکەش لەسایەی سەری چالاکییە نهێنیەکانی «ری لوبرانی»، یەکێ لە پیاوە تەلیسماوییەکانی ئیسرائیلیەوە بوو، ئەو کاتی خۆی نێردەی تایبەت بوو بۆ ئێران و لوبنان؛ لەسەر داوای «ئیسحاق شامێر»ی سەروەزیر بە ئەرکەکە هەڵسا. ئیدی بە هۆی ڕێککەوتنامەکە، ئیسرائیل قایلبوو بڕی ٣٥ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی لەبەرانبەر کۆچی جووەکانی ئەوێ بدا، لەکاتێکدا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش بەڵێنی دایە بیچمە سەرەکییەکانی حکومەتەکەی «مێنگیستۆ» مافی پەنابەری سیاسییان لە ئەمریکا پێبدا. هەر لەهەمان کاتیشدا گەیشتنە لێکتێگەیشتنێک لەگەڵ سەرکردە یاخیبووەکان، کە ئەوانیش بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بە ئاگربەست قایل بن، تا لەو ماوەیەدا ئیسرائیلییەکان ئۆپەراسیۆنی گواستنەوەی جووەکان بە ئەنجام بگەیەنن. ئەمەش هەر سی و شەش سەعاتی خایاند و ئۆپەراسیۆنەکەش سەری گرت.

هێزی بەرگری ئیسرائیلی بەرپرسیاربوو لە راپەراندنی ئۆپەراسیۆنی «سۆلۆمۆن». ژەنەراڵ «ئامنۆن لیپکین شاهاک»ی جێگری سوپاسالار سەرپەرشتی کردەوەکەی پێسپێردرا. ئینجا بە فەرمانی ئەو، ئیسرائیل هەموو ئەو ئامێرانەی "کە بیانتوانییایە بفڕن" ناردە ئەدیس ئەبابا. کۆمپانیای هێڵی ئاسمانی ئەلئال ٣٠ فڕۆکەی خۆی خستەبەردەست، هێزی ئاسمانیش زۆر لە فڕۆکەکانی خۆی ناردنە ئەوێ. دەستەی گوڵبژێری کۆماندۆی «شالداگ» kingfisher یش نێردرانە ئەدیس ئابابا. سوپاش بە دەوری خۆی سەدان سەربازی زەمینی پیادە و بەشێک لە پەڕەشووتوانانی بە ڕەچەڵەک ئەسیوپی، ئەوانەی ساڵانێک پێشتر بە منداڵی گەیشتبوونە ئیسرائیل، دیسان ڕەوانەی ئەوێندەرێ کرانەوە. ئەوان بە نێو فڕۆکەخانەکەدا بڵاوکرانەوە تا ڕێنوێنی جووەکان بکەن و سواری فڕۆکەکانیان بکەن. لە ماوەی سی و چوار سەعاتدا، ١٤٤٠٠ جوولەکە گەیەندرانە فڕۆکەخانەکە. لەوێشەوە بە خێرایی سواری فڕۆکەکان کران و بەرەو ئیسرائیل هەڵفڕین. لەو کردەوەیەدا پێوانەی نێودەوڵەتی شکێندرا: بۆینگی ٧٤٧ی ئەل ئالی ئیسرائیلی ١٠٨٧ی کۆچبەری بارکرد، بەڵام کاتێک لەفڕۆکەخانەی ئیسرائیل دابەزین، ژمارەیان ببووە ١٠٨٨ کەس. ئاخر لە کاتی فڕینەکەدا منداڵێک لەدایک ببوو.

لە نیگای ئەو سەربازە گەنجە ئەسیوپییانە کە لە ئیسرائیلەوە بەهانای براکانیانەوە چووبوون، هەر سۆز و خۆشەویستی لەو کۆچبەرانەی بەرێ و تەنانەت لە دەستەی پەرەشوتوانە توندوبەند و خۆگرەکانیش، ئەوانەی لەبن یەک بەرگی کەسکی هێزی بەرگری ئیسرائیلدا بون کڵاوی سووریان لەو نێوەدا بەچاوی فرمێسکاوییەوە دەستی ئاوارەکانیان گرتبوو، سواری فڕۆکەکانیان کردن.

✡ ✡ ✡

ئەمڕۆش، پاش زیاتر لە بیست ساڵ لە ئۆپەراسیۆنی «سۆلۆمۆن»، هێشتا زۆر لە جوو لە ئەسیوپیا ماون، هەوڵیش دراوە بۆئەوەی بیانهێننەوە ئیسرائیل. بەڵام لەخۆگرتنی ئەو ئەسیوپیانەی بردرانە نێو ئیسرائیل، لەنێو کۆمەڵگەکەدا کارێکی ئاسان نییە. زۆر جاریش لەبەر ئەو کەلێنە بەرفراوانەی کلتوری کۆمەڵگەی ئەفریقایی و ژیانی دەوڵەتی ڕۆژئاوایی نوێ؛ بەڵام لەبەر هۆکاری جیاگەری ڕووقایمانە یاخود لەبەر داوای ناشیرینی سەرکردە دینییەکان بەوەی هێشتاش ئەسیوپییەکان بە جووی ڕەسەن دانانێن.

لە دوا کۆپلەی گۆرانی " گەشتەکەشدا" هاتووە:

لەبەر مانگدا

خەیاڵی دایکم لێم دەڕوانێ

هۆ دایکە، توخوا لامەچۆ!

خۆ ئەگەر ئەو بە تەنیا لام بمێنێتەوە

دەتوانێ بڕوایان پێبهێنێ

بەوەی، منیش جووم.

## پاشبەند، شەڕ لەگەڵ ئێران؟

***فڕۆکەخانەی ئەنتەبە، ئۆگەندا، ٤ی تەمموزی ١٩٧٦***

لە شەوێکی تاریک و نوتەکدا، چوار فڕۆکەی هێرکولیسی ئیسڕائیلی، بێئەوەی ڕاداری ئۆگەندی هەستیان پێبکا، بە دزی لە فڕۆکەخانەی «ئەنتەبە»دا نیشتنەوە. ئەوان زۆر لە دوورەوە، لە مەودای ٢٥٠٠ مایلەوە، لە بنکەی خۆیان لە ئیسڕائیلەوە هەڵفڕیبوون، کۆماندۆکانی "سەیارەت ماتکال" و چەند یەکەیەکی لێبژاردەی سوپایان بارکردبوو. ئاخر هەفتەیەک پێشتر، تیرۆرستەکانی عەرەب و ئاڵمان فڕۆکەیەکی هێڵی ئاسمانی فەرەنسایان کە لە تەلئەبیبەوە بۆ پاریس دەڕۆیشت ڕفاند، و ناچاریان کرد لە فڕۆکەخانەی ئەنتەبەدا بنیشێتەوە. تیرۆریستەکانیش بە پشتیوانی و پارێزگاری دیکتاتۆرەکەی ئۆگەندا «عیدی ئەمین» ٩٧ ئیسڕائیلییان بە بارمتە گرتن. ئیسڕائیلیش بڕیاری ئۆپەراسیۆنێکی ئازایانەی لەناو جەرگەی ئەفریقا بۆ ڕزگارکردنی بارمتەکانی دا.

کۆماندۆ ئیسڕائیلییەکان چەند خولەکێک دوای دابەزین لە فڕۆکەکان بە نێو فڕۆکەخانەکە وەربوون. «یۆنی ناتانیاهو» فەرماندەی هێزی "سەیارەت ماتکال" سەرکردایەتی پیاوەکانی کرد، بۆ هێرشکردنە سەر تەرمینالی فرۆکەخانەکە، کە بارمتەکانیان تێدا بەند کردبوون. لە گەرمەی تەقەی شەڕەکەدا، «یۆنی ناتانیاهو» ڕاقەنا، گوللەیەک پێکای. ئەوسا ئەفسەرێکی دیکەی "سەیارەت ماتکال" بە ناوی کاپتن «تامیر پاردۆ» بەسەر فەرماندەکەی نوشتایەوە، مایکی نێرەرەکەی کردەوە و بانگی هاوڕێکانی کرد و پێیڕاگەیاندن کە لە «یۆنی» درا. ئینجا «موکی بێتزەر» جێگرەکەی «یۆنی» وەڵامی دایەوە و پێیگوت: "جێگەی ئەو بگرەوە!"

ئەویش جڵەوی فەرماندەیی وەرگرت و لەسەر ئەرکەکە ڕۆیشت. هەر چەند خولەکێک دواتر، شەڕەکە کۆتایی پێهات. تیرۆرستەکان کوژران، بارمتەکانیش ڕزگارکران، فڕۆکە قورسە هێرکولوسەکان هەڵسان و بەرەو ئیسرائیل هەڵفڕین.

کردەیەکی فریادڕەسانەی وا، ئەوەندە دوور لە خاکی نیشتمان، هی ئەوە بوو ببێتە ئەفسانەیەک بۆ خۆی. بەڵام خۆ ئۆپەراسیۆنەکە بێ قوربانی نەبوو: سێ لە بارمتەکراوەکان هەروەک سەربازێک کە ئەویش ملازم «یۆنی ناتانیاهو»ی برای سەروەزیری داهاتوو «بنیامین ناتانیاهو» کوژران. ئینجا سەرلەبەری دەوڵەتی ئیسرائیل پرسەی بۆ «یۆنی» دانا. هەر ئەو شەویش «تامیر پاردۆ» ئەفسەری پەیوەندییەکانی هێزی "سەیارەت ماتکال" لە ئۆرشەلیم لە دەرکەی ماڵی ماڵباتی «ناتانیاهو»ی دا؛ ئەو بەتایبەت نێردرابوو تا هەواڵی کوژرانی کوڕەکەیان پێڕابگەیەنێ. دۆستایەتییێکی گەرم لەنێوان ئەو و بنەماڵەکە پەیدا بوو، ئاخر ئەو لەدوا ساتەکاندا لەپاڵ «یونی»دا بوو.

سی و پێنج ساڵ دواتر، ئەو «تامیر پاردۆ»یە کە تەمەنی ببووە پەنجا و حەفت ساڵ کرایە *ڕامساد* و جێگەی «مایەر داگان»ی گرتەوە.

✡ ✡ ✡

لە تەلئەبیب و لە بنەماڵەیەکی بەڕەچەڵەک جووی تورکی و سێربی لەدایک ببوو، «تامیر» لە تەمەنی هەژدەساڵیدا خۆبەخشانە چووبووە نێو هێزی پەرەشوتوانان، لە ئەکادیمیای ئەفسەران دەرچوو، لە ڕاژەی یەکەکانی هێزی کۆماندۆی سەیارەت ماتکال و «شالداگ»دا بوو. چوار ساڵیش

دوای ئۆپەراسیۆنەکەی «ئەنتەبە»، چووە ڕیزەکانی مۆساد و لە چەندین ئۆپەراسیۆنی بێناودا بەشداری کرد و سێ جارانیش خەڵاتی ئاسایشی ئیسرائیلی پێبەخشراوە. لە ١٩٩٨یشدا بە سەرۆکی لیژنەی لێکۆڵینەوەی مۆساد لە هەوڵی سەرنەکەوتووی خالید مەشعەل دەستنیشان کرا. هەر دوای ئەوەش کرایە سەرۆکی «نێڤیۆت»، هۆبەیەکی مۆساد کە بەرپرس بوو لە کۆکردنەوەی زانیاری ئەلکترۆنی لە وڵاتە بیانییەکان. ئەو لە تەکنەلۆژیای نوێ و دانانی پلانی خەیاڵکردەی داهێنەرانە شارەزا بوو. لە ٢٠٠٢شدا، کاتێک «داگان» بە *ڕامساد* داندرا، «پاردۆ» بووە یەکێک لە دوو جێگرەکانی ئەو. لە ماوەی چوار ساڵی بە دوادا هاتوودا، سەرپەرشتی ستافی ئۆپەراسیۆنی مۆسادی کرد؛ بەڵام لە ٢٠٠٦دا ساڵێکی وەک ژەنەڕاڵێکی سوپا لەنێو هێزی بەرگری ئیسرائیلدا بەسەربرد، لەوێدا ڕاوێژکارێکی ستافی ژەنەڕاڵەکان بوو بۆ ئۆپەراسیۆنی تایبەت. دەگوترا لە ماوەی جەنگی دووەمی لوبناندا پلانی چەندین نیازکردەی داناون. لە ٢٠٠٧یشدا دیسان بانگکرایەوە تا لەپاڵ «داگان»دا لەنێو مۆساددا کار بکاتەوە. واش چاوەڕوان دەکرا دوای تەواوبوونی خولی «داگان» لە ٢٠٠٩دا ببێتە *ڕامساد*، بەڵام کابینەی حکوومەت بە کارە باشەکانی «داگان» سەرسام بوو، بۆیە ڕاژەکەی بۆ ساڵێک درێژ کردەوە. «پاردۆ»ش بەمە قایل نەبوو، بۆیە لە کاروباری مۆساددا دەستی لەکار کێشایەوە لەگەڵ کۆمپانیایەکی داودەرماندا ڕووی لە بیزنس کرد. ئەمەش زۆری نەخایاند. چونکە لە ٢٩ی نۆڤێمبەری ٢٠١٠دا «ناتانیاهو»ی سەروەزیر کردیە *ڕامسادی* داهاتوو، ئەوە بوو لە یانیوەری ٢٠١١دا وەک سەرۆکی مۆساد دەست بەکار بوو.

بە زۆر شێواز «پاردۆ» شوێنپێی ڕامسادەکەی پێشخۆی هەڵگرتبووەوە. شەڕی دڵڕەقانەی پەردەپۆشکراو لەگەڵ ئێران بەردەوام بوو. لە نۆڤێمبەر

و دیسێمبەری ٢٠١١دا، چەندین تەقینەوە لە بنکەی سەربازی لە کەناری ئیسفەهان کران، ئەو شوێنەی مووشەکە دوورهاوێژەکانی شیهابیان تێدا تاقی دەکرانەوە، گازی یۆرانیۆم لە کانی سەنتەرفیوگەکانی جیادەکرایەوە و دەکرایە ماددەیەکی ڕەق. زانایەکی دیکە بەناوی «د. موستەفا ئەحمەدی ڕەوشەن» کە جێگری بەڕێوەبەری «ناتانز»ی توانستی ژێرزەمینی بوو، لە کاتێکدا کوژرا کە تڕومبێلەکەی لە نێو شەقامەکانی تاراندا لێدەخوڕی. شێوازی کردەوەکەش هاوشێوەی کوشتنەکانی پێشوو بوو.

ئێران ئیسرائیلی بە پەلاماردانەکان تاوانبارکرد و سوێندیشی خوارد تۆڵە بکاتەوە. بۆ یەکەمین جاریش بوو، دەزگەی نهێنی ئێرانی چەندین کردەوەی دژی ئامانجە ئیسرائیلییەکان لە ئاسیادا ئەنجام دان: تڕومبێلێکی مینڕێژکراو لە «نیودەلهی» بووە مایەی بریندارکردنی دیپلۆماتێکی ئیسرائیلی و خێزانەکەی؛ هەوڵێکی هاوشێوەش لە «تبلیسی» پایتەختی «جۆرجیا» درا بەڵام شکستی هێنا؛ چەندین تەقینەوەش لە «بانکۆنگ»ی پایتەختی تایلەند کران، یەکێکیان خودی بکەرەکەشی بریندار کرد کە ڕەگەزنامەی ئێرانی هەبوو. دەزگەی نهێنی میسرییش پیلانێکی ئێرانی بۆ تەقاندنەوەی کەشتییەکی ئیسرائیلی کە بەنێو نۆکەندی سوێسدا ڕێی خۆی تەیدەکرد، پووچەڵ کردەوە. ئەو شەڕە دەمامکدراوەی نێوان ئیسرائیل و ئێران هەنووکە ببووە شەڕێکی کراوە. لێکۆڵینەوەی پۆلیس لە «نیو دەلهی»، «بانکۆنگ» و «قاهیرە»دا پەنجەی تۆمەتیان بۆ دەزگەی نهێنی ئێرانی ڕاهێشت. ڕۆژنامەگەری جیهانیش وردەکاری هەوڵە نسکۆخواردووەکانی ئێرانییەکانی بۆ هێرشکردنە سەر ئامانجە ئیسرائیلیەکان لە هەندەران وێنا کرد.

هەروەها ئەم دۆخە کراوەتر بوو، زانیاری وردەکاری دیکە سەبارەت بە ئۆپەراسیۆنی ئیسرائیلی لەنێو ئێراندا بڵاوکرایەوە. سەرچاوە

ڕۆژئاواییەکان گوتیان؛ گوایە مۆساد بنکەی ئۆپەراسیۆنیان لە ئازربایجان و کوردستان و ڕاستەوخۆ لەسەر سنوورەکانی ئێران داناون. ئەو بنکانە وەک بنکەی مەشق و ڕاهێنانی مەیدانی وان بۆ ئەوەی ئاژانەکان بنێرنە نێو قووڵایی خاکی ئێران. هەر هەمان سەرچاوە ئەوەشیان گوت، گوایە ئاژانەکانی مۆساد لەنێو ئێراندا دەستبەکارن و لەڕاستیشدا ئەندامی ڕێکخراوی موجاهیدینی خەلقی نەیارن، ئاخر ئێرانییێکی موسڵمان باشتر لە ئەفسەرێکی مۆساد دەتوانێ باشتر دزە بکاتە نێو خەڵک. ژمارەیەک لە میلشیاکانی ڕێکخراوی موجاهدینی خەلق، بە نهێنی لە بنکەکانی ئیسڕائیلدا مەشقیان پێکراوە و لەسەر هەندێ ئۆپەراسیۆنی شێوە تایبەتیش ڕاهێندراون وەک لە شەقامەکانی ئێراندا ڕووی دا، بەوەی بۆسەیان بۆ زانا ناوەکییەکان دانا یان ترومبێلی بۆمرێژکراویان لە نزیکماڵەکانیان تەقاندنەوە.

لە باری دیکەشدا، بە شێوازی جیاجیاوە لە یاخیبووان نزیک دەکەوتنەوە. چەندین یاداشتی سی ئای ئەی باسی ئەوەیان کردووە کە ئەفسەرەکانی مۆساد لەژێر "ئاڵای ساختەوە" چەندین نێردەیان" هێناونەتە ڕیز. هەروەک ئاژانەکانی سی ئای ئەی دەریان خست، گوایە ئیسڕائیلییەکان میلیشیا تیرۆرستەکانی پاکستانی، جوندوڵلایان بەکرێ گرتون و ناردویانەتە ناو ئێران تا کاری تێکدەرانە بکەن. بە گوێرەی یاداشتی ئەو ئاژانانەی سی ئای ئەی، هەروەک ئەفسەرە هەواڵگرییە ئەمریکییەکانیان کرد، نەیارێتی موسڵمانی دڵسۆزیان دژی ئێران و بە بەرژەوەندی دەوڵەتی جوو بەکارهێنا.

لە بەهاری ٢٠١٢شدا، چاودێرە نێودەوڵەتییە نیگەرانەکان باسی ئەوەیان کرد، کە پڕۆژەی ناوەکی ئێران خەریکە تەواو دەبێ و سەروچاوەکانی لەنێو ئاژانسی وزەی ناوەکی نێودەوڵەتیش ڕایگەیاند، کە ئێران ١٠٩

کیلۆگرام یۆرانیۆمی پیتێندراوی بەرهەم هێناوە، ئەمەش بەشی دروستکردنی چوار بۆمبی ناوەکی دەکا. خۆ ئەگەر ئیسرائیل بڕیار بدا، زەبرێکی کوشندە لە پڕۆژەی ئێرانییەکان بدا، بەوەی دەست لە مەڵبەندەکانی ناوەکی بوەشێنێ، ئەوا شەڕە ڕووپۆشکراوەکەیان دەبێتە شەڕێکی کراوە.

 بە گوێرەی ڕۆژنامەگەری جیهانیش و هەندێ لە وتەبێژە زۆربڵێکان، هەر ئیسرائیل بە تەنیا لەبەردەم ئەگەری سەربازیدا نەبوو. لە ئۆرشەلیم و واشنتندا، سەرچاوە فەرمییەکان ئەوەیان پشتڕاستکردۆتەوە کە ئیسرائیل و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەیەکەوە کاردەکەن، بەڵام لە خاڵێکی سەرەکییدا ناکۆکن: کەی پێویست دەکا بەهەر توانایەک بێ، بە سەربازی یان غەیرە سەربازی، ئێران لە شوێنی خۆی بوەستێنن. دامودەزگەکانی ئەمریکایی دەڵێن ساتی لەبار، دەبێ ئەو کاتە بێ کە پیتاندنی یۆرانیۆم ی ئێرانی بگاتە پلەی ٨٠٪، ئەوەش قۆناغێکی چارەنووسسازانەی پەرەپێدانی توانستی ناوەکییە. گەیاندنی ڕادەی پیتاندنی یۆرانیۆم بۆ ئەو ئاستە، دەکرێ بە خێراییش بگاتە سنووری ٩٧ پلەی سەدی، ئەم پلەیەش پێویستە بۆ بۆمبی ناوەکی.

هەرچی خشتەی ئیسرائیلە جیاوازە، ڕوانینەکەیان لەسەر بنەمای مەیدانی و دۆزینەوەی مانگە دەستکردەکان ڕۆناوە. مۆساد ئەوەی دۆزیوتەوە کە ئێران لەگەڵ کات لە شەڕ و کێبەرکێیەکی شێتانە دایە، ژمارەیەکی گەورەی توانستەکانی لە ژێر زەمیندا و بە قووڵایی هەشتا مەتر و زیاتریش دروست کردوون. هەمو کەلوپەل و پێداویستیان بۆ ئەو تاقیگە نهێنییانەی ژێرزەمینی گواستوونەتەوە. ئەو زانیارییە هەواڵگرییانەی بە یارمەتی ڕێکخراوی موجاهدینی خەڵق دەست مۆساد کەوتوون، گوایە ئێران توانستێکی نوێی لە نزیک «فۆردۆ» دروست کردووە. لەو هۆڵە

کەتە و زلانەی توانستە نوێیەکەیدا، ئێرانییەکان نەخشەی دامەزراندنی سێ هەزار سەنتەرفیوگی نوێیان داناوە، کە زۆر خێراتر و پێشکەوتوتریشن لەو ئامێرانەی ئێستا بەرکارن. دەکرێ ئێرانییەکان لەو توانستانەدا خۆراکی پیتاندنی سەنتەرفیوگ بۆ زیاتر لە 3.5 پلەی سەدی بەرزبکەنەوە و بەردەوامیش بن لە پیتاندنەکە تا دەگەنە مەبەستی خۆیان. ئێران لەو باوەڕەدایە کە ئەو ئەشکەوتەی ڕۆژی حەشرە، وەک زۆر لە بنکە و تاقیگەکانی دیکە دەبێ بەرلەوەی سەنتەرفیوگیان لێدابمەزرێ و بەرلەوەی دژی لێدانێکی هێزی ئاسمانی بپارێزرێن، تێکوپێک بدرێن. "کاتێکیش ئەوان دەگەنە قۆناغە کوشندەکەی پیتاندن،" وەک نێردەیەکی ئیسرائیل بە هاوتا ئەمریکاییەکەی گوت؛ "ئەوا کار لەکار دەترازێ. ئەو کات ئەوان دەگەنە قۆناغی پارێزبەندی، کە هیچ بۆمبێک ناتوانێ پرۆژەکەیان تێکوپێک بدا. کاتی دەستبەکاربوون لە بەهاری ٢٠١٢دا هاتووە."

واشتنتۆن بڕوای نەهاتبوو دەیەویست هەڵمەتێکی سزادانی قورس بسەپێنێ. ئیسرائیلیش باوەڕی بەوە نەبوو، سزاکان ئێران بوەستێنێ. لە کۆبوونەوەی لوتکەی بەهاری ٢٠١٢دا، سەرۆک «ئۆباما» و سەروەزیر «بنیامین ناتانیاهو» پەسنی هاوپەیمانە ستراتیژییەکەی نێوان هەردوو وڵاتەکەیان دا، بەڵام لەسەر ڕێگەی بەرەنگاربوونەوەی پرۆژەی ناوەکی ئێران ڕێکنەکەوتن. هێشتاش ڕاپۆرتەکانی مۆساد هەر ئاماژە بەوە دەکەن کە ئێران بێباکانە بە دوای هێز و دەسەڵاتی ناوەکییەوەیە. لەهەمان کاتیشدا، سەرکردە ئێرانییەکان، بێباکانە گەفی لەناوبردنی سەرتاسەری لە ئیسرائیل دەکەن. ئەو بیرۆکە مەترسیدار و توندڕۆیەی ئێرانی ناوەکی بۆ ئیسرائیل جیهانیش ڕایدەگەیەنێ، هەروەک ئەوە وایە کە ئیسرائیلییەکان قسە بەناوبانگەکەی تەلمودیان بەبیربێنێتەوە: "ئەگەر یەکێک بێت بتکوژێ، لەجێی خۆت هەڵسە و یەکەمجار تۆ ئەو بکوژە."

ئیسرائیل هەستی کردەوە، دیسان تەنیایە. هەروەک چۆن لە ١٩٤٨ لە سالّی دروستکردنی خۆی و لە ١٩٦٧ لە ئێوارەی بەر لە جەنگی شەش ڕۆژە، دیسان ئیسرائیل ڕووبەڕووی چارەنووسسازترین بڕیاری هەبوونی بۆتەوە.

## چەند سەردێڕێک لە ژیاننامەی وەرگێڕ

- ❖ لە ١٩٦٨ لە گوندی گرتک لە دۆڵی ڕوستێی دەڤەری باڵەکایەتی لە دایک بووە.
- ❖ لە ١٩٨٨دا بە کالۆریۆسی لە قانون لە زانکۆی بەغدا وەرگرتووە.
- ❖ لە ١٩٩٧ەوە تا ٢٠١٢ ئاوارەی ئەورووپا (هۆڵەندا و بەریتانیا) بووە.
- ❖ لەپاڵ زمانی زگماکیدا؛ زمانەکانی عەرەبی، هۆڵەندی و ئینگلیزی دەزانێ.
- ❖ لە ١٩٨٦ەوە هەوڵی نووسینی داوە. تا ئێستا ١٢ کتێبی لە زمانەکانی هۆڵەندی و ئینگلیزییەوە وەرگێڕاون. دەیان وتار و لێکۆڵینەوەی قانونی و سیاسیشی بڵاو کردوونەتەوە.

## چاپکراوەکانی وەرگێڕ

1. نهێنییەکانی مۆساد، نووسینی گۆردۆن تۆماس، وەرگێڕان لە زمانی هۆڵەندییەوە، سێ جار چاپکراوەتەوە؛ چاپی یەکەم ٢٠٠٨ چاپخانەی هێڤی، هەولێر. چاپی دووهەم دەزگەی چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕۆژهەڵات، هەولێر ٢٠١٤. چاپی سێهەم ڕۆژهەڵات ٢٠١٦.
2. مادلین ئۆلبرایت، سیاسەتی ئەمریکا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، وەرگێڕان لە هۆڵەندییەوە، سەنتەری نما ٢٠٠٩، هەولێر.
3. داود بنگۆریۆن، دامەزرێنەری دەوڵەتی ئیسرائیل، نووسینی ڕۆبەرت سەنت یۆهن، وەرگێڕان لە هۆڵەندییەوە، چاپخانەی هێڤی ٢٠١١، هەولێر.
4. کوردستان لە نێوان سیڤەر و سنووره دەستکردەکاندا، نووسینی: هیسەر لێهر واگنەر. مێژوو. وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە. چاپی یەکەم؛ لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی هەولێر ٢٠١٣. چاپی دووەم، ئاوێر ٢٠١٥.
5. وەرزێکی سپیی وشکوبرینگ، ئەندریێ برینک. ڕۆمان. وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر ٢٠١٣.
6. ژیانی من، چۆن ئیسرائیل دامەزرێنرا؟ گۆڵدا مایەر، یاداشت، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر، هەولێر. ٢٠١٤.

7. ئینفێرنۆ، دۆزەخ، دان براون، ڕۆمان، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر ٢٠١٥.
8. شەڕەف، ئەلیف شەفەق، ڕۆمان، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر ٢٠١٥.
9. یاخیبوون، مناحیم بێگن، یادەوەری، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر ٢٠١٦.
10.خانووەکەی مزگەوتێ، قادر عەبدوڵڵا، ڕۆمان، وەرگێڕان لە هۆڵەندییەوە، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر ٢٠١٦.
11.داود بنگۆریۆن، دامەزرێنەری دەوڵەتی ئیسرائیل، نوسینی ڕۆبەرت سەنت یۆهن، وەرگێڕان لە هۆڵەندییەوە، چاپی دووەم، بژارکراو، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر ٢٠١٦.
12.کۆدەکەی داڤینشی، دان براون، ڕۆمان، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە، ناوەندی ئاوێر، هەولێر ٢٠١٦.
13.خەتی بزماری، ڕۆمان، قادر عەبدوڵڵا، وەرگێڕان لە هۆڵەندییەوە، ناوەندی ئەندێشە، سلێمانی ٢٠١٧.